د. عەلی وەردی

# گاڵتەجاڕی عەقڵی مرۆڤ

وەرگێڕانی:

فەیسەڵ خەلیل

ناوەندی ئاویر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
ژمارەی بڵاوکراوە: ١٨٦




گاڵتەجاری عەقڵی مرۆڤ

وەرگێڕانی: فەیسەڵ خەلیل

دەرهێنانی هونەری ناوەوە: خلیل هدایەت مام شێخ

بەرگ: ئاکار جەلیل کاکەوەیس

تیراژ: (١٠٠٠) دانە

نرخ: (٨٠٠٠) دینار

شوێنی چاپ: چاپخانەی ڕۆژهەڵات/هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٦٣٠)ی ساڵی ٢٠١٤ی پێ دراوە

ناوەندی ئاویر
بۆچاپ و بڵاوکردنەوە
ناونیشان: هەولێر - پشت پارێزگا - بەرامبەر دەرگای قەڵات

ژمارەی مۆبایل: 07504209495 07504242101

ئیمەیل: Nawendi.awer@yahoo.com
فەیس بووک: www.facebook.com/nawendi.Awer

## پێرست

# پێشەکی

ئەم کتێبەم کە لە چەند بەشێکی جیاواز پێکهاتووە، لە چەند کاتێکی جیاواز نووسراوە، دوای دەرچوونی دواکتێبم بوو کە (واعیزی سوڵتانەکان)ە. ئەم چەند بەشە لە بارەی یەک بابەت نییە، ئەوەی بە یەکتریان دەبەستێتەوە ئەوەیە کە لە ژێر کاریگەری ئەو دەنگ وسەدایە نووسراون کە لە کتێبەکەی دیکەم کەوتنەوە. دەمەویت دەرگایەک لەسەر خوێنەران بکەمەوە بۆ ئەوەی ئاوڕتوێ ومشتومڕ بکەن، هەقیقەتیش تەنها رەچەی لێکۆڵینەوە ومشتومڕە.

پێنج کتێب وەک وەڵامی واعیزی سوڵتانەکان نووسراون، ئەمە جگە لە وتارەکان. ئەو کتێب و وتارانەم بەوردی خوێندنەوە، لەوانەشە هەندێکجار دووبارەم خوێندبنەتەوە، پێویستیشە سوپاسی خاوەنەکانیان بکەم لەبەر ئەو ماندووبوونەی لە توێژینەوە و نووسین چەشتویانە[1]. بەڵام ئەمەش لە خوێنەر ناشارمەوە جۆرێک لە بیرکردنەوەم لەو نووسینانە بینی، بەلای منەوە زۆر پەسەند نییە. ئەوان لە دوڵێک

---

[1] سوپاسی تایبەتم بۆ هەر یەکە لەبەڕێز محمد سالح قەزوینی وماموستا عەبدولمونعیم کازمی و بەڕێز موڕتەزا عەسکەری هەیە، چونکە لە کتێبی ئەوان زۆر رەخنەی جددی و بۆچوونی دروستم بینی. عەل وەردی

دەنووسن، من لە دۆڵێکی دیکە. بانگەشەی ئەوەش ناکەم من لەڕووی هزرەوە لەوان ڕاستترم، ئەو هەڵسەنگاندنە کارێکی ئەستەمە، چونکە پێوەرێکی گشتیمان نییە جێگای ڕەزامەندی هەمووان بێت، ئایندە بەڕێ ڕاستی هەر کۆمەڵێکمان بۆ دەردەخات. ئەوەی کەفوکوڵ بێت دەڕوات و ئەوەی سوودیشی بۆ خەڵک هەبێت ئەوا لەسەر زەوی دەمێنێتەوە.

ئەوەی دەتوانم بیڵێم ئەوەیە ئەوان بەشێوازێک دەنووسن خەڵک لە سەدەکانی ڕابردوودا بەم شێوازەی دەنووسی، بەڵام من هەوڵ دەدەم بە شێوازێکی نوێ بنووسم، جیاوازییەکی زۆریش لەنێوان بیرکردنەوەی سەدەی دەیەم و سەدەی بیستەم هەیە. کەچی کێشەی برایانمان ئەوەیە ددان بەبوونی بیرکردنەوەیەکی نوێ نانێن، بایەخیش بەو تیۆرانە نادەن کە ئەمڕۆ زانایان دایانناون و خەریکە تیۆرە کۆنەکان لەناودەبەن، یەکێک لەوان لەنێو کتێبە کۆنەکان دەژیت و تابەتە دەرەوە، دەبینی هەندێکجار تووشی لەخۆبایی بوون دەبێت و وادەزانێ قسەی یەکلاکەرەوە لە لای ئەوە، بۆیە پێویستی بە گەڕان بەدوای زانستی نوێ نییە.

چەند جارێک بیستوومە دەڵێن: فەلسەفە هزری گەیاندۆتە ئامانجی خۆی، وردەکاری هەموو شتێکی تێدایە. تیۆرە نوێیەکانیش بەبڕوای ئەوان تەنها وێنەی شێواوی ئەوشتانەن کە بیرمەندانی پێشوو هێناویانن. یەکێک لەوانە لە کاتی وەڵامدانەوەی من دەڵێ:[7] لەکتێبی واعیبزی سوڵتانەکان هەندێک زاراوی زانستی نوێ هاتوون، کەسێک کەپێشتر نەیانزانێ، ئەوا ئەستەمە تێیان بگات. وەک دەشزانین ئەو زاراوانە نوێ نین، بەڵکو زۆر کۆنن، مەدەنیەتی نوێ بەرگ و ناوێکی نوێی پێ بەخشیون، بۆیە پێویستە ماناى ئەو وشانەی کە دکتۆر زۆر دووبارەیان دەکاتەوە، ڕوون بکەینەوە، ئەمەش وەک دەرخستنی چاکە و زانیای ئەو لە زانستە نوێیەکان دا".

[7] محمد صالح القزويني، الموعظة الحسنة، ج1، ص4

لێرەدا بەرگری لە خۆم وکتێبەکەم ناکەم. بەڵکو ویستم ئەو قسانە بۆ خوێنەر بگوازمەوە، چونکە ئەمە بریتییە لەو بیرکردنەوەیەی کە بەسەر زۆربەی پیاوانی ئاییني ئەو رۆژگارەمان دا زاڵە، ئەوان گاڵتە بە تیۆرە نوێیەکان دەکەن، بە گۆرانکاریی بیرۆکە کۆنەکانی دەزانن، ناشزانن ئەوان گاڵتە بە خۆیان دەکەن. ئەوان جیاوازییەکیان لەگەڵ ئەو رێوییە نییە، کە بەترێی دەگوت ترشە، چونکە دەمی پێنەدەگەیشت.

ئەمرۆ تیۆرە نوێیەکان ، کودەتایەکی گەورەیان بەسەر شێوازی بیرکردنەوە کردووە، بەڵکو ئەمەیان شۆرشێکی گەورەیە. ئاسان نییە کەسێك کە ئەیزانێ؛ بڵێ من لە دێر زەمانەوە دەیزانم. لەگەڵ ئەوەشدا ناکرێت نکوڵی لەوە بکەین کە فەلسەفەی کۆن چاکەیەکی پێشکەش بەبیری مرۆڤایەتیی کردووە، بەڵام ئیعتراف کردن بەو چاکەیە رێگرییمان لێ ناکات لەوەی بیرکردنەوەی خۆمان بە گوێرەی پێویستییەکانی سەردەمی نوێ بەرەوپێش ببەین.

***

هەندێك لەو لووتبەرزانەی پیاوانی ئاییني بانگەشەی نوێبوونەوە دەکەن لە نووسین وخوتبەکانیان، بۆیە دەبینی هەندێك وشە و زاراوەی نوێ ئەزبەردەکەن و دەیخەنە سەر رووپەری گۆڤارد و رۆژنامەکان، دواتر لە قسەکانیان دووبارەی دەکەنەوە گوایە ئەوان بوون بە نوێخواز. هەندێکیان پێیان خۆشە پێیان بگوترێت ئەوان کۆن ونوێیان کۆکردۆتەوە، دواتر لووتی بەرزدەبێتەوە لەخۆیایی دەبێت بەو زانستە سەیری لە سنگی خۆی هەڵگرتووە. نموونەی ئەو جۆرە کەسانە وەك ئەو لادێیە سادەیەیە کە ویستی مەدەنی بێت لە قسەکانی، کەچی بەداخەوە رۆیشتنی لەبیرکرد. دەبێت ئەو کەسانە تێبگەن نوێبوونەوە لە فیکر ئەوە نییە زاراوەی نوێ ئەزبەر بکەین؛ بەڵکو راستتر گۆرانکارییەکی گشتی دەبێت لەو پێوەرانە بکرێت کە مرۆڤ لە بیرکردنەوەی بەکاری دەهێنێ.

بۆ خوێنەر ئەو نموونەیە دەهێنمەوە: لەکتێبی واعیزی سوڵتانەکان(لاپەڕە٩٠) وتم: هەرچەندە لەناو خەڵك نەریتی حیجاب وجیاکردنەوەی دوو رەگەزەکە زیادبکرێت، ئەوا لادانی سێکسی زیاد دەبێت. برایانمان لەو قسەیە تەگەیشتن و گاڵتەیان پێکرد. بەڵگەشیان ئەوە بوو لادانی سێکسی لە خۆرهەلات وخۆرئاوا هەیە. بۆ ئەمەش چەندین بەلگەیان بۆ بوونی لادانی سێکسی لەو کۆمەڵگایانە هێنایەوە کە حیجابیشی تێدا نییە. باسیان لەوە کردبوو لە زۆربەی پایتەختەکانی ئەوروپا یانەوکۆمەڵی تایبەت بەنێربازی هەیە[3].

ئەو بەڵگەیەی ئەوان هێناویانە لەبنەڕەتەوە لاوازە لەمشتومڕەکەیان سوودبەخش نابێت. من نەمگوتووە لادانی سێکسی لەو وڵاتە بوونی نییە کە حیجابی تێدا نییە. بەڵکو وتوومە رێژەکەی لەو وڵاتانە کەمترە، ئەمەش بابەتێکە زانایان توێژینەوەیان لەسەر کردووە وبەئەنجامی یەکلاکەرەوە گەیشتوون. لادانی سێکسی لە هەموو کۆمەڵگاکان ریشەکێش ناکرێت. مامۆستا هافلوك ئەلس کە پسپۆڕە لەتوێژینەوەی سێکس، دەڵێ:" لەسەدا دووی خەڵك تووشی لادانی سێکسی دەبەنەوە بەسروشت ئەوەك وەرگرتن"[4] هۆکاری ئەمەش بۆ کەموکوری پێکهاتەی بایۆلۆژیی دەگەڕێتەوە، ئەوانە لە خۆیانەوە مەیلیان بەلای لادانی سێکسی هەیە؛ تەنانەت ئەگەر چەندین کچی جوانیان لە منداڵییەوە لەگەڵ دانرابێت.

ئەوانە بەهەرجۆرێك بێ چارەسەریان نییە. دەگوترێت یەکێك لە پزیشکەکانی نەشتەرگەری لە دانیمارك توانیویەتی چارەسەریان بکات، ئەمەش بەرێگای ئەوەی بکرێنە ژن. بەڵام ئەو شێوازە برەوی نەبوو، حکومەتیش ئەو شێوازەی قەدەغەکرد. لەوانەیە زانست رۆژێك لەرۆژان رێگایەکی سەرکەوتووتر لەوە بدۆزێتەوە. هەرچۆنێك بێت توێژەرانی کۆمەلایەتی هێندە بایەخ بەو جۆرە کەسانە نادەن، بەڵکو بایەخ بەو کەسانە دەدەن، کە لەژێر کاریگەری باروودۆخی کۆمەلایەتی وەرسانگرتووە.

[3] مرتضی العسکري، مع الدکتور الوردي، ص٥٧
[4] Ellis, psychology of sex,piv

توێژەرانیش بینویانە ڕێژەی لادان بەپێی چەندین هۆکار زیاد وکەم دەکات، یەکێك لە هۆکارەکانیش حیجابە.

ئامارەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ڕێژەی لادانی سێکسی لەنێو دەریاوان وسەرباز و هەموو ئەوکۆمەڵگایانە زیاد دەکات کە ژنی تێدا نییە، یان حیجابی تێدایە. ئەو پیاوەی بۆ ماوەیەکی زۆر ژن لە نزیکی خۆی نابینێت، ئەوا خۆی دەبینێتەوە کە بەرەو ئەو کوڕانە دەڕوات کە کەم وزۆر لە ژنان دەچن. ئەو دەیەوێت قەرەبووی لەدەستدانی ژن بکاتەوە، ئەمە جیاوازی لەگەڵ ئەو لادەرە سروشتییە هەیە، کە ئارەزووەکەی قەرەبووکردنەوە نییە.

ئەو لادەرەی کە بەپێی بارودۆخی کۆمەڵایەتی ئەو خووەی وەرگرتووە، حەز لەو کوڕانە دەکات کە لە شێوە ورووخساریان لە ژن دەچن. بەڵام ئەوەی لادانەکەی سروشتی بێت ئەوا ئارەزووی بەلای پیاوانی زل و زبر هەیە کە هەموو شێوەکانی پیاوەتی تێدا بێت، واتە ئەو جۆرێکە لە ژن لەشێوەی پیاو. ئەگەرهاتوو ئێمە تاوتوێی سروشتی ئەو لادانەی سێکسی بکەین کە لە وڵاتانی پڕ حیجاب هەیە، دەبینین زۆربەیان وەرگیراون و مەیلی قەرەبووکردنەوەن. تکام لە خوێنەر هەیە ئەو بارودۆخە فێزەوەنە لەبیرنەکات کە لە عێراق لەسەردەمی عوسمانییەکان هەبوو. ئەوکات حیجاب لە کۆمەڵگا توند نەبوو، تا کار گەیشتە ئەوەی عەشقی غیلمان بووە هۆی خۆهەڵکێشانی زۆرێك لە پیاوان، تەنانەت تا ئێستا شوێنەواری ئەو دیاردەیە ماوە.

لادانی سێکسی ئەمڕۆ بەدزێوترین شێوەی لە کەنارەکانی کەنداوی فارسی هەیە، لەهەردوو لای عەرەبی و فارسییەکەی، مەسقەتیش بەمەڵبەندی ئەو لادانە دادەنرێت. لەوێ پیاو دەتوانێ هاوسەرگیری لەگەڵ پیاوێکی دیکە بکات، وەك ژن مامەڵەی لەگەڵ بکات، ئەوکاتە بەو پیاوەی شووی کردووە، دەڵێن(ئینسن). ئەو نەریتەش لە کەنداوی فارسی لەلایەن پورتوگالییەکان هاتبوو کە لە سەدەی شانزەم دەسەڵاتیان لەوێ گرتەدەست. حیجابیش پاڵپشتی بوونی ئەو دیاردەیەی کرد.

پورتوگالییەکان کە دەستیان بەسەر ئەوکەندلوەدا داگرتبوو؛ یەکێکن لەو نەتەوانەی کە زۆرترین ئارەزوویان بۆ لای نێربازی هەیە. هۆکارەکەش ئەوەیە ئەوان دەریاوان بوون و زۆرترین کاتیان لەناو کەشتیە کۆنەکانیان بوون؛ دەشزانین ماوەی نێوان پورتوگال و کەنداو زۆر دوورە، ئەوکاتە بەلای "رەئس رەجا سالح" بەچەند مانگێک تێدەپەڕین. دەریاوانەکانیش بەگشتی مەیلیان بۆ لادانی سێکسی هەیە، ئەمەش لەبەر زۆری ئەو ماوەیەیە کە دوور لە ژن لەناو کەشتیەکانیان بەسەری دەبەن. ئەو شوێنانەی کە دەریاوانەکانیش هاموشۆی دەکەن خالی نییە لەو دیاردەیە.

نێربازیی لە ئەلمانیا بەر لەسەردەمی هیتلەر بلاوبوو، وەک دردەکەوێت نەریتە سەربازییەکانی پروسیا هاوکارییان لە بلاوبوونەوەی ئەو دیاردەیە کردووە، ئەو جەنگاوەرانەی کە لە سەنگەرەکانیان دا دوور لە مال و کەسوکارن ناچارن ئەو دیاردەیە بەنەریت وەربگرن؛ ئەمەش وایکرد سوپاکانی جەنگی دووەمی جیهان ژنی تێدابێت و نێربازییان لە سەربازەکانیان قەدەغەکرد.

هەروەها ئەو دیاردەیە لەنێو کەسانی خاوەن پۆستە بالاکانی دەوڵەتی عوسمانیش هەبوو؛ رەنگە لەبەر ئەوە بێت ئەوان لە نەریتە کۆنە سەربازییەکانیان راهاتوون، ئەوان لە گەنجێتی دا زۆربەیان مەمالیک بوون. ئەوکاتە دەوڵەت ئەوانی دەکڕی و لە قوتابخانە سەربازییەکانی دادەنان بۆ ئەوەی هونەرەکانی جەنگ فێر ببن، لەوکاتەشەوە فێری هونەرەکانی لادانی سێکسی دەبوون.تا کار گەیشتە ئەو ئاستەی ئەو دیاردەیە لەنێو پیاوانی دەوڵەت باو بوو؛ بۆیە پێیان دەگوت نەخۆشی پیاوی گەورە، ئێستاش لەنێو پاشاکانی میسر کە بەرەگەز تورکن یان (کولەمەنی– ئەوانەی وەچەی مەمالیکن)ین ئەو دیاردەیە هەیە. جگە لەمانە دیاردەی نێربازی لەنێو راهیبەکانیش هەیە ئەوانەی لە دێرە دابڕاوەکان دەژین. هەروەها لەنێوان ئەو پیاوە ئاینییانەش هەیە کە لە مەڵبەندەکانی دیندارى دوور لە ژنانن، هەندێک لە مەڵبەندە ئاینیەکان لە ئێران لە کەمکردنەوەی ئەو دیاردەیە سەرکەوتوو بوون بەوەی رێگە بەزەواجی موتعە بدەن، بەمەش پیاوی ئاینی کەمتر چار دەبرێتە غیلمان.

پوختەی بابەکە ئەوەیە: لادانی سێکسی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیی ئاڵۆزە، چەندین هۆکاری هەیە. ئاسان نییە یاسایەکی گشتی بۆ دابنێین، بەڵکو دروستترە بڵێین: دیاردەی حیجابی ژن و جیاکردنەوەی ژنان لە پیاوان دەبێتە هۆی زیادبوونی ئەو دیاردەیە. مەبەستیشم ئەوە نییە کە بڵێم حیجاب ئەو دیاردەیە لە نەبوونەوە دروست دەکات، وەک هەندێك لەورەخنەگرانەی دواکتێبم تێگەیشتبوون.

دەبێت ئێستا سەرنج بدەینە ئەو لایەنەی، کە برایانمان لە خاوەن بیرکردنەوە کۆنەکان لێی ئاگادار نیین. ئەوان وا توێژینەوە لەبارەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان دەکەن، کە دژایەتی بێت لەنێوان بوون و نەبوون. ئەمە لە لای ئەوان بە یاسای" نەبوونی ناوەڕاست" وەرگیراوە. توێژەرە نوێیەکان باوەڕیان بەو دیاردەیە نییە، بەلای ئەوانەوە شتێك نییە بەناوی دووانەیەکی لە یەکتر جیاواز لەنێوان بوون یان نەبوون بێت. ئەوان هەرکاتێك توێژینەوە لەبارەی دیاردەیەك دەکەن، رەچاوی رێژەیی زیادبوون و کەمبوون دەکەن. لادان و لەشفرۆشیی و تاوان و کێشە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە تەنها لەیەك هۆکار پەیدا نابن؛ کەسیش ناتوانێ بەتەواوی بەسەر ئەو دیاردانەوە زاڵ بێت. چاکسازانی کۆمەڵایەتی کاتێك باسی کێشەیەك دەکەن، لە رووی رێژەی بڵاوبوونەوەی لەناو خەڵك دا باسی دەکەن. ئەوان هەوڵ دەدەن رێژەکەی کەم بکەنەوە، نەوەك لە کۆمەڵگا ریشەکێشی بکەن. لێرەشەوە ئامار هاتۆتە نێو توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکان و ئەو ئامارە پاڵپشتی چاکسازی کۆمەڵایەتی دەکات.

***

بەڕێز موڕتەزا عەسکەری بەشێکی زۆری کتێبەکەی لە پێناو بەڵگەهێنانەوە بۆ لادانی سێکسی لە ئیسلام تەرخان کردووە، ئەو دوو هۆکار دەستنیشان دەکات:

١- ئەو مێر وخەلیفانەی کە بەدوای شەهوەتی سێکسی بوون و بەدوای چێژی نوێ دەگران، ئەمەشیان لە غیلمان دۆزییەوە.

٢- دێرەکانی مەسیحییەت، کە لەسەردەمی عەباسییەکان بوونە شوێنی غیلمانەکان؛ ئەمەش لە پێناو بەدرەوشتکردنی کۆمەڵگای ئیسلامی، لە بەرامبەر دەوڵەتی مەسیحی کە خۆی بۆ دەوڵەتی ئیسلامی مەڵاس دابوو[٥].

لێرە مەبەستمان ئەوەنییە داکۆکی لە میرانی موسڵمان و دێری مەسیحییەکان بکەین، بەڵکو دەمەوێ بڵێم دیاردەی لادانی سێکسی لەناو خەڵک بە کاریگەری میرێک یان دێرێک بڵاونابێتەوە، بەڵکو ئەمە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی گشتییە. لەوانەشە نێربازی میرێک یان لادانی دێرێک ئەنجامەکانی ئەو دیاردەیە بێت نەوەک لە هۆکارەکانی بێت.

یەکێک لەو کەموکورییە لۆژیکییانەی کە لە بیرکردنەوەی ئەو برایانەمان هەیە ئەوەیە، ئەوان زۆرجار گالیسکە لەپێش ئەسپەکە دادەنێن، وەک پەندە ئینگلیزیەکە دەڵێ: ئەوان هۆکار بە ئەنجام دەزانن، ئەنجامیش بە هۆکار. ئێمە نکوڵی لەوە ناکەین کە سفور خراپەی خۆی هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا ئیعتراف بەوە دەکەین کە حیجابیش خراپەی خۆی هەیە. دیاردەیەک نییە لەو کۆمەڵگایە خاڵی بێت لە خراپە و چاکە. لەوانەشە خاوەناتی لۆژیکە کۆنەکە نەیانەوێ لەو قسەیە بگەن.

***

برایانمان چەندین هونەرییان بۆ دەرخستنی خراپەکانی سفور و مۆدە و رووتبوون و بەڵاکانی خۆشەویستی وحەزداریی بەکارهێناوە[٦]. دەمەوێ زانیاری ئەوەیان پێبدەم، ئەمڕۆ زانایانی کۆمەڵناسی چەندین توێژینەوەی وردیان لە بارەی ئەو خراپەکارییانە کردووە. تەنانەت بەبەراورد ئەوانەی برایانمان باسیان کردووە شتێکی پووپوچە لەچاو ئەوانەی کە زانایانی کۆمەڵناسی باسیان کردووە.

هەندێک لە زانایانی کۆمەڵناسی ناویان لەدڵداری ناوە(گرێی رۆمانسی) باسیان لەوە کردووە کە ئەو جۆرە گرێیە چ بەڵایەکی کۆمەڵایەتی رووبەڕووی خێزان دەکاتەوە، یەکێک لە زانایانی کتێبێکی گەورەی لەوبارەیەوە نووسیوە؛ شرۆڤەی هەڵوەشانەوەی

[٥] مرتضى العسكري، المصدر نفسه،ص٣٢
[٦] عبدالمنعم الكاظمي،من كنت مولاه، ج٣،ص٥١

خێزانی کردووە، ئەمەش لەئەنجامی بڵاوبوونەوەی خۆشەویستی و دڵدارییە، کە لەنێوان لاوانی نەوەی نوێ هەیە[٧].

زانایان کاتێک ئەمەیان کردووە، بەرەو بۆچوونەکانیان نەچوون وەک برایە توندڕەوەکانمان کردیان، کە داوایان لەئافرەت کرد بگەڕێتەوە ماڵەوە و سەرلەنوێ حیجاب بپۆشێتەوە. چونکە ئەوان دەزانن، ناتوانن میلی کاتژمێر بگەڕێننەوە دواوە، ئافرەت کاتێک لە ماڵەوە دەرهات، ئەگەر دونیای لێ پڕ لە ئامۆژگاری و هاواریش بکەین، ئەوا جارێکی دیکە ناگەڕێتەوە ماڵەوە.

نابێت بیرۆکە تەنها لەخودی خۆیدا مەزن بێت، بەڵکو دروستتر دەبێت پراکتیکیی بێت و لە لایەنی کرداری گونجاو بێت. زۆرجار ئەو بیرۆکانەی کە یۆتۆپییەکان و خاوەنەکانی کۆشکی بلوری دەیهێننەوە نایابن، بەڵام لەهەمان کاتدا زیانبەخشن. بۆیە بینیمان بیرمەندانی کۆن نەیانتوانیوە جیاکردنەوە بۆ ئەوە بیرۆکانە بکەن کە جێ بە جێ ناکرێن لەگەڵ ئەوانەی جێ بە جێ دەکرێن. ئەوان لە خەمی ئەوەدابوون توێژینەوەیەکی لۆژیکی ڕووت بۆ بیرۆکەکە بکەن. ئەگەر بینیان جوانە و چاکەی هەیە، ئەوا باوەڕیان پێی هێناوە وکوێرانە بانگەشەی بۆ دەکەن. بێگومان ئەو بارودۆخە سەیرەی کە ئافرەتی نوێ پێگەیشتووە لە ڕووتی و ئازادی بێسنووری کێشەی کۆمەڵایەتی ترسناکی دەبێت؛ بەڵام گونجاو نییە ئێمە لە بەرانبەری بوەستین و هاوار بکەین " بگەڕێوە ماڵ". ئەگەر گریمانەی ئەوە بکەین لە گێڕانەوەی ئافرەت بۆ ماڵەوە سەرکەوتوو دەبین، ئەوا بەجۆرێکی دیکە تووشی ئەنجامی ترسناکتر دەبین.

لەڕاستیدا ناتوانرێت کۆمەڵگا لە کێشەکان خاڵی بێت. بوونی کێشەکان هۆکارێکە لە هۆکارەکانی پێشکەوتن. ئەگەر کێشە نەبوایە ئەوا خەڵک ڕازی دەبوون، جێگیر دەبوون؛ لەپێشکەوتن دەوەستان. ئەمەش چەمکێکە لە چەمکە نوێیەکان کە خاوەنی لۆژیکی کۆن هەرسی ناکات. یەکێک لەتایبەتمەندییەکانی ژیان ئەوەیە ،کە

---

Elliot and Merrill, social disorganization,p467 [٧]

ناتوانین سەردەمێکی خاڵی لە خراپە بدۆزینەوە. ئەگەر ئەوەی کۆن سەرنج دەخاتە سەر خراپییەکانی سقوڕ، ئەوا شیاوە ئەوەی نوێیش سەرنج بخاتە سەر خراپییەکانی حیجاب. چونکە ئەو کاتە ئافرەت نەزان بووەو لەژیان نەگەیشتووە، تەنها لەو شتە پڕوپووچانەی ناو ماڵە تەنگەکەی نەبێت. کەچی لە واقیعدا ئافرەت ئەو قوتابخانەیە کە کەسایەتی مرۆڤی لێ دروست دەبێت. ئەو کۆمەڵگایەی منداڵ لەباوەشی ئافرەتێکی نەزان پەروەردە دەکات، ئەوا ناتوانێ چاوەڕوانی خزمەتێك و دیدێکی دروست لە تاکەکانی بکات.

پیاو لە زەمەنی ڕابردوودا پاڵەوانی شمشێر بەدەست بوو. ئەوکاتیش ئافرەت لاواز بوو، پێویستی بە پیاوێك هەبوو لەبژێوی دا هاوکاری بکات، بۆیە ناچار بوو خزمەتی پیاو بکات و نازی هەڵگرێت و بۆ ئەوەی لەگەڵ پیاو بەئامانجەکانی خۆی بگات. بەڵام ئەمڕۆ شمشێر هێزی خۆی نەماوە، باوی هێزی بازوو و لوتبەرزیی نەماوە، بەڵکو کاتی زیرەکیی و کارامەیی دەست و زوبانە. بەمەش ئافرەت لە کارکردن ڕکابەریی پیاو دەکات، چونکە هەستی کردووە توانای ڕکابەریی هەیە و شمشێر و زۆرانبازی لەئارادا نییە. ئەگەر ئەمڕۆ پیاو بیەوێ سەرلەنوێ ئافرەت ملکەچ بکات، دەبێت پێچەوانەی ئەوانە بکات: ژن وەك ئەو کار دەکات، وەك ئەو دەخوێنێ، وەك ئەو لوتبەرزە. سەرەرای ئەمانەش چەکی چاو و مەمکی هەیە، کە وا لە پیاو دەکات کڕنۆشی بۆ بیات و لەبەردەمی غەزەلخوان بێت.

ئەگەر شمشێر وەك جاران برەوی هەبێت، ئەوا پیاو دەیتوانی بە ئافرەت بڵێ: "بگەڕێوە ماڵ". دواتریش قسەکەی بەشمشێر بەجێ دەهێنا. بەڵام لە بەدبەختی پیاوان ئەمڕۆ شمشێر لە مۆزەخانەکان دانراوە. لە شوێنی ئەو دەمانچە وتفەنگ و فڕۆکە هاتوون. کەواتە لەتوانای پیاو نییە ئافرەت بگەڕێنێتەوە ماڵەوە و دواتر گوێڕایەڵ و ملکەچی بێت.

ئافرەت وەك پیاو مرۆڤە. وەك ئەو مافی ژیانی هەیە و مافی خۆیەتی چێژ لە ژیان وەربگرێت.مەبەستم ئەوە نییە من لە ڕابردووەکە ڕازیم، ڕابردووی کۆن بۆمن باشتر

بوو. کێشەکە ئەوەیە ڕەزا و تورەیی من پەیوەندی بەو بابەتەوە نییە. چونکە ڕەوتەکە بەتەوژمە، ئەوەی ڕووبەڕووی تەوژمەکە دەبێتەوە ئەوا ڕۆژێك وردو خاش دەبێت. لەوانەشە لەوە بگات کە ئەو لە بەرەنگاربوونەوەی ئەو تەوژمە زیانی بەخۆی گەیاندووە.

***

لەو چەمکە نوێیانەی لۆژیکی نوێ باوەڕی پێیەتی، چەکی جوولە وپێشکەوتنە. هەموو شتێك لەو گەردوونە لەبارێکەوە بۆ بارێکی دیکە پێشدەکەوێت و شتێکیش نییە بەری لێبگرێت، بۆیە ئێستا پێویستە واعیزەکان ڕەگەزەکانی ئەو پێشکەوتنە تاوتوێ بکەن، بەرلەوەی ئامۆژگاری بریقەدار بەسەر خەڵك ببارێنن.

بەداخەوە دەبینین برایانمان لە پیاوانی ئایینی لەو حەقیقەتە ناگەن. بینیمان چۆن بەرەنگاری هەر ڕەوتێکی نوێ دەبنەوە، وەك ئەوەی کارەکان هەموو بەدەست ئەوان بێت و خەڵکیش گوێڕایەڵیان بێت. سەیر ئەوەیە ئەوان لەسەرەتادا بەرەنگاری ڕەوتێك دەبنەوە کەچی دواتر دەچنە ژێرباری ئەم ڕەوتە. بینیمان زۆرێك لە واعیزەکان سفوریان حەرام کرد، کەچی دواتر کچانی خۆیان سفور بوون. بینیمان ڕێگریان لە چوونە قوتابخانە دەکرد، دواتر بە تاك و کۆ کچان وکوڕانی خۆیان چوونە بەر خوێندن لە قوتابخانە نوێیەکان. بینیمان ڕادیۆیان حەرام کرد، دواتر ڕادیۆ لەماڵەکانی ئەوان هەبوو، وەك ئەوەی شەیتان بێت لەدەمی مارەوە بەرەو ماڵی ئەوان چووبێت. ئەمڕۆش سەما و ڕووتبوونەوە حەرام دەکەن، کێ دەزانێ لەوانە ڕۆژێك لەڕۆژان ئەوانیش سەما لەسەر ئاوازی جاز بکەن و قسە لەسەر هونەر و قیژەقیژی مارلین بکەن.

دەڵێن پیاوێکی ئایینی ئامۆژگاریی یەکێك لەموریدەکانی کرد، کوڕەکەی لە قوتابخانە بهێنێتە دەرەوە، ئەمەش لەبەر ترسی خودا. پیاوەکەش کوڕەکەی لەبەر خوێندن دەرهێنا و تۆبە و ئیستیغفاری دەکرد. کەچی دوای ماوەیەك بینی پیاوی ئایینی کوڕەکەی بێ سێ و دوو نارده قوتابخانە. بۆیە ئەوجارە پیاوەکە بەپەلە کچەکەی

ناردە قوتابخانەی کچان، بینی کابرای واعیز هات ئەوجارەش ئەوی ترساند، بەڵام موریدەکە وەڵامی دایەوە، وتی:" جەنابی شێخ ئەمجارە کەسێکی دیکە فریو بدە". ئەم واعیزە بەناچاری ئەو کارەی کردووە، ئەمەش لەژێر فشاری رەوتی کۆمەڵایەتی دەوروبەری بووە. ئەو لە سەرەتادا قوتابخانەی حەرام کرد. لەگەڵ ئەوەشدا دەیەوێت کوڕەکەی داهاتوویەکی درەوشاوەی هەبێت، کەبینی خەڵك رێز لەخاوەن بڕوانامەی قوتابخانە دەگرن، لە کاروپیشەی دیکەی بەچاکتر دەزانن، بەخێرایی کوڕەکەی بردە قوتابخانە و ئەوەی لەبیر کرد کە سەرەتا خۆی بەحەرامی زانیبوو.

ئەو باوکەی گوایە لە ترسی خودا کوڕەکەی نانێرێتە قوتابخانە، دەبینێ لە دوارۆژدا تووشی سزای خودا دەبێتەوە. ئەو کاتەی دەبینێ کوڕەکەی لە چاو هاورێیەکانی لەژیان دواکەوتووە. کچەکەش لەماڵەوە دانیشتووە دەگری و گلەیی لەبەختی خۆی دەکات. چونکە برادەرەکانی هەموویان بێگە و مووچە و شوویان هەیە. ئەویش لە ماڵەوە هاوڕێی نائومێدییە. ئیمام عەلی دەڵێ:" منداڵەکانتان فێری دابونەریتی خۆتان مەکەن، ئەوان لەسەردەمێك دەژین کەسەردەمی ئێوە نییە". بەخوا ئەمە پەندێکی گەورەیە. چونکە ئیمام ئاماژە بۆ ئەوەدەکات کۆمەڵگا لە گۆڕانکارییەکی بەردەوام دایە. ئەو دابونەریتەی کە بۆ سەردەمێك گونجاوە، کەڵکی سەردەمێکی دیکەی نییە. بۆیە پێویستە واعیزەکان فێری رەوتەکان ببشکنن بەر لەوەی هەوڵی دژایەتی بدەن، بەمانایەکی دیکە پێویستە ئەوان نێبگەن و بێدەنگ بن.

***

کاتێك موسڵمانان بەر شارستانیەتی رۆژئاوا کەوتن، کەوتنەبەر رەوتەکانی، بۆیە ناچار بوون شت لەو رەوتانە بخوازن جا باش بێت یان خراپ. یەکێك لەو شتە سەیرانەی کە واعیزەکان باسی دەکەن ئەوەیە دەڵێن:" شتە چاکەکان ببەن و واز لەخراپەکان بهێنن" وەك ئەوەی مەسەلەکە هەڵبژاردنی کاڵاك بێت.

شارستانیەتی ئامێرێکی بەیەکترەوە بەستراوە، ناتوانرێت پارچە پارچەی بکەین و ئەندامەکانی لەیەکتر جیابکەینەوە. کاتێك شارستانیەت دێت، بەچاکە وخراپەکانیەوە

دێت، ناشتوانرێت چاودێرێك لەسەر سنوور دابنێین بۆ ئەوەی چاكەكانمان بۆ جیابكاتەوە و خراپەكان بگەڕێنێتەوە. ئەمەش مانای ئەوەیە ڕەوتەكە تەوژمێكی هەیە و كەسێك ناتوانێ بیوەستێنێ.

خوالێخۆشبوو ئیمام یەحیا ویستی دژی ئەو ڕەوتە بوەستێتەوە و بەهیچ شێوەیەك نەچێتە سنووری یەمەن، ئەو ڕێگری لەوەكرد هیچ شتێك لە ڕۆژئاواوە بچێتە یەمەن، ئەمەش كاتێك زانی كەهاتنی شتێكی بچووك دەرەنگ یان زوو شتی گەورەتر بەدوای خۆی دەهێنێ. بەڵام ئەمە كاتیی بوو، ناتوانرێت ماوەیەكی زۆر بەردەوام بێت، چونكە ڕەوتەكە لەوە بەهێزترە زەمەنێك لە بەردەمی خۆڕاگر بێت. ئەوكاتە هات ئیمام پێویستی بە دەرمان بوو لەڕۆژئاوا، پێویستی بە ئۆتۆمبیل بوو بۆ گواستنەوە، پێویستی بە تەلەفۆن بوو بۆ پەیوەندیكردن بەئازیزان، پێویستی بەچەك بوو لە دژی دوژمنان، ئەو پێویستیانەش بەپێی تێپەڕبوونی ڕۆژگار زیاد دەبن.

یەمەنیش دەكەوێتە بەر باری شارستانیەتی نوێ، هیچ دەرفەتێكی دیكەی نییە، چ پێیەوێ یان نا. كاتێكیش شارستانیەت دێت ئەوا بە سوودبەخش و زیانەكانیەوە دێت. كاتێك دەبینی ئافرەت لەوێ ڕادەپەڕێ، لێرەش ڕادەپەڕێ و داوای مافەكانی دەكات و داوای یەكسانی دەكات. ژن سەرەتا دەچێتە قوتابخانە، ئەوكاتە حیجابیە، كاتێك فێربوو، داوای پیشەی كرد، ئەوا پەچەی لادەبات، دواتر سفور دەبێت و دواتر جلی نیمچەڕووت دەبێت. قۆناغ لەدوای قۆناغ دێت.

ئەوەی لێرەدا ڕوودەدات، لەوێش ڕوودەدا. پێشكەوتنی كۆمەڵایەتی لەسەر ئەورێبازە دەڕوات كە لە وڵاتێكی دیكە پێیدا تێپەڕیوە، ئەمەش سوننەتی خودایە، بەدیلێكمان بۆی نییە.

***

مرۆڤ لە ژیانی كۆمەڵایەتی خۆی دا، بایەخ بەو حەرام و حەڵاڵە نادات، كە واعیزەكان باسی دەكەن، بەڵكو بایەخ بەوە دەدات بژێویی و پێگەیەكی كۆمەڵایەتیی بۆخۆی و منداڵەكانی هەبێت. ئەگەر كەسانی شارستان ڕێزیان لە پێگەیەك گرت، ئەوا

ئەستەمە باوک بتوانێت رێگری لە کورەکەی بکات، تا هەوڵ بۆ ئەو پێگەیە نەدات، تەنانەت ئەگەر جوبرائیلیش بێت(سەلامی خوای لێ بێت).

شارستانیەتی رۆژئاوا سەرنجراکێش و زۆردارە، ئەوکەسە وردو خاش دەکات لە رێگای بوەستێتەوە. ئەوەی شایەنی باسە ئەو شارستانیەتە تایبەت نییە بەخەڵکی خۆرئاوا. راستتر ئەمەیان شارستانیەتێکی جیهانییە و رۆژهەلات و رۆژئاوا بەشداربیان لە دروستکردنی کردووە. ئەمرۆش بەهەموو گۆی زەوی بڵاودەبێتەوە و دەگاتە دوورترین شوێن. ئەگەر ئەو شارستانیەتە بچێتە وڵاتێک ئەوا تاک ناتوانێت بەرەنگاری ببێتەوە، چونکە بژێویی و پێگە بە تاک دەدات؛ بۆیە خەڵک لە رکابەریی لەسەر ئەو شارستانیەتە دوودڵی ناکات. جا کاتێک واعیزێک لەبەردەمیان دەوەستێتەوە، ئەوا گوێرایەڵی نابن و گاڵتەی پێدەکەن. بەتایبەتی ئەگەر بیبینن ئەوکەسە دواجار دێتە ژێربارەوە.

***

مەبەستم ئەوە نییە بەو نووسینەم شکۆمەندی بەشارستانیەتی خۆرئاوا بدەم؛ یان بانگەشەی بۆ بکەم، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە ئەمە روون بکەمەوە کە روو دەدات. چەمکە نوێیەکان کە شارستانیەتی خۆرئاوا دەیانهێنێ؛ بێگومان دێن، کاتی ئەوە هاتووە لەو هەقیقەت بگەین بەرلەوەی تێپەڕێت.

ئێمە ئەمرۆ بەقۆناغێکی گواستنەوەی سەخت تێدەپەڕین، هەست بەئازارێکی گەورە دەکەین، ئەوە نیوە سەدەبوو ئێمە لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە دەژیاین. دواتر شاستانیەتی نوێ لەناکاو هات هەموو ئەوشتانەی لەناوبرد کە بنیادمان نابوون، بۆیەش دەبینین دەمەقاڵێ و مشتومڕ لەهەر ماڵێک لەنێوان ئەوەی نوێ و کۆندا هەیە. ئەوەیەک بەچاوی سەدەی دەیەم سەیری ژیان دەکات و ئەوەیەکی دیکەش بەچاوی سەدەی بیستەم. چاوەڕێی ئەوەمان لە بیرمەندان وپیاوانی ئایینی دەکرد بۆ ئەوەی لەو ئازارەدا هاوکاری قەومەکەیان بکەن، کەچی بەپێچەوانەوە ئەوان بەرەنگاری چاکسازیی بوونەوە و ئازارەکەیان دووهێندە کرد.

# سروشتی مەدەنیەت



بیرمەندانی یۆتۆپیا ئیستاتیی لەگەڵ دابێت، ستایشی هاوکاریی وبرایەتی و یەکگرتنی گوفتار دەکەن، ئامۆژگارییەکانیان بەشێوەیەکی سەیر پڕ بووە لەو ستایشە. هەر هەموویشیان لەسەر ئەمە ڕێککەوتوون، دەکەمەن ئەبێ ئەگینا کەسێک نەبوو ڕیزپەڕیی.

ئێمە نکۆڵی لە دروستی ئەو بۆچوونەی ئەوان ناکەین، یەکگرتوویی گوفتار بێگومان بۆ کۆمەڵگا هێزە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نکۆڵی لەوە ناکەین کە لە هەمان کاتدا ئەو ڕێککەوتنە زیانی بۆ کۆمەڵگای مرۆیی هەیە. کۆمەڵگای مرۆیی ئەتها ناتوانێت بەرێککەوتن بژی،بەڵکو دەبێت جۆرێک لە ململانێشی تێدابێ بۆ ئەوەی بەرەو پێش بچێت. پێشینان کاتێک تەنها جەختیان لەسەر ڕێکەوتن کردۆتەوە تەنها لەبەر ئەوە بوو لەیەک ڕوو سەیری حەقیقەتیان کردووە و ڕووەکەی دیکەیان فەرامۆش کردووە، بە گوزارشتێکی دیکە: ئەوان درکیان بەنیوەی ڕاستی کردووە، کەچی نیوەکەی دیکە بەشاراوەیی ماوەتەوەو کەس بوێریی ئەوەی نەبووە تاوتوێی بکات.

ڕێکەوتن یەکانگیری بەکۆمەڵگە دەدات، کەچی دۆگمابوونیشی پێ دەدات، یەکێتی تاکەکان هێزێک لە نێوانیان بەرامبەر کۆمەڵەی دیکە دروست دەکات کە

جێگەی گاڵتە نییە، بەڵام لە هەمان کاتدا وایان لێ دەکات نەتوانن پێشکەون و لەگەڵ بارودۆخی نوێ بگونجێن. یەکانگیری کۆمەڵایەتیی و دۆگمایی چەکن و بەیەکەوە لەدایک دەبن، بۆیە دەگمەنە کۆمەڵگایەکی یەکگرتوو و پێشکەتوو لەیەکاندا بدۆزیتەوە .

توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکان ئەوەیان سەلماندووە، کە ئەو کۆمەڵگە سەرەتاییانەی باوەڕێکی ئەوراویان بەنەریتی باب وباپیران هەیە و لانادەن، ئەوا لە سستی وەستێنی دان وناتوانن بەرەوپێش بچن تەنها کەمێك نەبێ. لەوانەشە لەو جۆرە کۆمەڵگایانە ململانێی سەخت ببینین، بەڵام ئەو ململانێیە لەسەر بنەمای کەسییە و توخنی نەریتەکان ناکەوێ، بەڵکو زۆرجار ململانێیەکانیان لەسەر کێبڕکێیانە بۆ ئەنجامدانی ئەو نەریتانە و هەوڵی هەر یەکەیانە بۆ ئەوەی لەسەرووی ئەویتر بێت.

ئەو ململانێیەی کە دەبێتە هۆکاری بزاڤ و پێشکەوتن دەبێت لەسەر بنەمایەك بێت، نەوەك لەسەر ئاستی شەخسی بێ. کۆمەڵگای بەبزاڤ وپێشکەوتوو دەبێ بە لایەنی کەمەوە دوو ئاراستەی دژ بەیەکتر لەخۆیەوە بگرێت، بەشێوەیەك هەریەکیان بانگەشە بۆ جۆرێك لە پرەنسیپ بکەن، کە پێچەوانەی ئەوە بێت کە لایەنەکەی تر بانگەشەی بۆ دەکات. بەمەش ( کێکی نەریتەکان ) دەشکێ وەك بیبهوت[^] گوزارشتی لێکردووە ئەو کاتەش کۆمەڵگە بۆ پێشەوە جووڵە دەکات.

کۆمەڵگای یەکگرتوو شێوەی لەو مرۆڤە دەچێ کە قاچێکی لەوەی دیکەی گرێداوە، بۆیە ناتوانێ بڕوات. ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەش لە دابونەریتەکان پێکهاتووە، ئەگەر هاتوو دابونەریتەکان لاوازبوون، ململانێی هزریی وکۆمەڵایەتیی دەست پێدەکات، ئەوکاتەش کۆمەڵگا دەتوانێ لەپێناوی پێشکەوتن پێیەکانی بجووڵێنێ و بە پێیەکانی بڕوات لە ئاستێك نەوەستێ؛ جا ئەگەر لە کۆمەڵگادا ململانێی نێوان

---

[^] Babehhot, physics and politics

دوولایەتی دژ بەیەکترت بینی، بزانە ئەو دوولایەنە وەک دوو پێیەن، کە کۆمەڵگا پێیان دەڕوات.

***

شایەنی ئاماژەیە بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی سەرەڕای چاکەکانی، خاڵی نییە لە خراپە. شتێکیش لە گەردووندا نییە هەمووی چاکە یان هەمووی خراپە بێت. بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی بێگومان لە گرنگترین هۆکاری مرۆڤ دەکات؛ کەچی لە هەمان کاتدا کۆمەڵگا باجێکی زۆر دەدات. کەواتە جوڵانەوەکە سەرکێشی و بەرەوپێشچوونە بەرەو نادیار، ئەمەش دەبێتە هۆکاری دڵەڕاوکێ و فشاری زیدەڕۆیی لە زۆر بابەت. ئەو مرۆڤەی لە کۆمەڵگایەکی بزاو دەژی، ناتوانێ ئەو دڵنیایی و ئاسوودەییە بەدەست بهێنێ کە مرۆڤی کۆمەڵگایەکی سست بەدەستی دەهێنێ.

ئەو مرۆڤەی هەموو ڕۆژێک ڕووبەڕووی کێشەیەک دەبێتەوە، هێشتا کێشەکەی تەواو نەبووە تووشی کێشەیەکی تر دەبێ. ئەو لە کۆششێکی بەردەوام دایە تاحەسێتەوە بە مردن نەبێ؟ ناشزانێ دوای مردن چ ئازارێکی دۆزەخی تووش دەبێ. دەروونی مرۆڤایەتی گرێدەگرێ بۆ ئەوەی ڕێگای پێشکەوتن ڕۆشن بکاتەوە.

ئەگەر بچیتە نیویۆرک و پاریس وهەر شارێکی گەورەی دونیا دەبینی خەڵک لە ڕاکردنێکی بەردەوام و جووڵەیەک دان، شەو ورۆژ ساردبوونەوەی نییە. هەموویان بە پەلە دەڕۆن. ئەگەر پرسیاریان لێ بکەی ( بۆ کوێ ؟ ) بەچەند وشەیەکی نارۆشن منگە منگێ دەکەن و بەپەلە دەڕۆن. بەڵام لە کۆمەڵگایەکی سست دروشمی خەڵک ئەوەیە " پەلە کاری شەیتانە " ئەوان بە کاوەخۆ دەڕۆن، هەست بەوە دەکەن ڕۆژ درێژە پێویست بەپەلە ناکات، خەمی ئەوەیانە گوێ لە چیرۆکی پێشینیان وئەفسانە بگرن، جار لە دوای جار بە بیستنیان دڵخۆشتر دەبن هەست بەوە دەکەن لە ڕێگای ئەمریی دان، کە ئەزیەتی نییە .

لێرەدا مرۆڤ تووشی کێشەیەکی دووسەرە بووە، دوو ڕێگای پێچەوانەی لەبەردەم دایە، دەبێت بەیەکێکیان دا بڕوات: ڕێگایەك ئاسوودەیی وسستییە، ڕێگاکەی دیکەش دڵەڕاوکێ و پێشکەوتنە، مەحاڵیشە بتوانێ لەیەك کاتدا بەهەردووکیان دا بڕوات.

هەندێك بیرمەندی گێل هەن، خەیاڵی ئەوە دەکەن کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی توانای هەیە بڕوای بەدابونەریتەکان هەبێ و بەکانگیر وئاسوودەش بێ. لە لایەکی دیکەش پێشکەوتوو بێت ولە ڕێگای گەشەکردنی شارستانیدا بێت. ئەمە خەیاڵێکی سەیرە تەنها لەزهنی ئەوانەیە کە لە کۆشکی بلورین دان و لەحەقیقەتی ئەو کۆمەڵگایەی تێیدا دەژین تێ ناگەن.

***

مێژوونووسی بەناوبانگ توینبی دەڵێ ئەو خەسڵەتە سەرەکییەی، کە مەدەنییەت لەژیانی سەرەتایی جیادەکاتەوە، داهێنانە. ژیانی سەرەتایی بە لاسایی بەڕێوەدەچێت، کەچی ژیانی مەدەنییەت بەداهێنان [9].

حەزکردن بە لاسایی کردنەوەش وایکردبوو مرۆڤ نزیکەی سێ سەد هەزار ساڵ ژیانێکی سەرەتایی بژێت، هەموو ئەو ماوەیەش بەو دابونەریت و ئەو بیرکردنەوەیە ڕازی بوون کە لە باب وباپیرانیانەوە بۆیان جێمابوون. کاتێك لە ئەمانی چاخی سەهۆڵبەندان هەندێکیان تووشی مەینەتی بوون ،ڕێگای بژێویان لێ داخرا. تووشی شۆك و بیرکردنەوە بوون زەینیان خستە کۆشش بۆ دۆزینەوەی ڕێگایەکی نوێ، بەمەش دەرگای شارستانییەتیان بۆ کرایەوە [10].

دەتوانین بڵێین مەدەنییەت و دڵەڕاوکێ لە یەکتر جیانابنەوە، مرۆڤ بەر لە دەرکەوتنی مەدەنییەت لە خۆشگوزەرانی هەمیشەیی دابوو، دڵەڕاوکێیان نەبوو، نەیاندەپرسی ( بۆچی؟ ) هەموو شتێکیان لە بەردەست دابوو کە لەلایەن باب و

[9] Toynbee< a> study of history ab p49

[10] Ibid,p .68-77

باپیران ئامادەکرابوو ئەوانیش لەسەری دەڕۆیشتن و دەیانگووت: " بل قالوا إنا وجدنا آباءنا على امة وإنا على آثارهم مهتدون"[1].

ئەو بنەمایەی کە مەدەنیەتی لەسەر بونیاد دەنرێت وەك تۆینبی دەڵێ: " مانـدووبوون و مەینـەتی و زەحمەتییە"، ئەو شوێنانەی ئاسان بـژێوییان تێـدا دەستدەکەوێت یان بژێوی تێدا هەڵدەگیرێتەوە ناتوانێ مەدەنیەت بەرهەم بهێنێت، چونکە مرۆڤ لـە تەمبەڵی راهاتووە و رادەستی قـەدەر بووە وچێژ لەخەونـەکانی دەبینێ.

مەدەنیەت باجێکی زۆری دەوێ، لەلایەك قازانجە و لەلایـەکی دیکـەش زیانـە، بۆیە ئەوانەی لە رێگای مەدەنیەت دەڕۆن دەبێ لەوە بگەن کە ڕووبەڕووی ئازارو دڵەڕاوکێ و مەینەتی دەبنەوە. ئەگەر دەیانەوێ لە پاروەڕۆخی خۆیـان بمێنـەوە لـە ئاسـوودەیی وحەسانەوە، پێویستە ئەو رێگایە ترسناك و ماندووکەرە نەگرنەبەر.

تۆینبی دەڵێ : مەدەنیـەت شـانۆی شـەیتانە و ئـەو بوارەیـە کـە شـەیتان پسـپۆڕیی لێوەرگرتووە، بە بڕوای ئـەو مەدەنیـەت ئـەنجامی ملمـلانێی نێـوان خـوداو شـەیتانە، خودا بەئەنقەست شەیتانی دروست کردووە و بەسەر مرۆڤی زاڵکردووە بـۆ ئـەوەی بەرەو رێگای مەدەنیەتی ببات .

تۆینبی لەوبارەیەوە فەلسەفەیەکی گاڵتەئامێزمان بۆ دەهێنێتەوە دەڵێ :

ئەو چیرۆکەی کە تەورات لە بارەی فریودانی ئادەم لەلایەن شـەیتان و دەرکرنـی لـە بەهەشـت هـاتووە ،لەڕاستیدا ئـەوە چـیرۆکێکی ڕەمزییـە ئامـاژە بـۆ دەرکـەوتنی مەدەنیەت و دەرچوونی مرۆڤ لە قۆناغی سەرەتایی وقۆناغی مەدەنی دەکات .

***

شەهرستانی خاوەنی کتێبی ( الملل والنحل ) دەڵێ: "کە ئیبلیس بیانوی لـە خـودا گرت، حەوت پرسیاری ئاراستە کرد" ئیبلیس وتی :

---

[1] القرآن، سورة الزخرف، الآية/ ٢٣

یەکەم : ئەگەر خوا بەر لە دروستکردنی من، هەموو ئەو شتانەی دەزانی، کە لە لای من ئەنجام دەدرێ، بەسەرمن دێ. بۆچی لەسەرەتا منی دروست کرد؟ پەند لە دروستکردنی من چی بوو ؟

دووەم : ئەو بەویست وخواستی خۆی منی دروست کردووە، بۆچی دواتر داوای ناسین و ملکەچی لە من دەکات ؟ پەند لەو داوایە چییە؟ کە دەزانرێ ئەو بە گوێڕایەڵی هیچ کەس سوودمەند نابێ و بە یاخیبوونی کەسیش زەرەرمەند نابێ .

سێیەم : کاتێک دروستی کردم و داواشی کرد؛ من پابەندبووم بە ناسین و گوێڕایەڵی ئەو. ئەی بۆچی داوای لێکردم ملکەچی ئادەم بم و کڕنۆشی بۆ بەرم ؟ بەتایبەتی پەند لەو داوایە چی بوو ؟.

چوارەم : من درێژییەکەم ئەنجام نەداوە تەنها ئەوە نەبێت گوتم: " کڕنۆش بۆ کەس نابەم جگە لە تۆ " بۆچی نەفرەتی لێکردم و لە بەهەشت دەریکردم، پەند لەمە چی بوو؟

پێنجەم : ئەو دوای ئەوەی نەفرەتی لێکردم و دەریکردم، ڕێگای بەرەو ئادەمی بۆم کردەوە تا چوومە ناو بەهەشت ئادەمم فریو دا، بۆ ئەوەی لەو درەختە بخوات کە داوا کرا بوو لێی نزیک نەبێتەوە؛ ئەگەر ئەو ڕێگری بکردایە لە چوونە ناو بەهەشت ئادەم ئاسوودە دەبوو، بەنەمریی لە بەهەشت دەمایەوە. پەند لەمە چی بوو؟

شەشەم : ئەو دوای ئەوەی ڕێگای ئادەمی بۆم واڵا کرد و دوژمنایەتی خستە نێوانمان، بۆچی منی بەسەر کوڕەکانی زاڵکرد، لەگەڵ ئەوەی من دەیانبینم و ئەوان من نابینن کەچی وەسوەسەی من کاریان تێدەکات ؟ ئەو ئەگەر لەسەر زگماکییەکە ئەوانی دروست بکردایە بێ گۆڕانکاری ، بەپاکی و گوێڕایەڵی و ملکەچی خودا دەژیان ئەمە لە دانایی دەوەشێتەوە .

حەوتەم : ئەو دواتر دەرفەتی پێدام، چارەنوسی منی خستە ڕۆژی دوایی، ئەگەر ئەوکات دەستبەجێ لەناوی دەبردم و ئادەم و کوڕەکانیشی ئاسوودە دەبوون

ئەوکات خراپە لە جیهان نەدەبوو، ئایا مانەوەی جیهان تەنها بە چاکە، چاکتر نییە لەوەی چاکە تێکەڵ بە خراپە بکرێت ؟"[١٢].

شەهرستانی ( بار لە ئەستۆی ئەوە) باس لەوە دەکات، کە خوا وەڵامی بیانوەکانی ئیبلیسی دایەوەو وتی " ئەی ئیبلیس ئەگەر راستگۆ و دڵسۆزی دەبووی لەو باوەڕەی کەمن خوای تۆ و خوای بوونم ئایا بە ( بۆچی ) بڕیارت لەسەرمن دەدا ؟ من خودام، خودایەك نییە جگە لە من ، من بەرپرس نیم لەوەی ئەنجامی دەدەم ، خەڵق هەموو بەرپرسن "[١٣].

شەهرستانی سەرنج لەسەر ئەو شتانە دەدا وئەڵێ: " هەر گومانێك کە لەسەرەتای بوونەوە تووشی ئادەمیزاد بووە، هەموو لەو وشە گێلانەیە پەیدابووە ئەویش ( بۆچی ؟ ) یە". بەبڕوای شەهرستانی ئەو وشەیە دەگەڕێتەوە سەر " نکوڵی کردن لەبابەتێك دوای دانتان بەهەق و بەسەندکردنی ئارەزووە لەبەرامبەر تێکست ". ئەفرەتلێکراوی یەکەمیش عەقڵی بۆ ئەو شتانە بەکارهێنا، کە عەقڵ درکی پێناکات، بۆیە بڕیاری خالقی لەسەر خەڵق دا و بڕیاری خەڵقی لەسەر خالق دا، یەکەمیان زێدەڕۆییە و دووەمیان ناکاملییە". شەهرستانی بڕوای وایە دەبێت مرۆڤ بەشەواری ملکەچی فەرمانە خوداییەکان بێت کە لەلایەن پێغەمبەرو پیاوچاکانەوە دێن، نابێ پرسیار لە بارەی هۆکارەکەی بکات و گومانی لە داناییەکەی بکات، ئەو بەهەشتەی ئادەم پێشتر تێیدا دەژیا، ئەمرۆ فریشتەکان تێیدا دەژین، شوێنی دڵنیابوون و یەقینە، کە خەڵکەکەی بەپاکی و گوێڕایەڵی وملکەچی تێیدا دەژین، کە ئیبلیس پرسیار لەخودا دەکات " ئایا مانەوەی جیهان لەسەر چاکە چاکتر نییە لەوەی تێکەڵ

١٢ الشهرستاني، الملل و النحل، ج١، ص٧-٨
١٣ نفس المصدر ،ج١ ،ص٩

بەخراپە بکرێ ؟ " سەیر ئەوەیە فریشتەکانیش پرسیارێکی لەو شێوەیان کرد خودا وەڵامی دایەوە (انی أعلم ما لا تعلمون )[14]ئەوان بێدەنگ بوون .

لە فەرموودەیەکی قودسی هاتووە خوا دەفەرمووێ: " أنا الله لا اله الا أنا خلقت الشر وقدرته فويل لمن خلقت له الشر وأجريت الشر على يده "[15]. لەوە دەردەکەوێت کە خودای پەروەردگار بە ئەنقەست خراپەی دروست کردووە و لەسەر دەستی خەڵك ئەنجام دەدرێت لەبەر هۆیەك لەوانەیە نەیویست بێ فریشتەکان بزانن ئەوەك ببێتە هۆی بەدبوونیان .

خودا ئادەمی دروست کرد دواتر بەمەبەست و بەئەنقەست شەیتانی بەسەردا زاڵکرد چاکەو خراپە تا رۆژی زیندووبوونەوە لە ململانێ دان ئایا نهێنی ئەو جیاوازییە چییە کە مایەی دڵەڕاوکێیە ؟

هەندێك لە سۆفییەکانی ئیسلام هەوڵیان دا وەڵامی ئەو پرسیارە بدەنەوە بەو مانایە وتیان " شتێك ناناسرێت بەدژەکەی نەبێ " رووناکی ناناسرێت تاریکی نەبێت، ئەندروستی ناناسرێت نەخۆشی نەبێت، ( بوون ) ناناسرێت ( نەبوون ) نەبێت بەبڕوای سۆفییەکان ئەو دژبەیەکانەیە کە گەردوونی لێ دروست بووە لەسەر ئەو بنەمایەش مرۆڤ ناتوانێت درك بەخودا بکات کە ( حەقە ) ئەگەر رووبەڕووی ناحەق نەبێتەوە، مەسەلەی( خراپە ) لەلای سۆفییەکان بەمشێوەیە شرۆڤە دەکرێت، بۆیە خراپە لە دیدی ئەوان پێویستە بۆ بوونی چاکە، چونکە مرۆڤ درك بە چاکە ناکات ئەگەر لەبەرامبەری خراپە نەبێ؛ هەروەك چۆن لە رووناکی ناگات ئەگەر تاریکی نەبێت.

ئیبن خەلدون لە مەسەلەی خراپە بۆچوونێکی نزیك لەسۆفییەکانی هەبوو، دەڵێ: " چاکەی زۆربوونی نابێت ئەگەر بەبوونی خراپەیەك نەبێت، کە لە پێناو بابەتەکانی دابێت، چاکەش بەبێ لەخۆگرتنی خراپە دەرباز نابێت، مانای ئەوەش بوونی ستەمە

---

[14] القران، سورة البقرة، اية، ٣٠

[15] عبدالرزوف، الاتحافات السنية، ص٦٢

لەگەڵ دروست بوونی خەڵق لەوە تێبگە لەراستی دا"[16]. ئەو بۆچوونەی سۆفییەکان – خەلدون – ئارادەیەکی زۆر لە تیۆرە ناسراوەکەی هیگڵ دەچێت، زێدەڕۆیی ناکەین ئەگەر بڵێین لەو بوارەدا سۆفییەکانی ئیسلام چەند سەدەیەک پێش هیگڵ کەوتوون .

کەچی بەداخەوە بیرمەندانی یوتۆپیا بایەخیان بەو بۆچوونە نەداوە، سەرنجیان نەداوەتێ، ئەوان لە بابەتی( بوونی خراپە لە جیهان ) تووشی سەرسووڕمان بوون و مشتومڕێکی دوورودرێژیان لەوبارەیەوە کردووە، کەچی بەئامانجێکی خوازراو نەگەیشتوون، هەموو ئەو ئەنجامانەی بەدەستیان هێناون خاڵی نین لە بێسەرووبەریی و دەبەنگی.

کەم توانایی ئەوان لە تێنەگەیشتن و چارەسەرنەکردنی ئەو کێشەیە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە ئەوان بیرکردنەوەیان بەپێی لۆژیکی کۆنی ئەرستۆتالیسە، ئەو لۆژیکەش باوەڕی بەیاسای ( نەبوونی دژیەک ) هەیە ، شت لەلای ئەوان لەخۆی دا خۆیەتی، واتە لەخودی خۆی دایە، لەوانی دیکە سەربەخۆیە .

کەچی لۆژیکی نوێ، ئەوەی سۆفییەکان و ئیبن خەلدون مژدەیان داوە، وەها شتەکان دەبینێ لە یەکانگیری وکارلێکردن و دژ بەیەکتری بەردەوام دان، هیگڵ ئەو لۆژیکەی بەو چەند وشەیە کورتکردۆتەوە دەڵێ: " هەر شتێك لەناوەختی خۆی دا دژەکەی هەڵگرتووە، ئەو ناتوانێ ببێت ئەگەر دژەکەی لەگەڵ نەبێت" [17]. بەهۆی ئەو دژیەکییەوە کارلێکردنی نێوان شتەکان لە گەڕەوون پێشدەکەوێ و هەر رۆژەو شتێکی نوێی تێیدا دەردەکەوێ .

کەموکوڕی یوتۆپییەکان لەوە دایە باوەڕیان بە جووڵە وپێشکەوتن نییە. جووڵە لەدیدی ئەوان بابەتێکی راگوزەرە، وەستانیش بنەڕەتی گەردوونە، بۆیە ئەوان

---

[16] ابن خلدون، المقدمة، ص۳۹۰-۳۹۱
[17] علي الوردي، خوارق اللاشعور، ج۱،ص۱۰۰-۱۰۱

نەیانتوانی لە نهێنی گەردوون و نهێنی ژیان و نهێنی مەدەنیەت بگەن، بێهودە مشتومڕدەکەن.

***

مرۆڤ بەر لە دەرکەوتنی مەدەنییەت وەک بینیمان رازی وئاسوودەبوو و پرسیاری ( بۆچی ؟ ) نەدەکرد، لێکۆڵینەوە و وردبینی نەدەکرد، لە رووی دەروونییەوە لە ژیان کامەران بوو.بەڵام کاتێک مەدەنیەتی داژییەوە سەری کەوتەناو ئەو کێشە نوێیانەی بە خەیاڵی باب وباپیری نەهاتوون. ئەو بووە هاوڕێی شەیتان بەمەش لەلایەک بووە داهێنەر لەلایەکی دیکەش ماندوو و زەحمەتکێش بوو.

بیرمەندانی ساویلکە لەو باوەڕەدان، دەتوانین مەدەنیەت دابەش بکەین: بەو مانایەی ئەوان دەتوانن مەدەنیەت لەدڵەڕاوکێ و ماندووبونەکەی پاک بکەنەوە ،کەچی داهێنان و نوێبوونەوەکەی بپارێزێت، بەڵام لۆژیکی نوێ ئەو بۆچوونە قبوڵ ناکات.مەدەنیەت دابەش ناکرێت. بۆیە ئەگەر هاتە کۆمەڵگایەک , ئەوا بەچاکە وخراپەکانییەوە دێت، بۆیە مەحاڵە چاکەکانی لە خراپەکانی جیا بکرێتەوە. مرۆڤیش کە دەچێتە بەردەم دەرگای مەدەنیەت ناچار دەبێت ئەو ئاسوودەییەی لەرۆژگاری رابردوو هەیبووە لەدوای خۆی جێبهێڵێ .

لەماوەی جەنگی جیهانی یەکەم دا عێراقییەکان درکیان بەو هەقیقەتە کردووە، کاتێک بینیان مەدەنیەتی رۆژئاوا بە داهێنراو و سیستەمی فیکریی و کۆمەڵایەتییەوە بۆیان دەهات، بۆیە ئەوان ئەو ئاسوودەییەی رابردوویان جێهێشت و تێکەڵ بەمەیدانی ژاوەژاوی مەدەنیەت بوون.

تائێستا ئەوەی کۆن هێمنی وئاسوودەیی رابردوویان لەبیرە، ئەوان لەسەر ئەو رێچکەیە دەرۆیشتن کە لەلایەن باب باپیرانیانەوە بۆیان داڕابوو، پرسیاریان نەدەکردو دڵەڕاوکێیان نەبوو. هەندێک لە بیرمەندانمان ئەوکات وتیان: واز لەخراپەکانی مەدەنیەت بهێنن، تەنها چاکەکانی ببەن. بەڵام ئەو بانگەوازەیان وەک فووکردن بوو، یان هاوارێک بوو لە دۆڵێک. مەدەنیەتی نوێ داهێنانی فیکر و

نوێکردنەوەی سیستەمی بە ئێمە داوە. بەڵام لە هەمان کاتدا شڵەژانی مێشك وەڵپەیەکی دەروونی بەئێمە داوە کە کۆتایی بۆ نییە.

هێزی مرۆیی ئەوکاتەی ئازاد دەبێ و لە دابونەریت دەچێتە دەرەوە، ناتوانێت سروشتی بەقینی خۆی لە یەك شێوەدا بپارێزێت. ئەو کاتێك گومان لە بابەتێك دەکات ناتوانێ ئەو گومانەی لە ئاستێك بوەستێنێ؛ لەمەشدا گومان وەك نەخۆشییەکە هەموو لایەنەکان دەگرێتەوە. مرۆ کاتێك نەریتێك دەشکێنێ؛ رۆژێك دادێ دەبێت سەرجەم نەریتەکانی دیکەش بشکێنێ. مرۆڤیش لەو کاتە لەلایەك سوودمەندەبێ و لەلایەکی دیکەش زەرەرمەند دەبێ. لێرەشەوە ئەو وتەیە گوتراوە " ئەوەی لۆژیکی بەکارهێنا، دەبێت بە زەندیق".

***

مامۆستا حافز وەهبە باسی ئەوەمان بۆ دەکات، کاتێك پاشا عەبدولعەزیز ئال سعود، قوتابخانەی نوێ و وێستگەی بێتەلی هێنایە وڵات، فەقیهەکانی ( نەجد ) دژی وەستانەوە، چونکە پێیان وابوو قوتابخانە کوفر بڵاودەکاتەوە و بێتەلیش شەیتان لە گواستنەوەی هەواڵ بەکاری دەهێنێ.

ئەمە چیرۆکەکەیە کە مامۆستا وەها بۆمان دەگێرێتەوە: " لە سەرەتای مانگی حوزەیرانی ١٣٤٩ك — ١٩٣٠ز، هەرایەك لە نێوان پیاوانی ئایینی نەجد دروست بوو. لە مەککە کۆبونەوەیان کرد، دوای راوێژکردن لە نێوان خۆیان دا، بڕیاریان دا ناڕەزایی بەرامبەر کارگێڕی مەعارف ( پەروەردە ) دەرببڕن، چونکە چەند بڕیارێکی داوە .

یەکەم : خوێندنی نیگارکێشی. دووەم : فێربوونی زمانی بێگانە. سێیەم : فێربوونی جوگرافیا و بابەتی خڕیی و گۆیی زەوی و خولانەوەی زەوی. لە بەرئەوەی من جۆرێك لە سەرپەرشتیارییم بەسەر دائیرەی مەعاریفەوە هەبوو، بۆیە لەگەڵ شای شکۆمەند لەبارەی ئەو بابەتە دوام. ئەو پێیوابوو داتایی ئەوەیە لەگەڵ ئەو شێخانە

دابنیشم و تاوتوێی بابەتەکە بکەم منیش لەگەڵیان دانیشتم وقسەی نێوانمان بەو شێوەیە بوو.

حافز: پاشای شکۆمەند فەرمانی پێکردووم لە خزمەتتان دابم بۆ ئەوەی شرۆڤەی ئەو بابەتانەتان بۆ بکەم کە داواتان کردووە لە پرۆگرامی خوێندن نەمێنێن.ئێوە رادەی خۆشویستنم دەزانن لەبەرئەوەی ئێوە ئەهلی سوننەن باوەڕتان بە ( ئیجتیهاد ) هەیە، هەموو شتێك رەتدەکەنەوە پێچەوانەی قورئان وسوننەتی راشکاو بێت، ئەو زەمەنە بەسەرچوو قسەی زانا هەرچییەك بێت بە ئەرگومێنت بزانرێت، لەو بڕوایە دانیم ئێوەش بتانەوێ ئێمە بڕیارەکانی ئێوە بێ تاوتوێکردن قبوڵ بکەین، ئەوەش لەگەڵ ئەو رۆحە ناگونجێت کە بانگەشەی بۆ دەکەن، ئەمە مانای نییە ئەو خەڵکانە بە هەڵە بزانین کە بێ ئەرگومێنت و بەڵگە بەدوای زاناکانیان دەکەون، کەچی خۆشمان لەسەر هەمان شێواز بڕۆین .

یەکێك لەشێخەکان دەڵێ : ئەوەی دەیڵێی راست و دروستە، بەڵام ئێمە بۆ شا عەبدولعەزیز ئەو بەڵگانەمان بەدەست داوە کە خراپەی خوێندنی ئەو زانستانە روون دەکاتەوە، سەبارەت بە تیگارکێشی ئەوەیان وێنەگرتنە ئەوە بەرەهایی حەرامە. سەبارەت بە زمانی بێگانەش ئەمە پاساوێك دەبێت بۆ وەستان لەسەر بیروباوەڕی کافرەکان و زانستە بەدەکانیان، ئەمەش مەترسییە بەسەر بیروباوەڕمان وئاکاری منداڵەکانمان. ئەوەی پەیوەندی بە جوگرافیاشەوە هەیە، ئەوا بابەتی خڕیی زەوی و سوڕانەوە و ئەو شتانە لە بارەی ئەستێرە وهەسارەکانی تێدایە کە زانایانی یۆنانی باسیان کردووە و زانایانی سەلەفیش نکۆڵیان لێکردووە دوای هێنان و بردنێك یەکێك لەشێخەکان دەڵێ: ئەوەی باوەڕمان پێ هەیە بڕیارمان لەسەر داوە و بۆ ئیمامان بەرزکردۆتەوە پێویستیشمان بە (جەدەل ) نییە لە شەرع رەتکراوەتەوە. ئەگەر

ئیمام قسەکانی ئێمەی قبوڵ کرد سوپاسی خوادەکەین، ئەگەریش سەرپێچی کرد، ئەوا یەکەمجار نییە کە پێچەوانەی ئێمە بێت"[18].

ئەو پاساوانەی کە زانایانی نەجد لە حەرامکردنی بابەتی وێنەو زمان و جوگرافیا داویانن لە راستیدا پاساوی رووکەشانەن، ئەوان دڵنیان ئەو بابەتانە پێچەوانەی ئاین نییە. لە راستیدا ئەوەی زیاتر لێی دەترسن ئەو ( جەدەل )ەیە کە گوایە لەشەرع دا نەهی لێکراوە، ئەوان دەزانن وێنە و زمان و جوگرافیا باوەڕی ئەو کەسە لاواز ناکات کە فێری دەبێت. ئەوەی باوەڕ لاواز دەکات ئەو شتانەیە کە لەو بابەتانە دەردەکەوێت، ئەویش جەدەل و پرسیارکردن و فەلسەفەکارییە.

بابەتی خڕبوونی زەوی پەیوەندی بە باوەڕ وخوا وپێغەمبەرایەتی و رۆژی دوایی نییە، شێخەکانی ئاین بە تەواوی ئەمە دەزانن، لەگەڵ ئەمەشدا ئەوان لەنەستدا درک بەوە دەکەن کە ئەو بیرۆکە نوێیە لە سروشتی خۆیدا ئەو سەلیقەیەی تەسلیم بوون و لاساییە دەڕوخێنێ کە شێخەکان لەپەیڕەوکارانی دەخوازن.

شێخەکانی ئاین لە نوێکردنەوەی بیرکردنەوە ناترسن، بەقەد ئەوەی ترسیان لەو جەدەلە هەیە، کە ئەو بیرۆکەیە لەزهنی تازە پێگەیشتوانی دەخولقێنێ. کوڕێکی پێ ڕاگەیشتوو لەوە راهاتووە زەوی بەتەختی و بەوەستاوی ببینێت، ئەو کاتە هەڵدەچێ و پرسیارو مشتومڕەکان ئەگەر بگوترێت زەوی خڕەو بەبۆشایی ئاسمان دەخولێتەوە ،وەک ئەوەی لەگەڵ زانایانی ئاینی لە نەجد روویدا، لەگەڵ زانایانی عێراقیش لەسەرەبەندی مەدەنیەت لەو وڵاتە روویدا. ئەوان وەک بینیمان هەموو شتێکیان حەرام دەکرد، خوێندنەوەی رۆژنامەیان حەرام کرد سفوریان حەرام کرد هەموو شتێکی نوێیان لە جلوبەرگ و سەرتاشین حەرام کرد دواتریش ئەو هاوارانەمان دەبیست کە لە دژی ئەو کەسانە بەرزدەبوونەوە کە دەیانگوت باران لەهەڵم دروست دەبێ زەوی خڕە و میکرۆب هۆکاری نەخۆشیە.

[18] حافظ وهبة، جزيرة العرب في القرن العشرين، ص١٢٦-١٢٧

وەك ئاشكرایە ئیسلام ئەو بابەتانە حەرام ناكات وسزای كەسەكانی نادات كە باسی دەكەن، كەچی زانایانی ئایینی لە دەستیانەوە دركیان بەمە كردووە ئەو جۆرە بابەتانە ئەگەر پڕوپووچیش بن پلە بەپلە دەبنە هۆی ئازادی عەقڵ، ئەمەش پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت ( هەست بكات یان نەكات ) گومان وپرسیار لە هەموو شتێك بكات، ئەمەش ئاخیر زەمانی گەورەیە.

زانایانی بەزیدی ناسوودەبوون كاتێك خوێندن و نووسینیان لە پەیڕەوكاران حەرام كرد، خوێندن لەسەرەتادا وا لە مرۆڤ دەكات هەندێك كتێب و شزای خوازراو بخوێنێتەوە دواتر بەرەبەرە شتی تر دەخوێنێتەوە، هەموو ترسەكە لەو شتانەیە لەوانەیە رۆژنامە یان گۆڤارێكی نوێ بێت، یان خوێنەر باز بدات كتێبی فەلسەفە و دەروونناسی و كۆمەڵناسی بخوێنێتەوە ( لێرەوە پەنا بەخوا ) ئەمەش لە سروشتی خۆی دا هۆكاری پرسیاركردن ودڵەڕاوكێ و ئازادی بیركردنەوەیە. كاتێكیش خوێنەر گەیشتە ئەو قۆناغە شەرمەزارییە، ئەوا لە كامەرانی بەهەشتەوە دەردەچێت و دەكەوێتە سەر مەدەنیەتی ئەو زەوییەی كە باوكە ئادەمی كەوتە سەر.

تەورات شرۆڤەی هۆكاری دەركردنی باوكە ئادەم دەكات لە بەهەشت دەڵێ : ئادەم لە بەهەشت دەژیا، ئەو لەگەڵ ژنە شۆخەكەی بوو، بە نیعمەت و دڵخۆشی بوون، غەمێكی نەبوو، ماندووبوونی نەبوو. تا ئیبلیسی نەفرەتكراو هاتە لای ژنەكەی بۆ ئەوەی فریوی بدات و لە درەختە حەرامەكە بخوات تەورات وەسفی ئەو درەختە دەكات گوایە درەختی زانینی چاكە و خراپەیە [19].

زانایانی ئاین لە دیاركردنی جۆری ئەو دارە شومە سەریان سوڕماوە كە بووە هۆكاری دەركردنی ئادەم لە بەهەشت، هەندێك دەڵێن دار سێوە، هەندێكی تر دەڵێن گەنمە ، هەندێكی دیكە شتی تر دەڵێن وەك تێبینی دەكەین ئەو ڕووەكە نە سێوە، نەگەنم، نەكاڵەك بووە، بەڵكو درەختێكی رەمزی بووە ئەوكەسەی بیخوات گومان و

---

[19] التوراة، سفر التكوين، الاصحاح الثاني.

پرسیار دەکات درەختەکە مانی دەدات لە دوای بابەتی خراپە و چاکە و جیاکردنەوەیان بگەڕێت. بەمانایەکی دیکە ئەمە ئاماژەیە بۆ چەمکی یاخی بوون و جورئەت کردنی حەرام. وەک قورئان باسی دەکات خودا فەرمانی بە ئادەم کردووە لەو ڕووەکە نزیک نەبێتەوە: کەچی ئادەم لەو فەرمانە یاخی بوو لە دارەکەی خوارد بۆیە کێشەکە تەنها لە یاخیبوونی فەرمانەکەیە نەوەک شتی دیکە.

تەورات دەڵێ : ئەوکاتەی خودا بینی ئادەم لە درەختە حەرامەکە دەخوات وتی " ئەمەش مرۆڤ وەک یەکێک لە ئێمە چاکەو خراپە دەناسێ " دوای ئەمە تەورات وەسفی حاڵەتە نەخوازراوەکەی ئادەم دەکات دوای ئەوەی لە دارەکەی خواردووە چاکەو خراپە دەناسێ . تەورات دەڵێ : دوای ئەوەی ئادەم و حەوا لە دارە حەرامەکەیان خوارد چاویان کرایەوەو لە ڕووتی خۆیان هەستیان بەشەرم کرد، بۆیە خۆیان بەدار هەنجیر داپۆشی. ئادەم گوێی لە دەنگی پێی خودا بوو کە لە بەهەشت دەگەڕا، شەرمی کرد بۆیە خۆی لەناو دارەکان حەشاردا ، خودا بانگی کرد : ئادەم تۆ لە کوێی ؟ ئادەم وەڵامی دایەوە : لە بەهەشت گوێم لە دەنگی تۆبوو لە ڕووتیی خۆم شەرمم کرد ، خۆم حەشاردا. خودا وتی کێ بەتۆی وتووە تۆ ڕووتی ؟ ئایا لەو دارەت خواردووە کە فەرمانمان کردبوو نەیخۆی ؟ دوای ئەمە تەورات دەڵێ : بە ئادەمی وت لەبەر ئەوەی گوێت لە ژنەکەت گرتووە لەو دارەت خواردووە کە فەرمانم کردبوو نەیخۆی، بۆیە زەوی بەهۆی تۆوە نەفرەت لێکراوە ، بەماندووبوون هەموو ڕۆژەکانی ژیان دەخۆی ، دڕکت بۆ دەڕوێ ، گژوگیای کێڵگە دەخۆی ، بە ئارەقی نێو چەوانت نانێک دەخۆی تا دەگەڕێیتەوە ئەو زەویەی لێوەی هاتووی لەبەر ئەوەی تۆ لە گڵی بۆ گڵیش دەگەڕێیتەوە.

تورێتیی پێیوایە ئەو کەوتنەی ئادەم خۆی لە خۆیدا مەدەنیەتە. ئادەم دوای دەرکرانی لە بەهەشت شەرم دەکات دوای ئەوەی کەم شەرم بوو، وایلێهات چاکە و خراپە بناسێ،کە پێشتر نەفام بوو، بە ماندووێتی نانێک دەخوات ئەویش بە ئارەقی نێوچەوانی، پێشتر ئەمیەل و ڕازی شتێک نووشی دڵەڕاوکێی نەدەکرد .

مەدەنیەت چاکەیەکی گەورەی بۆ مرۆڤ هێناوە، لەگەڵ ئەوەشدا خراپەیەکی گەورەتری بۆ هێناوە. مەدەنیەت بیری مرۆڤی لە زیندان ئازادکرد، وایکرد ئەو هزرە لە گەردوون بخولێتەوە و پرسیار لە هەموو شتێك بکات لەگەڵ ئەوەشدا هزر بەرەو دڵەڕاوکێ و وڕێنە و یاخی بوون چوو. بە پێی گوزارشتەکەی تەورات تامی ناسینی چاکەو خراپەی بە مرۆڤ داوە، لەگەڵ ئەوەشدا وایکرد بە برینکی زۆر تامی تەهامەتی و چاکە و خراپە بچێژێت.

مرۆڤ بەر لە مەدەنیەت بیری نەدەکردەوە ، دوو دڵیش نەبوو. بۆیە دروستە بڵێین: بیرکردنەوە و دڵەڕاوکێ دوولەیەکن لەیەکتر جیانابنەوە.

موتەنەبی لە یەکێك لەقەسیدەکانی دەڵێ:

**ذوالعقل يشقى بالنعيم بعقله   وأخو الجهالة بالشقاوة ينعم**

هەندێك لە دەبەنگەکان، ئەوانەی شتێك لە بنەماکانی زانست فێربوون، وادەزانن موتەنەبی مەبەستی ئەوانە، بۆیە بەنیوچەوانی خۆیان دەکێشن و بە حەسرەتەوە دەڵێن: ئەوان بەهۆی بیرکردنەوە بەرز و زانستەکانیان تووشی مەینەتی بوون.

ئەوان لە یەك کاتدا دەبەنگ ودڵخۆشن. خوا نیعمەتی ئەو بنەما سادانەی زانستی پێبەخشیون. لە ناو خەڵکی عەوام شانازی بەخۆیان دەکەن ولە چایخانەکان دادەنیشن باسی ئەرستۆتالیس وفارابی دەکەن ولوتیان بەرزدەکەنەوە. ئەوان حەسرەتیان هەیە لە نەزانی خۆیان، ئەگەر بەراستی بەدبەختن ئەوا چاکترە بە مەینەتی خۆیان خەریك بن.

سەیرتر لەوانە ئەو نووسەرۆکەیە، کە وتارێك یان دوو وتاری لە رۆژنامەیەك نووسیوە وبەخۆی دەڵێ: "ئەو مۆمێکە لەپێناو رووناکی کەسانی دیکە دەتوێتەوە". دواتر بەشەقام دەڕوا بۆ ئەوەی خەڵك بەسەرسامییەوە سەیری بکەن. ئەگەریش بینی ئەوان سەرقاڵن بە کێشەکانیانەوە ئاگایان لەو نییە، ئەوا دەڵێ: "بلیمەتەکان بەوشێوەیە دەمرن".

ئەوانە نازانن ئازادی بیرکردنەوە ئەهامەتی بۆ تاك نییە، تەنها ئەوکاتە ئەبێت کە لە زیهنی هەموو خەڵك دابێنێت. ئەوکاتیش خەڵك دەبنە سوتەمەنی بۆ ئەوەی ڕێگای پێشکەوتن و جووڵەی کۆمەڵایەتی ڕۆشن بکەنەوە. بەڵام ئەو تاکەی کە لە کۆمەڵگایەکی سست دەژیت، ئەوا جیێژە تایبەتەکانی ئەو بەبڕێك تێگەیشتن لە کەسانی دیکە جیادەکرێنەوە. ئەو کاتەش قاچ دەخاتە سەر قاچ و شانازی بەو زانستە زۆرەی دەکات. حەسرەتیش دەکێشێ لەبەر ئەو (بەدبەختی)یە خۆشەی کە هەیەتی.

***

وەك وتمان (دەبەنگی) گشتی ئاسوودەیی وکامەرانی بۆ خەڵك دەهێنێت. پێشینان وتوویانە" دڵخۆش ئەو کەسەیە، کراسێکی نییە" مەبەستیان ئەوەبوو کە ئەو کەسەیە کە کراسێکی نییە و نایەوێ کراسێکی هەبێت، بەڵام ئەو کەسەی کە کراسێکی دەوێ و نیەتی، ئەوا بێگومان تووشی ئەهامەتی دەبێت. لێرەشەوە کێشەی گەورەی مەدەنیەت هاتووە. مەدەنییەت ماشای هەڵبەکردن ورکابەریی و چەوسانەوەی خەڵکیە لەلایەن خەڵکانێکی دیکەوە، چیێتێکی خۆشگوزەران دەرکەوتووە کە چەندین کراسی هەیە، بەڵام کەسانێکی زۆر ماون کراسیان هەبێت، خەڵکیش لە برسێتی و تێربوون لە دڵەڕاوکێ دان. دەگوترێت کەسی شارستان ئەگەر برسی بێت دزی دەکات، ئەگەر تێر بێت بەدکار دەبێت. لە هەردوو حاڵەتدا ئەهامەتی ناوەستێ. ئەو بەدوای ئامانجێکەوە ڕادەکات، ئەگەر بەو ئامانجە گەیشت لە بیری دەکات وئامانجێکی دیکە دروست دەکات. ئەو بەدوای سەراب ڕادەکات، ئەو لە هەموو ڕۆژێکدا داهێنان و هەڵبە دەکات ئەوەی ئەمڕۆ بەلایەوە نوێ بێت، ئەوا بەیانی کۆن دەبێت.

بەڵام سەبارەت بەو کەسە سەرەتاییانەی لەسەر خۆڕسکی خۆیان دەژین، ئەگەر برسی بوون سوپاسگوزاری خودا دەکەن، ئەگەر تێریش بوون هەروەها سوپاسگوزار دەبن. تایبەتمەندی ئەوان ئەوەیە هەموویان بەیەکەوە تێر دەبن و برسی دەبن.

کەسێک لەوان نییە بەشخوراو بێت، ڕکابەریی لە لای ئەوان قەدەغەیە، تەنها ئەوکاتە نەبێت کە سوودی گشتی هەبێت، هەڵەی تاکەکەسیش بە نەنگی دەزانرێت و نابێت تاک ئەو سیفەتەی هەبێت.

ئەمەمان زۆر بەڕوونی لە لای ئەو کەسانە بینیوە کە لەبیابان دەژین و خراپییەکانی مەدەنیەتیان تووش نەبووە. هەروەها ویل دۆرانت باسی ئەوەی کردووە ئەم سیفەتانە لە لای ئەوکەسانەوە هەیە کە لە جەنگەڵەکان دەژین[30]. برسییەک لەنێوان ئەوان نییە، خواردن لە هەموو شوێنێکی گوند هەیە. ئەگەر یەکێکیان دەسکەوتێکی هەبێت، ئەوا یەکسەر بەسەر کەسانی دەوروبەری دابەش دەکات. دەڵێن یەکێک لە گەشتیارەکان قاتێکی تەواوی بەمرۆڤێکی سەرەتایی دابوو، دواتر بینی کڵاوەکە لەلای یەکێکە و چاکەتەکە لەلای یەکێکی دیکە و پانتۆڵەکەش بەشی یەکێکی دیکە بووە.

هەروەها یەکێک لەو مرۆڤە سەرەتاییانە لە دوورگەی ساموا، لە دەمی گەشتیارێک بارودۆخی خەڵکی لەندەن دەزانێ، بەسەرسامییەوە دەڵێ: " چۆن دەکرێت ئەو خەڵکە هەژارو برسی بن؟ ئایا خزم و عەشیرەتیان نییە؟ ئەو بەلای سەیرە وێنای ئەوە بکات کەسێک برسی بێت و کەسانی دەوروبەریشی تێر بن.

بەڵام لە مەدەنیەت ئەمە کارێکی باوە، جێگای سەرسامی نییە. ئەمەش بێگومان دەبێتە هۆکاری ململانێ، لە ئەنجامیشدا بزاوی کۆمەڵایەتی دروست دەبێت کە تەواری کۆمەڵگا بەردەوامیش دەبات.

***

دروشمی مرۆڤی سەرەتایی ئەوەیە" قەناعەت گەنجینەیەکی لەبن نەهاتووە". ئەوان شتێک بۆ بەیانی گڵ نادەنەوە. کەسی (بەدو) دەڵێ: " ئەوەی لەناو دەستە خەرجی بکە، ئەوەی بەیانی خۆی دێت". پیری لەیەکێک لەپیاوانی ئەسکیمۆ دەپرسی:" بیر

[30] Durant.our orient heritage.p17

لەچی دەکەیتەوە؟" ئەویش دەڵێ:" پێویست بەبیرکردنەوە ناکات، بەشێکی زۆر خواردنم هەیە".

دورانت باسی هۆزەکانی بۆشمان دەکات لە ئەفریقیا دەڵێ:" هەموویان برسین، یان هەموویان تێرن". ئەگەر یەکێك لە مرۆڤی سەرەتایی ڕاوی نێچیرێکی قەڵەو بکات، ئەوانی دیکە بەدەوروبەری کۆدەبنەوە وسەمای بۆ دەکەن، دواتر لە نێچیرەکە دەخۆن و ڕاوکەرەکەش بەقەد ئەوان بەشی خۆی وەردەگرێت. تەنها ئەوەندەی دەوێ کە لەناو گرووپەکەی دەرکەوتووە و خەڵك باسی دەکەن.

بۆیە مرۆڤی سەرەتایی کارناکات کاتێك خواردنی هەبێت؛ ئەگەر خۆراکیش نەما ، ئەوا لە زەوی بەدوای بژێوی دەگەڕێت. لێرەوە کێشەی ئەو کۆمپانیانە دەرکەوتووە کە مرۆڤی سەرەتایی وەك کرێکار بەکاردەهێنن؛ چونکە ئەو مرۆڤە کە لە کۆتایی هەفتە پارەکەی وەردەگرێت، ئەوا دەچێتەوە ماڵ و ناگەڕێتەوە تا پارەکەی تەواو دەبێت.

هەرئەمەش لەلای ئێمە تێبینی دەکرێت، بەتایبەتی لەلای ئەو چینانەی کە هێشتا تووشی بارگرانی مەدەنیەت نەبوونەتەوە. دەبینین کەسانی لادێیی چەند ڕۆژێك کار دەکەن، دواتر دەگەڕێنەوە گوندەکەیان تا پارەکەیان خەرج بکەن.

دورانت دەڵێ:" مرۆڤە سەرەتاییەکانی ئوسترالیا ناتوانن کار بەو کرێیە بکەن کە دواتر پێیان بدرێت، ئەوان یەکسەر پارەکەیان دەوێ. ئەگەر یەکێکیان پارەیەکی لە کارەکە دەستکەوت، ئەوا تا پارەکەی تەواو دەبێت ناگەڕێتەوە سەرکار.

دواتر دورانت سەرنجی خۆی دەدا و دەڵێ:" ئەوکاتەی مرۆڤ بیر لە بەیانی دەکاتەوە، لە بەهەشت دەردەچێ و دەکەوێتە دۆڵی دڵەڕاوکێ؛ ئەو کاتە ڕووی لەخەمان زەرد دەبێت و چاوچنۆك دەبێت و حەزی خاوەندارێتی دەبێت و خۆشی دەبەنگیی نامێنێ".

***

شوێنەوارناسەکان دەڵێن: " مەدەنیەت ئەوکاتە دەستی پێکردووە، کە مرۆڤ کشتوکاڵی دۆزیوەتەوە. بەر لەو کاتە مرۆڤ قووتی خۆی لە دار هەڵگرتەوە یان لە زەوی ڕاوی کردووە. ئەوەی لێرەدا شایەنی ئاماژە بۆ کردنە،کە کشتوکاڵ پێویستی بە پلاندانان و چاوەڕوانی وعەمبارکردن هەیە. جووتیار بۆ داهاتووی کاردەکات. ئەو ناچارە زەوی بکێڵێ ودواتر تۆو بکات ودواتریش دروێنە بکات. ئەم بابەتانەش پێویستی بەوە هەیە مرۆڤ بیر لە بەیانی بکاتەوەو خۆی بۆ ئامادە بکات.

جگە لەمەش جووتیار پێویستی بەوە هەیە ماڵ دروست بکات و فەلەکناسی بزانێ و نووسین بزانێ؛ کشتوکاڵ پێویستی بە سەقامگیری هەیە لەسەر زەوی، سەقامگیریش پێویستی بەماڵ دانان هەیە، سەرەرای ئەمەش دەبێت تۆماری حیسابی خۆی بکات، لە بیری نەکات و قەرزەکانی تۆمار بکات، نەوەك نکوڵی لێ بکرێت. دەبێت چاودێری جووڵەی مانگ و خۆر بکات بۆ ئەوەی وەرزەکانی چاندن و دروێنە بزانێت. هەر هەموو ئەمانەش بەرەو زانینی زانست و هونەرەکانی دەبەن.
ئەندازە و ژمێریاری وفەلەکناسی دواجار دەبنە فەلسەفەکاری. فەلسەفەش دەبێتە هۆی گومان و پرسیار و دڵەڕاوکێ. بۆیە لێرەوە دەتوانین بڵێین: مرۆڤ کاتێك مەدەنیەتی دانا، ئەوا خۆی تووشی بەڵایەك کرد و نازانێ چۆن لێی دەربچێ.
ئەوەی گومان لەخودا بکات کافرە، ئەوەی لۆژیکی هەبێت زەندیقە. کەچی مرۆڤی سەرەتایی نە کافرە، نە زەندیقە. گومان و زەندیقی ئەوکاتە دێت کە تووشی کەسانی شارستان دێت و تووشی نەخۆشی ئەوان دەبێت. ئەو لە گوندەکەی ئاسوودە و دڵنیا دەژی، لەکولتووری کۆنەکەی خۆیدا ئاسوودەیە چێژ لە خەونەکانی وەردەگرێت. کەسێك لە گوند نییە بڵێ"بۆچی؟" هەموو شتێك بەلای ئەوانەوە پیرۆزە نابێت لێی دەربچن، گومانیش لەلای ئەوان کوفرێکە خاوەنەکەی توندترین سزا وەردەگرێت.
ئەوان دەروونیان پڕبووە لە یەقین وباوەڕ وخۆشی ئەگەر یەکێك لەوان نەخۆش بکەوێت ئەوا بۆلای کاهین دەچێت بۆ ئەوەی نزای لەسەر بخوێنێ؛ یان تفی لە دەم

بکات، بەدەوری سەما بکات، باوەڕی بەوە هەیە بەوکاهینە چارەسەری دەردەکەی دەکرێت، هەر ئەمەش وادەکات دڵی پڕ لە ئومێد و ئاسوودەیی بێت.

ئەو لەمەیاندا پێچەوانەی کەسی شارستانە، کە ترس بەسەری زاڵە ولە دڵەڕاوکێ دایە. ئەگەر گرگان لە نزیک گوند هەڵچوو ئەوا دەچنە لای کاهین دەست دەکەن بەنزا و سەما، گرگان بەمە داتامرکێنەوە بەڵام ئەوان ئاسوودە دەبن و دەزانن تەنها ئەوە رووەدا کەخودا لە چارەنووسیان دا نووسیویەتی.

ئەگەر یەکێك لەوان چوو ڕاو بکات، ئەوا پێویستی بەوە نییە چەکەکەی تیژ بکاتەوە. بەڵکو زیاتر پێویستی بەتیژکردنەوەی چەکی دەروونی خۆی هەیە. ئەو نزایەی لایە کە لە کارەکانی رابردوو بەکاری هێناوە، ئەو دەچێتە لای کاهین بۆ ئەوەی راوەکەی بە بەرەکەت بکات و لە مەترسی دووری بخاتەوە، بۆیە کاتێك نووشی ئاژەڵێکی دڕندە دەبێت ناترسێ؛ چونکە نزاکەی سەری دەخات و کاهینەکەی چارەسەری دەکات. بەڵام ئەگەر گورگ ئەوی خوارد، ئەوا کێشەیەك نییە چونکە دەچێتە ئەو شوێنەی باوباپیرانی تێیدا دەژین و لە نیعمەتی فیردەوس دەژین کە ئیمانداران بەڵێنیان پێدراوە.

# لۆژیکی دەمارگیرەکان



لە پێشەکی ئەم کتێبەدا ئاماژەم بۆ ئەوەکرد، کە پیاواتی ئایینی لەلای ئێمە هێشتا بە شێوازی سەدەی دەیەم بیر دەکەنەوە، کەچی ئەوان لە سەدەی بیستەمدا دەژین. ئەوان لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانیان وەک فارابی و ئیبن توفەیل مشتومڕ دەکەن، بێ ئاگان لەوەی کە زانستی نوێ ئەو تیۆرانەی هێناوە، قسەکانی فارابی و ئیبن توفەیل وا لێ دەکەن لەگریوگاڵی منداڵ بچێت.

کاتێک لە هاوینی رابردوو سەرداتی ئێرانم کرد، چوومە لای شێخێک لە شێخەکانی ئایین، لەوێ گوێم لێگرت ئەوشێخە بانگەشەی ئەوەی دەکرد فەیلەسووفە. کاتێک قسەی دەکرد، قوتابییەکانی لەسەرسامیدا دەمیان لەئاست ئەو لۆژیکەی دەکردەوە کە لە شێوازەکانی فەلسەفەی کۆن بەکاری دەهێنا.

جێگای گلەییە ئەو شێخە تەمەنی درێژی لە بەکارهێنانی ئەو هونەرە کۆنەی شێوازی قسەکردن بەسەربردبێت، بینیم بەوە دڵخۆشە کە زمان پاراوە لە بەکارهێنانی زاراوەکانی فەلسەفەی کۆن، ئەو قەناعەتی بەو فەلسەفەیە هێناوە و بڕواشی وایە خەڵکیش هەموویان قەناعەتیان بەو فەلسەفەیە دێت کاتێک گوێی بۆ شل دەکەن،

کەچی بیرکردنەوەی لەو چوارچێوە تەسکەدا قەتیس بوو، لە نێوان ئەو پێوەر و زاراوانەی خۆی نەبێت کەس تێی ناگات.

ئەو شێخە لە نموونەی ئەو پیاوەیە کە هەموو تەمەنی بە مەشقکردنی شمشێر و ڕم و جۆرەکانی دیکەی چەکی کۆن بەسەر بیات؛ بڕواشی وابێت ئەو چەکانە دونیا داگیر دەکات، کەچی زانراوە ئەو لەسەردەمێکدا دەژیت، ئەو چەکانە لە مۆزەخانە دانراوە، خەڵک سەیریان دەکەن و گاڵتەیان پێدەکەن.

جا ئەوانەی لۆژیکی کۆن لەو سەردەمەدا بەکاردەهێنن لەو پاڵەوانانەی شێوازی عەنتەرەی عەبسی دەچن، کە بە شمشێر هێرش دەکەنە سەر سەربازێکی نوێ،چەکێکی بەدەستەوەیە خێرا تەقەدەکات. جا ئەوان هەرچەندە جۆرەکانی پاڵەوانێتی و ئازایی بەکاربهێنن، ڕاسترین مەزندە ئەوەیە کە تفەنگەکە دەیانکوژێ وبەشێوەیەک پاڵەوانێتی و جۆش و خرۆشیان دادیان نادات.

****

سوودی نییە ئەگەر بڵێم لۆژیکی نوێ لە لۆژیکە کۆنەکەی ئەوان ڕاستترە، پێوەرێکی ڕەها نییە هەردوو لایەن ڕازی بکات، هەر لایەنێک لەسەر ئەوە ڕاهاتووە، ڕاستی تەنها لەلایەنی خۆیەوە ببینێ؛ بێ ڕەچاوکردنی ئەوانی دیکە، ئەو لە شێوازی بیرکردنەوەی خۆی ڕازییە و حەز ناکات بچێتە سەر بیرکردنەوەیەکی دیکە.

لەوبارەیەوە هەر دەتوانم ئەوەندە بڵێم کە لۆژیکی نوێ سەردەکەوێت، جا ئێمە بمانەوێت یان نا. لۆژیکە واقعییەکەی زانست شتێک لەبەردەمی ناوەستێت، بەسەر لۆژیکی کۆنیش سەردەکەوێت وەک چۆن تفەنگ لەململانێی مانەوەدا بەسەر شمشێر بەدەستەکانەوە سەرکەوت.

****

شمشێر بەدەستەکان دەتوانن ئەوەندەی بیانەوێت گلەیی لە تفەنگ بکەن و بە چەکی ئەو ترسنۆکانەی بزانن کە لە دوورەوە خۆیان بۆ دوژمن مەڵاس داوە و دوژمن غافڵگیر دەکەن. هەروەها شمشێر بەدەستەکان مافی خۆیانە ستایشی خۆیان بکەن

و هەموو ئەو جۆرە ستایشانە بدەنە پاڵ خۆیان وەك ئەوەی لە رابردوو شانازییان پێوەدەکرد، بەڵام ئەو ستایشە لە بەردەم تفەنگدا سوودیان پێناگەیەنێ. بێگومان تفەنگ دەیانکوژێ و بەهەرحاڵ بێت سەرکەوتن بۆ ئەوە. لەو کاتەدا باشترە شمشێربەدەستان دان بەو واقیعە بنێن، کە بوارێك نەماوەو دەبێت دەرئەنجامەکەی قبوڵ بکەن، ئەگینا زەمانە لەناویان دەبات وەك چۆن بەردهاوێژەکانی لە سەدە سەرەتاییەکانی مرۆڤایەتی لەناوبرد.

کاروانی مێژوو دەڕوات و بەردەوامە لە رۆشتن، ئەو (چاکترین) لەسەر بنەمای ئەو پێوەرانە ناناسێ کە لەخۆوە لە خەیاڵی فەیلەسووفانی کۆشکی بلورین هەن، ئەوەی لەگەڵ کات ئەڕوات دەکەوێتە ژێر پێی رێبوارەکان، کاتێکیش هاوار دەکات کەسێك بەهانایەوە نایەت. مێژوونووسان باس لەوە دەکەن کاتێك ناپلیۆن هاتووە میسر داگیر بکات، پلانێکی سەربازی لەلا بووە؛ کەچی مەمالیکەکان بە شمشێرە بریسکەدارەکانیان بەرەو رووی دێن و دڵنیا لەوەی بەسەر ناپلیۆن زاڵ دەبن، یەکێك لەوان ئاسێکی بەسەرەو بەشێوازی کۆن قەڵغانی هەڵگرتووە، بەفیزەوە، گوایە ئەمرۆش سەردەکەوێت وەك چۆن دوێنێ بەسەر شاپۆڕای جووتیار و هەژاران سەرکەوت. ئەسپ حیلەی دێت و شمشێرەکان دەبریسکێنەوە و تەپوتۆز بەرزدەبێتەوە، وایان خەیاڵ کردبوو کە ناپلیون(کورتەباڵای کافر) لە بەرامبەر ئازایەتە دەگمەن و باوەڕ بەهێزەکەی ئەوان دەبەزێت.

کەچی ناپلیۆن لەو کاتەدا هێمن بووە، سەیری ئەو گاڵتەجاڕە دەکات کە بەدەستیەوە بووە، پلان بۆ مانۆڕ و تەوقکردن و هێنان و بردن دادەنێت،، هێڵێك لەوێ دەکێشێ و خاڵێك لەوێ دادەنێ وەك ئەوەی یاری شەترەنج بکات، یان فاڵ بۆ کچانی دراوسێ بگرێتەوە.

ئەمە هیچ نییە جگە لەساتێك لەساتە یەکلاکەرەوەکانی مێژوو، کەدەبینین مەمالیکەکان بەجلە کەشوفەکان و سمێڵە زلەکانیانەوە لەسەر زەوی کەوتوون، ئەوکاتەش نە لە جۆش وخرۆش و نە هوناقاکانیان سوودمەند نەبوون

***

زۆر کتێبم خوێندۆتەوە، کە لەو رۆژگارەماندا پیاوانی ئاینی بڵاویان دەکەنەوە، لە خوێنەر ناشارمەوە کەمن بۆ خوێندنەوەی ئەو جۆرە کتێبانە پەرۆشم، لە کاتی خوێندنەوەیاندا هەست دەکەم، من فیلمێکی مێژوویی لە فیلمە سینەماییەکان دەبینم، بەتایبەتی ئەو هەستەم کاتێك هەیە کە ئەو کتێبانە دەخوێنمەوە کە پیاوانی تایفە ئیسلامییە جیاوازەکان دەیاننووسن و وەڵامی یەکتر دەدەنەوە.
نووسەر لە لاپەڕەی یەکەمی کتێبەکەی دا پێشەکیەکی زەبەلاح دەنوسێ، لە بارەی خۆیەوە دەڵێ ئەو بێلایەن و هەموو سۆزە مەزهەبییەکان و باوەڕە پێشینەکەی لەخۆ داماڵیوە، بۆیە دەیەوێت لەژێر رۆشنایی عەقڵ و لۆژیك تایتۆیێ مێژوو بکات.
کەچی من لە سەرەتای دەستپێکردنی خوێندنەوەی ئەو جۆرە کتێبە، دەبینم خاوەنەکەی بەڵگە و ئەرگومێنتی عەقڵی ونەقڵی کۆدەکاتەوە، بۆ ئەوەی دروستی بیروباوەڕە مەزهەبییەکەی بەشێوەیەك بسەلمێنێ کە پاشگەزبوونەوەی لێ نەبێت. ئەو کتێبەکەی بە شکۆمەندکردنی عەقڵ دەست پێدەکات، کە گوایە پێویست لەژێر رۆشنایی عەقڵدا بۆچوون و باوەڕەکان راست بکەینەوە، کەچی لەدووتوێی کتێبەکە دەبینین خۆی کەمێك یان زۆر لە باوەڕە کۆنەکەی دەرناچێت، وەك ئەوەی بەڵگەهێنانەوەی عەقلی بەلای ئەوە ئامانجێك بێت بۆ باوەڕەکانی، بەو رێگایە گونجاوەی دەبینێ بۆ پاڵپشتی باوەڕ و قورخکردنی هەقیقەت.
ماوەیەکی کورت بەسەر دەرچوونی ئەو کتێبە تێناپەڕێت، دەبینین کتێبێکی دیکە لەلایەن پیاوانی تایفەی دووەم بڵاو دەبێتەوە، ئەمەش وەك هاوکارەکە کتێبەکەی بە شکۆمەندکردنی عەقڵ و لۆژیك دەست پێدەکات، دواتر بۆ پاڵپشتی باوەڕە باوەکەی بەڵگەی عەقلی و نەقلی بەکاردەهێنێت، وەك ئەوەی لۆژیك پاڵپشتی شتێك نەکات تەنها باوەڕی ئەو نەبێت. سوپاسگوزاری بۆ خودا،بەمشێوەیە زەمان بەدوای زەمان دەڕوات و پیاوانی ئاینیش سەرقاڵی پاڵپشتیکردنی بیروباوەڕەکانین لە رێگای عەقڵ

و لۆژیکەوە. کەسیان بەوەی دیکە ڕازی نییە، هەریەکێکیش لەوان سیفەتی لە شێوەی لوتبەرزیی و سۆفسەتە و دەمارگیری دادەتە پاڵ ئەوانی دیکە.

بەم نزیکانە کتێبێك بڵاوبۆتەوە، توێژینەوە لە بارەی ڕووداوێکی مێژووی ئیسلامیی دەکات. بەپێی ئەوەی کە تایفەیەکی دیاریکراو دەیبینێت، یەکێك لەوان پێشەکی کتێبەکەی نووسیوە و دەڵێ:" ئەو کتێبە لە چەند لایەنێك سەرکەوتووە، لە تێڕوانینی بۆ توێژینەوەکە سەرکەوتوو بووە، تێڕوانینێکی بابەتییانەی پەتییە. نووسەر هیچ سۆز و لایەنگرییەکی نییە، ئەگەریش ڕێککەوتووە کە توێژینەوەکە بە باوەڕە مەزهەبییەکەی کۆتایی بێت، ئەمە شتێك نییە، تەنها ئەوە نەبێت کە میتۆدە قووڵەکەی، ئەوی بەو کۆتاییە گەیاندووە... هتد"[٢١].

نووسەری پێشەکی، تێڕوانینی بابەتیانەی پەتی وداماڵراو لە هەر باوەڕێکی مەزهەبی دەداتە پاڵ نووسەری کتێبەکە. دواتر دەڵێ ئەو تێڕوانینە بابەتیانەیە کە نووسەری گەیاندۆتە دەرخستنی دروستی باوەڕە مەزهەبییەکەی، واتە نووسەر لە سەرەتادا مەبەستی ئەوە نەبووە بەڵگەی بۆ دروستی باوەڕەکەی بهێنێتەوە، بەڵکو ئەرگومێنێت لە خۆیەوە هاتووە، کاتێك نووسەر پەیڕەوی میتۆدێکی وردی زانستی کردووە لە توێژینەوەکەی دا.

لۆژیکی نوێ ئەو قسانەی بە خورافە دەزانێت کە ئاینپەروەرێکی باوەڕدار بە یەکێك لەمەزهەبەکان، ناتوانێت خۆی لە سۆزە مەزهەبییەکەی داماڵێت. باوەڕدار هەندێکجار وادەزانێ خۆی لە سۆز داماڵیوە، بەڵام ئەوەیان وەهمێکە بنەمای لەڕاستیدا نییە.

یەکێك لە مەرجەکانی میتۆدی زانستی وردبین ئەوەیە، کە خاوەنەکەی بەر لەوەی دەست بەتوێژینەوەکەی بکات بە گومان و سەرسوڕماو بێت. بەڵام ئەوەی بانگەشەی ئەوە دەکات کە تێڕوانینی بابەتیانەیە، ئەو لەباوەڕی خۆیدا تا تەوقی سەری نقوم

[٢١] محمد رضا المظفر، السقيفة،ص٤

بووە. واتە ئەو گێلە یان فێڵبازە؛ ئێمەش دەمانەوێت پیاوانی ئایینی ئەو دوو سیفەتە بەدوور بگرین.

گلەیی لە پیاوانی ئایینی ناگیرێت کاتێک بە هەموو هۆکارێک پاڵپشتی لە باوەڕە مەزهەبییەکەیان دەکەن، ئەوان لە بەرانبەر ویژدانیان و پەیڕەوکارانی مەزهەبەکەیان پابەندن بەوەی کە باوەڕەکەیان بەچەندین شێواز بڵاو بکەنەوە. بەڵام گلەییان لێ دەگەین کاتێک لەو پێناوەدا لۆژیکی کۆن بەکاردەهێنن. ئەو پیاوانە نموونەی ئەو کەسەن بە شمشێرێکی پەمەنی دەچێنە جەنگێکی سەردەمیانە؛ ئەوا لەیەک کاتدا زیان بەخۆی و خەڵکەکەشی دەگەیێنێت، ئەوکاتەش جەنگاوەران تەقەی لێناکەن، بەباشی دەزانن گاڵتەی پێ بکەن تەوەک بیکوژن.

ئەزموونێکی زۆر سەلماندوویەتی مشتومڕی لۆژیکیی کە پیاوانی ئایینی بەکاری دەهێنن، یارییەکی دۆڕاوە و بێ ئەنجام و بێهودەیە، نەمبینیوە کەسێک لە ئەنجامی مشتومڕی لۆژیکی باوەڕ بە نەیارەکەی بهێنێ. ئەو مشتومڕە مرۆڤ کپ دەکات و هەندێک جاریش جۆش وخرۆشی پێدەدات، بەڵام ڕازی ناکات. بۆیە مرۆڤی باوەڕدار تا دواهەناسەی باوەڕی بە دروستی بۆچوونەکەی هەیە، بەڵام ئەگەر بیتیمان بەڕاستی بۆچوونی گۆڕیبوە، ئەوا دەبێت بە دوای پاڵنەرە دەروونیی و کۆمەڵایەتییەکان بگەڕێین کەپاڵیان ناوە.

***

کاتێک مرۆڤ بەرگری لەباوەڕە مەزهەبییەکەی دەکات؛ ئەوا وادەزانێ ئەمەی لە پێناو خودا و خۆشەویستی ڕاستییە، کەچی نازانێ بەمە فێڵ لە خۆی دەکات. لەڕاستیدا ئەو باوەڕەکەی لەو ژینگەیە وەرگرتووە کە تێیدا گەورە بووە. ئەگەر هاتوو ئەو لە ژینگەیەکی دیکە گەورە بێت، ئەوا دەمانبینی کە ئەو باوەڕی ئەو ژینگەی دەبێت، دواتر بێ دوودڵی وادەزانێ کۆشش بۆ ڕاستی دەکات.

عەقڵی مرۆیی هیچ فێڵێکی دانەهێناوە، لە فێڵی هەق و حەقیقەت دزێوتر بێت. نەمبینیوە لەودونیایەدا کەسێک هەبێت بڵێت من هەق و حەقیقەتم خۆشناوێ. تەنانەت

ئەو ستەمکارانەی کە لاپەڕەکانی مێژوویان بە ستەم پڕکردۆتەوە، کە بە بیستنیان جەستە دەکەوێتە لەرزین. کە گوێت لە قسەکانی ئەوانیش دەبێت، دەبینی پڕیەتی لە خۆشەویستی هەق وهەقیقەت. جا زۆر بەسەر ئەو داماوە دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەوان، کاتێک دەبینی ئەو لەژێر زوڵمی ئەوان دەناڵێنێ؛ کەچی ئەوان دەنگی سروودی هەق و هەقیقەتیان بەرزدەبێتەوە.

دەگێڕنەوە یەکێك لە سوڵتانە باوەڕدارەکان بەخوا؛ ڕۆژێکیان دە هەزار کەس سەردەبڕێت، کە لەسەر باوەڕی زینگەی ئەو نیین کە ئەو تێیدا گەورە بووە؛ لە کەلەسەری کوژراوەکان منارەیەکی بەرز دروست دەکات و خۆشی سەردەکەوێت بەدەنگێکی بەرز هاوار دەکات" لا اله الا الله"[22].

لەشێوەی ئەو ڕووداوە لە سەردەمی عوسمانییەکان ڕوویداوە، کاتێك والی موسڵ هێرشێکی سەربازی کردە سەر ئەو ئێزدییانەی لە باکووری عێراق نیشتەجێن، هێرشەکرایە سەر گوندەکانی ئێزدی، منداڵەکانیان کوژران و ژنەکانیان هەتك کران، دواتر پیاوەکانیان هێنایە موسڵ بۆ ئەوەی یەکێك لەو دووانە هەڵبژێرن: تیغی شمشێر یان شەهادەی(لا اله الا الله).

بێگومان والی بەو سەرکەوتنە دڵشاد بووە کە خودا لەسەر دەستی ئەو ئەنجامی داوەو وا خەیاڵی کردووە کە کۆشکی گەورەی بۆ لە بەهەشتی فیردۆس دروست دەکرێت ئەمەش وەك پاداشتێك بۆ ئەو کوشتارە نایابەی ئەنجامی داوە. والی لە ئێزدییەکان تووڕە بووە، گوایە شەیتان پەرستن، ئەوەی بیرچووە ئەگەر خۆی لە گوندێکی ئێزدی لەگەڵ دایك وباوکێکی ئێزدی گەورە بووایە، ئەوا وەك ئەوان شەیتان پەرست دەبوو؛ ستایشی شەیتانی دەکرد و لەخۆشەویستی و پەرۆشی ئەو دەتوایەوە.

---

[22] احمد امین ظهر الاسلام، ج٤ ، ص ١٢١

بەڵام ئەو وا راهاتووە جنێو بەشەیتان بدات و رقی لێی بێت.ئەو لە سەردەمی زووی منداڵییەوە بینویەتی خەڵکەکەی دەوروبەری جنێو بەشەیتان دەدەن و رقیان لێیەتی، بۆیە ئەویش لەگەڵ ئەوان جنێو دەدات و لە وێنەی دزێو و قێزەوەن خەیاڵی دەکات.

ئەبو سعودی عەمادی کە لە سەردەمی سوڵتان سلێمانی قانونی موفتی ئیسلام بووە، لەبارەی حەڵاڵبوونی کوشتنی ئێزدییەکان پرسیاری لێکراوە، موفتی لەوەڵام دەڵێ: "خوا لە زانینی راستی زاناترە، کوشتنی ئەوان غەزایە، ئەوەی بەدەستی ئەوان بکوژرێت شەهیدە، چونکە جیهاد و شەڕی ئەوان گەورەترین جیهاد و گەورەترین شەهید بوونە. ئەوان زیاتر لەکافرەکان کافرترن. کوشتنی ئەوان بەپێی هەرچوار مەزهەب حەڵاڵە، جیهادکردنیش لەدژی ئەوان راستتر و پاداشتی لە هەموو عیبادەت زیاترە، پەرتەوازەکردنی ئەوان، دەستکردن بەکوشتاریان و کوشتنی سەرۆکەکانیان لە ئەرکە ئاینییەکانە.ئەو حاکم و والیانەی کە رێگەی بەکوشتاری ئەوان دەدەن، هانی کوشتاری ئەوان دەدەن و ئارەزووی نەفرەتیان دەکەن، خوا سوپاسی کوشتنی ئەوان دەکات وپاڵپشت و هاوکارییان دەبێت لە مەبەستەکانیان و لە سەرکەوتنی سەرن پاڵپشتیان دەکات، بۆیە دەتوانن پیاوەکانیان بکوژن و ژن و منداڵەکانیان بەدیل بگرن، لە بازاڕی موسڵمانەکان وەک دیلی کافرەکان بیانفرۆشنەوەوە حەڵاڵیشە هەڵسەوکەوت لەگەڵ کچ و ژنەکانیان بکەن"[٢٢].

ئەو فەتوا زاڵمانەیە دەکرێت لە بیرکردنەوە نموونەیەکی نایابی شێوازی لۆژیکی کۆن بێت. ئەمە لۆژیکی باوەڕی یەکلاکەرەوەیە، کە هیچ گومانێك لەخۆیەوە ناگرێت، ئەوەی لەو باوەڕە لایدا وگومانی لێکرد، ئەوا پێویستە لە پێناو خودا بکوژرێت. خاوەنانی ئەو لۆژیکە بایەخ بەوە نادەن کە لایەنەکەی دیکە چی دەڵێن، گوایە ئەساسی ئەوان لە بنەڕەتدا پووچە بۆیە پێویست بە مشتومڕ ناکات.

---

[٢٢] صدیق الدملوجي، الیزدیة، ص ٤٢٩-٤٣٠

شیلەر لەوەسفکردنی لۆژیکی کۆن دەڵێ:" ڕاست لە ڕۆشنایی لۆژیکی ڕەها بەکە، دەبێت هەموو بۆچوونەکان ڕێککەون، تۆ دەبێت یان لەگەڵ هەقیقەت بیت، یان لەدژی بیت. ئەگەر دژی بیت ئەوا تۆ سەرگەردان دەبی، بەڵام ئەگەر لەگەڵی دابیت ئەوا کەس جورئەت ناکات دژایەتیت بکات، تۆ ساقی تووڕەبوونت هەیە لە بەرامبەر ئەوکەسانەی کە مشتومڕ لەسەر ڕاستی دەکەن. ڕاستی هی تۆیە، یان دروستر هەقیەت تۆی ئەگەر بێت خۆت لە هەستە مرۆییەکانت داماڵێتی"[11].

ئەو لۆژیکە هاوکاری خەڵکی کردووە، ئێستاش لەو جەنگە ئایینی و سیاسیانەی کە لاپەڕەکانی مێژووی پڕکردۆتەوە هاوکارییان دەکات، ئەو لۆژیکە بەکەڵک هێرشبردن و بەرگری کردن دێت، بەڵام ئەو لۆژیکە بۆ دۆزینەوەی هەقیقەتی نوێ و سەلماندنی بۆچوونی کۆن کەلکی نییە، مامۆستا تۆماس ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە، کە لۆژیکی کۆن بریتییە لە لۆژیکی باوەڕ کۆنەکان تەوەک لۆژیکی مەعریفەیەکی گەشەکردوو"[12].

ستەمە سزای خەڵک لەسەر ئەو باوەڕە بدەین کە لە پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی وەریانگرتووە. کەچی لۆژیکی کۆن لەسەر ئەو بنەمایە دامەزراوە کە مرۆڤ بە ویستی خۆ باوەڕ وەردەگرێت، ئەمەش لە ڕێگای بیرکردنەوە و تێڕوانین دەبێت ئەمەش هەڵەیەکە کە لە زۆر لایەنەوە ستەمی لێ دەکەوێتەوە.

لەڕاستیدا مرۆڤ باوەڕ بەو عەقیدەیە دەهێنێ کە لە باوانییەوە وەریگرتووە دواتر بیری لێدەکاتەوە، زۆریەی کاتیش بیرکردنەوەکەی لە بارەی پاڵپشتی کردنی باوەڕی خۆیەتی، دەگمەنە ببینین کەسێک تەنها لە ئەنجامی بیرکردنەوەی بیروباوەڕی بگۆڕێت، بەڵکو دەبێت چەندین پاڵنەری دیکەی دەروونی و کۆمەڵایەتی هەبن بۆ ئەمە پاڵنەری بن، چا ئەو ئاگادار بێت یا نا.

قورئان عەقڵی خەڵک بە داخراو رکوێر وەسف دەکات، لە چەندین ئایەتدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، ئەو دەفەرموێ" فأنها لاتعمی الابصر ولکن تعمی القلوب التی

[11] Schiller,FORMAL ;OGIC, P.398-399
[12] Thomass, living words of philosophy,p.91

في الصدور"[٦٢]. مەبەستی قورئانیش لەدڵەکان( عەقڵەکانە)، ئەوەی شێوازەکانی زمانی عەرەبی بزانێت، ئەمە دەزانێ. قورئان چەندین جار خەڵك ئاگادار دەکاتەوە بەو وشانە: الا تفکرون،، الا تعقلون،... الا تبصرون..(ئایا بیرناکەنەوە. ئایا عەقڵتان بەی ئایات، ئایا سەیر ناکەن) کەچی خەڵك گوێبیستی ئەوانە دەبن و تێناگەن.

هەر ئەو خەڵکانە بوون پێغەمبەریان بەسەرکەوتوو نەدەبینی، تا ئەوکاتەی شکۆ و هێزی بەدەرکەوت، ئەوکاتەش بەدەوریەوە دەیارین و ئیسلام بوونی خۆیان رادەگەیاند و بێ بەدەمیان دەیانگوت" لا اله الا الله محمد رسول الله".هەر کاتێکیش ئیسلام سەرکەوتنی زیاد دەبوو، ئەوانیش باوەڕیان زیاتر دەبوو، تا لە کۆتایی بینیمان ئەو کەسانەیان دەچەوساندەوە کە لەو ئاینە دەردەچوون، وەك ئەوەی چۆن لەسەرەتادا ئەو کەسانەیان دەچەوساندەوە کە دەهاتنە ریزەکانی ئەو ئاینەوە. ئەمرۆ موسڵمانان دەبینین کە لە خۆشەویستی پێغەمبەر دەتوێنەوە و هەر ئاوێك بێت گۆرانی لە ستایشی ئەو دەچڕن، ئەوان بۆیە ئەمە دەکەن چونکە ل ژینگەیەك پەروەردەبوون پێغەمبەر مەزن وپیرۆز دەکات. بەڵام ئەگەر ئەمرۆ پرەنسیپەکانی ئەو لەناویان دەرکەوێت ئەوا وەك پێشینانیان بەرەنگاری دەبنەوە، کەمتر لەوە ئەنجام نادەن کە پێشینانیان ئەنجامیان داوە، " خەڵك هەر خەڵکە رۆژەکانیش یەکن" وەك شاعیرێکی عەرەبی وتویەتی.

موسڵمانانی ئەمرۆ پێیان وایە ئەگەر ئەوان لە سەردەمی دەعوەی ئیسلامی دەبوون، لەگەڵ بیستنی دەچوونە ریزی ئەو ئاینەوە، من ئەمە بە پڕوپووچترین قسەی ئەوان دەزانم. بۆیە پێویستە موسڵمانان هەزار جار سوپاسی خوا بکەن، ئەواتی لەو سەردەمە سەختە دروست نەکردووە،کە ئەگەر خوا ئەواتی ئەوکات دروست بکردایە، ئەوا لە شێوەی ئەبوجەهل و ئەبوسوفیان و ئەبولەهب دەبوون، یان بەلایەنی

[٦٢] القران ، سورة الحج، اية ٤٦

کەمەوە دەستوپێوەندی ئەوانە دەبوون و ئەوا بەردیان دەگرتە خاوەنی دەعوە و گاڵتەیان بەخۆی و قورئان ومیعراجەکەی دەکرد.

خوێنەری بەرێزم وێنای خۆت بکە کە لە سەروبەندی دەعوەدا لە مەککە دەبیت، دەبینی پیاوێکی بێهێز خەڵك بە بەرد ستەمی لێدەکەن و گاڵتەی پێدەکەن و بە شێت ناوی دەبەن. تەسەوری خۆت بکە، تۆش لەو مەککەیە گەورە بوویت و باوەڕ بە پیرۆزی ئەو بتانە دەهێنیّ کە باوانت باوەڕیان پێبووە، خۆت بەو پیرۆز دەکەیت و داوای یارمەتی و چاکە لەو بتانە دەکەیت، دایکە بەسۆزەکەت تۆی لەسەر ئەمە پەروەردە کردووە، لە منداڵییەوە لەسەری ڕاهاتووی، لەمە زیاتر شتێکی دیکە نابینی، دواتر دەبینی پیاوێکی لاواز دێت جوێن بەو بتە پیرۆزانەت دەدات و کەسوکار و خەڵکی تۆ و شارەکەت ڕقیان لیّ دەبێتەوە و هەموو خراپەکارییەکی دەدەنە پاڵ. تۆ ئەو کاتە چی دەکەی. تکایە ماوەیەك بیر بکەوە بەر لەوەی وەڵامی پرسیارەکە بدەیتەوە.

ئەو وەسفەی قورئان بۆ عەقڵی خەڵکی کردووە، تا ئاستێکی زۆر لەوە دەچێت کە زانستی نویّ لەسروشتی عەقڵی مرۆڤ ئاشکرای کردووە. عەقڵی مرۆڤ بەبەرگێکی ئەستوور داپۆشراوە، بەڵگە وئەرگومێنت لە سنوورێکی دیاریکراو نەبێت کاریگەریی نابێت، ئەو سنوورەش لەو دابونەریتە کۆمەڵایەتیانە پێکهاتووە کە مرۆڤی تێدا پەروەردە بووە، من لە کتێبێکی پێشترم ناوناوە بە "چوارچێوەی هزری".[٢٧]

جا تۆ ئەگەر بتەوێت بەهێزترین بەڵگە بۆ مرۆڤێك بهێنیتەوە بۆ ئەوەی بە بۆچوونێکی ڕازی بکەیت کە پێچەوانەی دابونەریتە باوەکەی پێشووی بێت، ئەوا لەتۆ لامل دەبێت و بەڵگەکەی تۆ بە پرووپووچ و نامافوول دەزانیّ. تۆش لەوە سەرت سوڕدەمێنیّ کە نەیارەکەت باوەڕی بە ئەرگومێنتێکی بەهێز نییە، زۆربەی جار ئەو نەیارە کە گوێی لەو ئەرگومێنتەی تۆ دەبێت، بە گاڵتەوەی ڕووبەڕووی دەبێتەوە و ڕقی لێدەبێتەوە،

[٢٧] علی الوردي: خوارق اللاشعور، الجزء الاول، الفصل الاول.

ڕەنگە تۆ لەوکاتە ئەو کەسە بە قین لەدڵ ولوتبەرز بزانی، ئابێت ئەوەش لەبیر بکەی، کە نەیارەکەشت لەناخی خۆی دا تۆ بەلوتبەرز و قین لەدڵ دەزانێ.

هەردووکتان باوەڕتان بەوە هەیە، کە لەلاتان هەیە،(کل حزب بما لديهم فرحون) هەر لایەنێك دڵی بەوە خۆشە کە هەیەتی.

پێشینیان بەڵگەی بەهێز و ئاشکرایان بە خۆری نیوەڕۆ وەسف دەکرد، ئەوەیان لە بیرنەبوو خۆری لەوپەڕی ڕووناکی خۆی دا، بەڵگەیەکی تەواو نابێت لەلای کەسێکی کوێرەوە، کاتێك خۆر لە لای ئەو بە بەرگێکی ئەستوور داپۆشراوە. هەر ئەوان کاتێك مشتومڕیان لەنێوان خۆیان دەکرد، هەریەکەیان ئەویتری بەوە تاوانبار دەکرد، کە بەئەنقەست چاو لە بینینی ڕاستی دەنوقێنێت. هەر یەکەیان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە ڕاستی تەنها لەلای ئەوە نەوەك خەڵکانی دیکە. وەك ئەوەی گوایە خوای تۆ خۆشویستنی هەقی تەنها لەدڵی چەند کەسێك چەسپاندووە و خەڵکەکەی دیکە لە گومڕایی بەجێهێشتووە.

ڕۆژێکیان لەدانیشتنێك بووم، چەندین پیاوانی ئاینیش لەوێ بوون، لەکاتی قسەکردن ئەو پیاوانە لەسەر ئەو بۆچوونە کۆك بوون، کە دەبێت دانیشتوانی زەوی پابەند بن بەوەی لەدوای ئاینی ڕاستی بگەڕێن، ئەگەر دۆزیانەوە ئەوە دەبێت یەکسەر بچنە سەر ئاینەکە، بە بۆچوونی ئەوان خەڵك ناچارە واز لە کارەکانی بهێنێ، لە گۆی زەوی بگەڕێت بۆ دۆزینەوەی ئاینی هەق.

منیش وتم" بۆچی ئێوە لە زەوی بەدوای هەقیقەت ناگەڕێن؟" ئەوان سەریان لەو پرسیار پڕوپووچە سوڕما و گوتیان" ئێمە پێویستمان بەوە نییە کە بەدوای هەق بچین، چونکە هەق وا لەلای ئێمەیە".

ئەوان وادەزانن تەنها خۆیان لەسەر هەقن، نەوەك خەڵکانی دیکە. ئەوەیان لەبیرکردووە ئەوەی باوەڕی بەئاینێك هێناوە وەك ئەوانە، بۆ گوێی ئەو دونیایە بچێت، دەبینی خەڵك بە باوەڕی خۆیان دڵشاد وئاسوودەن و دەیانەوێ نەتەوەکانی دیکە بێن بۆ ئەوەی ئاینی هەق بیەن کە تەنها لە لای ئەوان هەیە.

یەکێك لەشتە سەیرەکانی ئەو تێگەیشتنانە؛ ئەوەیە کە جاحیز لەسەدەی سێیەمی کۆچی باسی کردووە، دەڵێ: خوا کافرەکان لەسەر کوفرەکەیان سزا نادات، مەگەر دەمارگیری لەبەرامبەر هەق بکات، ئەو کەسەش باوەڕی بە ڕاستی دەعوە هەیە بەڵام لەبەر بەرژەوەندی خۆی کوفر قبوڵ دەکات.

بەبڕوای جاحیز: بیروباوەڕی مرۆڤ بەپێی ویست نییە، بەڵکو بەسەریدا سەپێنراوە، ئەمەش ئەنجامێکی حەتمییە بۆ پێکهاتەی عەقڵ و ئەو بۆچوونانەی پێی دەدرێت. ئەوەی ئاینێکی پێ بدات ئەگەر عەقڵ بەباشی نەزانێ، ئەوا ناچارە کە بەباشی نەزانێت. بواری ئەوەش نییە بە باشی بزانێت، بۆیە ئەو بەرپرس نییە لە باوەڕی خۆی، چونکە خوا لە توانای مرۆڤ بەدەر شتێك ناکاتە ئەرك. ئەوەی قووشی ئاینێکی ڕەنگ بووە، سوور بەڕەش دەبینێ، ئەوا گلەیی لێناکرێت. چونکە ناتوانێت شتێك بکات تەنها چاوەکانی دەکاتەوە و دەینوقێنێ، بەڵام ئەوەی ڕەش و سوور وەك خۆیان دەبینێ ئەوا ئەویش پەیوەندی بەخۆیەوە نییە، لە بارەی شتە (مەعقولەکان[28])ی دیکەش هەروایە[29].

ئێمە نامانەوێت لێرەدا تاوتوێی ئەو بۆچوونەی جاحیز بکەین، چونکە زۆر ترسناکە و دەماتخاتە هەڵوێستێکی شەرمەزاری کە نازانین چۆن لێی دەربچین، بەڵکو دەمانەوێ سەرنجی خوێنەر بۆ ئەو بەراوردە نایابە ڕابکێشین کە جاحیز باسی کردووە. ئەوەی هەستپێکراوەکان وەك مەعقولەکانە، بەبۆچوونی جاحیز عەقڵ وەك هەستە، بەپێی ویست نابێت، تەنها لەستوورێکی دیاریکراو نەبێت.

تۆ ناتوانی شتێکی پەردەپۆش کراو ببینی، یان ڕووداوێك کە لەدەرەوەی بینینی تۆ بێت. ناشتوانی شتێك ببینی کە تۆ کوێر بیت. هەستکردنت بەشتێك، پێویست دەکات هەستێکت بۆ زانینی هەبێت، ئەگینا ئەو شتە بەبۆچوونی تۆ نادیارە و بوونی بەلای تۆوە نییە. ئەمڕۆ زانایان پێیان وایە بیرکردنەوە وەك هەستکردنە. تۆ ناتوانیت

---

[28] ئەوشتانەی عەقڵ دركیان پێدەکات (وەرگێڕ)

[29] احمد امین، ضحی الاسلام، ج٣، ص ١٣٣-١٣٤

بەعەقڵ درك بەشتێك بكەیت، مەگەر تەنها لەچوارچێوەی چەمك و پێوەرە هزرییەكانی تۆ بێت كە لە دەوروبەرە كۆمەڵایەتییەكەت لێی راهاتووی.

ئەو كاتە مرۆڤ وەك ئەو ئەسپەیە كە گالیسكەیەك رادەكێشێ و چوارچێوەیەك بۆ بینینی دانراوە، ئەوكاتە تەنها ئەو شتانە دەبینێ كە دەكەونە چوارچێوەی بینینی ئەو، لەوانەیە خوێنەر ئەو لێكچوونە قبوڵ نەكات، گوایە ئەو ئازادە لە بیركردنەوەی بەهەموو لایەك دەگەڕێت، ئەمەش وەهمێكە بنەمای راستی نییە.

سەختە، هەندێكجاریش مەحاڵە مرۆڤ بە ئازادییەكی تەواو سەیری بابەتەكان بكات، هەندێك گێل وادەزانن كە لە بیركردنەوەیان ئازادن، ئەمەش بەهۆی ئەوەیە كە چوارچێوە هزرییەكەی ئەوان كۆتێكی نەستە بەسەر عەقڵیان دانراوەو ئەوان هەستی پێناكەن، ئەمە لە شێوەی فشاری كەشوهەوایە كە قورسایییەكی تۆزی بەسەر جەستەمانەوە هەیە، هەستیشی پێناكەین، بەڵام كاتێك شوێنی خۆمان دەگۆڕین دەزانین بڕی ئەو فشارە گۆڕاوە، ئەوكاتە هەست بەوە دەكەین كە ئێمە لە وەهم دابووین.

بەمشێوەیەش عەقڵی مرۆڤ هەست بە قورسی ئەو چوارچێوەیە ناكات كە بۆی دانراوە، تەنها ئەوكاتە نەبێت كە بۆ كۆمەڵگەیەك دیكە گوێزرایەوە، ئەو كاتە تێبینی دەكات كە بیركردنەوە و چەمكەكانی ئەوێ لە شتەباوەكانی ئەو جیاوازە، ئەوكاتە هەست دەكات كە كۆتە فیكرییەكانی ئەو قورس بووە، ئێستا وا خەریكە بیركردنەوەی دەكرێتەوە.

***

هەڵە ناكەین ئەگەر بڵێین: مرۆڤ چەند بگەڕێت و سەرنجی بیروباوەڕە جیاوازەكان بدات، ئەوا چوارچێوەی هزری كە لە سەری پەروەردە بووە دەكرێتەوە و دەتوانێت كەم یان زۆر لەكۆتەكانی بیركردنەوەی ئازاد بێت، هەرچەندیش گۆشەگیر بێت ئەوا هزری بەرتەسك و دەمارگیرتر دەبێت. ئەوەی لە ژینگەكەی خۆی جیانابێتەوە و تەنها ئەو كتێبانە دەخوێنێتەوە كە پشتگیری باوەڕ باوەكەی ئەو دەكات، ناتوانێ

وەك بێلایەنێك سەیری بکەین لە باسی کردنی بابەتەکان، چونکە باوەڕەکەی بیرکردنەوەی رەنگ کردووە و لە توێژینەوەی دروست دووری خستۆتەوە.

ئەمە بابەتێکە کاریگەرییەکەمان بەئاشکرا لە ئافرەت بینی، کاتێك لە ماڵەوەمان دەستبەر کردووە و ئاسۆی گەڕان و تێکەڵاویمان لەژن بەرتەسك کردۆتەوە، عەقڵی تا ئەوپەڕی سادەیی سادەبۆتەوە، لێرەشەوە ئەو قسەیە هاتووە کە دەڵێ:" عەقڵی ژن نیوەی عەقڵی پیاوە." بەڵام لە رۆژئاوا بینیمان ژن لە دووربینی ودروستی بۆچوون، کێبڕکێ لەگەڵ پیاوان دەکات. هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئێستا ژن بەتەواوی وەك پیاوان کار دەکات و سەفەر دەکات، دەخوێنێ.

هەندێك لە بیرمەندان دەڵێن دەبێت ژن لە ماڵەوە بێت و حیجاب بکرێت، ئەمەش بە پاساوی ئەوەی کە نیوە عەقڵە و ناتوانێت بەو عەقڵە لە بەرامبەر سەرکێشییەکانی سۆز پارێزگاری لە خۆی بکات، ئەوەیان لە بیرکردووە کە عەقڵی بەهۆی ئەمەوە گۆشەگیر بووە، ئەوان بەو حیجاب کردنەوە عەقڵی ئەویان بەرتەسك کردۆتەوە[20]، دواتر حیجابیان کردووە بە بیانووی بەرتەسکی عەقڵیی، درێنێ هۆکارەکەیان بۆ دروستکردووە، ئەمڕۆش دەیانەوێ لەو هۆکارە بکەنە ئەنجام و پاساو.

پیرەژنێکم دەناسی چووە مەککە وگەڕایەوە، ئێستا بە دیدێکی نوێ سەیری شتەکان دەکات، پێشتر وەك پیرەژنە باوەڕدارەکانی دیکە وایدەزانی کە خۆی و قەومەکەی ئیمانی راستەقینەیان قۆرخ کردووە، بەڵام سەری سوڕما کاتێك ئەو حاجیانەی بینی بوو کە لە چەندین مەزهەبی جیاوە لەوپەڕی ئیمانداری دابوون، بەشێوەیەك کە گومان لەدڵسۆزییان ناکرێت. ئەوکاتە ئەوژنە هەستی کرد کە

[20] حیجاب لێرەدا تەنها بەمانای ئەو پۆشاکە نایەت، بەڵکو دەرگەگرتنیش لەزمانی عەرەبی بە مانای حیجاب دێت(وەرگێڕ)

حەقیقەت موڵکی هەمووانە، خوا زۆر لەوە دادپەروەرترە کە تەنها کۆمەڵێك هەڵبژێرێت و کۆمەڵێکی دیکە بەلاوە بنێت.

مانهایم لە رووی ئازادی بیرکردنەوەی مرۆڤ دەکات بەدوو بەشی سەرەکیی:

١- چینی یەکەم مانهایم بە(کۆتکراو لەرووی کۆمەڵایەتی) ناویان دەبات، ئەمە زۆرینەی خەڵکە، ئەوانە لە بیرکردنەوەیان لەو چوارچێوەیە دەرناچن کە کۆمەڵگە بۆی دیارکردوون.

٢- بەڵام چینی دووەم (ئازادبوو لە رووی کۆمەڵایەتی)ین، ئەوانەن کە ئاسۆکانیان فراوانتر بووە، ئەوان سەیری هەموو بۆچوونەکانیان کردووە، لە ئەنجامی ئەمەش هزریان ئازاد بووە.

لەبەر ئەمەش لۆژیکییەکان رەخنەیەکی توندیان ئاراستەی مانهایم کرد، ئەوان بڕوایان وایە، هەر چۆنێك بێت لە توانای کەس نییە کە لە کۆتە هزرییەکانی تەواو ئازاد بێت، ئازادبوونی رەها لە توانا دا نییە، بەڵام مرۆڤ لە توانای دایە بەرێژەیی بیری خۆی ئازاد بکات، بیرمەندانی ئازاد بەپلەی جیاواز دەتوانن لە نەریتی ژینگەکەیان ئازاد بکەن، هەرچەندیش لەوە وردبنەوە ئەوا داهێنانیان زیاتردەبێت و ڕێگای توێژینەوەی دروستیان لەبەردەم دەکرێتەوە.

***

دەتوانین حەقیقەت بە هەرەمێکی فرە ڕوو بچوێنین، ئەو مرۆڤەی کە (لەرووی کۆمەڵایەتییەوە کۆتکراوە) تێڕوانینی هەردەم لەسەر یەك ڕووی حەقیقەت دەبێت و ڕووەکانی دیکەش فەرامۆش دەکات، چونکە ئەو لە شوێنەکەی خۆی دا بەزنجیرێکی بەهێزی نەریت و چەمکە باوەکانی کۆمەڵگە بەستراوەتەوە، بۆیە ناتوانێت بەلای ڕاست و چەپ بڕوات، تەنها لە سنوورێکی دیاریکراو نەبێت، بەڵام کە ئازادبوو، زۆر یان کەم، زیاتر لەحەقیقەتی مامناوەندی نزیك دەبێتەوە کاتێك دیقەت لە جووڵەی خۆی دەکات بەلای ڕاست و چەپەوە.

پێشینان بڕوایان وابوو کە هەقیقەت یەکە، ئەویش لە بۆشاییەوە هەڵپەسێردراوە، ئەمەش مانای ئەوەی هەقیقەت یەک ڕووی هەیە، ئەوەی ئەو ڕووەی بیبینی ئەوا بێ پێچ و پەنا تەواوی هەقیقەتەکە دەناسێ، لەبەر ئەوەش کاتێک بینیان دوو لایەن ململانێیان لەسەر شتێک هەیە، زوو ئەوەیان یەکلاکردۆتەوە کە دەبێت لایەنێک لەسەر هەق و ئەویتر لەسەر ناهەق بێت. بەمەش دەبێت هەق بەتەواوی لەلای لایەنێک بێت، بەڵام لایەنەکەی دیکە بەبڕوای ئەوان بێگومان دەبێت لەسەر ناهەق بێت.

کەچی لۆژیکی نوێ ئەو پرەنسیپەی گۆڕی، پێیوایە هەقیقەت لەلای کۆمەڵێک خەڵکەوە قۆرخ ناکرێت، هەر کۆمەڵێک بە تێڕوانینی تایبەتی خۆی سەیر هەقیقەت دەکات، ناشزانێ کە هەقیقەت چەندین ڕووی دیکەی هەیە.

لەڕاستیشدا هەق و ناهەق دووڕووی پەیوەست بەیەکترن، کاتێک هەق دەبێت ناهەقیشی لەگەڵ دەبێت. ئەگەر دوو کۆمەڵە مرۆڤ کێشەیان لە نێوان بوو، بەڵگەی ئەوە دەبێت کە هەریەکەیان لە یەک کاتدا هەق و ناهەقن، بەمانای ئەوەی هەر کۆمەڵێکیان ڕوویەکی هەقیقەت دەردەخات، کەچی کۆمەڵەکەی دیکە ڕوویەکی دیکەی هەقیقەت دەردەخات.

ڕکابەریش بۆیە دەبێتە هۆی توندڕەوی لە نێوان ئەو دوو کۆمەڵەی کە لەلایەن خۆیەوە سەیری هەقیقەت دەکات. بەمەش هەر یەکەیان لە ئاستی مامناوەند دوور دەکەوێتەوە کە لە سەرەتادا لە نێوانیان هەبوو، بەمانایەکی دیکە ڕکابەری ناتوانێت دادپەروەرانە بێت، سروشتی ململانێیەکەش توندڕەویی وجۆش وخرۆش و هەڵچوونی سۆز دەبێت. بۆیە دەبینین ڕکابەرەکەیان هەرچەندە درێژە بکێشێت، ئەوانیش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە دادپەروەریی دووردەکەونەوە.

دەگێڕنەوە کە دوو سوارچاکی سەدەکانی ناوەڕاست لەلای پەیکەرێکی کۆن بەیەک گەیشتن، ئەوان لەسەر ڕەنگەکەی ناکۆکن دەبن. یەکێکیان بەزەردی دەزانێ و ئەویتر بەشینی، کەچی لەڕاستیدا لەیەک کاتدا شین و زەرد بوو، چوونکە ڕوویەکی بەشێوەیەک ڕەنگ کرابوو، کە لە ڕەنگەکەی دیکە جیاواز بوو، ئەو دووسوارچاکە

قارەمانە ئەوەستان تا لە ڕەنگی هەردوولا دڵنیابیبنەوە، هەریەکەیان دەیویست سوور بێت لەسەر ڕەتکردنەوەی بەرامبەر و ئەویتری بەهەڵە دەزانی، هەرچەندە مشتومڕ و ململانێی نێوانیان توند دەبێت، ئەوا هەریەکەیان لەسەر بۆچوونەکەی خۆی سوورتر دەبێت. ئەو ململانێیەی نێوانیان لەسەر هەقیقەتی مامناوەند دوورکەوتەوە، بەمەش بەرەو دەمارگیری و توندی دوژمنایەتی چوون. ئەمەش نەخۆشی نێوان گۆمەڵە ڕکابەرەکانە، لایەنێکیان ناتوانێ شتێك لە ئامەقی لە بیروباوەڕی خۆی بدۆزێتەوە، کاتێك مشتومڕ لە ئارادا بێت.

***

پوختەی قسەکان ئەوەیە: لۆژیکی کۆن بۆ سەردەمی ڕابردوو دەگونجا، بۆ ئەو سەردەمەمان ناگونجێت کە تێیدا دەژین، مرۆڤ لەڕابردوودا دەگمەن نەبێت لەو ژینگەیە دەرنەچووە کەتێیدا پەروەردە بووە، چونکە ئەو کات سەفەر بەشێك بووە لە جەهەنەم وەك لەپەندی پێشینانیان باسیان کردووە[21]. کەچی ئەمڕۆ گەشتکردن بەشێکە لە ئاسوودەیی مرۆڤ، زۆرجار زۆرتر لەوە ئاسوودە دەبێت ئەوەك لەناو ماڵ و خزم و خزمەتکار بێت. مرۆڤی سەردەمی ئێستا دەتوانێ بە چەند ڕۆژێکی دیاریکراو هەموو زەوی بگەڕێت. ئێزگە و ئاژانسەکانی هەواڵ دەرفەتی پێداوە بە ڕاکشاویی لەسەر جێگاکەی گوێبیستی ڕووداوەکانی دونیا بێت، چاپخانەکانیش لە چاپکراوەکانی خۆیان نقومی دەکەن و زەینی مرۆڤی ئێستاش پڕ بووە لە بۆچوون و بیرۆکە.

ڕۆژگارێکیش دێت مرۆڤ دەتوانێ لەوسەری زەوی بۆ ئەمسەری بچێت، وەك چۆن لە نێوان ماڵ و شوێنی کارەکەی هاتوچۆ دەکات، یان بەدەم نانخواردنەوە لەگەڵ ژن و منداڵەکانی سەیری سەرتاسەری دونیا دەکات. ئەو کاتە مرۆڤ خۆی لە

[21] پەندەکە بە عەرەبی بەمشێوەیەیە(السفر قطعة من سقر) سەقەر بەمانای دۆزەخ و ئاگریش دێت( وەرگێڕ)

شێوەی مێروولەیەکی بچووک دەدۆزێتەوە کە گەردیلەیەکی بچووکی هەڵگرتووە، وادەزانێ گەنجینەیەکی مەزنی بەکۆڵەوەیە. دەبێت مرۆڤیش درک بەوە بکات کە لە بەردەم سەردەمێکی نوێدایە ئەو بیرۆکە سنووردارانە دادی نادەن کە باو و باپیرانی شانازییان پێوەدەکرد.

# عەلی کوڕی ئەبو تاڵب



یەکێك لەو ڕێکەوتە سەیرانەی لە ژیانم تووشی هاتووم، ئەوەبوو ڕاستەوخۆ دوای نووسینی بەشی ڕابردوو، بەبازاڕی کتێب تێپەڕیم دوو کتێبی نوێم بینی. یەکێکیان لەبڵاوکراوەکانی کتێبخانەی سەلەفی بوو لە قاهیرە کە خاوەنەکەی ( محب الدين الخطيب ) ە ئەویتریان لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی گشتی ئەهلی بەیت بوو لە بەغدا. هەردوو کتێبەکەم کڕی هەر لە کتێبخانەکەم دانیشتم دەستم بە خوێندنەوەیان کرد، بۆم دەرکەوت لەو ئەنجامەی پێیگەیشتوون هەردووکیان دژبەیەکن. کتێبی یەکەم دەیەوێت ئیمامەتی ئەبوبەکر و عومەر بسەلمێنێ گوایە ئەوان لە عەلی باشتربوون، کەچی دووەمیان دەیەوێ ئیمامەتی عەلی و باشتربوونی عەلی لە ئەبوبەکر وعومەر بسەلمێنێ.

یەکەم دەڵێ:" یەکێتی گوفتاری موسڵمانان نایەتەدی مەگەر شیعە ملکەچی ئیمامەتی ئەبوبەکر و عومەر بن و دان بەوەبنێن کە یارانی پێغەمبەری خودا ئەو کەسانەبوون دەستیان بەشەریعەتەوە گرتووە و ئەمین بوون لە گەیاندنی شەریعەت

بەکەساتی دوای خۆیان، یاران ( سەحابە ) هەموویان دادپەروەربوون ئەگەر چی لە زانست و پێگەدا جیاوازیان لەنێوان هەبوو"[٣٣].

کەچی دووەمیان دەڵێ :" ئەمە بیروباوەڕی شیعەی دوانزەییە لە ئیمامەت، بڕواشی وایە ئاسوودەیی بۆ مرۆڤ بەتایبەتی بۆ موسڵمان نییە مەگەر لەسەر ئەوە رێککەون کە ئەو باوەڕە بەبەڵگە یەکلاکەرەوەکانی و بە بورهانە رۆشنەکانی دەیەوێت ئەوان کامەران بن و دەنگیان نەبەرد بێت ، خوا پشتو پەنامان بێت"[٣٤]. ئەگەر لە بۆچوونەکان بەدوای ئەو دوو کتێبە بڕۆین ئەوا هەرگیز ناگەینە رێکەوتن؛ چونکە هەریەکەیان لەو باوەڕەدایە کە هەق لای ئەوە ناشیەوێ لە( کەری خۆی دابەزێ )، وەك پەندە پێشینانەکە دەڵێ.

سەیر ئەوەیە نموونەی ئەو مشتومڕە چەندین جار لە سەردەمە کۆنەکان روویداوە، جارێك جاحیز وئیسکاف مشتومڕ لە بارەی ئیسلامبوونی ئەبوبەکر وعەلی دەکەن، جاحیز دەڵێ: " لەو رووە ئەبوبەکر لە عەلی باشترە، چونکە ئەبوبەکر کاتێك ئیسلام بوو، پیاوێك بوو عەقڵی پێگەیشتبوو، کەچی عەلی کاتێك بووە ئیسلام منداڵ بوو، هێشتا عەقڵی پێنەگەیشتبوو". بە بڕوای جاحیز ئیسلامبوونی پیاوێکی بە تەمەن باشترە چونکە مەینەتی دیدگا و شڵەژانی دەروون و زەحمەتی لە گۆڕینی ئاینێك دەبینین کە پێشتر لە تێگەیشتنی راهاتووە."

ئیسکاف وەڵامی دەداتەوە دەڵێ: "ئیسلامبوونی عەلی لەو تەمەنەدا باشترە، چونکە زۆربەی کات خۆشەویستی ویاری وگەپ بەسەر هاوتەمەنی عەلی زاڵ دەبێت. کەچی ئەو باوەڕی بەو بەڵگانەی دەعوە هێنا کە بۆی دەرکەوتبوون؛ بۆیە شەهوەتی خۆی سەرکوت کرد بەسەر خەیاڵی خۆی زاڵ بوو، لە نەریتی خۆی دەرچوو و خۆی لەئارەزوو پاراست، شەڕی ناخی خۆی بەخوا پەرستی شکاند " دواتر جاحیز بەشێکی درێژی بۆ جیاوازی نێوان مانەوەی عەلی لە جێگای پێغەمبەر و مانەوەی

---

[٣٣] عبدالله السویدي، مؤتمر النجف، ص٦ وغیرها
[٣٤] علي نقي الدین الحیدري، الوصي، ص٥٥

ئەبوبەکر لە ئەشکەوت لە شەوی کۆچکردن دا تەرخان کردووە، ئیسکافی وەڵامی ئەمەشی داوەتەوە.

دواتر جاحیز درێژدادڕی لە ژماردنی چاکەکانی ئەبوبەکر کردووە لە ئازایی و دەستکراوەیی ....هتد[٥٤]، ئیسکافیش بەبەراوردکردن لە ئازایی عەلی و سیفەتی دیکە وەڵامی داوەتەوە. ئەگەر خوێنەر سەیری ئەو مشتومڕە درێژە بکات، کە ئیبن ئەبو حەدید باسیکردووە لەو کۆمەڵەیە بە شێوازێکی رازیکەرانە بەڵگەی عەقڵی و نەقڵی دەهێنێتەوە کەچی کەس قەناعەتی پێ نایەت خاوەنەکەی نەبێت[٥٥]. لە بەرامبەریشدا کۆمەڵەکەی دیکە بڕوایەکی تەواوی هەیە بۆچوونی ئەو راستتر ودروستترە و لە کتێبی خوا وسوننەتی پێغەمبەر نزیکترە. من کاتێک نموونەی ئەو جۆرە مشتومڕە درێژانە دەخوێنمەوە خەیاڵی ئەوە دەکەم کە خاوەنەکانیان باوەڕیان بەهاتنی رۆژی دوایی نییە، چونکە ئەگەر بڕوایان بەو رۆژە هەبێت ئەوا مشتومڕەکەیان بۆ رۆژی دوایی دوادەخەن وکاری خۆیان رادەستی خوا دەکەن بۆ ئەوەی دادپەروەریان لە نێوان بکات. نازانم مەبەستی ئەو کەسانە لەو مشتومڕە چییە ؟ ئەگەر ئەبوبەکر وعەلی جارێکی دیکە بگەڕێنەوە ئەو ژیانە، ئەوا پاساوێک بۆ ئەو کەسانە دەدۆزینەوە کە مشتومڕ دەکەن، بەڵام ئەو دووانە لە زەمەنێکی دوورەوە بۆلای خودا گەڕاونەتەوە، ئەوان ئێستا لە بەردەستی خودا دان، ناگەڕێنەوە ئەو ژیانە ئەگەر دونیاش پڕبکەین لە مشتومڕ و رکابەری.

ئێمە کاتێک تاوتوێی مێژوودەکەین دەمانەوێ لە ئێستاو داهاتوومان سوودمەندبین، ئەمەیە ئامانجی گەلانی زیندوو لە خوێندنی مێژوو. گاڵتەجاڕییە مشتومڕ لەسەر بابەتێک بکەین ١٣ سەدەی بەسەردا تێپەڕیووە، بێئەوەی سوودێکی بۆ ئێستا و داهاتوومان هەبێت.

---

[٥٤] احمد امين، ظهر الاسلام،ج٤،ص٣٠-٣٨

[٥٥] ابن ابي حديد، شرح النهج،ج٣،ص٢٢٥-٢٨٢

پاڵەوانانی مێژوو گرنگیان نییە، تەنها لە ڕووی ئەو پرەنسیپە کۆمەڵایەتییانەوە نەبێت کە کۆششیان بۆ کردووە. بۆیە ئێمە کە توێژینەوە لە مێژوو دەکەین، دەمانەوێ ڕکابەری پرەنسیپەکان هەڵبهێنجین و پاڵەوانەکانیش دەکەینە ڕەمزی ئەو پرەنسیپانە. خودی پاڵەوان بایەخێکی نییە، بەڵکو پێگەی کۆمەڵایەتی بەوە پێوانە دەکرێت کە چەند پرەنسیپەکانی هەڵگرتووە وچەند بۆ بەدەستهێنانی کۆششی کردووەو چەند قوربانی بۆداوە.

بۆ نموونە ئێمە کاتێك توێژینەوەو لە بارەی ململانێی نێوان عەلی ومعاویە دەکەین، بەریەکەوتنێك لە نێوان دوو پرەنسیپ دەبینین، یەکێکیان ئاگاداری سامانی میللەتە دەیەوێت دەستی بەر ئەو سامانە مەزنە هەبێت، دەست بەسەرداگرتن و تەخشان وپەخشانی نەهێڵێت، کەچی ئەویتر دەیەوێ سامانی میللەت بەپێی خواستی سوڵتان و بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی دابەش بکرێت[26]. خوێندنی ئەو ڕکابەرییە بۆ ژیانی ئێستامان سوودبەخشە، چونکە ڕۆشنایی دەخاتە سەر ئەو بابەتەی کە ئەمڕۆ بەدەستیەوە دەناڵێنین لەکێشە کۆمەڵایەتی و ئابورییەکاندا. بە تایبەتی ئەمڕۆ لە قۆناغێکداین کەلێنی نێوان دەوڵەمەندو هەژاران فراوانتر دەبێت.

بەڵام زانینی ئەوەی کامیان لەبەردەم خودا باشترن عەلی یان ئەبوبەکر، ئەوە بابەتێکە پەیوەندی بەژیانی پراکتیکی ئێمەوە نییە و ئەوە بابەتێکە تەنها بۆ خودا دەگەڕێتەوە کە بڕیاری لێ بدات. چونکە لەوانەیە لەوەشتومڕە بەئەنجامێك بگەین، بەڵام کاتێك لە بەردەم خودا دەوەستین دەبینین ئەو ئەنجامەی کە لە پێناوی دا خەباتمان کردووە لە بنەڕەتدا هەڵەیە.

پێغەمبەر محەمەد دەڵێ:" خەڵك نووستوون، کە دەمرن بەئاگادێنەوە". لەراستیدا ئێمە نووستووین، یان لەژێرکاریگەری دابونەریت و ئەو پێوەرانە کە لە ژیانی دووئیامان خومان پێوەگرتووین خەوتوین[27]. کێ دەزانێ لەوانەیە ئەو جیهانە بەجێ

[26] سید قطب، العدالة الاجتماعیة في الاسلام، ص١٩٦-١٩٧
[27] علي الوردي، شخصیة الفرد العراق، ص٢٤-٢٧

بهێڵین درک بەوە بکەین پێوەرەکانمان رۆژەیی‌ەو پێوەرەکانی دیکە هەین کە جیاوازیەکی گەورەیان لەگەڵ هی ئێمە هەیە.

ئەگەر هاتوو مشتومڕی پاشخرپوونی عەلی و ئەبوبەکر لە چوارچێوەی گەران بەدوای ئەو پرەنسیپانە ئەبێت کە پەیوەندی بە کێشەکانی ئێستاماتەوە هەیە، ئەوا مشتومڕەکە سوودبەخشە و بایەخێکی کۆمەڵایەتی هەیە، بەڵام مشتومڕ لەسەر پێگەی ئەو دوو پیاوەیە لە ئایینا ئەمەش دەچێتە چوارچێوەی پەنهانی و ویژدانەوە کە کەسێك بە دڵنیایی نازانێت تەنها خوا دەتوانێ یەکلاکەرەوە و دادپەروەربێ.

شەریف رەزی لە کتێبەکەی نەهجی بەلاغە، باس لەوە دەکات یەکێك لە یارانی عەلی لە بارەی پەیوەندی عەلی بە عومەر و ئەبوبەکر و عوسمان پرسیار کردووە، عەلی بەوشێوەیە وەڵامی دەداتەوە ودەڵێ" ئەی برام لە بەتی ئەمسەدە لەو پێگەیەدا ستەمکاریی دووره، ئێمە لەوە بەرزترین و زیاتر پەیوەستین بەپێغەمبەری خوداوە، کەچی ئەو شوێنەوارە لە دەروونی کەسانی دیکە قەوم نییە، ئەوان دەروونیان پیس بووە. بڕیار بۆ خودایە و لە رۆژی قیامەت دەردەکەوێت. واز لەوە بهێنە لەوەی پەیوەندی بەتۆوە نییە. با باسی بابەتی کوڕی ئەبوسوفیان بکەین کە ماوەیە پێی پێکەنیم و دوای ئەوەی گریام، بێگومان ئەمە بابەتێکی سەیرە و خواروخێچە. ئەو قەومە هەوڵیان دا نوری خودا خامۆش بکەن و نێوانی من و ئەوان بکەن، کاتێك مەینەتییەکان لە نێوان ئێمە و ئەوان نامێنن، ئەوا من هەقم لەوان دەوێ. تۆ لەوان مەبە، دەروونت پڕ حەسرەت نەبێت، خودا دەزانێ چی دەکات"[٢٨].

ئەو قسانەی ئیمام عەلی کە لە نەهجی بەلاغەوە هاتووە، بۆچوونی عەلیمان لەبارەی خەلافەت و ئیمامەت بەروونی بۆ ئاشکرا دەکات، کەواتە عەلی بابەتەکەی لەگەڵ ئەبوبەکر و عومەرو عوسمان بۆ دادپەروەریی خودا جێ دەهێڵێ، ئەمە مەسەلەی سەرۆکایەتییە هەندێك پێداگریان لەسەر کردووە، هەندێکی دیکە لێی خۆش بوون

[٢٨] محمد عبده، نهج البلاغة، ج٢، ص٧٩-٨٠

کەواتە گرنگیەکی گەورەی نییە؛ بایەخی گەورە بە بڕوای عەلی لەململانێی معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان دایە معاویە دەیەوێت ڕووناکی خودا خامۆش بکات، کەچی عەلی لە بەدەستهێنانی هەق یان لە پێناوی دەمرێت. باشترە موسڵمانان ئامۆژگاری لەو داتایە وەربگرن کەچی ئەوان بەوە سەرقاڵن کە عەلی یان ئەبوبەکر لەلای خوا باشترە؟ بابەتی عەلی و معاویەش لە رکابەرییە کۆمەڵایەتیەکەی نێوانیانەوە لەبیر دەکەن .

ئەبوبەکر وعەلی هەردووکیان سووربوون لەسەر پاراستنی سامانی میللەت، شتێکیان بۆ خۆیان و یاران وخزمانی خۆیان نەدەبرد، ئەگەر لێرەو لەوێ هەڵەیەک بینرابێت، ئەو هەڵانە پێشبینی کراون و خوا لێیان خۆش دەبێ و خواش دەزانێ کەس نییە هەڵە نەکات. بەڵام ململانێی نێوان عەلی ومعاویە زۆر لەوە قوڵتربووە، بەزمانی ئەو سەردەمەمان دەڵێین ریشەیی بووە و پەیوەندی بەهەڵەی سادەوە نەبووە بەڵکو پەیوەندی بە چارەنوسی میللەتەوە هەبووە : ئایا لە رێگای دادپەروەری کۆمەڵایەتی دەڕوات یان بەڕێگای دەسەڵاتێکی زۆردار کە داد ویەکسانی نازانێت؟

دەستەیەک لە یارانی عەلی هاتنە لای عەلی پێشنیاریان کرد وەک معاویە بکات سامانی میللەت بۆ راکێشانی سەرۆک و خانەدانانی قورەیش و هۆزەکانی تری عەرەب بەکاربهێنێ کەچی عەلی وتی "ئایا فەرمانم پێ دەکەن سەرکەوتن بەزۆرداریی بەدەست بهێنم"[31] . خەڵک لەو سەردەمەدا بەتەواوی لە گرنگی ئەو ململانێیە تێنەگەیشتوون، مەیلیان بە دوای سەرۆکەکانیان دەڕۆیشت، سەرۆکەکانیشیان مەیلیان بەلای ئەو کەسانەوە بوو کە پارەیەکی زۆرتری پێ دەدان بەلایانەوە گرنگ نەبوو ئەو سامانە تالانە یان براوە .خەڵک لە گرنگی ئەو رکابەرییە نەگەیشتن تا سەدە نوێیەکان، کە رای گشتی پێگەیشت و گەلان وشیاربوونەوە ولێپرسینەوەیان لەگەڵ سەرۆکانیان لەسەر مەسەلەی ماڵی میللەت ئەنجام دەدا. جێگای داخە پیاوانی

[31] احمد امین، ضحی الاسلام، ج١،ص٢٣،٢٤

ئايينى تا رۆژگارى ئێستامان وەك بەگرنگى ئەو بابەتە ناگرن،ئەوان بەبابەتى بەراوردكردنى چاكەى ئەبوبەكر وعەلى سەرقاڵن. ململانێى نێوان عەلى و معاويەش بەلاوەكى دەزانن. سوننە پێيان وايە عەلى ومعاويە هەردووكيان موجتەهيدبوون؛ كەواتە هەردووكيان بە هەڵگيرسانى ئەو جەنگە لە دژى يەكتر مەبەستيان هەق بووە، دواتر سوننە دەڵێن عەلى لە ئيجتهادەكەى راست بوو، معاويە هەڵەبوو، كەسى بە ئيجتهاديش لەراستى وهەڵەدا پاداشتى هەيە. كەواتە لە ديدى ئەوان بابەتەكە تەنها پەيوەندى بەراستى و هەڵەى ئيجتهادەوە هەيە[1]. كەچى شيعە پێيان وايە مەسەلەكە ململانێى نێوان باوەڕدار ومونافيقە، دواتر بە قوڵايى ململانێيەكە ناچن بۆ ئەوەى پرەنسيپە كۆمەڵايەتيەكانى بپشكنن.

عەلى كوڕى ئەبو تاڵب لە ديدى ئەوان بۆتە ئيمامێك، خودا خۆشەويستى ئەوى لەسەر بەندەكان بەواجب داناوە، كەچى ئەو خەباتە بەهێزەى لە پێناو دادى كۆمەڵايەتى ئەنجامى داوە؛ ئەوا لەديدى شيعەكان بابەخێكى نييە. بۆ نموونە ئەوان ناسرەدينى شايان لەلا باشترە لەهارون رەشيد، بيانويان ئەوەيە كە يەكەميان سەردانى گۆڕى حوسێنى كوڕى عەلى كردووە و بەسادەيى سەرى دانەواندووە فەرمانى چاككردنى گۆڕەكەى داوە، بەڵام دووەميان زيارەتكەرانى گۆڕى حوسێنى ئەزيەتداوە و ئەوەى عەلى چەوساندۆتەوە[2].

كەچى لەراستيشدا شاە جياوازيەكى لەگەڵ هارون رەشيد نەبووە؛ لە بابەتى سامانى ميللەت كە خودا فەرمانى داوە لەخاوەنە راستەقينەكانيان خەرج بكرێت، هەردووكيان سامانى ميللەتيان بردووە و كەنيزەيان پێ كڕيوە ودواتر لە ترسى خودا گرياون. لە كاتى گەشتەكەم بۆ ئێران كۆشكێكى شام بينى هيچ جياوازييەكى لەگەڵ كۆشكەكانى هارون رەشيد نەبوو، كە كتێبەكانى مێژوو باسى دەكەن. ئەو كاتە قسەى ئەبوزەرم بيركەوتەوە كە بەمعاويەى وت كاتێك بينى كۆشكێكى مەزن دروست

[1] ابن خلدون، المقدمة، ص٢١٤-٢١٥
[2] محمد صالح القزويني، الموعظة الحسنة،ج٢،ص٤٠

دەكات وتی " ئەگەر ئەمەبە پارەی خاوەنەكەی بێت دەستبڵاوییە، ئەگەر بەپارەی میللەتیش بێت ئەوا خیانەتە" .

من كاتێك ئەو دوو كتابەم خوێندەوە كە لە سەرەتای ئەو بەشە باسم كردن، بۆنی تووێژینەوەم لە بارەی پرەنسیپە كۆمەڵایەتییەكان نەكرد. ئەویان دەڵێ: " عەلی شایەنی خەلافەت بوو نەوەك ئەبوبەكر " ئەمەی دیكەیان دەڵێ: " ئەبوبەكر شایەنی بوو" كەچی رەعیەتی بەسەرزمانیش كە خوازیاری دادپەروەرییە لە دەسەڵاتدارەكانی، بەداخەوە لە هەردوو كتێبدا بێدەنگە. لەوانەیە كەسێك نارەزایی دەربرێت و بڵێ " لە بەشی رابردوودا گوتمە هەردوو كۆمەڵێ ركابەر لەیەك كاتدا هەق و ناهەقن، چونكە هەریەكەیان سەیری روویەكی هەقیقەت دەكات و رووەكەی دیكە فەرامۆش دەكات، ئەی بۆچی لایەنی هەق دەخەیتە پاڵ عەلی و ناهەقیش دەخەیتە پاڵ معاویە ؟".

لە راستیدا ئەمە نارەزاییەكە بەهای خۆی هەیە، خوێنەر بەوردی لە بەشەكانی داهاتودا وەڵامەكەی دەست دەكەوێت. لێرەدا تەنها ئەوەندە دەڵێم ئەوەی لە بەشی رابردوودا باسم كرد، تەنها بەسەر ركابەری تەقلیدیی جێ بە جێ دەكرێت كە بیروباوەڕەكانی بەسەرزاڵە، بەشێوەیەك هەر كۆمەڵێك لەچوارچێوەی هزری خۆی سەیری هەقیقەت دەكات و هەستیش بەو چوارچێوە داتراوە ناكات.

كەچی ركابەریی نێوان عەلی ومعاویە جۆرێكی دیكەیە لە شێوەی ئەو ململانێیەیە كە لە نێوان كاروانچی وچەتە روودەدات، ئەمە بوار نادات بڵێین چەتەكان لە رووبەڕووبونەوەی كاروانەكە ئیجتهادیان كردبوو، بۆیە روویەك هەقیقەتیان لەلا بوو.

ساماتی میللەت هەر بۆ میللەتە، محەمەد وئەبوبەكر وعومەرمان بینی شەرمیان لەوە دەكرد شتێك لەو سامانە بۆخۆیان و كەسوكاریان ببەن، هەریەكەیان تامردن لە دونیادا جگە لە كراسێكی بە پینەو نەعلێكی چنراو هیچی تریان نەبوو.بۆیە لێرەدا بوارێك بۆ ئیجتهادكردن و پێچەوانەی ئەو بۆچوونە نییە. لە بەشی داهاتوودا باس لە فەلسەفەی توێی دیموكراسی دەكەین، كە چۆن باوەڕ بە هەقیقەتی رەها ناكات و لە

بڕی ئەو باوەڕی بەو هەقیقەتە هەیە کە زۆرینەی خەڵک دەیبینن. ئەمڕۆ ئێمە دەنگی دەنگدەران هەژمار دەکەین و مەیلمان بەلای زۆرینەی دەنگەکانەوە هەیە، ئەوان سەرچاوەی دەسەڵاتن و تەنها مافی خۆیانە کارەکانی خۆیان بەڕێوەبەرن، کەچی ئەگەر یەکێك هاتوو وتی ئێوە هەڵەن و من ئیجتهادم کردووە کەوا چاکترە سامانی ئێوە لە ئارەزووەکانی خۆم خەرج بکەم ،بێگومان ئەو کاتە خەڵك وەڵامێکی بۆ ئەو کەسە نییە تەنها ئەوە نەبێت دەیخەنە زیندانەوە. فەقیهەکان پێشتر دەیانگوت " لە کاتی بوونی ئێکست هیچ ئیجتیهادێك ناکرێت " ئێستاش دەتوانرێت بگوترێت ئەوەی زۆرینەی میللەت بڕیاری لەسەر دەدات ئیجتهادی بۆ ناکرێت.

لێرەدا لەوانەیە نارەزاییەکی دیکە بێتە بەردەم قسەکانمان و بگوترێت زۆرینەی میللەت پشتیان لە عەلی کرد کە دەیویست دادپەروەری کۆمەڵایەتی بەدەست بهێنێ. کاتێك ئەو کوژرا ژمارەیەکی کەمی لایەنگرە دڵسۆزەکانی نەبێت کەسی دیکەی لەگەڵ نەبوو لەم بارەیەوە چی دەڵێی ؟

دەڵێم : بێگومان ڕێگای عەلی بە پێی بەرژەوەندی زۆرینە بوو، بەڵام کاتێك زۆرینە بەرژەوەندی خۆیان نەزانیوە ئەمەیان بابەتێکی دیکەیە. سیستەمی زۆرینە کە دیموکراسیەتی نوێی لەسەر بنیادنراوە دوای بە جێهاتنی چەند مەرجێك دەبێت کە گرنگترینیان : بڵاوبونەوەی فێرکردن و هۆشیاری رای گشتیی و دروستبوونی حیزبی نوێ و بەرزبوونەوەی پێگەی ڕۆژنامەوانی ...هتد ،لەگەڵ ئەوەشدا ئەم سیستەمە هێشتا کەم و کوڕی زۆرە .

هەرکاتێك وشیاری خەڵك زیاتر بوو و فێربوون بڵاوبۆیەوە تواناي زۆرینە لە زاڵکردنی بۆچوونەکانیان بەسەر دەسەڵاتداران زیاتر دەبێت ،کەچی لە سەردەمی عەلی کوڕی ئەبو تالب کۆمەڵگا ( بەدو ) بووە زۆرینەش هۆزەکی بووە، سەرۆکی هۆز بە خواستی خۆی قسەی دەکرد، زۆرجاریش تاکەکان بەدوای سەرۆکەکانیان دەڕۆیشتن و زەرەرمەند دەبوون هەستیان پێ نەدەکرد.

عەلی خەڵکی سەردەمی خۆی بەو شێوەیە وەسف کردووە دەڵێ: " خەڵك سێ جۆرن، زانای ڕەبانی و زانایەك لە پێناوی نەجاتبوون، ئەوانی دیکەش هەمەجی و بودەڵەن، لەگەڵ هەر قیڕەیەك دەقیڕێنن و لەگەڵ هەربایەك دەچەمێنەوە ".

وەك دەردەکەوێت ئەو وەسفە تا ئەمڕۆ بۆ زۆربەی وڵاتانی ئیسلامی دروستە کەواتە کاتێك ئێمە مێژوو دەخوێنین دەبکەینە هۆکارێك بۆ ڕۆشنبیرکردنی خەڵك و ڕێگایەکە بۆ هاوکاریکردنی ئەوان لە چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی هێشتا پەدەستیەوە دەناڵێنن، کەچی ئەمڕۆ موسڵمانان وەك بینیمان مێژوو دەخوێنن بۆ ئەوەی بزانن فڵان ئازاترو زاناترو باشتربووە لە فڵان، بەمەش هیچ زێدەییان بۆ بابەتەکە نییە، خۆشیان بێباکانە لە بارودۆخێکی کۆمەڵایەتی خراپدان، هەوڵیش نادەن سوود لەو وانە بە هێزانەی مێژوو وەربگرن .

ئەوان کاتێك باس لە ژیاننامەی پیاوانی مێژوو دەکەن شتێك نازانن تەنها ئەوە نەبێت کە فڵان شەهید بوو( خۆزگە لەگەڵی دەبووین ) فڵان موناfیق بوو ( نەفرەتی خوای لێبێت ) کەچی ئەوان لە هەردوو ئاراستەدا درۆ دەکەن، ئەوان وەك پێشینەی خۆیان بەزمان دادپەروەریان دەوێت و بەکردار لێی رادەکەن .

دەگێڕنەوە پیاوێك زۆر بۆ حوسێنی کوڕی عەلی گریاوە، هەرجارێك بگریایە دەیگوت " خۆزگە لەگەڵی دەبووم سەرکەوتنێکی مەزنم بەدەست دەهێنا "وا ڕێککەوت حوسێنی لە خەو بینی بەتەنیا بوو هەر چواردەوری دوژمن بووە، هاوار دەکات کەسێك بەهانای نایەت، پیاوەکە سەیری ئەو سوپا زۆرو زەوەندە دەکات کە ئابلۆقەی حوسێنی داوە لەکەربەلا، شمشێر دەبریسکێتەوە، گۆڕەپانی جەنگیش پڕ بوو لەلاشەو خوێنی لێدەچۆڕی، ئەو کاتە هەستی بە گەورەیی ئەو مەترسیە کرد کە لەسەر حوسێن و ئەو کەسە هەیە کەدەیەوێت پشتگیری بکات، پیاوەکە سەری خۆی دادەنوێنێ و لە نێو گردەکان رادەکات، نەوەك حوسێن بیبینێ وداوای پاڵپشتی لێ بکات.

بەڵام حوسێن دەیبینێ وداواکەی لێ دەکات وشمشێر وقەڵغانێکی پێ دەدات بۆ ئەوەی پاڵپشتی بکات، هەرکە ئەو هاوڕێیەمان شمشێر وقەڵغانەکە وەردەگرێت رادەکات و لە هیچ شتێك ناگەرێتەوە، واتە ئەو تەنها حوسێنی نائومێد نەکرد بەداخەوە بەڵکو شمشێرو قەڵغانەکەشی دزی .

بۆ ئێمە گونجاو نییە بەو بەستەزمانە پێ بکەنین یان پێی سەرسام بین، هەموومان وەك ئەوین. دەگمەن یەکێك دەست بەپرەنسیپەکان دەگرێت کاتێك مەسەلەکان دەگەنە حاڵەتی تەنگەژەیی.هەموومان کاتێك وتاردەخوێنینەوە مشتومڕدەکەین و شیعر دەخوێنینەوە بانگەشەی هەقیقەت دەکەین. ئێمە ئەو کارەدەکەین لە ناخەوە بڕوامان بەوە هەیە کە ئەو قسانە دروستن زیان وبەرپرسیارێتی تێدانییە، بەڵام کاتێك بارودۆخەکە جددی دەبێت و هەقیقەتەکە دژی بارودۆخەکەی ئێمە بێت، ئەوا پەنا دەبەینە بەر تورەگەکەمان کە پڕیەتی لە بەڵگەی عەقڵی و نەقڵی، ئەوەشیان هەڵدەبژێرین کە لەگەڵ هەڵوێستی ئێمە گونجاو بێت و بەو شێوەیەش هەقیقەتیش وێنادەکەین بە پێی رەزامەندی ئێمە بێت. دواتر ئەمە لە بیر ناکەین کەسەر لەنوێ دەست بەخوێندنەوەی قەسیدەکان بکەینەوە .

خەڵك لە سەرەتای ئیسلامدا قورئانیان دەخوێند ولە ترسی خودا فرمێسکیان دەڕشت زیاتر لە ئێمەش پەیوەست بوون بەرێنماییەکانی ئیسلام و زیاتر خۆشەویستیان بۆ دادپەروەریی و یەکسانی هەبوو، کە پێغەمبەر محەمەد هێنابووی، بەڵام کاتێك بینیمان عەلی کوڕی ئەبو تالب ئەو رێنمایانە بەکلاکەرەوە پەیرەودەکات و بنەماکانی دادپەروەری بێ دوودڵی دەچەسپێنێ، ئەوا لێی دوورکەوتنەوە وپشتگیری دوژمنانی عەلییان کرد.

بۆیە عەلییان وەك حوسێنی کوڕی لە دوا رۆژی ژیانی بەتەنیا بینی. لە هەموو لایەکییەوە مرۆڤە گورگ ئاساکان دەیان لوراند. کاتێك ئیبن ملجم شمشێرەکەی لە سەریدا وتی " سوێند بەخوای کەعبە سەرکەوتم " لە راستی دا ئەو بەو لێدانە سەرکەوت لەو دونیایەدا نەجاتی بوو، دوای ئەوەی وانەیەکی دایە مرۆڤایەتی کە لە

بیرناکرێت ئەویش ئەوەیە خەڵك بەگوفتار هەقیقەتیان دەوێ، کەچی بەکردار رقیان لێیەتی.

عەلی کوڕی ئەبو تالب بە دادپەروەرییەکەی موسڵمانانی لە یەکتر جیاکردەوە، ئەمەش وەك هەر دادپەروەردەیەکی یەکلا کەرەوەیە کە کۆمەڵەکان هەر شوێن و کاتێك لە یەکتر جیادەکاتەوە[٤٦]. موسڵمانان ئەمڕۆ پێیان وایە ئەگەر عەلی کوڕی ئەبوتالب ببینن، ئەوا بەدەوری کۆدەبنەوە و پاڵپشتی دەکەن و لێی جیانابنەوە، بەمەش ئەوان فێڵ لە خۆیان دەکەن. ئەگەر ئەمڕۆ یەکێك لەنێوانمان وەك عەلی هەڵکەوت خەڵك بەیەکسانی ببنێ و لەگەڵ خاوەن پێگەو دەسەڵات نەرمی نەنوێنێ پارەی میللەت لەیاران و لایەنگران نەدات و موجامەلەی کەس نەکات و چاوپۆشی نەکات، ئەوا لێی جیادەبنەوە وەك پێشینیان ئەنجامیان دا ئەوا دونیای لەسەر وێران دەکەین وهەموو ئەو تۆمەتانەی دەدەینە پاڵ کە لە فەرهەنگ دەیاندۆزینەوە. لەو بڕوایەم دوژمنترین کەس لە نێو ئەو خەڵکە دەبێ کە باسیان لە خۆشەویستی ئەو دەکرد وبە گۆرانی ستایشیان دەکرد، فەرەزدەق لە کۆنەوە بە حوسێنی کوڕی عەلی وتووە " دڵی خەڵك لەگەڵ تۆیە شمشێریشیان لەسەر تۆیە ".

***

بۆچی بچینە مێژوویەکی دوور، با گریمانەی ئەوە بکەین لە لای ئێمە کاتێك وەزیرێك هەیە لە بەڕێوەبردنی کارگێڕی و سیاسیی لەسەر ڕێگای ئیمام عەلی دەڕوات، ئەو لە دادپەروەری زۆر توند دەبێت پاراتەوەو واسیتە قبوڵ ناکات، چەندین پیاوی خاوەن سامان و پێگەو دەسەڵات سەرۆك عەشیرەت دێنە لای چەندین تەلەفۆن ونامەی راسپاردەی بۆ دێت، ئەویش هەموویان رەتدەکاتەوە و بایەخ بەهیچ شتێك نادات هەق نەبێت.

[٤٦] علي الوردي، وعاظ السلاطين، ص٢٠٧

نابێت ئەوەش لەبیرکەین هەموو خاوەن پێویستیەکان خۆیان بە خاوەن ماف دەزانن، بۆیە کاتێک دێتە لای وەزیر پاساوی خۆیان هەیە، یەکێک لەوان دایکی نەخۆشە دەبێت چاودێری بکات. بۆیە دەبێت بگوازرێتەوە بەغدا بۆ ئەوەی لەلای دایکی بێت. دووەمیان ئەویش لە خێزانەکەی دوورە. سێیەمیان ستەملێکراوە و قوربانی زۆرداریی رژێمی پێشووە. چوارەم ژنەکەی مردووە منداڵی جێهێشتووە. پێنجەم دەیەوێ خزمەتی میللەت بکات. شەشەم دەیەوێ لەپێناوی نیشتمان بتوێتەوە ...هتد، چەندین پاساوی ڕەوای دیکە کە وەزیر ناتوانێ ڕەتیان بکاتەوە، ئەگەر ڕەتیشی بکاتەوە لە دیدی ئەوان ستەمکارییە و نەفرەتی خوای لێکراوە .

ئەوەی کێشەکە ئاڵۆزتر دەکات هەریەکێک لە خاوەن پێویستییەکان کاتێک دێتە لای وەزیر زەبەلاحێکی سیاسەت و ڕۆژنامەوانی و بازرگانی و زانست و ئەدەب لەگەڵ خۆی دەهێنێ، ئەگەر وەزیر ڕەتیان بکاتەوە ئەوا زمانەکان بەدوای کەموکوڕییەکانی دەگەڕێن بۆ یانە ودانیشتەکان. پێدەچێت لەو زێدەڕۆییانەی بەهای وەزیرەکە کەم دەکەنەوە وله کەسایەتی کەم دەکەنەوە.

هەرچەندیش ئەو وەزیرەی گریمانەمان کردووە بمێنێتەوە ئەوا دوژمنەکانی زۆردەبێت و لایەنگرانی کەم دەبێت، تا دەگاتە ئەو ڕۆژەی سەیری ڕاست وچەپی خۆی دەکات لایەنگرێکی نییە جگە لە خودا، وەک دەزانین خودایەش سەبرێکی بێ سنووری هەیە .

ئەگەر ئێستا ئەبوبەکر وعەلی دەریکەوینەوە بە موسڵمانان بگوترێت: یەکێکیان هەڵبژێرن دەبینین موسڵمان واز لەهەردووکیان دەهێنێ و رادەکەنە لای معاویەی هاوڕێیان، چونکە لە لای ئەو خوانی چەوری خۆشگوزەرانی ڕۆژروزەوەند هەیە. معاویە بەکۆشکە فراوان و خوانە ئاوەدان و ماڵە زۆرەکانی لە دڵی ئەوان لە عەلی وئەبوبەکر و هەردەسەڵاتدارێکی دیکە نزیکترە کە لەناو خەڵک دادپەروەر بێت .

عەقیلی برای عەلیمان بینی کە چۆن لە عەلی رایکرد دوای ئەوەی بینی وەک خەڵك بەشی دەدات. ئەو خانەدانێکی قورەیشە، کەچی لە وەرگرتنی بەخشش لە لای عەلی

جیاوازییەکی لەگەڵ بەندەیەکی حەبەشی نییە، بۆیە دواجار عەقیل چووە لای معاویە و وتی " براکەم لەئاین بۆ من باشترینە، بەڵام لە دونیادا معاویە باشترینە"[43].

عەبدوڵڵا کوڕی عەباسی ئامۆزای عەلی خەریک بوو هەمان شتی کرد کاتێک بینی عەلی لێپرسینەوەیەکی وردو پێداگری لەسەر پاراستنی ماڵی میللەت هەیە، ئەوا ئەو سامانی بەسری برد و چووە مەککە لەوێ سێ کەنیزەی چاو جوانی کڕی و دواتر نامەیەکی بۆ عەلی نارد دەڵێ:" ئەگەر بە ئەمانە واز لە من نەهێنی ئەوا ئەو پارەیە دەبەمە لای معاویە، تا بەو پارەیە لەگەڵت بجەنگێ"[44].

هەندێك خەڵك گومان لە راستی ئەو چیرۆکە دەکەن، بەڵام من بەراستی دەزانم. تکام وایە ئەوەی گومان لەو چیرۆکە دەکات با سەرەتا خۆی بپشکنێ ئەوجا دیقەتی بابەتەکە بدات. ئێمە رۆژانە بەجۆرێك لە جۆرەکان ململانێی نێوان عەلی و معاویە دەبینین، کاتێك دەبینین دوو پیاو لە ململانێ دان یەکێك خۆشگوزەران وشتێك داوەت سازدەکات و مریشك سەردەبڕێت ئەویتر رووت ورەجاڵ لە دونیادا شتێکی نییە ئەو مەقیقەتە نەبێت کە داکۆکی لێدەکات ئایا پشتگیری کامیان دەکەیت ؟

هەموومان بانگەشەی ئەوە دەکەین کە هەقمان خۆشدەوێت و لە ناخمانەوە پشتگیری دەکەین، کەچی لە راستیدا تەنها مەبەستمان ئەو هەقە شیعرییەکە دەیڵێینەوە بێئەوەی سنوورەکەی لە ژیانی پراکتیکی بزانین، بەڵام هەقی یەکلاکەرەوە ئەوەی هەڕەشە لە بەرژەوەندییەکانمان دەکات ئەوا ئێمە دوورترین کەسین لەو هەقیقەتە.

ئەوەی جێگای سەرنجە ئەمڕۆ موسڵمانان عەلی کوڕی ئەبو تالیبیان خۆشدەوێ، هەندێك کەم، هەندێك زۆر، هەندێك تارادەی هورێنە زێدەڕۆیی لەخۆشەویستی عەلی دەکەن. لەو سەردەمەدا کەسێك نییە رقی لەعەلی بێت، تەنها تایفەیەکی بچووکی پاشماوەی خوارج نەبێت کە لە شوێنە دوورەدەستەکان دەژین. رەنگە یەکێك

[43] عباس العقاد، عبرية الامام،ص٥٠
[44] طه حسين، الفتنة الكبرى، ج٢،ص١٤٢

بپرسێت " ئەگەر خەڵك كاتێك عەلی لە ژیان مابوو ڕقیان لێبوو، پشتیان تێكرد، هۆكاری چییە لە دوای مردنی خۆشیان دەوێ و زێدەڕۆیی لە خۆشەویستی ئەو دەكەن؟ "

پەندێكی عەرەبی هەیە دەڵێ: " ئەگەر بەهای من نازانی بڕۆ كەسی دیكە تاقی بكەوە" بەڵام ئەو پەندەش تیۆری سۆفیەكانمان بەبیر دێنێتەوە كە دەڵێ: " شتێك ناناسرێت بە دژەكەی نەبێت ". خەڵك بەسەرۆكەكانیانەوە بۆلای معاویە ڕۆیشتن و عەلیان جێهێشت، ئەوان وایاندەزانی ئەو بابەتە سادەیە جیاوازی نێوان دوو سەركردەیەكە لەسەر یەك ئایینن و یەك جۆرە نوێژدەكەن و یەك كتێب دەخوێنن .

بەڵام بەدوای تێپەڕبوونی ڕۆژگار بۆیان دەركەوت كە بابەتەكە لەمە قوڵترە، ئەوان بینیان سیاسەتی عەلی بۆ ماوەیەكی درێژ بۆ ئەوان سوودبەخشتر دەبوو، كەچی سیاسەتی معاویە لە ڕواڵەت بریقەدارو تەفرەدار بووە كەچی لە ناوەخندا ژەهرێكی تێدایە خێرا دەتكوژێت. تەنانەت ئەو دەوڵەتەی معاویە دایمەزراندبوو دەوڵەتێكی نەتەوەیی – چینایەتی بوو، بەر لەوەی ئیسلامی ودیموكراسی بێت، ئەو دەوڵەتە رەعیەتی بۆ سەر چینی جیاواز دابەش دەكرد، بە پێی ئەو دەوڵەتە قورەیش لە هەموو عەرەب باشتربووە، عەرەب لە هەموو موالیەكان باشتربوو، مەوالیەكان لە ئەهلی زمە باشتربوون كە چارەنوسیان دۆزەخە. كەچی سیاسەتی عەلی پێچەوانەی ئەمەبوو، وەك بینیمان بەزەیی بۆ خەڵكی ئاینەكانی دیكە هەبوو وەك موسڵمانان مامەڵەی لەگەڵ دەكردن، جیاوازی كردنیشی لە نێوان عەرەب و موسڵمانانی دیكە هەر لەخەیاڵی عەلی نەبووە .

سەبارەت بە كافرەكانیش، نەیدەویست بەر لە جەنگی ستەمكارە موسڵمانەكان بەرەنگاری ئەوان ببێتەوە، لەبەر ئەمە دانیشتنەكانی لە مزگەوت تێكەڵەیەك بوو لە چەند گەل ورەنگ پێكهاتبوو، ئەو تاكەوپەڕی لەگەڵیان سادەبوو. تەنانەت دەگوترێت هەندێك كاتی لە لای بەقاڵێكی فارس بەڕێ دەكرد كەناوی مەیسەمی خورمافرۆش

بوو، زۆرجاریش ئەگەر مەبەسەم کارێکی هەبوایە ئەوا عەلی لە شوێنی ئەو خورمای دەفرۆشت.

بەڵام کاتێک معاویە دەڕۆیشت ئەوا کیسرا ئاسا کەژاوەیەکی مەزنی لەگەڵ دەڕۆیشت، کاتێک دادەنیشت چەندین دەرگەوان وپاسەوانی شمشێرلەشان دەوریان دەدا، خوانەکەی پڕبوو لە خواردنی نایاب، ئەنها کەسانێک لە چینە باڵاکان بە پلە لەگەڵی دادەنیشتن. خەڵکیش لە رێزگرتنی ئەو جۆرە دیمەنانە راهاتوون پێیان باشترە رێز لە خاوەنەکەی بگرن زیاتر لە پیاوێک کە جلی پینەداری پۆشی بێت وقسەکانی باوەڕپێ لە خواپەرستی بێت. من پێموانییە خەڵک لەو سەردەمانە جیاوازیەکی ئەوسەردەمەی عەلی هەبێت، میکیاڤیللی لەئامۆژگاریەکانی بۆ میر دەڵێ: "واباشترە بۆ میر بەرێزو شکۆمەند بێت, لە بری ئەوەی خۆشەویست بێت"[٤٥]، مەبەستی میکیاڤیللی ئەوەیە ئەو میرەی لە کۆمەڵگای وەک ئێمە و کۆمەڵگای کۆن دەژیت، خەڵک دەتوانن لە بەرامبەری بوەستنەوە وسەرپێچی فەرمانەکانی بکەن ئەگەر خۆشەویست بێت, بەڵام ئەگەر بەرێزو بەشکۆبێت ئەمەیان بۆ ناکرێت.ئەو خەڵکانەی لە سەردەمی عەلیش دەژیان بەهایان بۆی نەبوو؛ کاتێک مرد کەسانێک هاتنە سەرتەختی دەسەڵات بەقیز وزۆردار بوون، ئەو کاتە خەڵک هەستی کرد ئەوان بەمردنی عەلی زەرەرمەند بوون و قەرەبوو ناکرێتەوە.

چارەنووس وای رێکخست دوای مردنی عەلی بە ماوەیەکی کورت پیاوێک حوکمڕانی عێراقی کرد کە بە ستەمە زۆرو دڵڕەقییەیەکی لەرادەبەدەر ناسرابوو، ئەویش حەجاج کوڕی یوسفی سەقەفی بوو کە دەتوانین بە ( نمونەی رۆژهەڵات ) ی ناوببەین.

سەرەڕای زوڵم و زۆرداریی، حەجاج زۆر رقی لە عەلی و شیعە بوو؛ بۆیەش بەتوندی راوی شیعەکانی دەنا وئازاری دەدان ولە قەد خورما هەڵیدەواسین. بەشێوەیەک پیاو هیوای دەخواست پێی بڵێن زەندیقی یان کافر، بەڵام پێی نەگوترێت تۆ عەلی کوڕی

---

٤٥ Machiavelli.the prince..p61

ئەبو تاڵیبت خۆش دەوێ، بۆیە ستەملێکراو زۆرجار وەک سروشت و پەناگەیەک بەکاری دەهێنا ناوی عەلی ببووە دەرمانێک ستەملێکراو بۆ برینی دڵی بەکاری دەهێنا. حەجاج لە پەها کۆمەڵایەتییەکانی دا (بەدو) بوو، هەربۆیەش زیاتر بایەخی بەخەزنەداری دەدا، زیاتر لەوەی بایەخ بە ئاوەدانکردنەوەی زەوییەکان بدات. ئەم سیاسەتەش بووە هۆی کاولبوونی کوفە وئابوورییەکەی، بۆیەش خەڵک کۆچیان دەکردو روویان لە زەوییە فراوانەکانی دیکە دەکرد، لەگەڵ خۆشیان ناڵەی خۆیان لە بەرامبەر زۆرداران دەردەبڕی[٤٦].

ئیبن خوردازبە دەڵێ: خەراج لە سەردەمی حەجاج لە رووی ستەم وسەرپێچییەکەی داڕمابوو[٤٧]. تەبەری باس لەوەدەکات یەزید بن مهلب رەتیکردەوە ولایەتی عێراق دوای حەجاج وەربگرێت یەزید "وتویەتی حەجاج عێراقی وێران کردووە، منیش بچمە عێراق ئەگەر خەراج بهێنم ئەوا لە شێوەی حەجاج دەبم ".عومەر کوری عەبدولعزیز لەماوەی حوکمڕانییە کورتەکەی نامەیەکی بۆ والی کوفە نوسیوە دەڵێ: "سەلامت لێبێت ،.... دواتر، خەڵکی کوفە بەڵایەکی سەختی بەسەر هاتووە زۆرو زۆرداری دەست فەرمانڕەواکانی خوداو لایەنگرانی بینیوە کە بەدکارەکان ئەنجامیان داوە ".

دکتۆر محەمەد عبدولعال کاتێک سەرنجی خۆی لەبارەی بارودۆخی خەڵکی عێراق دەدات لە سەردەمی ئەمەوییەکان و باسی بارودۆخە خراپەکەی دەکات دەڵێ: "..... ئەو قەیرانە ئابوورییانەی کە ماوەیەک درێژە دەکێشێ عەقڵ لاوازدەکات، دەیکاتە نێچیری مەزهەبە وێرانکەرەکان، کە بۆ خەڵک دەدرەوشێنەوەو بەڵێنێکی ژیانێکی خۆش دەدەن "[٤٨]. وەک دەردەکەوێت مەبەستی دکتۆر عبدولعال لە مەزهەبە وێرانکارەکان، ئەو مەزهەبانە بێت کە بانگەشەی شۆڕش دەکەن لەراستیشدا عێراق بەشێوەیەکی گشتی،و کوفە بەشێوەیەکی تایبەت لەو ماوەیەدا وەک ئاگردانێکی

---

[٤٦] ابن ابي حديد، شرح النهج، ج٣،ص١٥
[٤٧] ابن خرداذبة، المسالك و الممالك،ص١٥
[٤٨] محمد جابر عبدالعال، حركة الشيعة المتطرفين، ص٢٤

کۆمەڵایەتی بووە، ناوە ناوە بۆ شۆڕشێکی سەرکێش کلپەی کردووە. هەر لەبەر ئەم هۆکارەش بووە دەسەڵاتدارانی عێراقیان بەوڵاتی دووبەرەکی ودووڕوویی وەسف کردووە .

ئەوەی لێرەدا شایەتی ئاماژە بۆ کردنە ئەوەیە کە زێدەڕۆیی لە باوەڕ، ڕەوتێکی شۆڕشگێڕی لەگەڵ خۆی دەهێنێ هۆکارەکەش ئەوەیە باوەڕی سەنگین و میانڕەو لە سروشتی خۆی دا ساردە، خەڵك بەرەو بزاڤ هان نادات. هانیان نادات تا سەرکێشی بکەن و لە پێناو ڕێبازەکانیان ڕووبەڕووی مەترسی ببنەوە. بۆیە ئەگەر تاقوێ زۆرینەی ئەو شۆڕشانە بکەین کە لەو ماوە کورتە ڕوویان دا، دەبینین زۆربەیان زێدەڕۆییان لە بیروباوەڕکردووە.

وەك دەردەکەوێت یەکەم کەس کە ئەم جۆرە باوەڕانەی کردۆتە چەکی شۆڕشی خۆی موختار کوڕی عوبەیدەی سەقەفی بووە چەندین چیرۆکیش لە بارەی ئەو پیاوە دەگێڕنەوە کە ئێمە بە تەواوی ناتوانین لە ڕاستییان دڵنیابینەوە ئەوە زانراوە کە کورسیەکی بۆ لایەنگرانی هێناوە گوتویەتی ئەمە کورسی ئیمام عەلییە و پاسەوانیشی بۆ کورسیەکە داناوە، هەندێکجار کۆتری بەرەڵاکردووە بەسەر لایەنگرەکانی گوایە ئەمانە فریشتە هاتوون پشتگیری سەربازەکانی بکەن.

خەڵك هاتووە دەستی لێداوە گوایە کورسیەکە پیرۆزە و لە سوپا لەکاتی جەنگاکان لە پێش خۆیان هەڵگرتووە. دەگوترێت موختار بانگەشەی ئیمامی بۆ یەکێك لە کوڕەکانی ئیمام عەلی کردووە. ئەویش محمد بن حەنەفیە و مەزەندەی ئەوە کراوە گوایە مەهدیە، توندڕەویی لە لایەن خەڵکەوە زیاد دەبێت کاتێك ستەمیان لەسەر زۆر بێت ، ئەو زێدەڕۆییە گەیشتە حاڵەتێك هەندێك باوەڕیان بە گەڕانەوەی عەلی هەبوو گوایە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئیسماعیل کوڕی موسلمی مەککی لەکوفە بووە دەبینێ کەسانێك لە دراوسێکانی زۆر هاموشۆی ماڵێك دەکەن گوایە پیاوێکی تێدابوو بە عەلی کوڕی ئەبوتالیبیان زانیوە، ڕۆژێك ئیسماعیل لەگەڵ خەڵك دەچێتە ژوورەوە تامچیەکی پێبووە لە ژێر جلەکانی دەیشارێتەوە، دەبینێ پیاوێکی ورگنی کەچەڵ

دانیشتووە بانگەشەی ئەوە دەکات ئەو عەلیە گەڕاوەتەوە ژیان، ئەو کاتە ئیسماعیل قامچییەکەی دەردەهێنێت و لێی دەدات پیاوەکە هاوار دەکات ( لتاوی ، لتاوی ) ئەمە وشەیەکی تیتیە بۆ فریاکەوتن بەکاردێت، ئەو کاتە ئیسماعیل هاوار بەسەرخەڵکەکە دەکات و دەڵێ: " ئەی بەدڕەوشتینە عەلی کوڕی ئەبو تاڵب تیتی بوو ؟ ".

ئەوان زوڵم لێکراون زوڵملێکراویش بۆ ئەجاتبوون دەست بەلاوازترین هۆکار دەگرێت و عەقڵیش لەوکاتەدا دەسەڵاتی بەسەرەوە نابێت .هەرچەندە شاوازی تەمیووری سەردەمی ئەمەوی لە زەمکردنی عەلی و جنێودانی لەسەر مینبەر زیاتر دەبوو، ئەو خەڵکە زیاتر دەستیان بە خۆشەویستی ئەو چاکەکانی دەگرت .

هاوینی رابردوو لەگەڵ هاوڕێیەکم لە کۆڵانەکانی تاران دەخولاینەوە، بینیمان لەسەر دەرگای یەکێك لە مزگەوتەکان نوسراوە " ویلایەتی عەلی قەڵای منە،ئەوەی بچێتە ناو قەڵای من لە ئازاری من دووردەبێت " هاوڕێیەکەم ئەو نوسینەی بە قێزەون زانی گوایە لەگەڵ عەقڵی دروست ناگونجێت، بەبڕوای ئەو ماقوڵ نییە مرۆڤ تەنها بەخۆشەویستی عەلی و پشتگیری ئەو لە سزای خوا دوور دەبێت.

ئێمە گاڵتە بەو گوزارشتە دەکەین ئەگەر بەدیدی سەردەمی ئێستامان سەیری بکەین، بەڵام ئەگەر بەدیدی ئەو سەردەمە سەیری بکەین کە ئەو گوزارشتەی تێدا باوبووە ئەوە بە ماقوڵی دەزانین. جا ئەگەر بیرۆکەکە لە چوارچێوەی مێژووی خۆی داماڵین ئەوا شایەنی گاڵتە پێکردن دەبێت .

لە راستیدا ( ویلایەتی عەلی کوڕی ئەبو تاڵب ) لە سەردەمی خۆی دروشمێك بوو ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی و مانای سیاسی خۆی هەبوو، دەوڵەتی ئەمەوی لەسەر بنەمای دژایەتیکردنی عەلی و دوورخستنەوەی ئەوە دامەزرا بوو، کاتێك ئەمەی بۆی چووە سەر ئەوا جنێودانی عەلی و بێبەری کردنی کردە دەستووری خۆی. ئەمەش مانای ئەوەیە باسی هەر چاکەیەکی عەلی بکرێت؛ ئەوکاتە وەك ئاوزاندنی دەوڵەتی ئەمەوی و شۆڕشی دەوڵەت دادەنرێت. هەر کەدەوڵەت جۆرێك لە جۆرەکان لە خەڵکی توند بکردایە؛ ئەوا خەڵك زیدەڕۆییان لە خۆشەویستی عەلی و باسکردنی چاکەکانی

ستایشکردنی عەلی بکەنە هۆکارێك بۆ ڕوویەڕووبوونەوەی
دەکرد. وەك ئەوەی
داردەست و واعیزی دەوڵەت و پڕوپاگەندەکانیان. بەمەش ناوی عەلی بوو بەهێمای
دژایەتیکردنی دەوڵەت ، ئاسان نەبوو پیاوێك بڵێ عەلیم خۆشدەوێ. پشتوانی
پارێزگاری لە سەروماڵی بکات. بەماتای ئەوەی لایەنگیری عەلی بایەخدار بوو
باجەکەی گەورەبوو ئەوکات وەك سەردەمی ئێستامان نەبوو وشەیەك بێت لەسەر
زاران هیچ واتایەکی کۆمەڵایەتی وسیاسی نەبێت.

ئەمڕۆ خەڵك ناوی عەلی دەهێنن، لە ستایشی ئەو گۆرانی دەڵێن بێئەوەی کەس
ڕوویەڕوویان بێتەوە، بۆیە خەڵك ئەوەی لە بیرکردووە کە خۆشەویستی عەلی واتای
زیندان و سزاو لەناوچوونی سەروماڵ دەگەیاند. خەڵك عەلی لە ژیانیدا جێهێشت دوای
مردنیشی دەستیان پێوەگرت، ئەمەیە کارەساتی گەورە.

دکتۆر ئەحمەدئەمین بە سەرسامی پرسیار لە بارەی ئەو هۆکارە دەکات
کەوایکردووە خەڵك باوەڕیان بە خواوەندبوونی عەلی هەبێت، لە کاتێکدا کەسێك
باسی خواوەندبوونی محەمەدی نەکردووە؛ کە عەلی پەیڕەوکاری ئەو بووە. کاتێك
ئەحمەد ئەمین دەیەوێت هۆکاری ئەو دیاردە کۆمەڵایەتییە بدۆزێتەوە دووهۆکار
دەستنیشان دەکات :

١- شیعەکانی عەلی زۆر موعجیزە وغەیبناسی عەلیان گێڕاوەتەوە، وتویانە ئەو
هەموو شتێك دەزانێ ئەو خەریك بووە ڕووداوەکانی ڕۆژی قیامەتیش بزانێ.

٢- زێدەڕۆیی لە بارەی عەلی لە عێراقدا باوبووە[١].

عێراقیش لە دێرزەمانەوە سەرچاوەی ئایینە جۆراوجۆرەکان و مەزهەبە نامۆکان
بووە کە باوەڕیان بەوە هەبووە خودا لە هەندێك مرۆڤ بەرجەستە بێت ، ئەو
شرۆڤەکردنەی کە ئەحمەد ئەمین باسی کردووە لەو بنەما لۆژیکییەی هیچ
جیاوازیەکی لە شرۆڤەکردنی خاوەن بیرکردنەوەی کۆن نییە، ئەو دوور لە چوارچێوە

[١] أحمد امين،فجر الاسلام، ص٢٧٠

مێژووییەکە توێژینەوە لەبارەی بیرۆکەکان دەکات، وەک ئەوەی لە هەواوە هەڵواسرابێت پەیوەندی بەخەمی خەڵك و کێشە کۆمەڵایەتیەکانەوە نەبێت. ئەو یەکەمجار دەڵێ: زێدەڕۆیی لە ئەنجامی گێڕانەوەکانی شیعەبووە، کەچی پرسیار لەبارەی سەرچاوەی خودی چیرۆك و گێڕانەوەکان ناکات، ئەو بیرۆکەیە بیرۆکەیەکی دیکە شرۆڤە دەکات و نازانێ بیرۆکەی دووەمیش پێویستی بە شرۆڤەکردنە.

دووەم جاریش دەڵێ: خەڵکی عێراق بەر لەوەی ئیسلام بن ئایین و مەزهەبی جۆراوجۆریان هەبووە، ئەمەش دوای ئیسلام بوونیان کاریگەری لەسەر باوەڕیان هەبووە. باس لەوە دەکات ئەمەش لەبیردەکات کە هەموو گەلان بەر لەوەی ببنە موسڵمان ئاینی دیکەیان هەبووە. عەرەب بەر لە ئیسلام بتپەرست بوون میسرییەکان لەسەر ئایینی فیرعەون بوون. بەر لەوەی مەسیحییەت و ئیسلام بێت، هەموو گەلانی دیکە بەمشێوەیە بوون بۆ تەنها خەڵکی عێراق لەسەرباوەڕە کۆنەکانیان ماونەتەوە کەچی خەڵکی میسرو دوورگەی عەرەبی و ئەوانیتر بەتەواوی لەباوەڕە کۆنەکانیان نەجاتیان بوو.

دەبێت ئێمە لەژێر ڕۆشنایی لۆژیکی نوێ بابەتیانە توێژینەوە لەسەر بیروباوەڕەکان ئەنجام بدەین، بیروباوەڕەکان بەر لەوەی بیرۆکەی ئیبستراکت بن، ئەوا دیاردەی کۆمەڵایەتی بوون. بۆیە خەڵك کاتێ دەست بەباوەڕێکەوە دەگرن یان زێدەڕۆیی دەکەن ئەوا بەپێی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و دەروونیەکانە. جا ئەگەر ئەحمەد ئەمین تاوتوێی بارودۆخی کۆمەڵایەتی ودەروونی خەڵکی عێراقی لە سەردەمی ئەمەوییەکان بکردایە، ئەوا درکی بەو هۆکارە دەکرد کە پاڵی بەخەڵك ناوە عەلیان خۆشبوێت وزێدەڕۆیی لە خۆشەویستی ئەو بکرێت. ئەگەر زێدەڕۆییان لە خۆشەویستی محەمەد نەکردبێت هۆکارەکەی ئەوە بووە خۆشەویستی محەمەد لەوان قەدەغەنەکراوە. بەڵکو دەسەڵاتدارانیش لەو خۆشەویستییە لەگەڵیان بەشداربوون. ئەگەر کەلێنێك لە نێوان دەسەڵاتدار و خەڵك دروست بوو دەبینین خەڵك لەهەموو بانگەشەیەکی دەسەڵاتدار پێچەوانە هەڵسوکەوت دەکات. بۆیە خەڵك کاتێك دەبینی دەسەڵاتدار

ڕقی لە کەسێکە ودلوای سووککردنی دەکات، ئەوا بە پێچەوانەوە خەڵك زێدەڕۆیی لەخۆشەویستی ئەو کەسە دەکات، خوێنەریش دەتوانێ چەندین نموونە لە قۆناغە کۆن و نوێیەکانی مێژوو بدۆزێتەوە .

***

دکتۆر تەها حوسێن پێیوایە، تەشەیوع بۆ عەلی لە سەرەتادا وەك حیزبێکی ئۆپۆزسیۆن ستەمکاری و گەندەڵی دەستی پێکردووە، ئەو ئۆپۆزسیۆنەش هەندێکجار لە شێوەی شۆڕش دەردەکەوت، هەندێکجاری دیکەش وەك ڕق وکینەیەك بوو لە زۆردار. زۆرجاریش بەهەر هۆیەك بێت، هەندێك شت دراوەتە پاڵ شیعە، کە ئەوان ئاگاداری نەبوون و لە پێناویشی دا کوژراون و ئەشکەنجە دراون.

شێخ محەمەد جەواد موغنیە، سەرۆکی دادگای باڵای شەرعی –جەعفەری لە لوبنان سەرنجی خۆی لە بارەی ئەو قسەیەی دکتۆر تەها حوسێن دەدات و دەڵێ: "ئەگەر مەزهەبی شیعە لەسەر بنەمای شۆڕش بێت لە دژی ستەم و زۆرداریی، ئایا بەڕاستی ئێمە شیعەین. ئایا ئێمە عەلی وکوڕەکانی ئەومان خۆشدەوێ؟! . خۆزگە ئێمە بە گۆشەگیریی و بە تەنیا دەژیاین، لەسەر کاروانی ستەمکاران نەدەبووین قەسیدە و خوتبەی بریقەدار لە ستایشی ئەوان بنوسین"[٤٠].

ئەمە قسەیەکی زۆر نایابە، شایەنی ئەوەیە لە ماڵی هەر موسڵمانێك هەڵبواسرێت کە خۆشەویستی بۆ عەلی هەیە و شیعەیە. باشترە پیاوانی ئایینی ئەو قسانە بکەنە دەستورێك بۆخۆیان و واز لە شەڕە ڕەخنەی تایفی بهێنن، کە هەندێکجار هێرشەکانیان بۆ سەر یەکتر پەیوەندی بە ئایینی محەمەد و ئەهلی بەیت و یاران نییە لە خەبات و شۆڕشی کۆمەلایەتی مەزندا.

[٤٠] محمد جواد مغنية، مع الشيعة الامامية، ص٣٥

# کەموکوڕییەکانی
# شاری چاکەخوازان



بەڕێزێک لە پیاوە ئایینییەکانی شاری نەجەف کتێبێکی لە بارەی بیروباوەڕی شیعەکان نووسیوە، دەزگای چاپ دانەیەکی لەو کتێبە بۆ من ناردووە، لەسەری نووسیوە" دیاری ئێمەیە بۆ نووسەری بوێر دکتۆر عەلی وەردی، لەسەر خواستی نووسەر تکامان وایە بیخوێنیتەوە، سوپاستان دەکەین".

کتێبەکەم خوێندەوە و لە خوێندنەوەی چێژم وەرگرت، بڕگەیەک لە نووسینەکە سەرنجی ڕاکێشام. دەمەوێ دەقاودەق بۆ خوێنەری بگوازمەوە، چونکە پەیوەندی بە بابەتەکەی ئێمەوە هەیە. نووسەری بەڕێز دەڵێ:" بەڵێ ئەگەر موسڵمانان درکیان بەوە کرد، لەسەر ساناترین خەسڵەتی برایەتی نێوانیان بوەستن و کاری پێ بکەن، ئەوکات ستەم و دوژمنایەتی لەسەر زەوی نامێنێت. ئەو کات دەبینی مرۆڤ لەخۆشی دا برای یەکترن و کامەرانی کۆمەڵایەتیش تەواو دەبێت، بەمەش خەونی

فەیلەسووفانی پێشوو لە بارەی (شاری چاکەخوازی)[1] دێتەدی. کاتێک خۆشەویستی و تەبابیان لە نێوان دەبێت پێویستیان بە حکومەت و دادگا نابێت، نە پێویستیان بە پۆلیس و زیندان و یاسای سزادان و بڕیاری سزادان دەبێت، ئەو کات ملکەچی داگیرکەر و زۆردار نابن، ستەمکار بەسەریان زاڵ نابێت، ئەوکاتە زەوی دەبێتە زەوییەکی دیکە و دەبێتە بەهەشت و ماڵی کامەرانی"[2].

ئەمە قسەیەکی جوان و نایابە، چاکترین قسەیە گوتراوە و دەگوترێت، بەڵام یەک کەموکوڕی هەیە: مەحاڵە و لە نێوان ئەو مرۆڤانەی کە کوڕانی ئادەم و حەوان ئەوا نایەتەدی. کورتەی قسەکانی نووسەر ئەوەیە کە مرۆڤ کاتێک یەکتریان خۆشدەوێت و یەکگرتوو بن ستەم و دوژمنایەتیان لە نێوان نامێنێت، ئەوکاتەش ستەمکاران ناتوانن ستەم بکەن.

لێرەوە جیاوازییەکە خۆی حەشار دەدات، ئەگەرهاتوو خەڵک یەکگرتوو بوو، لەکاتێک دا کە زوڵم و ستەمیان لەسەر بوو، کەسێک نابێت بەرپەرچی ستەمکار بداتەوە، دەبێت یەکێک هەبێت دژی بوەستێتەوە و ڕەخنەی لێ بگرێت و دەسەڵاتی لێوەربگرێتەوە. هەر مرۆڤێک ، کاتێک ناکرەوانە بەخواستی خۆی دەسەڵاتی بەدەستەوە دەبێت، ئەوا مەیلی بەلای ستەم و زۆرداریی هەیە.

ئیمام عەلی دەڵێ:" ئەوەی شتێک بگرێتە دەست ناکرەوانە ئەنجامی دەدات" ئەو ڕستەیە گوزراشتێکی ڕەوانە بۆ دەرخستنی سروشتی مرۆڤ. دیارە مرۆڤ حەز بەوە ناکات ستەم بکات، بەڵام ستەم خۆی دێتە ناو دەستی، کاتێک بەخۆشی نازانی. هۆکارەکەش ئەوەیە ستەم و دادپەروەری ڕێژەیین، شتێک نییە بەناوی(دادپەروەریی) بەهەواوە هەڵواسرابێت، وەک ئەوەی ئەفلاتون و ئەو کەسانەی لەسەر بۆچوونی ئەو بوون وێنایان دەکرد.

---

[1] (المدينه الفازيله) لەوکتێبەدا بە شاری چاکە یان شاری چاکەخوازیی وەگێرانی بۆ کراوە، لەمەندێک شوێنش بە (یوتوپیا) هاتووە(وەرگێڕ)

[2] محمد رضا المظفر، عقائد الشيعة، ص١٠٢-١٠٤

ئەگەرهاتوو مرۆڤێکی بەڕێزی لەخواترسمان هێنا و هەموو کارەکانمان رادەستی ئەو کرد و پێمان وت" بادپەروەرانە حوکم لەنێوان خەڵك بکە" دواتریش ملکەچی بووین، لەسەر ئەوەش رێککەوتین کە گوێڕایەڵی ببین، دوای ماوەیەکی کورت یان درێژ، دەبینین ئەو بۆتە زۆردارێك کەنیزە دەکڕێت و کۆشك بەپارەی خەڵك دروست دەکات، خۆشی بەدادپەروەر دەزانێت. ئەوە بەوردی لە بەشی داهاتوو، دێینەوە سەر ئەوخاڵە.

***

ئەگەر بچینە گۆڕەپانی دادگاکان و گوێ لە داواکار و پارێزەرەکان بگرین، دەبینین هەر یەکێکیان وادەزانێ ئەو لەسەر هەقە. ئەگەر دادوەریش بڕیارەکەی لە بەرژەوەندی لایەنێك بێت لە دیدی ئەو لایەنە دادوەر دادپەروەرە (خوا نموونەی زۆر بکات و بەبەرەکەتی بکات)، بەڵام لایەنەکەی دیکە دادوەر ئەفرەترین خەڵقی خودا دەزانێت.

ئەم سیفەتە پەیوەستە بەمرۆڤەوە ئەگەر هاتوو هەزار ساڵ ئامۆژگارییە ئەفلاتونیەکانی بەسەر بباریێنین مرۆڤ ناتوانێ لەو سیفەتە ئەجاتی بێت.

دەڵێن پیاوێك هەبوو پشیلەکانی فێری ئەوە کردبوو مۆم لەسەر خوانەکەی دابنێن. کەچی یەکێك لەمیوانەکان دێت مشکێکی لە گیرفان دایە و لەسەر خوانەکە بەرەڵای دەکات، هەرزوو پشیلەکان بەدوای مشکەکە دەکەون و مۆمەکان دەکەونە سەر خوانەکە و خواردنەکە و ئەو کەسە دەسوتێت کە لێی دەخوات.

ئەوەی کە دەیەوێت سروشتی مرۆڤ بە ئامۆژگاری و قسە بگۆڕێت، جیاوازی لەگەڵ ئەو کەسە نییە کە پشیلەی فێری مۆم دانان کردووە، چونکە مرۆڤەکان گوێی لێدەگرن و بەئەدەبەوە لەبەردەمی دەبن، وەك ئەوەی لە بەردەم پێغەمبەران بن سەنگین دەبن. کەچی ئەگەر شتێکی گرانبەهایان بۆ هەڵدەبێت، سەگ ئاسا بەدوای دەکەون، ئەو کاتەش ئەوە لەبیر دەکەن بەچی ئامۆژگاری کراون و چۆن وەڵامیان داوەتەوە.

***

فەیلەسووفی عەرەبی بەناوبانگ ئەبونەسری فارابی کتێبێکی بەناونیشانی(بۆچوونەکان لەبارەی شاری چاکەخوازانەوە)نووسیوە. ئەگەر ئەو کتێبە بخوێنینەوە درک بە نهێنی ئەو هەڵەیە دەکەین کە بەسەر زەینی فەیلەسووفەکانی کۆن زاڵ بووە. فارابی لەو کتێبەدا وێنای کۆمەڵگایەکی پڕ چاکەمان بۆ دەکات، کە خەڵکەی دڵخۆشن و لە دونیا و قیامەت سەرکەوتوون. فارابی پێیوایە گرنگترین تایبەتمەندی ئەو کۆمەڵگایە بوونی سەرۆکێکی چاکەخوازە, کە کاروباری کۆمەڵگاکە رێکبخات و سەرپەرشتی بکات. لەوانەیە فارابی لەمەباتدا پەیڕەوی ئەو بۆچوونەی کردبێت کە دەڵی:" ئەگەر پاشا باش بێت، رەعیەتیش باش دەبێت". دەربڕیندەکەوێ؛ کە ئەو بیرۆکەیەی لە ئەفلاتونی مامۆستای وەرگرتووە، کە لە کۆمارە پڕکامەرانەیەکەی پاشایەکی فەیلەسووفی دانا بوو[42].

فارابی باس لەو خەسڵەتانە دەکات کە دەبێت لەو سەرۆکە بەرێزە یان بە گوتە ئەفلاتونییەکە لەو پاشا فەیلەسووفە هەبێت، فارابی بەو شێوەیە ئەو خەسڵەتانە دەژمێرێت:

١- دەبێت ئەندامەکانی جەستەی تەواو بێت، هەر ئەندامێکی سوور بوو لەسەر ئەنجامدانی کارێك, کە بەئاسانی ئەنجام دەدرێت.

٢- دەبێت تێگەیشتن و وێناکردنی باش بێت، لەو شتانەی بۆی دەگوترێت. دەبێت لەوە تێبگات کە کەسەکە چی دەڵێت و بابەتەکە لەلای ئەو چی دەبێت.

٣- دەبێت توانای ئەزبەرکردنی باش بێت, لەوە تێبگات کە دەیبینێ و دەیبیستێ و درکی پێدەکات. نابێت رستەیەك لەبیر بکات.

٤- دەبێت زیرەك و وریا بێت، ئەگەر بچووکترین بەڵگە هەبوو بۆی، ئەوا زیرەکییەکەی پەی بەو بەڵگەیە ببات.

٥- دەبێت گوزارشتەکانی جوان بێت، زمانی لە دەربڕینی بۆچوونەکانی پاراو بێت

[42] De Vaux, Encyclopedia of Islam, art.Farabi

٦- دەبێت خۆشەویستی بۆ فێربوون و سوودبینین هەبێت و ڕەخنەی لە ساناییی قبوڵکردن هەبێت، لە فێربوونیشدا ماندووبوون ئازاری نەدات و زەحمەتییش ئەزیەتی نەدات.

٧- دەبێت بۆ خواردن و خواردنەوە و نیکاح چاوبرسی نەبێت، خۆی لە یاریکردن بەدوور بگرێت و ڕقی لە چێژەکانی بێت.

٨- دەبێت ڕاستیی و ڕاستگۆیانی خۆش بوێت، ڕقی لە درۆ و درۆزنان بێت.

٩-دەبێت دەروونی مەزن بێت و حەزی لەو سەربەرزییە بێت، کە بێگومان دەروونی بەسەر هەموو ئەو شتانە زاڵ دەکات کە ئاستی نزم دەکەنەوە لەوانە درهەم و دینار و کەلوپەلەکانی دیکەی دونیا.

١٠- دەبێت دادپەروەریی و دادپەروەرانی خۆشبوێت و ڕقی لە ستەم و ستەمکاران بێت، دادپەروەری بەخەڵک بدات و خەڵکی بۆ هان بدات.

١١- دەبێت ماملاوەند بێت، سەرسەخت نەبێت، لادەر و پاراش نەبێت ئەگەر کار بۆ دادپەروەریی بکات، بەڵام سەرسەخت دەبێت ئەگەر بەدوای زۆرداری و دزێوی بێت.

١٢- دەبێت موکڕ بێت لەسەر ئەنجامدانی ئەو کارەی دەبێت ئەنجام بدرێت و پاڵەوان بێت و ترسنۆک و دەروون لاواز نەبێت.

فارابی دوای ئەو ژماردنە جوانە دەڵێ: " ئەگەر هاتوو سەرۆکێك دەسەڵاتی شاری گرتەدەست و ئەو سیفەتانەی تێدا نەبێت، ئەوا شارەکە ڕووبەڕووی مەینەتی دەبێتەوە"[٥١]. فارابی وادەزانێ چاکسازی بابەتێکی زۆر ئاسانە، ئەویش لەسەر هەڵبژاردنی سەرۆکی کۆمەڵگاکە وەستاوە، کە دەبێت ئەو مەرجانەی تێدابێت کە ئەو باسی کردووە، ئەوکاتەش خەڵك ئاسوودە دەبێت و رایەڵەکانی خۆشەویستی و برایەتی کامەرانی نێوانیان لە خۆیانەوە دەگرێت. فارابی لەو بۆچوونەی دا لەو مشکە

[٥١] الفارابي، اراء اهل المدينة الفاضلة ص ٨٧-٩٠.

دەچێت کە پێشنیار بۆ هاوڕێکانی کردووە زەنگێک بەگەردەنی پشیلەوە هەڵواسن، بۆ ئەوەی لەمەترسی دوور بن.

دەگوترێت ڕۆژێکیان کۆمەڵێک مشك کۆبوونەوە، بۆ ئەوەی بیر لە ڕێگایەك بکەنەوە، لە مەترسی پشیلە دووریان بخاتەوە. دوای مشتومڕێکی توند، مشکێکی بەڕێز پێشنیاری بۆ کردن زەنگێك بە گەردەنی پشیلەوە هەڵواسن، ئەگەر پشیلەکە هێرشی کرد، بەر لە هاتنی مەترسی ئەوان دەتوانن ڕابکەن.

بێگومان پێشنیارەکە نایابە، بەڵام کێشەی گەورە لە چۆنیەتی هەڵواسینی زەنگەکەیە بەگەردنی پشیلەکەوە. کوا ئەو عەنتەرە کە بتوانێت گەردنی پشیلە بگرێت و داوی جەڕەسەکەی لێ قایم بکات و بەساغ وسەلامەتیش بگەڕێتەوە ناو کەسوکار خۆی؟. مشکی هاوڕێمان بیری چوو پێشنیارەکەی پراکتیکی نییە، چونکە پشیلە هەر مشکێك دەخوات، کە بیەوێت زەنگەکە بەملی ئەو هەڵواسێت. زێدەڕۆیی ناکەین ئەگەر بڵێین بیرکردنەوەی زۆربەی فەیلەسووفانی کۆن لەو جۆرە بووە. ئەوان بیرۆکەی جوان ونایابیان هەبووە، بەڵام کەموکوڕی گەورە ئەوەبووە کە پراکتیکی نەبووە.

پیاوێکی لادێی سەیری کتێبخانەیەکی پڕ لە کتێبی کۆن دەکات دەڵێ: " من دەزانم چی لەناو ئەو هەموو کتێبانە هەیە، هەموویان دەڵێن ئەی مرۆڤ چاکەخواز بە". ئەو لادێیە کرۆکی حەقیقەتی پێکاوە، هەموو کتێبەکانی کۆن ئامۆژگاری مرۆڤ دەکەن، کە لایەنی چاکە بگرن و واز لە خراپە بهێنن، ئەمەش بەڕاستی بیرۆکەیەکی نایابە، بەڵام بەداخەوە ئەوەیان ڕوون نەکردۆتەوە مرۆڤ چۆن بەو ئەنجامە جوانە دەگات.

بیرۆکە تەنها نابێت نایاب و جوان بێت، بەڵکو دەبێت بەر لە هەموو شتێك شایەنی پراکتیزەکردن بێت، بۆیە ئەگەر گوێ لە شێتان بگرین زۆر جار کۆمەڵێك بیرۆکەی نایاب دەدرکێنن، بەڵام سەرەڕای ئەمەش ئەوان ناتوانن ببن بە پێغەمبەر و چاکەخوازی کۆمەلایەتیی.

چاکەخواز و پێغەمبەران بیرۆکەیەکی زۆر سادە دەهێنن، کەچی رووی دونیا دەگۆڕن، هی ئەوان پراکتیکییە کاریگەری بەسەر ژیانی مرۆڤەوە هەیە، بەرەو جوڵانەوەی کۆمەڵایەتیان دەبات کە رۆڵی لە داڕشتنی مێژوودا هەیە. کەچی برایانم لە فارابییەکان ، ئەوان بە بیرۆکە باڵاکانیان سەرقاڵن، بایەخ بەوە نادەن کە جێ بە جێ دەکرێت یان نا. سەرەڕای ئەمەش سەیر ئەوەیە یەکێکیان کاتێک دەبینی خەڵک بەدوای بیرۆکە باڵاکانی ئەوان ناکەوێت ئەوا گلەیی لە خەڵک دەکات. هۆکاری نەهامەتی دەداتە پاڵ خەڵک، ئەو گلەیی لە خەڵک دەکات لە خۆی ناکات، سکاڵای بەدەست کەموکوڕی خەڵکەوە هەیە، نەوەک کەموکوڕی هزری خۆی.

ئەگەر بینیمان بیرۆکەیەکی جوان هەیە کەچی ئەوە دوای ئەوە کەسی بەدوای ناکەوێت، ئەوا دیارە کەموکوڕی لەو بیرۆکەیە دایە نەوەک لە خەڵک. خەڵک لە سروشتێکی دیاریکراو لێ راهاتووە، ناتوانێت دەستبەرداری بێت، بۆیە پێویستمان بو بیرۆکەیە کە لەگەڵ سروشتی مرۆڤ بڕوات، نەوەک بیرۆکەیەک بێت، بیەوێت ئەو سروشتەی مرۆڤ لەگەڵ ئەو بڕوات.

ئەگەر دەتەوێت گوێڕایەڵت بن، دەبێت فەرمانەکانت بەپێی توانا بن.

دەگێڕنەوە کە دانیشتوانی گوندێک ئاوی رووبارێکیان دەخواردەوە، هەرکەسێک ئەو ئاوەی بخواردایەوە شێت دەبوو، بۆیە هەموو شێت بوون، پاشا نەبێت. وابێتەوات دانیشتوانی گوندەکە چرپەی ئەوەیان دەکرد گوایە پاشا شێت بووە، بۆیە دەبێت لە دەسەڵات بدرێت. لەکۆتایی دا پاشا ناچار بوو ئاوی رووباری شێتی بخواتەوە بۆ ئەوەی وەک پاشا بمێنێتەوە. عاقڵییە هەندێک جار شێت بیت. رەوتی کۆمەڵایەتیش زۆر لەوە بەهێزترە کە تاکەکەسێک بەفیزی زانستەوە رووبەرووی بێتەوە. محەمەدی پێغەمبەریش ئیعترافی بەوە کردووە کە گوتویەتی " ئێمەی پێغەمبەران بەگوێرەی عەقڵی خەڵک قسە دەکەین".

بینیمان فارابی کۆمەڵێک سیفەتی بەرز دەهێنێت، بۆ ئەوەی لە سەرۆکی شاری چاکەخوازان هەبێت، بەڵام چرکەساتێک نەوەستا بیر لەوە بکاتەوە کەچۆن خەڵک

ئەو سەرۆکە سەیرە هەڵدەبژێرن. با گریمانەی ئەوە بکەین کە خەڵك ئەو بۆچوونیان پەسەند کردووە کە فارابی باسی کردووە، بۆیە کۆدەبنەوە بۆ ئەوەی سەرۆکێك لە نێوان خۆیان هەڵبژێرن کە ئەو سیفەتە دەگمەنانەی تێدا بێت، ئەو کاتە چی روودەدا؟

بێگومان ئەوان دەکەونە رکابەری وململانێ و مشتومڕ کاتێك دەیانەوێت سەرۆکێك لەنێوان خۆیان دەستنیشان بکەن. مرۆڤ لەوە راهاتووە کە خۆی بەشایەن و چاکەخواز و زانا و بەتوانا بزانێت. تەنانەت کەسێکی دەبەنگ و گێلیش هەندێك جار لە دووربینی وناکاربەرزییدا خۆی بەشیاوترین کەس دەزانێت بۆ سەرۆکایەتی. لەوانەیە راست بێت کە دەگوترێت" هەرچەندە دەبەنگی مرۆڤ زیاتر بوو، ئەوا یەقینی ئەوەی زیاد دەبێت کە ئەو لە هەموو شتێك لە کەسانی دیکە باشترە".

بۆیە هێشتا خەڵك سەرۆکەکەیان دیارنەکردووە، دەبین لەنێوان خۆیان بۆ چەندین حیزب و لایەن دابەش دەبن، هەر یەکێك لەوان پێیوایە کاندیدەکەی ئەو بۆ سەرۆکایەتی شیاوترە، هەر کەسێك بەوەی خۆیان دڵشادن، لێرەوە دەبینی دەنگەکان هاوار دەکەن و دەستەکانیش بەرز دەبنەوە، وەك ئەوەی پەندەکە دەڵێ(ناو بێنە و دەستان بطۆ)**.

کۆمەڵگای نوێ رێگایەکی بۆ هەڵبژاردنی سەرۆك دۆزیتەوە کە بێ کێشەیە، ئەویش بە سیستەمی دەنگدان ناودەبرێت. لەو شێوازەدا سەندوقی قوفڵکراو دادەنرێت، کە حیزبەکان سەرپەرشتی دەکەن و هەر دەنگدەرێك دەچێتە ژێر پەردەوە بۆ ئەوەی بەنهێنی ناوی کاندیدەکەی خۆی بنووسێت و داوتریش دەیخاتە سندوقەکەوە. سەرەرای ئەمەش دەبینین کەشی هەڵبژاردن بە پڕوپاگەندە و درۆ ودەلەسە بارگاوی

---

** پەندە عەرەبییەکە ئەمەیە (جیب لیل و خذ عتابە) کەپەندێکی عێراقییە بۆ درێژدادڕی مەسەلەکان بەکار دێت(وەرگێڕ)

دەبێت و هەڵوێستەکە دژوار دەبێت هەر کاندیدێک هەموو شێوازەکان بۆ ئامانجەکانی خۆی بەکاردەهێنێت.

ئەوە لە هەموو کات و شوێنێکدا سروشتی مرۆڤە. گەلانیش لە رادەی ئاژاوەی هەڵبژاردن جیاوازیان هەیە، بەڵام لەڕووی بنەماوە هەر هەموو گەلان لەسەر یەك سروشتن، ئەویش سروشتی ململانێ و رکابەری و زاڵبوون و بانگەشەی کردنی هەر لایەنێکە کە هەق تەنها بەلای ئەوە. بەڵام فاراپی بڕوای وایە ئەمە لە شاری چاکەخوازان ڕوونادات، چونکە ئەوان چاکەخوازن یان بە مانایەکی دیکە ئەوان فەیلەسووفن. ئەو بڕوای وایە کە فەیلەسووفان لە سروشتی خۆیاندا لە خەڵکی عەوام جیاوازن، کەچی لەڕاستیدا جیاوازییەك لەنێوان ئەوان و خەڵك دا نییە تەنها لەڕواڵەت و پلەوە نەبێت. ئەگینا لەڕووی بنەماوە یەکن و نەگۆڕاون. فەیلەسووف ململانێ بە هۆی فرتوفێڵە لۆژیکییەکان و گۆتەگۆتی فەلسەفە دەکات، کەچی کەسێکی سادە ململانێ بە خەنجەر و چەقۆ دەکات. بەڵام هەر چۆنێك بێت لە سروشتی ئەو ململانێیە دەرناچن کە خەڵك فرچکیان پێوەگرتووە.

هەر یەکێك لەوان بۆ خۆی هەوڵ دەدات و هەر کەسەو ئاگرەکە بۆ خۆی خۆش دەکات، کەچی ئەو ئارەزووە بە چەندین جۆر پاساو وبیانو دەشارنەوە، یەکێکیان سەرۆکایەتی دەوێ بۆ ئەوەی خزمەتی نیشتیمان بکات، یەکێکی دیکە لە پێناو راستی ئەرکارە دەکات، سێیەمیان لە پێناو خودا و پێغەمبەر...هتد. هەر یەکێکیش وادەزانێ هەق تەنها لەلای ئەوە، ئەگەر لەبەردەمی تکۆڵیشت لەوە کرد، ئەوا زۆر توڕە دەبێت و شمشێری جیهادی پیرۆز بەڕووت دا هەڵدەکێشێ.پەنا بەخوا.

***

مرۆڤ ناچارە حەقیقەت لە میانەی بەرژەوەندی و شتەباوەکانی دەوروبەری ببینێت، ئەگەرهاتوو ئەوحەقیقەتە لەگەڵ بەرژەوەندی و ئەو شتە باوە کۆمەڵایەتیانەی یەکبگرێتەوە، ئەوا بۆ ئەو سەختە دان بە حەقیقەتێکی جیاواز بنێت، ئەگەر وەك رۆژی ڕووناکیش بێت.

پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەو ئایەتە قورئانییە کرد کە دەفەرموێ" فانها لاتعمی الابصار ولکن تعمی القلوب التی فی الصدور "[٣٦]، ئەگەر دڵ کوێر بوو، یان بە بەرگێکی ئەستور داپۆشرا، ئەوا مەحاڵە هەست بە بەڵگەیەکی ڕۆشن بکات، چونکە ڕۆشنی بەڵگە بابەتێکی ڕێژەییە. لە دیدی تۆ ڕۆشنە چونکە لەگەڵ باوەڕە باوەکانی تۆ و ئارەزووە تایبەتەکانی تۆ یەکدەگرنەوە، بەڵام لە دیدی کەسێکی دیکە ڕۆشن و ڕوون نییە. ئەوەی لەنێو ئەو کەسانە دەژیت کە خۆیان بە خواترس و خۆشەویستی حەقیقەت دەردەخەن ئەگەر بەوردی ئەوان تاقی بکاتەوە، دەبینێ ئەوان وەک کەسانی دیکە ململانێ و ڕکابەریی و ئیرەییان لەنێوان دا هەیە.ڕەنگە لە هەندێک لایەنەوە لەو شتانە پێش خەڵکیشەوە بن.

ئەگەر یەکێکیان کەسێکی نزیکی خۆی ببینێت کە بە چاک و پێگە و زۆری پەیوەند لەو باشتر بێت، ئەوا ڕقی لێ هەڵدەگرێت و بەدوای هەڵە و کەموکورییەکانی دەگەڕێت. ئەوەی شایەنی باس بێت لە دونیادا کەسێک نییە بێ کەموکوڕی بێت، بەڵام ئەو هاوڕێیەمان زێدەڕۆیی لە وەسفکردنی کەموکورییەکان دەکات و لەلایەن خۆشییەوە شتی بۆ زیاد دەکات، دواتر بۆ خەڵک بەشێوەیەکی نایاب وێنای ئەو کەموکورییانە دەکات. کەچی کەموکورییەکانی خۆی نابینێت، چونکە لە دیدی ئەو هەڵەیەک بووە، خواش سەهوەکان قبوڵ ناکات. بەڵام ڕکابەرەکەی کەموکورییەکانی دەبێتە گوناهێک کە زەوی و ئاسمان لەت دەکات، ئەنجامدەرەکەشی دەبێتە دوژمنی خوا و پێغەمبەر. لێرەشەوە ئەو هاوڕێیە شمشێری لۆژیکی کۆن دەردەهێنێت و ئەملا و ئەولای پێدەکات، واز لە ڕکابەرەکەی ناهێنێ تا پشتی لە ئەرز دەدات و ڕامداری دەکات.

لەوانەیە کەسێک لەگەڵ ئەو قسانە نەبێت و بڵێ:" ئەگەر ئەوەی دەیڵێی ڕاست بێت، کەی مرۆڤ لە کاروبارە سیاسییەکەی سەرکەوتوو دەبێت و چۆن بە ئامانجە کۆمەڵایەتییەکانیان دەگات؟" لەڕاستیدا مرۆڤ هێشتا بە ئامانجە کۆمەڵایەتییەکانیان

[٣٦] القرآن، سورة الحج اية ٤٦

نەگەیشتوون کە دەیخوازن، ئەوان لە جوولانەوەی خۆیان بەردەوام دەبەن بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە، تەنێ ژیانی کۆمەڵایەتیش لەو جووڵە بەردەوامە دایە. ئەگەر مرۆڤایەتیش بە ئامانجەکانی خۆی بگات، ئەوا ژیان دەوەستێ و شارستانییەت لەناودەچێت.

وەک پێشتریش باسمان کرد ژیان بریتییە لە کارلێککردن و دژیەیەکبوون و رکابەری، ئەگەر ئەوانە نەبوایە شتێک نەدەبوو بەناوی ژیار و کۆمەڵگا. ئەگەر حیزبێکی ئۆپۆزسیۆن خەبات لەپێناو دادپەروەری بکات، ئەوکاتەی بە دەسەڵات دەگات ناتوانێ دادپەروەیی تەواو بەدەست بهێنێت، ئەو دادپەوەرییە نموونەییەی کە لە ئۆپۆزسیۆنی خەباتکار خەونی پێوە دەبینێ هەرگیز بەدی نایەت. بەڵام کاتێک ئەو حیزبە خەبات لەپێناو دادپەروەیی دەکات، بە ئەرکێکی کۆمەڵایەتی گەورە هەڵدەستێت. ئەو لە ڕووی دەسەڵاتدار دەوەستێ و رەخنەدەگرێت و رێگری لە ستەم و فشارخستکردنی دەسەڵات دەکات. بینیمان سروشتی دەسەڵاتدار مەیلی بەلای زۆردارییەوە هەیە، ئەگەر ببینێت کەسێک نییە دژی بوەستێتەوە ئەوا زۆردار دەبێت و سامانی رەعیەت بۆ خۆی قۆرخ دەکات.

کەچی حیزبی ئۆپۆزسیۆن دەروون و ئاکاری لە حیزبی دەسەڵات بەرزتر نییە، ئەو کاتێک دەگاتە دەسەڵات ئەوا ناتوانێت لە سروشتی مرۆڤایەتی دەربچێت و دەبێتە موڵکدار. ئەوە هەر مرۆڤە و بەمرۆڤیش دەمێنێتەوە تا دەمرێت. بۆیە ئەویش پێویستی بەوەیە لە ماوەی حوکمڕانی کەسێک هەبێت دژایەتی بکات و رەخنەی لێ بگرێت و کەموکورییەکانی دەربخات. بۆ ئەوەی تاڕادەیەک لە حوکمڕانی دا چاکەخواز بێت، بەڵام ئەگەر پشت بەنیازپاکی خۆی ببەستێت و هەموو ئەوکەسانە لەناو ببات کە دژایەتی دەکەن و رەخنەی لێدەگرن، ئەوا ئەوکاتە چارەنووسی وەک چارەنووسی کەسانی پێش خۆی دەبێت، ئەوا شوێنی پێی ئەوان دەکەوێت و پێی لە شوێن پێی ئەوان دادەنێت.

***

زانایانی کۆمەڵناسی دەڵێن: کۆمەڵگای مرۆڤایەتی خاڵی نابێت لە کێشە، ئەو کێشانەش رەمزی ژیانی کۆمەڵگا و دروشمی بزووتنەوە بەردەوامەکەی دەبێت. کێشە هانی خەڵك دەدات بۆ دۆزینەوەی چارەسەری کێشەکان. بەمەش دابەش دەبن و ململانێی لەگەڵ یەکتر دەکەن، هەرکەسێکیش لەوان لایەنێکی هەقیقەت بۆ خۆی دەبات کە لەگەڵ ئەوانی دیکە جیاوازە. ئەوکاتە مرۆڤ هەست بەوە دەکات زیندووە و لەگەڵ زەمەندا گەشە دەکات. بەڵام سەبارەت بە بیروڕای یۆتۆپیاکان، ئەوا کۆمەڵگا لە پێکهاتەکەی دا کێشە و رکابەری تێدا نییە، ئەمەشیان خەونێکە کە بۆ جیهانی فریشتەکان دەگونجێ و بۆ ئەو جیهانەی کە ئێمە تێیدا دەژین گونجاو نییە.

***

خەڵکی ئەو سەردەمە درکیان بەوە کردووە کە ململانێ لە نێوان مرۆڤ دا بابەتێکی سروشتییە و ناتوانرێت بەهۆی ئامۆژگاری و قسەی بریقەدار لەناوببرێت. بۆیە دەبینین ئەوان لە سیستەمە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانیان داوا دەکەن دان بەو هەقیقەتە بنرێت و دەرفەت بەو ململانێیە بدرێت کە لەسنووری رەوایەتی دەربکەوێت.

ئەمە زۆر بەروونی لەو سیستەمەی دیموکراسی دەردەکەوێت، کە لەو سەردەمەمان لەوڵاتانی پێشکەوتوو بەرقەرارە. لەڕاستیشدا دیموکراسی تەنها ئەو سیستەمەیە کە لەسەر بنەمای رکابەریی دامەزراوە. دیموکراسی دەرفەت بەخەڵك دەدات بچنە ناو حیزبە رکابەرەکانەوە، بەڵام لە هەمان کات چەندین بنەمای روونیان بۆ دادەنێت کە خەڵك پەیڕەوی بکەن. دواتر چاوەڕوانی ئەوە دەکات، کە کامە حیزبە زۆرترین دەنگ بەدەست دەهێنێت و دەسەڵات بەدەستەوە دەگرێت. ئەگەر یەکێك لەحیزبەکان سەرکەوت، ئەوا رێگە بەحیزبە دۆڕاوەکان دەدرێت ئۆپۆزسیۆنی حکومەت بن و بەرەو رووی سیاسەتەکەی ببنەوە و بە خواستی خۆیان تاوانگی بڕژێن. حیزبەکانی ئۆپۆزسیۆن کۆشش دەکەن بەر دەنگە پاڵپشتیەکانی بەدەسەڵات بگات. سیاسەت بەپێی چەمکی دیموکراسی نوێ شتێك نییە، تەنها کێبڕکێیەکە لەسەر بەدەستهێنانی

دەنگ. بۆیە هەر حیزبێک هەوڵی ئەوە دەدات تاوبانگی حیزبی رکابەر بزڕێنێ و کەموکورییەکانی دەربخات، بۆ ئەوە رەزامەندی رای گشتی لەشوێنی ئەو حیزبە بەدەست بهێنێ.

دیموکراسی باوەڕی بە هەقیقەتی رەها نییە، بەو ئەرگومێنتەش رازی نابێت کە حیزبەکان بۆ پشگیری بۆچوونەکانی دەهێنێتەوە، ئەو تەنها باوەڕی بە زۆرینەی دەنگ هەیە، ئەگەر حیزبێک توانی زۆرترین دەنگ کۆبکاتەوە ئەوا مافی ئەوەی هەیە سەرکەوتوو بێت و حوکمڕانی بکات. بایەخیش بۆ ئەو بەڵگە عەقڵی و نەقڵیانە دانانرێت کە ئەیارەکەی بەپاساو دەیهێنێتەوە. دیموکراسی گۆڕێکی لە لۆژیکی کۆن وەشاند کە هەڵسانەوەی بۆ نەبێت. بۆیە لە دیدگای دیموکراسی هەقی رەها و ناهەقی رەها نییە، وەک ئەوەی پێشان باوەڕیان پێی هەبووە.

بیرمەندانی پێشوو باوەڕیان بەوە هەبووە، کە زۆرینە بەڵگەی دروستی نییە. هەندێک لە فەیلەسووفانیش لە رابردوودا لەسەر ئەوە بەردەوام بوون، کە رقیان لە خەڵکی عەوام بێت و گاڵتە بە بۆچوونەکانیان بکەن. ئەوان پێیان وایە خەڵک وەک منداڵان عەقڵی پڕوپووچیان هەیە و دەروونیان نەخۆشە.

ئیبن روشد داوای لە برایانی دەکات، کە لەناو خەڵک جیاببنەوە، کۆمەڵێکی تایبەت بەخۆیان دوور لە هیچ و پووچی گەرەلاوژەوە و دزێوییەکانی دروست بکەن. ئیبن روشد پێیوایە کاتێک فەیلەسووفان کۆمەڵگایەکی تایبەت بەخۆیان دروست دەکەن، ئەوا دەتوانن دڵخۆش بن و هاوکارییەکی تایبەتی لە پێناو فیکری پەتی بکەن. ئەوکاتەش بەبڕوای ئەو مرۆڤایەتی بێشومار پێشدەکەوێ. کەچی ئیبن روشد ئەوەی لەبیرکردووە، فەیلەسووفانیش لە سروشتی مرۆڤایەتی جیاوازییەکیان نییە. ئەوان کاتێک کۆدەبنەوە، ئەوا دەکەونە ململانێ و ئەفرەت لەیەکتر دەکەن، تەواو وەک خەڵکی عەوام و سادە.

ئیبن روشد پێیوایە فەیلەسووفان ئەگەر لەسەر شتێک ناکۆک بن ئەوا یەکسەر بۆ بەڵگە عەقڵییەکان و ئەرگومێنتە لۆژیکیەکان دەگێڕنەوە و ملکەچی ئەو بۆچوونە

دەبین کە بە ماقوڵی دەزانن. بە بڕوای ئیبن ڕوشد ئەوان پەنا دەبەنە بەر عەقڵ و لۆژیک، شتێک نییە لەوە پڕوپووچتر بێت کە ئیبن ڕوشد و بیرمەندانی یۆتۆپیا باسی دەکەن.

***

جیاوازییەکی گەورە لە نێوان ئەو لۆژیکە قۆرخکراوەی هەق هەیە کە لە کۆندا باوەڕیان پێ هەبووە، لەگەڵ لۆژیکی زۆرینە کە خەڵکی ئەو سەردەمە باوەڕی پێی هەبووە، یەکەمیان لە ڕووی تیۆرییەوە ڕقی لە ململانێیە بەڵام لە ڕووی کردارەوە هاوکاریەتی، ئەوەیتریان دانی پێ دەنێت و ڕێزی لێدەگرێت، دەرفەتێکی ڕەوای پێ دەدات بۆ ئەوەی ئەو ململانێیە گوزارشت لە خۆی بکات. ئەمەش جیاوازییەکەی نێوانیانە.

***

ئێمە بانگەشە بۆ ئەوە ناکەین لۆژیکی زۆرینە چاکترین لۆژیک بێت کە مرۆڤ دایهێنابێ، بەڵکو دەڵێین هەرچۆنێک بێت لە لۆژیکی ڕەها باشترە کە زۆردارانی بەفیقە بارگاویکراو، لە سەردەمە کۆنەکاندا پشتیان پێ بەستووە. ئێمە ناتوانین نکۆڵی لەو فێڵ و درۆ و دەلەسانە بکەین، کە لە هەڵبژاردنەکان ئەنجام دەدرێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو فێڵ وفڕانە ئەرکی کۆمەڵایەتی خۆیان هەیە. ئەو کاندیدەی بەبەڵێنی هەنگوینی فێڵ لە دەنگدەران دەکات، ئەوا خۆی دەبینێتەوە کە کەم و زۆر پابەندی دەبێت کاتێک جڵەوی دەسەڵات دەگرێتە دەست یان کورسیەکی پەرلەمان بەدەست دەهێنێت.

ئەو ناچارە نازی دەنگدەران هەڵبگرێت، بۆ ئەوەی جارێکی دیکە دەنگی پێ بدەنەوە. ئەگینا ڕکابەرەکەی خۆی بۆ مەلاس دەدات و بەدوای کەموکورییەکانی دەگەڕێت، بەمشێوەیە فەرمانڕەوا خۆی لەوە دەدۆزێتەوە کە خزمەتی خەڵک بکات، لەو کاتەی کەدەیەوێت خزمەتی خۆشی بکات.

تکام لەخوێنەر هەیە ئەوە لەبیر بکات کە بەناوی دیموکراسی شێواو و هەڵبژاردنی نەفرەتی لەهەندێک وڵاتانی ڕۆژهەڵات دەگوزەرێت، ئەو وڵاتانە بەقۆناغی گواستنەوە تێدەپەڕن، بۆیە دەبێت ئەو وڵاتەی کە لە قۆناغی زۆرداریییەوە دەچێتە قۆناغی سیستەمی پەرلەمانی دەبێت ژانی لەدایک بوون ببینێت.

ئەگەر بچینە یەکێک لەو وڵاتە پێشکەوتووانەی کە دیموکراسی تێیدا پێگەیشتووە، دەبینین دەسەڵاتدارەکانیان لە ئاگایی و وریایی بەردەوام دان، ئەوا لەوە دەترسن خراپەیەک دەرهەق بەگەل بکەن و حیزبی ئۆپۆزیسیۆنیش ئەو هەلە بقۆزێتەوە، هەڵمەتێک لە دژی دەست پێ بکات. بەمەش چەندین کورسی لەدەست دەربهێنێت. گوتمان و دەیڵێینەوە: قۆرخکردنی دەسەڵات و زۆرداری لەلای هەر فەرمانڕەواییەک دەردەکەوێت کە کەسێک لەبەردەم نەبێت چاودێر و ئۆپۆزسیۆن بێت.

دەگوترێت ژنی وەزیری دارایی، لە یەکێک لەوڵاتە پێشکەوتووەکانی خودا، پێویستی بەهەندێک دراوی دەگمەن بووە، چونکە نەخۆش بووە پێویست بووە سەفەری وڵاتێکی خاوەن ئەو دراوە دەگمەنانە بکات، لەوەش ترسا مێردەکەی ئیمزای لەسەر ئەو بڕە پارە بۆ بکات کە پێویستیەتی، بۆیە وەک خەڵک دەچێت لەبەر دەرگای بانکی تایبەت دەوەستێت، بۆ ئەوەی بەشێک پاداشتی بەرکەوێت.

ئەو وەزیرە لە ڕووی سروشتی مرۆڤایەتیەوە جیاوازییەکی لەگەڵ هارون ڕەشید نەبووە، هەردووکیان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە لە خوا دەترسن و داوای هەق و ڕاستی دەکەن، هۆکاری جیاوازییەکە ئەوەیە ڕەشید ئەوەی دەیویست دەیکرد کەس لێپرسینەوە و دژایەتی نەدەکرد، بۆیە بینیمان بە پارەی خەڵک سێ هەزار کەنیزەی کڕی، کەچی وەزیری هاوڕێمان ئەوە ڕەتدەکاتەوە ئیمزا لەسەر کاغەزێکی ژنە نەخۆشەکەی بکات، چونکە لەوە دەترسێت ڕای گشتی گوێبیستی ئەوەبێت و حیزبی ئۆپۆزسیۆنش ئەو هەلە بقۆزێتەوە و ئاشکرای بکات و هەرایەکی لەسەر دروست بکات کە دامرکانەوەی نەبێت.

***

ئەو نموونە باڵایانەی کە حیزبەکانی ئۆپۆزسیۆن بانگەشەی بۆ دەکەن، ناتوانرێت لەسەر زەوی پراکتیزە بکرێت، سوودەکەی تەنها لەوەیە وەک چەکێک لە دژی ئەرکەسانە بەکاردێت، کە بەرژەوەندی گشتی پەخشان و تەخشان دەکەن، ماقوڵ نییە لەسەر ئەو زەوییە رۆژانێک بێت خەڵک بتوانێت ئەو ئایدیاڵەی خۆیان بەتەواوی بەدەست بهێنن.

نموونەی باڵا بریتییە لە سیمبولی ئەو بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەی کە تا رۆژی دوایی ئارام بوونەوەی بۆ نییە. هەرچەندە خەڵک لە پێگەکەی خۆیان تۆزێک بەرزتر ببنەوە، دەبینین ئەو ئایدیاڵانەش بەرزدەبنەوە و هانیان دەدات جارێکی دیکە سەرکەونەوە. بەمشێوەیەش دەبینی مرۆڤ لە وچانێکی بەردەوام دایە ئاسوودەیی و حەوانەوەی نییە. کەموکوڕی بڕیانی یوتوپیا ئەوەیە ئایدیاڵەکانی خۆیان لەسەر هەور داناوە و لەو زەوییەی نزیک ناکەنەوە کە تێیدا دەژین. بۆیە دەبینین ئایدیاڵی ئەوان هانی کۆمەڵگا نادات جووڵە بکات. ئەو ئایدیاڵانە بە ئاسمانەوە هەڵواسراون، خەڵک لەپێگەیشتنیان بێ ئومێد بووە، بۆیە لە گوفتاریان باسی دەکەن و لە کارەکانیان لێیان دوور دەکەونەوە. کەچی ئایدیاڵی ئۆپۆزسیۆن لە سەردەمی نوێ دا نزمە و بەلایەنی کەمەوە بەئاسانی بەشێکی بەدەست دەخرێت.

حیزبانی ئۆپۆزسیۆن داوای دادپەروەری رەها ناکەن کە لەو جیهانەمان بوونی نەبێت، بەڵکو داوای بەرزکردنەوەی کرێی کرێکاران و دروستکردنی شوێنی نیشتەجێبوون، بۆ کەسانی داهات نزم، بەخۆڕایکردنی خوێندن، دابینکردنی دەرمان و شتی لەو بابەتانە دەکەن. بۆ نموونە ئەگەر کرێی کرێکاران بەرزکرایەوە، ئەوا ئۆپۆزسیۆن داوا دەکات جارێکی دیکە بەرزبکرێتەوە، ئەگەر ماڵ بۆ کەسانی کەمدەرامەت دابین کرا، ئەوا ئۆپۆزسیۆن داوا دەکات ماڵەکان رادیۆ و تەلەفزیۆن و سەلاجەیان بۆ دابین بکرێت. بەمشێوەیە ئاستی بژێوی بەرزدەبێتەوە و لەگەڵ ئەویش ئایدیاڵەکە بەرزدەبێتەوە، بۆ ئەوەی لە ئەرکی ماندانەکەی بۆ سەرکەوتن بەردەوام بێت.

لە سەردەمی کۆندا لەتوانادا نەبووە رکابەری دیموکراسیانە بەرقەرار بێت، لە شێوەی ئەوەی لەرۆژگاری ئەمڕۆدا لە وڵاتە پێشکەوتووەکان ئەنجام دەدرێت، کە بە هێمنییەکی ڕێژەیی و بێ خوێنڕشتن وەسف دەکرێت. ململانێ لەرابردوو دا لەسەر بنەماڵەی زاڵبوون بەشمشێر و خوێنڕشتن بوو، کەسێك لە توانای نەبوو بەسوڵتان بڵێت:" تۆ هەڵەی تۆ ستەمکاری" بێ ئەوەی شمشێر و رایەخی مەرگی بۆ ئامادە نەکرێت. لێرەدا پیاوانی ئایینی بەرەورووی ئەو کەسە دەبنەوە و بە زەندیق و یاخیبووی میری موسڵمانانی ناودەبن، کە خوا بەسەر بەندەکانی فەرزکردووە ملکەچی بن. لە رابردوودا بنەمای ململانێ چەك بوو، ئۆپۆزسیۆن نەیدەتوانی سەرکەوتوو بێت ئەگەر چەك و هەڵمەتی چەکداری نەبووایە بۆ ئەوەی لە حیزبی سوڵتانی بباتەوە. ئەم هۆکارەش بوو وایکرد لەسەردەمی کۆندا پێشکەوتنی شارستانی زۆر هێواش بێت، چونکە رکابەری حیزبەکان زۆری تێدەچوو، کەسێك بوێریی ئەوەی نەبوو ئەنجامی بدات، تەنها پیاوە سەرکێش و ئازاکان و خاوەنی نموونە باڵاکان نەبێت.

بەڵام ئەمڕۆ حیزبی ئۆپۆزسیۆن تەنها پێویستی بەوەیە پرەنسیپەکانی خۆی لە رێگای رۆژنامە و رادیۆ و وتار بڵاو بکاتەوە، حیزبی دەسەڵاتداریش بە رۆژنامە و رادیۆ و پروپاگەندە وەڵامی دەداتەوە.رای گشتیش سەیری ئەو شەڕە دەکات، دواتر لە کۆتاییدا کاغەزەکەی دەخاتە ناو سەندوقی دەنگدانەوە، بەمەش خوا باوەڕداران لە جەنگ بەدوور دەگرێت.

بۆیە راستە ئەگەر بڵێین رکابەری لەقۆناغی شەڕی خوێناوی بۆ رێگای رکابەری کاغەزی گوازراوەتەوە. بەمەش شارستانیەت لە رێڕەوی خۆی خێرا رادەکات و ئایندەی خۆی نازانێت. ئەوەی شایەنە بگوترێت ئەوەیە، کە گەلانی نوێ لە رکابەرییەکانیان تەنها بەوەرگرتنی شێوازێکی نوێی بیرکردنەوە بەو ئاروەژخە ئارامە نەگەیشتوون، چەندین هۆکاری دیکە ل مەیاندا هاوکاری کردوون:

١–دروستکردنی باوەڕ و چەکی ئاگرینی نوێ.

٢- داهێنانی چاپخانە و ڕۆژنامەگەریی و... هتد

بارووە توانی بەسەر هەڵمەتی شمشێری ئەو عەنتەرانە زاڵ بێت، کە هێزی بازوو و خۆشەویستی زەبریان هەبووە، ئەمڕۆ هەر مرۆڤێک دەتوانێ چەك بەکاربهێنێت، تەنانەت ئەگەر ئافرەتێکی بێ هێز و کورتەباڵایەکی لاوازیش بێت. بەمەش جیاوازی لە نێوان هێزی دەسەڵاتدار و هێزی خەڵك کەمتر بۆتەوە؛ رەعیەت دەتوانێ بە هەمان ئەو چەکە سوڵتان لەناو ببات، کە خودی سوڵتان لە دژی ئەوان بەکاری دەهێنێ، کەچی لە سەردەمی کۆندا سوڵتان چەندین داردەست و پیاوی ناوقەلا و سەربازی مەشقپێکراوی هەبوو، کە حیزبی ئۆپۆزسیۆن نەیدەتوانێ رکابەری بکات.

بۆیە دەبینین لە سەردەمە نوێیەکاندا ژمارەی شۆڕشەکان زۆرترە، ئەگەر بەکۆن بەراورد بکرێت. فەرەنسا بە قۆناغێك تێپەڕیووە زوو زوو مەتەرێز لە شەقامەکان دادەنرا، دەسەڵاتدار ماوەیەکی زۆر کورت لە دەسەڵات نەدەمایەوە دەبینی خەڵك لە دژی رادەپەڕین و گوللەیان ئاراستەی سەربازەکانی پشت مەتەرێزەکان دەگرت. شۆڕشەکان ئەوەیان لە دەسەڵاتدار گەیاندووە کە باشترە وەڵامی ئارەزووی خەڵك بداتەوە و هەر کاتێك ویستیان لە تەختی حوکمڕانی بێتەخوارەوە. لێرەشەوە سیستەمی هەڵبژاردن و دەنگدان شوێنی ململانێی خوێناوی و تەقەی گرتووە.

لێرەوە نابێت ڕۆڵی چاپخانە و ڕۆژنامەگەری لەوپێشکەوتنە بەرچاوە لەیاد بکەین. رای گشتی لە وڵاتانی پێگەشتوو لەخۆوە پێڕانەگەیشتووە؛ تەنها دوای ئەوەی تاکەکانی چاپخانە و بڵاوکراوەی بە هەموو جۆرەکانی لەبەردەست بووە. بەمەش پەردە لەسەر کۆشکی دەسەڵاتداران لادرا. خەڵك باسی خراپ و کەموکورییەکانیان دەکرد، وەك چۆن پێشینان باسیان لە عەنتەرەی عەبسی و ئەبو زەیدی هیلالی دەکرد. هەر لەبەر ئەمەشە واعیزی سوڵتانەکان ناتوانن فێڵ لە خەڵك بکەن و بەوە رازییان بکەن کە دەسەڵاتدار بە فەرمانی خوا حوکم دەکات و بە فەرمانی خودا چێژ وەردەگرێت.

دەتوانین بڵێین دیموکراسی نوێ لەسەر دوو کۆڵەکە وەستاوە، یەکەمیان باڕووده، دووەمیان چاپەمەنییە. بۆیە زەحمەتە دەسەڵاتدار بتوانێت خۆی بە شمشێری داردەست و دەردەستی قەڵەم بپارێزێت کە ئێمە دووەمیان بە واعیزی سوڵتان ناوبردووە، تەنها ئەوەیە دەبێت دەسەڵاتدار ملکەچی خواستی رای گشتی بێت، ئەگینا لەناودەچێت و واعیز و داردەست دادی نادات.

***

رەنگە یەکێك بپرسێت و بڵێت: بۆچی دیموکراسی لە وڵاتی ئێمە و لە وڵاتانی ئەمریکای باشور و دوورگەکانی رۆژئاوا و رۆژهەڵاتی هیند سەرنەکەوتووە، کەچی چەکی نوێ وچاپەمەنی نوێی تێدا فەراهەم بووە؟ بۆ وەڵامدانەوە پێویستمان بەوەدیە کە لە سروشتی قۆناغی گواستنەوە بگەین کە ئەو وڵاتانەی پێدا تێپەڕ دەبێت، چونکە بەهەمان ئەو قۆناغە تێدەپەڕن کە وڵاتانی پێشکەوتوو لە سەرەتای سەدە نوێیەکان پێیدا تێپەڕبون.

خەڵك لێرە هێشتا بە عەقڵیەتی سەدە کۆنەکان دەژین و لۆژیکی کۆنیان بەسەر زاڵە؛ ئەویش لۆژیکی عەقیلەتی رەهایە کە کۆمەڵێك بەتەنها بۆ خۆی قۆرخ دەکات. ئەگەر بەیەکێکیان بڵێیت (تۆ هەڵەی) وادەزانێ گوتوتە(تۆ دەبەنگی) ئەوا خەنجەرەکەی هەڵدەکێشێ و لەورگتی گیردەکات. ئەگەر بەئەدەب بوو ئەمەی نەکرد ئەوا قینی خۆی دەشارێتەوە و لەبیری ناکات، تا تۆڵەت لێ نەکاتەوە.

یەکێك لە شێخی عەشیرەتە عێراقییەکان دانیشتنێکی پەرلەمانی ئینگلیزی دەبینێ رکابەریی و شەڕە قسەیەکی توند لە نێوان دوو ئەندام دەبینێت کەیەکێکیان لە ریزی ئۆپۆزسیۆنە و ئەویتریان لە ریزی دەسەڵاتە. دوای تەواوبوونی دانیشتنەکە شێخی بەڕێز دەچێتە چێشتخانەیەکی نزیك دەبینێ ئەوانەی بەر لە کاتژمێرێك بەشەڕهاتبوون، لەسەر یەك خوان دانیشتوون و بەیەکە بەزم و پێکەنین دەکەن.

شێخ تووشی شۆك دەبێت و بەو مانایە بە رێبەرە ئینگلیزەکەی دەڵێ"" قوڕ بەسەرتان، ئەمە گەشمەڕچارییە، وا هەست دەکەم کە نوێنەرانی ئێمە ملمانێ

دەکەن، بۆ ئەوەی فێڵ لە ئێوە بکەن، ئەوان شەڕ دەکەن لە شێوەی ئەو مزانەی کە شەڕیان بۆ ئەوەبووە لێفەکەی مەلا مەشهور بدزن". ئینگلیزەکە زەردەخەنەیەکی واتەداری بۆ دەکات و وەڵامی ناداتەوە، ئەگەر ویستی وەڵامدانەوەی هەبووایە دەیگوت" ئەمەیە دیموکراسی".

ئینگلیز بەر لە دوو سێ سەدە، وەک ئێمە بوون، بەڵام دوای ئەوەی بەزنجیرەیەک ئەزموونی سەخت تێپەڕین، ئەوا لەو جۆرە دیموکراسییە ڕاهاتوون. دیموکراسیەت بەر لەوەی بیرۆکەیەکی یۆتۆپی بێت، ئەوا نەریتێکی کۆمەڵایەتییە. ئێمە پێویستیمان بەئەنجامدانی هەیە دوای ئەوەی چەندین ئەزموونی سەخت دەبینین. ئێمە لەوانەیە ئەنجامی بدەین و چەند جارێک بکەین، تا ئەوکاتەی لۆژیکی دیموکراسی لە ناوەخنی تێگەیشتن و نەریتمان چەسپ دەبێت. ئەوکاتە لە قاوڵغی فیکرە کۆنەکەی خۆمان دەردەچین و بەرەو جیهانێکی فراوانتر دەچین، کە تێیدا ڕکابەریی و هاوکاریی بەیەوەکەوە بەندن و لە یەکتر جیانابنەوە.

زانایانی کۆمەڵناسی ئەو سیستەمە سیاسییەیان شارتووێ کردووە، کە لە وڵاتانی ئەمریکای ناوەڕاست و باشوور و کەنارەکانی هیند هەیە. لە ئەنجامدا ئەو شتە سەیرەیان بۆ دەرکەوت: هەر یەکێک بگاتە کورسی دەسەڵات ئەوا بەزەبری شمشێر ئەبێت نابەتە خوارەوە. شتێکیش بە ناوی هەڵبژاردن و دەنگدانی زۆر پەردە نییە.

هەر سەرۆکێک چاوی بڕیوەتە کورسی دەسەڵات، بەدوای هەلێک دەگەڕێت بۆ ئەوەی لایەنگر کۆبکاتەوە و بانگەوازی شۆڕش بکات. ئەگەریش گەیشتە کورسی دەسەڵات ئەوا سەرۆکێکی دیکە چاو لە کورسی دەبڕێت و بۆ ئەمەش لایەنگر کۆدەکاتەوە و ئامادەیی بۆ شۆڕشێکی نوێ ئەنجام دەدات.

لەوێ هەڵبژاردن شێوەی شۆڕشێکی چەکداریی دەگرێتەخۆ، هەر سەرکردەیەک بەخۆی دەڵێ:" بۆچی خەڵکی دیکە دەگەنە دەسەڵات، کەچی من پێی ناگەم، ئایا ئەوان لە من باشترن؟"

بەلای خوێنەرەوە سەیر نەبێت کە بەهەر شێوەیەك بێت، ئەو جۆرە باشترە لە سیستەمی زۆرداری، چونکە فەرمانڕەوای نوێ دەیەوێت تەنگی ئەیارەکەی پێشووی دەربخات و هەندێك چاکسازی ئەنجام بدات، جا زۆر بێت یان کەم. کەواتە وڵاتیش بەو ڕکابەریی و پێشبڕکێیە پێشدەکەوێت؛ کەچی بەشێکی زۆر لە خوێن و کۆشش و سامان سەرف دەکەن. ئەمە چاکترە لە سیستەمی ستەمکاریی، بەڵام دیموکراسی لەمەش باشترە. چونکە لەوەیاندا ڕکابەریی و ململانێش ئەنجام دەدرێت بێئەوەی کۆشش بەفیرۆ بدرێت و خوێن بڕژێت.

سیچەر هێمەرتۆن باسی کۆماری هایتیمان بۆ دەکات کە لەنێوان ١٨٠٧–١٩١٥ سەربەخۆ بووە، ئەو دەڵێ:" ئەو سەرۆکایەتەی کە لە وماوەیەدا حوکمڕانیان کردووە، گەیشتە ٢٤ سەرۆك. هیچیان بە سەلامەتی ماوەی دەسەڵاتیان تەواو نەکردووە، دووان نەبێت. کەچی ئەوانی دیکەی لە دەسەڵات بەکوشتن و ژەهر و کەنارگیرکردن لابراون. ئەوانەی بەشۆڕش لابراون ژمارەیان ١٧ یە. لەساڵی ١٩١٥ سەرۆك گلیوم بە هەرای شۆڕشگێران لادرا، ئەو سەرەتا پەنای بۆ کونسولیەی فەرەنسی برد بەڵام ئەمە دادی نەدا، تەگەیشتە ئەوێ گوللەی بەرکەوت. کەوتە سەرشەقام و خەڵتانی خوێن بوو"[٤٧].

ئەوەی مێژووی سوریا لە سەربەخۆییەوە تا ئێستا بخوێنێتەوە[٤٨]، یان مێژووی عێراق لە نێوان ١٩٢٣–١٩٤١ بخوێنێتەوە[٤٩]. دەبینێ ڕووداوەکانی هاوشێوەی ڕووداوەکانی هایتییە، لەمەشیاندا سەرنج بۆ خوێنەری بەهۆش جێدەهێڵم.

[٤٧] Hammerton(ed)people of all nations p684

[٤٨] غسان تويني، منطق القوة، او فلسفة الانقلابات في الشرق الادنى

[٤٩] Khadduri.inpependent iraq

# جۆرەکانی
# رکابەریی و هۆکارەکانی



پرۆفیسۆر کارڤەر پێیوایە رکابەری چوارجۆری هەیە[١٠]:-

١-جۆری یەکەم: ترمەتریقیانە، کە زۆر نزیکە لە سروشتە سەرەتاییەکەی ئاژەڵ. هێز لەو جۆرەدا شوێنی یەکەمی دەبێت، خاوەنەکەی هێز بۆ تێکشکاندن و ئازاردانی نەیارەکەی بەکاردەهێنێت، ئەو جۆرە چەندین شێوەی جیاوازی هەیە؛ لەوانە جەنگ و زۆرانبازی و شەڕە جنێو وتاڵان وهەتکردنی پاکیزە وجۆرەکانی دیکەی هاوشێوەی ئەو تاوانانە.

٢-جۆری دووەم :جۆرێك لە دیدگاو بەکارهێنانی زیرەکی تێدایە. واتە لە جۆری یەکەم پێشکەوتووترە ، ئەوجۆرەیان لە شێوەی دژی وتەڵەکەبازیی ئەو شێوانەی رکابەری دەبێت کە لە پەنای پەردەوە ئەنجام دەدرێن.

---

[١٠] Bogardus, development of social thought, P370-372

٣- جۆری سێیەم لە ڕکابەریی مرۆڤایەتی ئەمڕۆ خەریکە هەموو دونیای شارستانی دەگەڕێتەوە، چەندین شێوەی جیاواز لەخۆیەوە دەگرێت. لەواتە ئەو پیاهەڵدانەی کە لە نێوان ژن و پیاوان هەیە، لە نێوان حیزبەکان لە شێوەی هەڵبژاردن و فیستیڤاڵ دەبێت. لە نێوان کۆمپانیاکان لە شێوەی ڕێکلامی ڕەنگاوڕەنگ دەبێت، لە نێو خاوەن کێشەکان لە دادگا لە مشتومڕی پارێزەران دەبێت. لە نێوان تایفی سیاسی و ئایینی شێوەی خزم خزمێنە و واستەو لایەنگیری و ئەم جۆرە شتانە دەبێت.

٤- جۆری چوارەم: ئەمەیان هیوای ئەوە دەخوازێ هەموو دونیا بگرێتەوە، چونکە بەرفەمهێنەرە ، ئەمەش جۆرە ڕکابەری زانستی و ئابوری و سیاسی و کۆمەڵایەتی لە خۆوە دەگرێت کە لەسەر بنەمایەکی هێمن ئەنجام دەدرێت و ڕق و کینەی تێدانییە.

٥- جۆری پێنجەم هەیە ناتوانین بەرکابەری ناو ببەین و بەبینینی ئەو جۆرە ئاسوودە دەبین و ئێمەش لەسەر کورسی خۆمان دانیشتووین ، ئێمە سەیری یارییە وەرزشییەکان دەکەین جۆش و خرۆشمان بۆی دەبێت وادەست دەکەین ئێمەش لەناو یارییەکانین. یا سەیری فیلمێکی سینەمایی دەکەین، لە بارەی ڕاوەدوونان و ململانێ و جەنگی سەخت ، کەچی دڵخۆش دەبین . بەهەر حاڵ ئەمە جۆرێکە دروستکراوە و لە چوارچێوەیەکی دیاریکراو ئەنجام دەدرێت، بە بینینیان مرۆڤ جۆرێك لە بێشوو و ئاسوودەیی دەروونی وەردەگرێت.

کەوڵتە مرۆڤ لە کرۆکی خۆی دا لە ڕکابەری ڕاهاتووە، ئەگەر ڕکابەری ڕاستەقینەش دەبێت، ئەوا جۆرێکی وەهمی بۆخۆی دروست دەکات . بەهەر حاڵ مرۆڤ ناتوانێت خۆی لە ڕەوتی ڕکابەری نەجات بدات، تەنها ئەوە نەبێت لە جۆرێکەوە دەچێتە سەر جۆرێکی دیکە. تێبینی ئەوەش دەکرێت لەگەڵ پێشکەوتنی شارستانیەت لە ئاستێکی نزمی ڕکابەری بۆ ئاستێکی بەرزتر دەچێت جاران پیاو ژنی تاڵان دەکردو دەیفڕاند، دواتر بەپارەو پێکەو فیلمەکانی دەیکڕی ئێستا غەزەلی بۆ دەخوێنێ ودەڵێ: " لە خۆشەویستیت دەمرم" لەڕاستیشدا ئەو دەیەوێ چێژی لێ

ببینێت وتەنها بۆخۆی بێت, ئەگینا بۆ تووڕە دەبێت کاتێک مرۆڤێکی دیکە بۆ ئەو ئافرەتە غەزەلخوانی بکات "

ئەمە بابەتی کێبڕکێی و رکابەرییە لەسەر مانەوە ( تۆ یان ئەو ) خۆشەویستی لەوکاتە جۆرە تۆڕێکە وەک تۆڕی جاڵجاڵۆکە، خاوەنەکەی ئارەزووی هەر یەکێک بکات ئەوا بەو تۆڕە راوی دەکات.ئەو خۆشەویستیەش وەک فێڵی ( دادپەروەریی) یە . کە پارێزەران و سیاسی و بازرگانەکان بانگەشەی بۆ دەکەن. کەچی مەبەست تەنها بەرژەوەندی خۆیانە، دواجاریش ژن لە نهێنی ئەو فێڵە تێگەیشت، بۆیە بە خۆشەویستەکەی دەڵێ: "لە پێناو خۆشەویستیت دەتوێمەوە" کەچی لەراستیدا ئەو بۆ چێژ وبەرژەوەندی تایبەتی خۆی دەتوێنەوە.

لەراستیدا ژیانی کۆمەڵایەتی شتێک نییە، جگە لە ململانێی بەردەوامی نێوان بەرژەوەندییە تایبەتەکان، تەواو وەک رکابەریی نێوان بازرگانەکان، هەرکەسە بۆخۆی هەوڵدەدات، بەڵام کۆمەڵگا لەو ململانێیە سوودمەند دەبێ، کە بۆ بەرژەوەندییە تایبەتیەکان ئەنجام دەدرێت. واتە ئەو بە ئەنجامی داوای خۆی دەکات، کە بەهۆی ئەویشەوە سەرمایەی زانستی و ئابووری و کۆمەڵایەتی زیاد دەبێت .

کاتێک کۆمەڵگاش ئەو سامانەی لە ئەنجامی ململانێی نێوان تاکەکانی دەست دەکەوێت ئەوا باجێکی زۆریشی بۆ دەدات، لە پێناویدا گیان دەکێشرێت وخوێن دەڕژێت و دڵ دەسوتێ. وەک پێشتر بینیمان کێشەی ژیان ئەوەیە هیچ شتێک بەبێ نرخ نادات، دەبێت بۆ هەنگوین پێوەدانی هەنگ هەمیشە هەبێت وەک شاعیرێکی کۆن دەڵێت .

دونیای مەدەنییەت دەیەوێت ئەمڕۆ جۆری رکابەریی کۆمەڵایەتی نەرم بکاتەوە و ئاستیان بەرز بکاتەوە. تێبینی دەکەین لە ناو هەرنەتەوەیەکی پێشکەوتوو شەڕ و تاڵان و هەتکردن کەم بۆتەوە ئەگەر بە رابردوو بەراورد

بکرێت. هەندێك لە نەتەوە پێشکەوتووەکانیش لەسەر شێوازی رکابەری کۆن ماونەتەوە، ئەو جەنگە گەورانەی جیهان شتێك نییە جگە لە نموونەی ئاشکرای ئەو رکابەرییە کۆنە. ئێمە چاوەڕێی ئەو رۆژە دەکەین کە تێیدا جەنگی دەرەوە کەمبێتەوە وەك چۆن جەنگی ناوخۆ لە دونیای مەدەنیەت نەماوە، ئەوکاتەش خەڵك بەرکابەری ئابووریی و مشتومڕی مەبدەئیی ورکابەری سیاسی خەریك دەبێت بێ ئەوەی شمشێر بگرنە دەست ویەکتر بکوژن، ئایا ئەو رۆژگارە دێت ؟ ئەمەیان خوا دەزانێ .

***

پرۆفیسۆر کارڤەر دەڵێ رکابەری سیفەتی سەرەکی سروشتی مرۆڤە[٦١]، تەنانەت بەبڕوای ئەو هاوکاریی جۆرێکە لە رکابەری.مرۆڤ کاتێك هاوکاریی لەگەڵ کۆمەڵە کەسێك دەکات، بۆئەوەیە لە رکابەری گرووپێکی دیکە سەرکەوتوتر بێت، کارڤەر هۆکاری ململانێی مرۆڤایەتی بۆ دوو هۆکار دەگێڕێتەوە وهەردوو هۆکاریش بەسروشتی مرۆڤ دەزانێ، ئەوانیش :-

١-مەحاڵبوونی تێرکردنی سەرجەم پێداویستیەکانی مرۆڤ .

٢- خۆشەویستی مرۆڤ بۆ خودی خۆی، زێدەڕۆیی کردن لە هەڵسەنگاندنی خۆی[٦٢] .

لێرەدا دەمانەوێت بەوردتر شرۆڤەی ئەم دوو هۆکارە بکەین.

لەبارەی هۆکاری یەکەمەوە لەوانەیە یەکێك بڵێ :-دەتوانرێت پێداویستیەکانی مرۆڤ هەمووی دابین بکرێت، ئەگەر چاکسازی لە سیستەمی بەرهەمهێنان ودابەشکردن بکرێت. ئەمە رەنگە لە سەرەتادا راست بێت، بەڵام ئەگەرهاتوو دیقەتی ڕەوتی هەڵپەکردن بدەین کە مرۆڤ لەسەری راهاتووە، ئەوا هەست بەوە دەکەین تێر نابێت ئەگەر هەموو دونیاش موڵکی ئەو بێت. ئێمە

---

Ibid,p372 [٦١]

Carver, principles of political economy, p37 [٦٢]

باوەڕمان بە پێویستی چاکسازی سیستەمی بەرهەم ودابەشکردن هەیە لەنێوان مرۆڤەکان، ئەمەش بۆ ئەوەی لەکەمی پێداویستییە بنەڕەتییەکانی وەک خۆراک وپۆشاک وشوێنی حەوانەوە ودەرمان و فێرکردن نەجاتیان بدەین، بەڵام مرۆڤ بەوەندە وازناهێنێت، ئەو بەدوای پێداویستی دیکە دەبێت، چونکە کاتێک تێر دەبێت ئەوا گرنگترین ڕەگەزەکانی جوڵانەوەی پێویست لە ژیانیدا لەدەست دەدات کە پێشتر باسمان کرد.

ئەوەی ئەمرۆ بە پێداویستییەکانی خۆشگوزەرانی و کەمالی دەزانین، لە ڕۆژانی داهاتوو دەبێتە پێداویستی سەرەکی و مرۆڤ ناتوانێت دەستبەرداری بێت. لەوانەیە ڕادیۆ لەلای جووتیارانی ئێمە هۆکاری خۆشگوزەرانی بێت تەنها بەختەوەرەکان هەیانە، بەڵام لە لای جووتیارانی ڕۆژئاوا پێداویستی سەرەکییە ئەو ناتوانێت بێ ڕادیۆ هەڵبکات. سەبارەت بەتەلەفزیۆنیش کە ئەمڕۆ لە لای جوتیاری ڕۆژئاوایی بۆ خۆشگوزەرانییە، دوای چەند ساڵێک دەبێتە پێداویستی سەرەکی. بەمشێوەیە ئاستی بژێوی مرۆڤ بەرزدەبێتەوە ومرۆڤ هەر ڕۆژێک چاودەبڕێتە شتێکی نوێ .

مرۆڤ لە جوولەیەکی پێشکەوتنی بەردەوام دایە، ئەمەش نهێنی شارستانییەتیەکەیەتی، ئەگەر ببینێت کولێرەیەکی بەدەستەوە گرتووە، بە نێوچەوانی دەنێت و دەڵێ: " سوپاس بۆ نیعمەتی خوا ."

ئەوە بزانە ڕۆژانی داهاتوو کاتێک کوڵمی جوانێک ماچ دەکات، ئەمە لە بری کولێرەکە ئەمە دەکات، لەوانەشە دوای ئەم کوڵمە بێ شوکرانەی خودا سەفتەیەک پارە ماچ بکات .

***

لەوانەیە یەکێکمان خەیاڵی ئەوە بکات، ئەگەر هەندێک پێداویستی دیاریکراوی بۆ دابین بکرێت، ئەوا هیچی تری ناوێت. بۆ نموونە ئەو وێنای ئەوە دەکات ئەگەر کۆشکێکی فراوان وباخچەیەکی جوان و ژنێکی شۆخ

وئۆتۆمبێلێکی چاك وداهاتێکی زۆری هەبێت ئەوا دڵخۆش دەبێت لە دوای ئەمە پێویستی بەشتێکی دیکە نابێت .ئەوە هەڵەیە، ئەو کاتێك ئەو وەهمە دەکات کاتێك ئەو شتە نایابانەی نەبێت، بەڵام کاتێك ئەوانەی دەبێت لێیان بێزار دەبێت جا چاودەبڕێتە کەشتی و فڕۆکە و وەزارەت و پێگەی مەزن .

نوسەری رۆمانی ( رێگای فیل ) باس لە کچێك دەکات لەناکاو لە کرێکاری کۆگایەکی کتێب لە لەندەن دەبێتە شازادەیەك لە کۆشکێکی هاوشێوەی کۆشکەکانی هەزارو یەك شەوە لە سیلان. لێرەوە کچە خۆی لە جیهانێکی جوان و نایاب دەدۆزێتەوە، کە بە کارەکەر ودەستوپێوەند دەوردراوە، هاوسەرێکی قۆزی هەیە چاودێریی دەکات ودونیا بەهەموو شتەکانی خۆیەوە کڕنۆش بۆ ئەم کچە دەبات. کەچی ئەمە تەنها ماوەیەکی کورتە، دەبینین کچە دڵتەنگ دەبێت وچاو دەبڕێتە خۆشەویستی ودیمەنێکی نوێ، ئەوەی شاوتوێی ژیانی کچانی هۆلیوّد دەکات دەبینی هەریەکەیان بە تەنگەژەیەکی دەروونی وەها تێپەڕدەبێت، ئەو لە سەماکەرێکی ئاست نزم یان قوتابییەکی ئاسایی، دەبێتە شاژنێك پێگەیەکی وەهای دەبێت، کە لە رۆژگاری پێشوودا نەخۆی و نەدایك و داپیرەی لە خەونیش نەیانبینیبوە. بۆیەش تێبینیی ئەوە دەکەین هەر رۆژە و چاودەبڕێتە مێردێکی نوێ، هەندێکجاریش پەنا دەباتە بەرخۆکوشتن ئەگەر نەتوانێ خۆشەویستێك یان خەلاتێك وەك کچە هاوکارەکانی بەدەست بهێنێ .

دەگێڕنەوە پیاوێکی لادێی سادە بۆ یەکەمجار هاتۆتە بەغدا، بەلای دوکانێکی شیرنەمەنی تێدەپەڕێت، تووشی شۆك دەبێ کە دەبینێت ئەوەندە شیرینییە بەتامە لە پێشەوەی دوکانەکە لەسەریەك دانراوە، کەچی خاوەنی دوکان لەتەك سنیەکە دانیشتووەو شتێك لەو شیرینیە ناخوات. ئەو وادەزانی دوکاندارەکە کوێرە ئەو شیرنییەی دەوروبەری نابینێ، بەڵام دواتر بۆی دەردەکەوێ کە کوێر نییە، ئەوا سەرسوڕمانی زیاتر دەبێ. ئەو ناتوانێ وێنای

ئەوە بکات کەسێك لە تەنیشت شیرینی دابنیشێ و نەیخوات، هۆکارەکەش ئەوەیە شیرینی لە گوندەکەی ئەوان دەگمەنە. لەوانەیە یەکجار لە ژیانی بیخوات، ئەویش لە بووك گواستنەوەی کوڕی شێخ بێت، خوا بیپارێزێت. بۆیە کاتێك ئەو پاقڵاوە دەخوات هەست بەو بەری چێژ دەکات، سادەیەکەشی پاڵی دەنێت بۆ ئەوەی وابزانێ شیرینی زۆرترین لەزەت دەبەخشێتەوە هەر کەسێك بیخوات و جیاوازی لە نێوان ئەو کەسانە نییە کە زۆر یان کەم دەیخۆن. بۆیە دەبینین ئەو تووشی شۆك دەبێ کاتێك سەیری پیاوێك دەکات لە تەنیشت شیرینی دانیشتووە و هێمن و ئاسایی، لێکی نایەتەخوارەوە وەك ئەوەی لەلای قوڕوقایش دانیشتبێ.

ئەوەی بەسەر ئەو لادێیەسادە هاتووە، لە کاتێك لە کاتەکان بەسەر ئێمەش هاتووە. ئەگەر یەکێك لە ئێمە کچێکی بەناز لەسەر شەقام ببینێ وادەزانێ، ئەگەرهاتوو لەلای بوو یان ماچی کرد دڵخۆشترین کەس دەبێت، کەچی خەیاڵی خاوە، چونکە دەبینین مێردی ئەو کچە لێی بێزاربووە وەك ناوکەخورما تفی دەکاتەوە. ئەو کەسە بەچاوی ئەو لادێیەی سەیری شیرنەمەنی کردبوو، سەیری کچەکە دەکات، هەست بەحاڵی خۆی ناکات کاتێك پەیوەندی لەگەڵ هەبێ شەوو ڕۆژ لەبەر دەستی بێت. ئەوکاتە کچەکە وەك ئەو پاقڵاوەیە دەبێت، کە لادێیەکە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بیخوات، هەر ئەمەش هۆکاری هەڵوەشاندنەوەی سیستەمی هاوسەرگیری بوو لە کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی. کوڕێك شەیدای کچێك دەبێت، دەست دەکات بە غەزەل خوێندن و دەڵێ: " هەتا هەتایە تۆم خۆشدەوێ " دواتر ماچی دەکات وسبەی دێ، ئەوا لە مانگی هەنگوینیی شیرینی دەخۆن. کاتێك مانگی هەنگوینی تەواو دەبێ مانگی زفت دێت. ئەوا دەمەقاڵێ لە نێوانیان پەیدادەبێ و هەرکەسە تۆمەت دەخاتە پاڵ ئەویتر و پەتەکە بۆخۆی رادەکێشێ. هەندێك لە زانایان ئەو دیاردەیان ناوناوە

(گرێی ڕۆمانسی ) و ئەو هەڵوەشاندنەوە زۆرەی توێشی خێزانی نوێ بوو
ئەوەی ڕوویداوە دەگێڕنەوە"[٦٢] .

***

شتێك لە دونیا نییە بەردەوام مرۆڤ چێژی لێوەرگرێت، هەر چێژێك
هەرچەندە مەزن بێت، لە کاتی وەرگرتنی بەرەبەرە کەم دەبێتەوە، ئەمەش لە
زانستی ئابووری ئێمەدا بەیاسای (کەمبونەوەی سوود ) ناودەبرێت .
بەنزیکەیی هەموو مرۆڤەکان تووشی ئەو بەڵایە بوون، ئەو ئارەزوو دەکات
ببێتە وەزیر یان زانایەکی گەورە، یان دەوڵەمەندێك دەبینین حەرام حەڵاڵ
دەکات و حەلاڵ حەرام دەکات لە پێناو ئەمەدا، تا بەو ئامانجەی دەگات بێ
حەسیانەوە ڕادەکات ئەو خۆی دەسوتێنێ بۆ ئەوەی ببێتە سووتەمەنی
هاشێنی شارستانیەت. مرۆڤ لەوەدا فریودراوە بە دوای ئامانجێك ڕادەکات
سوودی بۆ ئەو نییە، بەڵکو شارستانیەتی مرۆڤایەتی لەو ڕاکردنە بەردەوامە
سوودمەند دەبێت.

سروشت چەندین فریودانی بەبریقەی لەبەردەم مرۆڤ داناوە، ئەگەر مرۆڤ بە
بیرکردنەوەیەکی لۆژیکی و بەعەقڵێکی سادە بیر لەم فریودانە بکاتەوە ئەوا
دەزانێ چ داوێکی بۆ دانراوەتەوە. بەڵام لە بەدبەختی یان بەختیاری بێت،
دەگمەن ئەبێ بیر لەوە ناکاتەوە، ئەو سەرقاڵی ڕاکردنە، کاتی ئەوەی نییە
خۆی بۆ بیرکردنەوەیەکی وەها تەرخان بکات.

***

پێغەمبەر محەمەد دەڵێ: " خەڵك نوستووە کە دەمرن بە ئاگادێن" بەڕاستی
ئەوان خەوتوون یان بەواتایەکی دیکە بەکاریگەری سروشتی کۆمەڵایەتی
خەوێنراون، کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە بێشکەوە تا گۆڕ لەژێر ئەو بارە دان.

[٦٢] Elliot and Merrill, social disorganization,chxx

مرۆڤ ئارەزووی هەندێك شت دەكات ئەگەر بێت لێی وردبێتەوە، ئەوا پڕوپووچە شایەنی ئەو هەوڵەو ماندووبوونە نییە. بەڵام ئەو بە پاڵنەری كۆمەڵایەتی پاڵنراوە، كە لە هەندێك لایەنەوە بەخەوتنی موگناتیسی دەچێت[16]. بۆ نموونە ئەو كۆشش بۆ سەرۆكایەتی و ناوبانگی دەكات، ناشزانێ ئەوانە سوودێكی بۆ ئەو نییە. ئەو دەیەوێ كاتێك بە شەقام تێپەڕیت خەڵك پەنجەی بۆ درێژبكەن، ئەو كاتە لوتبەرز دەبێت، تەنها ئەوەندەی دەیەوێ ببێتە بابەتی دانیشتنەكان و بایەخ بەوە نادات كە لە پێناوی ئەوەدا كۆششێكی زۆرو ماندووبوونی زۆری كێشاوە. سەیری ئەو پیاوە شیكە بكە جلی قورس لە قرچەی گەرما دەپۆشێ، ئەو لەو پێناوەدا ئەوەندە زەحمەتی وماندووبوون دەبینێ، مەبەستیشی تەنها سەرنجراكێشانی خەڵكە. ناشزانێ ئەو سەرسامییە سوودی نییە و زیانی هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا ناچارە ئازاری زەبری كۆمەڵایەتی بگرێت .

دەبینین ژن لە سەرماو سۆڵەی زستاندا جلێكی تەنك دەپۆشێ، لەسەرما دەلەرزێ كەچی بە زەردەخەنەیە، گوایە ئەمەی لەبەر سەلیقەیەكی دروست كردووە. دەبینین كراسێكی كورتی لەبەركردووە، كاتێك دادەنیشێ كراسەكەی رادەكێشێتەوە، بۆ ئەوەی رانی دەرنەكەوێ، دواتر لەخۆی ناپرسێ ئەو هۆكارە چییە كە وایكردووە كراسێكی كورت بدورێت ودواتر رایبكێشێتەوە .

سەیری دەكەی دەبینی رۆژێك شتێكی لەسەركردووە وەك پێڵاو كەچی ئەو بە (كڵاو ) ناوی دەبات، بایەخ بەوەش نادات ئەو كڵاوە پێڵاوناسایە بە گرانترین نرخ بكڕێت و پارەی باوك و مێردەكەی بۆ كڕینی نوێترین پۆشاك تاڵان بكات. ئەگەر هاتوو قسەشی لەگەڵ بكەی ئەوا چەندین ئاراوەی نوێت

---

[16] علي الوردي، شخصية الفرد العراقي، ص٢٣-٢٧

بەسەر دەبارێنێ گوایە بۆت دەسەلمێنێ ئەو لە ژنە بێرمەندە پێڕاگەیشتووەکانە.

زۆرجار مرۆڤ خۆی فریو دەدات، وادەزانێ هەموو جوڵانەوەی بە پێی عەقڵێکی دروستە، بۆیە دەبینی قسەی سەنگینت بۆ دەکات، تۆش وادەزانی ئەو بۆتە دانا وتەنها هەقیقەتی ئەبستراکت بەلای ئەو بایەخی هەیە، بەڵام کاتێک لەدوورەوە چاوی بە کچێك دەکەوێ، دەبینی بەپەلە دەست بۆ بۆینباغەکەی دەبات و رێکی دەخات و یان دەست بۆ قژی دەبات بۆ ئەوەی لە رێکوپێکی خۆی دڵنیا بێت.

ئەو هەموو کاتێك کە سەیری ئاوێنە دەکات وادەزانێ لە جوانی گەیشتۆتە ئاستێکی بەرز، ئەگەر بینی تۆ لە جوانی و شیکی رکابەری دەکەیت، ئەوا رق لە تۆ هەڵدەگرێ و چەندین خاڵی دزێوی تۆ دەژمێرێ. مرۆڤ لەوە ڕاهاتووە خۆی بە چاکتر وجیاوازتر دابنێت، ئەگەر ببینێ یەکێك لە کەسە نزیکەکانی لەبەر سیفەتێکی جیاواز خەڵك رێزی لێ دەگرێت، ئەوا ئەو رکابەری دەکات ئەگەر نەیتوانی ئەوا پاساو دەدۆزێتەوە و دەڵێ ئەو سیفەتە بایەخێکی نییە و سیفەتی دیکە هەیە گرنگترەو بۆکۆمەڵگا بەسوودترە. لێرەوە هەوڵ دەدات و ئەو سیفەتە دەداتە پاڵ خۆی، بۆ ئەوەی لەئەنجامیدا بەجۆرێك لە جۆرەکان ئیمتیازی بەرکەوێ. خەڵك ئەو کەسانەیان خۆشناوێ کە ستایشی خۆیان دەکەن، ئەوان باوەڕیان بەو پەندە هەیە، کە دەڵێ: " ئەوەی ستایشی خۆی بکات درۆ دەکات ". کەچی زۆربەی کات کە یەکێك ستایشی خۆی دەکات لە قسەکانی راستگۆیە.

بەڵام خەڵك مەیلیان بەلای رق وسووککردنی ئەوکەسانە هەیە، ئەگەر راستگۆش بن هۆکارەکەش ئەوەیە هەر کەسێك سەرسامە بەخۆی، ئەگەر ببینێ یەکێکی دیکەش خۆی سەرسامە ئەوا رقی لێ دەبێتەوە و بە نەیاروو رکابەری خۆی دەزانێت،چاوی مرۆڤ لەوە ڕانەهاتووە کەسێکی نزیك ببینێت،

لە بوارێکدا لە خۆی بەرزتر بێت. ئەو خۆی بەچەقی دونیاو بەرچاوان دەزانێ، ئەگەر بینیشی کەسێکی دیکە وەهایە، ئەوا رقی لێ دەبێتەوە و ئیرەیی پێدەبات و دەیەوێ لە بەرزی بیهێنێتە خوارەوە. رقی لە هەرکەسێکیش دەبێتەوە، رێز لەو کەسە بگرێت ستایشی چاکەکانی بکات .

تکام لە خوێنەر ئەوەیە، لەوە بگات کە ئەمەی سەرەوە لە رۆژئاوا و رۆژهەڵات سروشتی مرۆڤە. هەندێك لەوانەی خۆیان لێ بووە بەئەورووپی دەڵێن " ئیرەیی لەوڵاتانی رۆژئاوا بوونی نییە "، ئەمەش هەڵەیە چونکە رۆژئاواییەکان وەك ئێمە مرۆڤن، بەڵام ئیرەیی لە لای ئەوان کەمترە بەتایبەتی لە شارە گەورەکان. هۆکارەکەش ئەوەیە لەشارە گەورەکان رکابەریی لەسەر ئاستی کەسی ئەنجام نادرێت. خەڵك لەوێ رکابەریی لەگەڵ یەکتردەکەن بێ ئەوەی یەکتر بناسن. بە مانای ئەوەی رکابەرەکان ناسیاوی یەکتر نین و لەیەك گەڕەك پەروەردە نەکراون. لەبەرئەمەش رکابەری یەکتر دەکەن، بێ ئەوەی هەست بە ئیرەیی بکەن. لێرە ئەو پەندە هاتووە دەڵێ: " کچە گۆرانیبێژی گەڕەك دەنگخۆش نییە، چونکە هۆکارەکە ئەوەیە دەنگی ئەو کچە بەلای ناسیاوەکانی ناخۆشە ، کچیانی گەڕەك دەنگی گۆرانیبێژێکی بیانییان لاخۆشترە، ئەگەر لەو کچەی خۆیان خراپتریش بێت" هۆکارەکەش تەنها ئیرەییە، ناسیاوەکان ئیرەییان لەنێو ریشەکێش ناکرێت. پەندێکی دیکە هەیە کە لە ماناد هەر لەو پەندەی سەرەوە دەچێت، دەڵێ: " دوژمنی مرۆڤ ئەو کەسەیە کە لەگەڵی کاردەکات". ئەو پەندە لەسەر ئەو کەسانەیە، کە خاوەن یەك کارن ولە یەك شوێن کاردەکەن، بەڵام ئەگەر لە یەکتر دوور بن و یەکتر نەناسن، ئەوا ئیرەیی لە نێوانیان کەم وەکەمەن دەبێت .

ئەگەر سەیر بکەین ئیرەیی لە نێو مامۆستایانی زانکۆیەکی گەورەی رۆژئاوا کەمترە، لەوەی لە زانکۆیەکی بچوکی وڵاتێکی بچوك هەیە، چونکە مامۆستایانی زانکۆ گەورەکە لە چەندین شوێنی جیاواز هاتوون، هیچ یەکێك

لەوان هەست بەوە ناکات هاوکارانی لە دیدی ناسیاو وکەسوکاریان رکابەری دەکەن. کەچی مامۆستایانی کۆلیژە بچوکەکە لە رۆژانی سەرەتای خوێندنەوە یەکتر دەناسن، بۆیە لە بەرامبەر خەڵکی شارەکە رکابەرییەکی توند دەکەن .

هەر یەکێك لەوان دەیەوێ ئەویتر بە موحازەرە و نووسینەکەی سووك بکات. خۆی لە دیدی ئەو ئێرەییە بەرزدەکاتەوە کە لە ناخی ئەوان شۆڕبۆتەوە، کاتێك یەکێکیان لەوانی دیکە باڵاتر دەبێت، ئەوا ناسیاوەکانی لێوی رقبوونەوەی لێ دادەگرن بە (تەڵەکەباز ) وەسفی دەکەن دواتر چەندین بەڵگە دەدۆزنەوە بۆ ئەوەی خۆیان بە جیاواز بزانن.

ئەو دیاردەیەش لە نێوان پیاوانی ئایینیش هەیە، بەتایبەتی ئەگەر لە یەك وڵات بژین ئەوا رکابەریی دەکەن، بۆ ئەوەی سەرنجی دانیشتوانی شارەکەیان رابکێشن و زەکاتی ئەوان بەدەست بهێنن. تەنانەت رکابەری نێوان پیاوانی ئایینی بۆتە پەند، یەکێك لەوان پێغەمبەران و پیاوچاکان دەکوژێ، بۆئەوەی بەسەر کەسە ناسیاوەکەی سەرکەوێت.

***

وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، کارفەر رکابەریی مرۆڤایەتی بۆ دوو هۆکار دەگێڕێتەوە و سێیەمی بۆ نییە. یەکەمیان سەحاڵی تێربوونی تەواوی پێداویستیەکانە، دووەمیش زیاد لە پێویست خۆی خۆشدەوێ و بەهای بۆ دادەنێت.وەك دەردەکەوێت ئەو دووهۆکارەش پەیوەستن بەیەکەوە وەك ئەوەی دوو رووی یەك هەقیقەت بن .

بۆیە مرۆڤ کاتێك هەڵپە بۆ شتێك دەکات، وادەزانێ ئەو زیاتر مافی خاوەنداریتی ئەو شتەی هەیە. ئەو خودی شتەکەی ناوێ، بەڵکو دەزانێ کە کەسوکاری هەڵپە بۆ ئەو شتەدەکەن، هەڵپەکردن و بەها دانان بۆ خود پەیوەستن بەیەکترەوە، هەریەکەیان هۆکارو ئەنجامە بۆ ئەویتریان. ئەگەر گریمانەی ئەوە بکەین کە دەتوانین سەرجەم پێداویستیەکانی مرۆڤ دابین

بکەین، ئەوا مرۆڤ هەر لە رکابەری و ململانێ بەردەوام دەبێت. چونکە هەریەکێك وادەزانێ لە بەها وچاکە و پێگە لەواتی دیکە باشترە، بەردەوامیش مرۆڤ هاوار دەکات " بۆچی کەمترت لە هاورێکانم بەمن داوە ، ئایا ئەوان لە من باشترن" .

ئەگەر بەخشینێکی یەکسانت بە هەموویاندا، ئەوا پیاوماقول و گەورەکان بیانو دەگرن ودەڵێن: "چۆن کەسانی نزمتر لە ئێمە لەگەڵ ئێمە یەکسان دەکەن؟ " ئەگەر هاتوو بەپێی چاکەو پێگەی کۆمەڵایەتی بەخشینت بۆیان هەبوو، ئەوا ئاست نزمەکان بیانو دەگرن و هاوار دەکەن "خەڵك وەك ددانی شانە یەکسانن".

ئەمە لە کاتی خەلافەتی عومەر وعەلی کوڕی ئەبو تاڵب روویدا، عومەر بە پێی جیاوازی ئایینی و جیهاد بەخششی بەخەڵك دەدا، ئەو کاتە هۆزی قورەیش تورە بوون، چونکە ئەوان دوایین کەس بوون ئیسلام بوون، کەمترین ئەزموونیان هەبوو، بۆیە قورەیش تا عومەر کوژرا، رقیان لە خۆی وخەلافەتەکەی بوو[65]. تەنانەت دەگوترا ئەوان هانی کوشتنی ئەویان داوە و پیلانیان بۆ گێڕاوە[66] .

کەچی عەلی بەبێ جیاوازی بەخششی بە خەڵك دەدا، جیاوازی نێوان سەردار وژێر دەست نەدەکرد، جیاوازی لەنێوان موسڵمانی کۆن ونوێ نەدەکرد، بۆیە سەرۆك و خانەدانەکان رقیان لەو هەڵگرتبوو، دواتر لێی جیابوونەوە ودەست وپێوەندەکانیشیان لەو دوورکەوتنەوە وەك لە بەشی پێشوو باسمانکرد .

کاتێکیش معاویە هات، وەك عەلی رەچاوی یەکسانی نەکرد، وەك عومەریش نەبوو لەسەر بنەمای ( چاکترین ) هەڵسوکەوت بکات. بەڵکو لە هەڵسوکەوت ئەملاوئەولای دەکرد، چاوی لەویان دادەگرت و چاوی تەنها سەیری ئەو

---

[65] طه حسين ، الفتنة الكبرى، ج١، ص٣٣

[66] عبدالله العلايلي، سمو المعنى، في سمو الذات، ص٣٣

کەسانەی دەکرد کە سوودیان بۆ ئەو هەبوو یان لە ئەوان دەترسا، خەڵکەکەی دیکەشی بێبەش هێشتەوە .

ئەمەیان سیاسەتێکی ستەمکارانەیە، بەڵام خەڵک بێ دەنگ دەکات و بیانو ناگرن و هاوار ناکەن. نارەزایی و هاوارکردن لەو کاتەدا تەنها بەو کەسانە دەکرێت، کە شمشێرێکی تیژ وزمانێکی درێژیان هەیە. معاویەش ئەمانەی رازی کردبوو هێندەی پارە پێ دابوون بێدەنگی کردبوون. کەچی زۆرینەی خەڵک وەک مێگەل بوون نارەزایی و هاواریان نەبوو.ئەوان لەگەڵ هەموو کەسێک دەیانقیژاند، بۆیە معاویە وایکرد ئەوان بۆخۆیان زەوی رابخەن و خۆیان بە ئاسمان دابپۆشن .

ئەوەی شایەنی باسە ئەو سیاسەتە ناتوانێ بۆ ماوەیەکی زۆر خەڵک بێدەنگ بکات، چونکە ئەو لەو رۆژان و هێڵبازانەبوو دەیتوانی سەرچاوەی زیان و قازانج لە خەڵک ئاشکرابکات. بەڵام کاتێک مرد کوڕە دەبەنگەکەی شوێنی ئەوی گرتەوە، بۆیە نارەزایی و هاوار جارێکی دیکە بەرزبویەوە. ناتوانرێت مرۆڤ بەوە رازی بکرێت ماوەیەکی زۆر سەبر بگرێت، چونکە شارستانیەتی مرۆڤایەتی دەبێت لە رێرەوی خۆی بەردەوام بێت و دەبێ ئەو سوتەمەنیەشی هەبێت گیانی خەڵکی پێ بسوتێنێ.

لەوانەیە یەکێک بڵێ : لەوانەیە عەقڵی مرۆڤ توانای ئەوەی هەبێت شێوازێکی زانستی ورد دابهێنێ بۆ ئەوەی بەهرە و توانای خەڵکی پێ بپێورێت و عاقی خەڵک بە تەواوی بەبێ تورەیی و نارەزایی بدات. ئەو کاتە هەموو خەڵک رازی دەبن بە ئاسودەیی دەکەونە سەرکاری خۆیان. ئێمە گومان لەوە ناکەین رۆژێک لە رۆژان زانایان رێگایەکی ورد بۆ پێوانەکردنی بەهرە وتوانای خەڵک دابهێنن، بەڵام خەڵک بەمە رازی دەبێ؟ من گومانم لەوە هەیە. شێوازەکە هەر چەند بەدیقەت بێت، ناتوانێ خەڵک رازی بکات. دەبێت یەکێک لەناو خەڵک دەربکەێت و نارەزایی دەربڕێ وبڵێ " ئەو شێوازە خراپ بەکارهاتووە "

کێشەی هەر شێواز ورێگایەك کە مرۆڤ بەکاریدەهێنێ ئەوەیە، راست و هەڵەی تێدایە، وەك مرۆڤ کەموکوڕی هەیە.

یەکێك لەوەزیرەکانی رژێمی پێشوو، لەعێراق ویستی چاکسازی لەئاکاری خەڵك بکات، بۆیە پۆلیسی دامەزراند. ئەوەی لەبیرکرد کە ئەندامانی پۆلیس مرۆڤن و لەو کۆمەڵگایە گەورەبوونە کە دەمانەوێ چاکسازی تێدا بکەین. کەواتە ئەوانیش خراپی ئەو شێوازە بەکاردەهێنن، کە بۆ چاکسازی خەڵك دانراوە، هەر واشیان کرد بۆیە خەڵك گلەیی لەبەدڕەوشتی پۆلیسی رەوشت دەکرد .

هەموو ئەو رێگایانەی مرۆڤ بۆ رێکخستنی کارەکانی بەکاری دەهێنێ، بەرلەوەی زانستی و عەقڵی بێت مرۆییە، لەبەرئەمەش ئەوانەیە بتوانرێت رێگایەك بۆ هەڵسەنگاندنی بەهرەی مرۆڤ دیاربکرێت و مافی ئەواویان پێ بدرێت. هەموو خەڵکیش بەوە رازی دەبێت، بەڵام ئەو رێگایە دەبێت لە لایەن مرۆڤەوە بەڕێوەببرێت، کێشەکە هەمووی لێرەدا دەردەکەوێت .

گریمان بۆ بەڕێوەبردنی ئەو رێگایە کەسانێکمان دانا، کە لەوپەڕی دانایی و دەستپاکی و دادپەروەری دابن. بەڵام کاتێك لە بەخششدا کەسێك لە سەرووی کەسێکی دیکە دادەنێین، ئەوا ئەو کەسە بە روویان فوت دەبێتەوە وبە ستەمکار تۆمەتباریان دەکات. ئەو کاتە دادپەروەری ودەستپاکی دادی ئەوان نادات. ئەوەی بەشی خۆی کەمتر لەکەسانی دیکە وەردەگرێت ئەوا تورەدەبێ و بیانوو دەگرێت، کە ئەگەر هاتوو شتەکە لە لایەن پێغەمبەری خوداش ( د. خ ) بەخشرابێت. جا ئەگەر ئەو کەسە بەئاشکرا نارەزایی خۆی دەرنەبڕی ئەوا بەنهێنی تورە دەبێت، هەوڵیش بدات بە عەقڵ و ئیرادەی بەهێز سەرکۆنەی ئەو تورەییە بکات، ئەوا تورەیی بەئەستی شۆردەبێتەوە، ئەو کاتیش دەبێتە گرێیەك دەرمانی نابێت .

مامۆستایان بەڕوونترین شێوە لەکاتی تاقیکردنەوە تێبینی ئەوەیان لەقوتابیەکان کردووە، هیچ قوتابییەك بە نمرەکەی خۆی رازی نییە ئەگەر نزم بێت. هەرکاتێ ئەنجامەکان ئاشکرا دەکرێت دەبینی خاوەن نمرە نزمەکان لە قوتابیان دێن و دەفتەری تاقیکردنەوەیان بەدەستەوەیە هاوار و ناڕەزایی دەردەبڕن. هەر یەکێکیان خۆی بە خاوەن هەق و غەدرلێکراو دەزانێ و وەڵامی خۆی بە باشتر دەزانێ لەوەڵامی فلان وفیسار. مامۆستا ناتوانێ کەسێك رازی بکات بەوەی بەدەست ئەو نییە و نمرەکە راستە. بەڵگەی عەقڵی لەوکاتەدا سوود وکاریگەری نییە. قوتابیەکە وادەزانێ کە وەلامەکەی ئەو چاکترینە، بۆیە مامۆستا هەر بەڵگەیەکی عەقڵی بۆ رازیکردنی ئەو بهێنێتەوە کە وەڵامەکەی هەڵەیە، کاریگەری نابێت، چونکە قوتابیەکە ئەو کاتە چاوی خستۆتە سەر وەلامە دروستەکەی؛ ئەو بەشەشی فەرامۆش کردووە کە هەڵەیە داواش لە مامۆستا دەکات بەشە دروستەکەی بەتەنها بۆ هەژمار بکات، بەشەکانی دیکەش ئەو گەر خراپ و هەڵە بێت با فەرامۆش بکرێت .

ئەگەر قوتابیەکە لە پۆلەکەی لە کۆتایی ساڵ کەوت. ئەوا بەڵگە و ئاسازەی وەها کۆدەکاتەوە کە ئەو بەناهەق کەوتووە. ئەوانەی لەسەر ئەویان نوسیوە سەرکەوتوون کەچی لەبەر دوژمنایەتی پێشینە مامۆستا ئەویان دەرنەچواندووە. دواتر قوتابیەکە لێکدانەوە بۆ ئەو دوژمنایەتییە وەهمیە دەکات و گوایە ئەو بوێر بووە لەناو پۆل راستگۆبووە لە کاتی مشتومڕی زانستی بەڵگەی بەهێزی هەبووە بۆیە مامۆستا رقی لێ هەڵگرتووە و دواتر بە کەوتن تۆڵەی لێکردۆتەوە. مەبەستم ئەوە نییە مامۆستا لە هەموو کەوتن ودەرچواندنێکی قوتابی دروستە، ئەو مرۆڤە کەواتە هەڵەی خۆی هەیە، بەڵام لە زۆربەی کاتدا وەڵامەکان بەیەك پێوەر هەڵدەسەنگێنێت، هیچ پێوەرێکی مرۆڤیش بێ هەڵە نییە، بەڵام بەهەرحاڵ زۆر لەو پێوەرانە باشترە کە چارەنوس و بەخش مرۆڤی لە دونیادا پێ پێوانە بکرێت .

ئـەوەی لـەنێو قوتابیـان لـە کـاتی تاقیکردنـەوە روودەدا لـە ژیـان لـە چوارچێوەیەکی فراوانتر روودەدا، سەرجەم مرۆڤەکان بە بەشـی خۆیـان رازی نین ، شاعیرێکی عەرەب دەڵێ :

" کل من تلقاه یشکو دهره    لیت شعري هذه الدنیا لمن ؟

واتە" توشی هەرکەسێك دەبی گلەیی لە بەختی خۆی دەکات خۆزگە دەمزانی ئەو دونیایە بۆ کێیە ؟ "

وەڵامەکە ئەوەیە : دونیا بەشی تاکێك لە تاکەکان نییە هەریەکێك گلەیی لە بەختی خـۆی دەکـات و بـۆ بـەختێکی باشـتر هـەوڵ دەدات، کەچـی تـەنیا شارستانیەتی مرۆڤایەتی لەمە سوودمەند دەبێ .

ئـەو شارسـتانیەتەی تاکـەکانی قەناعـەتیان هەیـە و دەڵـێن: "قەناعـەت گەنجینەیە " ئەوا ناتوانرێت بە شارسـتانیەت ناوببرێـت، بـەڵکو کۆمەڵگایـەکی سستەو جوولەی نییە، لەوانەشـە لـە ئـەنجامی بـێ جوولـەیی دین ودونیا لـە دەسـت بـدات. لـە قورئانـدا هـاتووە"**ولولا دفع الله الناس بعضهم ببعض لفسدت الارض ولکن الله ذو فضل علي العالمین** "[٦٧] بۆیـە دەبێـت لـە هـەر شارسـتانیەتێك کەسـانی نـارازیی هـەبن ئەوانـەش ئـەوە دوای ئـەوە دەبنـە سوتەمەنی شارستانیەت و بەرەو پێشەوەی دەبەن .

پرەنسیپێك کە هەردەم پیاوانی ئاینیی بانگەشەی بۆ دەکەن ئەوەیە دەڵـێن: " برا و یەکگرتوو بن و واز لە ناکۆکی و جیاوازیی نێوانتان بهێنن ". دیارە ئەمە لەپرەنسیپێکی سوڵتانییە و بۆ ئـەوەیان هێنـاوە دڵـی خـوا پێداوان لە خۆشگوزەرانەکان رازی بکەن، ئەوانـەی چـێژ لـە نیعمـەتی خـودا وەردەگـرن وەدیانـەوێ ئـەو چـێژەش زێـتر وەربگـرن لەسـەر حیسـابی زەحمەتکێشـان و بەشخوراوان .

---

[٦٧] القران، سورة البقرة، ایة ٢٥١

سەیر ئەوەیە پیاوانی ئایینی کاتێک دەبینن دەسەڵاتداران ڕکابەریی و ململانێ دەکەن و هەریەکەیان دەیەوێ لەسەر ئەستۆی ئەویتر زیاتری هەبێت، پاساویان بۆ دەهێننەوە، بەڵام پاساو بۆ ئەو کەسانە ناهێننەوە کە خەڵکی سادەن و نارەزایی بۆ زێدەبەشیان دەردەبڕن .مامۆستا سوهیل عانی خاوەنی کتێبی " **حكم المتسطين علي كتاب وعاظ السلاطين** " دەڵێ: " نارەزایی دژی ستەم واجب نییە، ئەگەر هاتوو ئاژاوەی لێ بکەوێتەوە و یەکگرتوویی تێک بدات، چونکە دوورخستنەوەی زیان باشترە لە هێنانی قازانج" [68].

ترسمان لە پەرتەوازە بوونی گوتار و نانەوەی ئاژاوە لە هەموو نوسین و وتارەکانی واعیزی سوڵتانەکان تێبینی دەکرێت. ئەوەش لەبیردەکەن کەئەو سوڵتانەی ئەوان بانگەشەی ملکەچی بۆ دەکەن لە ڕێگای ئاژاوەنانەوە و پەرتەوازەکردنی دەنگی خەڵک دەسەڵاتیان گرتۆتەدەست. دەسەڵاتدارانی ئەمەوی دەسەلاتیان لە معاویە بۆ مایەوە کەئەویش لە دەسەڵاتی عەلی کوڕی ئەبو تاڵب یاخی بوو،عەباسیەکانیش دەسەڵاتیان لەو سەربڕە وەرگرتبوو؛ کە لە دەسەڵاتی ئەمەوییەکان یاخی ببوو؛ گوتاری موسڵمانانی لێکترازان تا ئەو سەردەم مابوو. هەروەها فاتیمیەکان و ئەیوبییەکان وعوسمانیەکانیش بەهەمان شێوەبوون،هەموویان دەسەڵاتیان کاتێک وەرگرت کە لە سەرداری خۆیان یاخی بوون. یەکێک لە سوڵتانی موسڵمانان لەئەنجامی شۆڕاو یەکگرتوویی گوتار دەسەڵاتی وەرنەگرتووە. سەیر ئەوەیە واعیزی سوڵتانەکان زەمی هەر ئاژاوەیەک دەکەن کە بەڕووی سوڵتان بدرێت، بەڵام ئەگەر ئەو ئاژاوەیە سەرکەوتوو بوو کارەکەی مەیسەر بوو؛ ئەوا واعیزەکان داوا لە خەڵک دەکەن گوێڕایەڵی سوڵتانی نوێ بن، ئەو کاتە گوێڕایەڵی سوڵتانی کۆن لەبیر دەکەن کە لەگەڵ با ڕۆیشت .

---

[68] سهيل العاني، حكم المقسطين، ص٧٨

هەروەها مامۆستا سوهەیل عانی دەڵێ: " شتێك لەسەر ئەستۆی رەعیەت بێت بەرامبەر بە سوڵتان تەنها ئامۆژگاری و پێرهێنانەوە و ناساندنە، بەڵام ئەوەی دەبێتە هۆی شكاندنی ئابڕوی ئەوا كارێكی ڕێگە پێنەدراوە .ئەو لەوە دەترسێ حەیاو ئابڕوی سوڵتان بشكێنرێ"[61] چونكە سوڵتان پەیوەستە بە پاراستنی هەیبەت و ئابڕوییەوە. كەواتە لەسەر هەموو موسڵمانێكی ژن یان پیاو ئەركە ڕێز لە سوڵتان بگرێت بەچاو پۆشین لەوەی جەور وستەمەی ئەنجامی داوە. ئەگەر هاتوو موسڵمانان بۆ میرەكەیان كڕنۆشیان برد وشیعری ستایشیان بۆ نووسی ئەوا ئەمەیان كێشەیەك نییە چونكە دەبێتە هۆی زیادبوونی هەیبەتی سوڵتان خودا سەركەوتوی بكات .

واعیزەكانی سوڵتان بڕوایان وایە ئەمیكردن لە خراپە واجیبە ئەگەر هاتوو تواناسان بەسەر بشكێت، بەڵام ئەگەر هاتوو بووە هۆی زیانی سامان و جەستەو ئابڕو ئەوا قەدەغەكراوە . ئەمە كاتێك باس دەكەن كە هەر ئەو دەم باسی جیهادیش دەكەن. ئەوان بایەخ بەوە نادەن كە موسڵمانان بەو جیهادە ماڵ و جەستەی لەسەر دادەنێن، چونكە لە پاڵ سوڵتان دژی دوژمنانی سوڵتان و ئایین دەجەنگن. بەڵام ئەگەرهاتوو موسڵمانان لە دژایەتی سوڵتان تووشی زیان بوون، ئەوا زیانەكە بە بۆچوونی ئەوان لەناوچوونە كە خودا نەهی لێكردووە. ئەمەش ماناكەی ئەوەیە ئایین لەدیدی ئەوان بۆتە ملكەچبوونی سوڵتان لەجەنگ و ئاشتیدا. ئەوەش بەلای ئەوانەوە گرنگ نییە سوڵتان ستەمكارە یان دادپەروەر، چونكە لە دیدی ئەوان ئەمە بابەتێكی سادەیەو گرنگی نییە و خوداش بەخشندەكانی خۆی خۆشدەوێ .

[61] المصدر السابق، ص٧٢

# قاوغی مرۆڤایەتی



لە بەشی پێشوو باسی ئەوەم کرد، کە سروشتی مرۆڤ لەوە ڕاهاتووە کە خۆی بە چاکتر و شایەنتر و ڕاستتر بزانێت لە هاوڕێ و کەسوکارەکانی. ئەمەش وا لە مرۆڤ دەکات لە هاوارکردن و ناڕەزایی دەربڕین و خواست بەردەوام بێت، لەسەر ئەو شتانەی کە مافی ئەویشی بەسەرەوە نییە.

بۆنموونە کاتێک سەیری کۆمەڵگای مەنگ بکەین، دەبینین هەر مەنگێک بێ ئەوەی گلەیی لە بەختی خۆی بکات و ناڕەزایی دەربڕێت ئەرکە کۆمەڵایەتیەکەی خۆی ئەنجام دەدات. شامەنگیش بەئاسوودەیی لەسەر تەختی خۆی دانیشتووە، ئەوەی بەخە یاڵ نایەت یەکێک لەمەنگەکان ڕۆژێک ناڕەزایی دەربڕێت و بڵێت" بۆچی تۆ لە خۆشگوزەرانی و حەسانەوەدی، منیش زەحمەتکێشم، هەموو تەمەنم کۆشش دەکەم بۆ کۆکردنەوەی مەنگوین؟".

هۆکارەکە ئەوەیە: مەنگ کارەکانی بەجووڵانەوەیەکی غەریزی ئەنجام دەدات، کە لە زۆر لایەنەوە لە جووڵانەوەی ئامێر دەچێت و هەست بە خودی خۆی ناکات، بۆیە دەبینین کۆمەڵگای مەنگ هەزاران ساڵە وەك خۆی ماوەتەوە، پێشبڕکێ ناکەوێت و گەشەش ناکات. کەچی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لە پێشکەوتنێکی بەردەوام دایە، مرۆڤیش کاتێك خزمەتی کۆمەڵگایەکەی دەکات، ئەمە دەزانێ و لە دوای ئەو کارەشەوە پاداشتێکی دەوێ؛ غەریزەکەی پاڵنەر نییە بۆ ئەوەی خزمەتێکی کۆمەڵایەتی ئەنجام بدات، بەڵکو بە پاڵنەری خۆشەویستی پێگە و دەرکەوتن خزمەت دەکات و لە لایەکی دیکەش بۆ بەدەستهێنانی بژێوییە. کێشەکەشی ئەوەیە هەردەم خۆی گلەیی لە بەختی خۆی دەکات و سکاڵای هەیە، خۆشی وا دەبینێ کە لە کەسانی دیکە خزمەتی زۆرتر کردووە و هیممەتی بەرزتر بووە، بیرکردنەوەی دروستتر بووە، بۆیە داوای پاداشتی زیاتریش دەکات.

ئەگەر تاکێك ببینێ کۆمەڵگاکەی بەهایەکی شایەنی بۆ خزمەتەکەی دانانێت، ئەوا ئەوتاکە پەنا دەباتە بەر سکاڵا وهاوار و دەڵێ" بەمشێوەیە کەسانی ئاست نزم بەرزدەبنەوە و شەرەفمەندەکانیش نزم دەبنەوە!". بۆیە ئێمە هەرچەندە بمانەوێت لە ڕازیکردنی سەرجەم خەڵك جددی بین، کەچی ناتوانین هەموویان بکەین بە سەرۆك و بەڕێوەبەر. کارگەیەك دەبێت یەك بەڕێوەبەری هەبێت، هاوڕێیانی دیکەش لە بەردەستی ئەو بەڕێوەبەرە کرێکارن. ئەگەر هاتوو کرێکارەکان و بەڕێوەبەرەکە لە یەك ژینگە پەروەردە کرابن و لە یەك قوتابخانە خوێندنیان تەواو کردبێت؛ ئەوا لە لای هەندێك لەکرێکارەکان ئاسان نییە ببنە کرێکاری سەرۆکێك لە خۆیان؛ دەبێت بەنهێنی یان ئاشکرا بڵێن" بۆچی بەسەر ئێمەتان باشتر داناوە، ئێمەش وەك ئەوین یان باشترین؟".

ئەگەر بڵێین نمرەکانی بەڕێوەبەر لە نمرەکانی ئێوە بەرزتر بوو، ئەوا بەوە وەڵاممان دەدەنەوە، کە نمرە نابێتە پێوانەیەکی وردی توانستی کەسێ، ئەوکاتەش هۆکاری بەرزی نمرەکانی بەڕێوەبەر بۆ خۆشەویستی مامۆستاکە بۆ ئەو یان ڕقی مامۆستا بۆ

ئەوان دەگێڕنەوە، وەك لە بەشی رابردوو باسمان کرد مرۆڤ لە دۆزینەوەی ئەو پاساوانە دەستەوەستان ناوەستێت کە بۆ دەرخستنی باشتربوونی لە کەسوکارەکانی بەکاریان دەهێنێ.

بەهەرحاڵ ئێمە هیوای ئەوە دەخوازین، کە مرۆڤ کار بکات بۆ ئەوەی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی دروست بکات، باشتر بێت لەو سیستەمەی ئێمە تێیدا دەژین، ئەمەش بەمانای ئەوە نایەت کەسەرجەم خەڵك بەو سیستەمە رازی دەبن و برایەتی و ئاسوودەیی و خەیاڵ رەحەتی لە نێویان دا بەرقەرار دەبێت. جا هەرچەندە ئێمە سیستەمی کۆمەڵایەتی خۆمان چاکتر بکەین، ئەوا کەسانێك هەر دەمێنن خۆیان بە ستەملێکراو و بەشخوراو بزانن. ئێمەش ناتوانین سیستەمێکی کۆمەڵایەتی دروست بکەین، خەڵك تێیدا وەك هەنگ خۆشەویستیان بۆکارکردن هەبێت. ئەمە ئەنجام نادرێت مەگەر سروشتی مرۆڤ لە رەگەوە بگۆڕدرێت، ئایا ئەمەش دەکرێت؟ زانینی ئەمەش بەلای خوا و زانایانە.

هەندێك لە توێژەران دەڵێن: ئەو سروشتەی مرۆڤ دەگۆڕێت، ئەگەر هاتوو بارودۆخی ئابووری دەوروبەری بگۆڕێت. ئێمە سەرنجێك لەسەر ئەو قسەیە نادەین، چونکە نازانین چەند دەتوانرێت سروشتی مرۆڤ بە گۆڕانی بارودۆخەکەی بگۆڕێت، لێرەشدا شتێکمان نییە ئەوە نەبێت کە دەستمان بۆ ئاسمان بەرزبکەینەوە و داوا لە خودا بکەین وا لە مرۆڤ بکات ئەو هیوایە مەزنەی بهێنێتەدی.

***

مرۆڤ وەك ئەوەی ئەمڕۆ تێبینیمان کردووە، یان بەر لە ئەمڕۆ و بەتێپەڕبوونی رۆژگار لە رابردوو تێبینیمان کردووە، خۆویستە و لەناو قاوغی خودی خۆی دەژی، ئەو هەقیقەت نابینێت تەنها لەمیانەی ئەو قاوغە پێەوە نەبێت. ئەو خۆی لە کەسانی دەوروبەری باشتر دادەنێ، ئەگەر بینی کەسێکی نزیکی لە ناو خەڵك پێگەیەکی بەرزتری دەبێت، ئەوا رق و ئازاری دەبێت و خەڵکیش بە خاوەنی ستەم و سۆزی چەپەڵ دەزانێت.

ڕەنگە یەکێك بیانو لەو قسانەمان بگرێت و بپرسێت: ئایا ڕۆشنبیری دروست دەتوانێت چاوی مرۆڤ بکاتەوە، بۆ ئەوەی بەقەد خۆی بایەخی خۆی بزانێت و شانازی بە چاکە وەهمییەکانی خۆی نەکات؟ بێگومان ڕۆشنبیری دروست دەتوانێت لەو لایەنەوە سوودبەخش بێت، بەلام لەگەڵ ئەمەشدا ئێمە پرسیار دەکەین و دەمانەوێت بزانین سنووری ڕۆشنبیری دروست لە کوێیە؟ خۆ زۆرینەی خەڵك خۆیان وادەردەخەن تەنها ئەوان لە ناو خەڵك ڕۆشنبیرن.

نامانەوێت ئەوە لەبیر بکەین، هەر کۆمەڵە خەڵکێك وادەزانن ڕۆشنبیری ئەو دروستە و بەها کۆمەلایەتییەکانی ئەو پێوەری چەسپاون. بۆ جیاکردنەوەی هەق و ناهەق، مرۆڤ کاتێك لە کۆمەڵگای دیاریکراو دەژیت دەبێت هەست بکات یان نا، ئەوا دەبێت پێوەرەکانی ئەو کۆمەڵگایە کاریگەری بەسەر مرۆڤەکەوە هەبێت. ئەو منداڵەی لە کۆمەڵگایەکی وەها دەژیت، کە ڕێز بۆ عەنتەریات و سمێڵ بادان و خەنجەر هەڵکێشان دادەنێت، کاتێك گەورە دەبێت هەوڵدەدات ببێتە عەنتەر، وادەزانی کە ئەو لە کەسانی تر باشترە بەهۆی پێگە کۆمەلایەتیەکەی. ئەگەر بەوت گوت فلانە کەس لە تۆ عەنتەرترە و ئازا و ماقوولترە، ئەوا لە تۆ توڕە دەبێت ئەو قسەی تۆ بە ئیرەیی و گازاندە دەزانێ؛ لەوانەشە زللەیەك لە ڕوومەتی ڕاستت بدات و زللەیەکی دیکەش لەلای چەپت بدات.

ئەگەر کۆمەڵگاکەش ڕێز بۆ توێژینەوەی زانستی و داهێنان و دانانی تیۆری نوێ دابنێت، ئەوا هەر تاکێك دەبینی، کۆشش بۆ ئەمانە دەکات و خۆشی بە پێگەیشتوو و بەرزتر لەوانی دیکە دەزانێ. بۆیە ڕۆشنبیر جیاوازییەکی لەگەڵ ناڕۆشنبیر نییە، تەنها لە ڕووی پلەوە نەبێت، کەچی لە ڕووی جۆرەوە هەموو وەك یەکترن. ئەمەش جێگای سەرسوڕمان نییە کە مرۆڤ هەرچەندە ئەزموونی زیاتر بێت و پەیوەندی بەخەڵکەوە زۆرتر بێت، ئەزموونی ئالۆز ببینێت، ئەوا لە تێڕوانینی بۆ حەقیقەتی خۆی واقعیانەتر دەبێت، بەلام بەتەواوی بەو حەقیقەتەش ناگات.

***

قاوغی مرۆڤ لەساڵانی زووی تەمەنی منداڵدا بەوپەڕی بەهێزی دەبێت. منداڵ بە چاویلکەی سۆز و چێژەکانی سەیری دونیا دەکات، ئەو ناتوانێت هەقیقەتی بابەتییانە و سۆزی خۆی بەرامبەر ئەو هەقیقەتە لە یەکتر جیابکاتەوە[٧٠]. شتێک جوانە چونکە لای ئەو خۆشەویست و بەتامە، بەڵام ئەو جوانە دەبێتە دزێو ئەگەر قێزەوەن و ئازاربەخش بێت. منداڵ خۆی بە چەقی دونیا دەزانێ، ئەگەر وازی لە قوتابخانە هێنا وادەزانێ هەموو منداڵان وازدەهێنن و دەرگاکانی قوتابخانە دادەخرێن، ئەگەر بینیشی ئەوان بەردەوامن ئەوا وابیردەکاتەوە کە ئەوان منداڵی چاک نین.

ئەگەرهاتوو بەختەوەکەرەکەی لێی دا، وادەزانێ دونیا هەموو خەمبار و لەگەڵ ئەو دەگری و لەگەڵ ئازارەکانی ژانی دەبێت.ئەگەر چێژێکی لەناکاویش ببینێت ئەوا لە بەرچاوی ئەو دونیا دڵشاد دەبێت. سەری لەوەش سووڕدەمێنێ ئەگەر کەسێک لەو کاتە خەمباربێت و لەگەڵ ئەو دڵشاد نەبێت. منداڵەکە گەورە دەبێت و عەقڵی پێدەگات و دەبێتە شارەزا ودانا. کەچی ئەو تێڕوانینە(قاوغیە) کەم و زۆر لە ناخی دڵی دەمێنێتەوە. هەرچەندیش ئەزموون و شارەزایی مرۆڤ زیاتر بێت ئەوا ئەو تێڕوانینەی سەرەوە لاوازتر دەبێت، بەڵام هەرگیز نامرێت و لەگەڵ مانەوەی مرۆڤ دەمێنێتەوە. بۆیەش دەبینین کاتێک مرۆڤ دڵخۆش دەبێت، دەیەوێت خەڵک لەگەڵ ئەو دڵخۆش بن، دەشڵێ" پێویست بەخەم ناکات، پێ بکەنە دونیا لەگەڵت پێدەکەنێ". ئەگەر هەر ئەو مرۆڤە کاتێکی دیکە دڵتەنگ بێت، رقی لە کەسێکی دیکە دەبێتەوە دڵخۆش بێت و پێبکەنێ، ئەوکاتەش دەڵێ:" پێکەنین بێ هۆکار لەبێ ئەدەبییە" یان دەڵێ:" لەو دونیا شوومەدا جێگای خۆشی نابێتەوە".

ئەگەر مرۆڤ سوود لە کەسێک ببینێ، بەهای ئەوکەسە لە لای ئەو بەرز دەبێتەوە لەپیاوچاکان و دادپەروەران دەبێت خوا نموونەیان زۆربکات.بەڵام ئەگەر ببینێ کەسێک زەمی دەکات، ئەوا گلەیی لێدەکات و دەڵێ:" تۆ بەهای راستەقینەی خەڵک

---

[٧٠] Young ,Personality,p768

نازانی". ئەگەرهاتوو زیانی لەبەر کەسێك بەرکەوت، ئەوا ئەو کەسە لە دیدی ئەو نەفرەتلێکراوترین خەڵقی خودایە. بەهەرحاڵ نیگەرانیش دەبێت ئەگەر خەڵك ستایشی ئەو کەسە بکەن و ئاماژە بەچاکەکانی بکەن. هەرچەند هەوڵیدات زەحمەتە مرۆڤ بتوانێت خۆی لەو قاوغە خودییە دەرباز بکات، بێئەوەی ئەو هەست بکات لە خۆی گرتووە. ئەو قاوغەشە وادەکات مرۆڤ چاکەتایبەتیەکانی خۆی مەزن بکات لەو کاتەی کەموکوڕی رکابەرەکانیشی مەزن دەکات. ئەو ئەگەر وتارێك بخوێنێتەوە بیبینی خەڵك بە رووی ئەودا دەمیان کراوەیە، ئەوا وادەزانێ سروشی بۆ هاتووە. ئەگەر هاوکارێکیشی ئەمەی کرد، لێوی دادەگرێت و دەڵێ:" ئەمە پڕوپووچە، ئەو نازانێ خەڵك لە دانیشتنە تایبەتییەکانیان لەبارەی ئەو و هاوکارەکەی چی دەڵێن."

راستە ئەگەر بڵێین بێزنگێکی نەست هەیە کە ئەو قسانە دەبێژێت لە بارەی کەسێکەوە دەکرێت و ناهێڵێت بە هەقیقەتی خۆی بگات، بۆیە ئەگەر کەسێك بینی ستایش دەکرێت ئەوا کەسی ستایشکەر بە داپەروەر دەزانێ؛ ئەگەریش زەم بکرێت، ئەوا پێیوایە لەبەر ئیرەیی وشتی لەو بابەتانەیە. بۆیە مرۆڤ دەبینین لە قاوغە تایبەتەکەی خۆی دەژی بە وردی نازانێ خەڵك پاشملە چی لە بارەی ئەو دەڵێن، چونکە بێزینگەکەی نەستی رێگا بەمە نادات.ئەگەر مرۆڤێك لە دانیشتنێك قسەی کرد، وادەزانێ خەڵك بەقسەکانی ئەو سەرسامن. بەڵام ئەگەر کەسێکی دیکە قسەی کرد وا دەزانێ دانیشتوان قێزیان دەبێتەوە بەڵام لە ئەدەبی خۆیانەوە قسەناکەن.

هەر فەرمانبەرێك ددبینی؛ خۆی بە دەستپاکترین و جددیترین دەزانی؛ کە گوایە موکڕە لەسەر کارەکەی خۆی، تەنانەت بەرتیلخۆریش کە دونیا لەبەر ناپاکی ئەو هاوارییەتی، خۆی بەشەریفترین بەندەی خودا دەزانێت. ئەوکاتەی مامۆستای سەرەتایی بووم هاوکارێکم هەبوو؛ بەرووني ناپاکی و چەپەڵیم لە هەڵسوکەوتی ئەو دەبینی، کاتێك بۆ کارێکی هەستیار گوێزرایەوە دەستی کرد بەتاڵانکردنی پارە تا لە کارەکەی دەرکرا، جا داوای هاوکاری لە هاوڕێیە کۆنەکانی دەکرد. من پرسیارم لە بارەی دەرکردنی نەدەکرد؛ خۆی زۆر باسی ئەو دەستپاکییەی دەکرد کە من لە

دێرزەمانەوە دەیزانم، ئەو خۆی بەستەملێکراو دەزانێ ئەو گوایە لە بری کەسانی دیکە تێوەگلاوە، بۆیە دەرکراوە، زۆر بەدڵخەوە حکومەت و نیشتیمان ئەویان لەدەست خۆیان داوە!.

***

مرۆڤ لەوە ڕاهاتووە کە خراپەکارییەکانی خۆی لەبیر بکات و چاکەکانی خۆی بەزێدەڕۆییەوە باس بکات. ئەمەش بەڕوونی لە لای نووسەرانی نموونەی وەک من دەبینی کە میللەت تووشی کارەساتی کتێبەکانیان بووە. کاتێک یەکێکیان کتێبێک بڵاو دەکاتەوە، ئەوا لە هەموو لایەکەوە پیرۆزبایی بەسەردا دەبارێت. نووسەر لەوە ڕاهاتووە کە خەڵک لەو جۆرە پیاهەڵدانە کۆمەڵایەتییە ڕاهاتوون. کێشەکەش لەوەدایە ئەو ڕەخنەگرانەی کەبەتفت و تاڵی ڕەخنە لە کتێبەکە دەگرن، ئەو ڕەخنەیان لە بەرامبەر نووسەرەکە دەرناخەن، ئەوان سووربن لەسەر ئەوەی نووسەر لە بارەی ئەو ڕەختانەوە نەزانێت، مەگەر هەندێکی زانیاری ناڕاستەوخۆ نەبێت.بەڵام ئەگەرهاتوو یەکێک لە ڕەخنەگرەکان ڕەخنە توندەکەی لە یەکێک لە گۆڤارو ڕۆژنامەکان بڵاوکردەوە، ئەوا هاوڕێی نووسەرمان دڵتەنگ دەبێت و ئەو ڕەخنەیە بە بەرهەمی مەبەستێکی خراپ یان بنەمایەکی ڕوخێنەر و ئیرەییەکی کوشندە دەزانێت. ساڵی ڕابردوو داوام لە قوتابییەکی قۆناغی چوارەمی بەشی فەلسەفەی کۆلێژی ئاداب و زانستەکان کرد، ڕاپۆرتێک لە بارەی من بنووسێت و هەموو ئەو بۆچوونانە کۆبکاتەوە کە لەبارەی نووسینەکانی من بەراشکاوی و بێ ڕیاباریی دەگوترێن. بە قوتابییەکەشم وت نمرەی کۆتایی خۆی لەسەر بڕی ماندووبوون و وردبینی لە نووسینی ڕاپۆرتەکە دەوەستێت. دوای ماوەیەکی زۆر قوتابییەکە هاتەوە بەدوای لێبوردنەوە وتی بەهیچ جۆرێك ئەو ڕاپۆرتە بەمن نادات، هۆکارەکەش ئەوەیە هەموو ئەو قسەو بابەتانەی لە بارەی منی کۆکردۆتەوە بریتین لە زەمکردن و بەکەمزانیی و جنێو، بۆیە ئەو لەخۆی دەترسێ جۆرە ڕاپۆرتێکی وەها ئابڕووبەر بەمن بدات.

دواجار ڕاپۆرتەکەم وەرگرت، بینیم نەفرەتیترین ڕاپۆرتە کە لەو دونیایەدا بوونی هەبێت. من دڵنیام لەوەی قوتابییەکە مەبەستی ئەوە نەبووە، تەنها ئەوەندەبێت کە سەرجەم بۆچوونە جیاوازەکان لە بارەی منەوە بەئەمانەتەوە کۆیکاتەوە. مەزندەی ئەوەش ناکەم قوتابییەکە ڕقی لەمن بێت، بەڵکو ئەو حەقیقەتە تاڵە بوو وایکرد کە من ڕاپۆرتەکە بە نەفرەتی وەسف بکەم. ئەگەر پێشتریش بەڵێنی نمرەیەکی بەرزم بە قوتابییەکە نەدابوایە، ئەوا ئەمرۆ یەکێک دەبوو لە کەوتووەکان.

من تائێستاش ئەو ڕاپۆرتەم پاراستووە، ڕەنگە وەک پاشکۆیەک لە کتێبەکانی داهاتووم بڵاوی بکەمەوە. کاتێک خوێنەری سەیری ئەو ڕاپۆرتە دەکات چەندین جنێو و ناپرووبردن دەدۆزێتەوە، کە بە بۆچوونی من بەڵگەکیان بۆ بەدەستەوە نییە. من لەو ڕاپۆرتە بەدوای ستایش گەڕام، لێرەو لەوێ شتێکی وەهام نەدۆزییەوە. یەکێک لە چاکییەکانی ئەو ڕاپۆرتە ئەوەیە ناوێکی دیاریکراوی نەهێناوە، تەنها ئەوانەی نووسیوە دەقی قسەکە و سیفەتی خاوەنەکە و پیشە و ئاستی ڕۆشنبیری و جۆری ئەو پرەنسیپەی کە لەڕاست یان لە چەپ باوەڕی پێیەتی. ئەگەر هاتوو لە ڕاپۆرتەکە ئاماژە بە ناوەکان بکرایە ئەوا لە ڕقی ئەو ناوانە نەدەخەوتم و کاتێک دەشخەوتم ئەوا لە خەونەکان تۆڵەیەکی کوشندە و بێ وێنەم لەوان دەکردەوە.

لە کاتی خوێندنەوەی ڕاپۆرتەکە درکم بەوە کرد کە من وێنەیەکی زۆر گەشم بۆ خۆم کێشاوە، دوور لەوەی کە خەڵک لە بارەی منەوە هەیانە.بەرلەوە من زۆر بەو ستایشە بۆندارانە ڕازی بووم کە لەسەر زمانی قوتابیان و هاوڕێیان و هەندێک لەو خوێنەرانم هەبوو کە نووسینەکانی منیان خۆشدەوێت و گوایە داکۆکیان لە من کردووە. بەڵام ئەو قوتابی و هاوڕێ و خوێنەرانەی کە زەمم دەکەن ئەوا بێگومان ڕاشکاوانە ڕوویەڕووم نابنەوە. هەرچەندیش هەوڵ بدەم ئەوەی ناودڵیان سەبارەت بەخۆم بدۆزمەوە، ئەوا ناتوانم بەتەواوی ڕاستییەکە بگەم، بەشە زۆرەکەی بەشاراوەیی دەمێنێتەوە. بەهەرحاڵ بێزنگی ئەست ڕێگە نادات ئاشکرایان بکەم.

داوام لە خوێنەر ئەوەیە گاڵتەم پێنەکات، چونکە ئەویش وەك من تووشی ئەو نەهامەتییە بووە، بەڵام ئەگەر ویستی فێڵ لە خۆی بکات ئەوا دەڵێ بەسەنگێکی قراوان ڕووبەڕووی ئەو حەقیقەتە تاڵە دەبمەوە، ئەو کات من قسە و چارەیەکم بۆ ئەو نییە، چونکە ئەو نایەوێت تێبگات، یان ڕاستتر خۆی خۆشدەوێ، وەك پێشینانیش وتویانە خۆشەویستی پیاو کەڕ وکوێر دەکات.

***

هاوڕێیەکی ڕاشکاوم وتی: لە سەرەتای گەنجێتیم هاموشۆی تیاترۆیەکی بەناوبانگی بەغدام دەکرد، هەرکە دەچوومە ژوورەوە ئەوا وامدەزانی هەموو سەماکەرەکان بەجوانی و شیك و نازوقیزی من سەرسامن، کاتێك سەیری ئاوێنەم دەکرد وام هەست دەکرد بەڕاستی من وەها قۆزم و سەماکەرەکانیش هەر لەو ڕوانگەیەوە سەیرم دەکەن. وامدەزانی کە ئەوانەی لە دەوروبەرم دانیشتوون ئەو قۆزی و سمێڵ قنجی و شیك پۆشییەی منیان نییە، بۆیە پێموابوو هەموو غەمزە و نیگا و هەستی سەماکەرەکانم بۆ خۆم داگیرکردووە. کاتێك دەردەچووم لەبەردەرگا چاوەڕوانی دەرچوونی سەماکەرەکانم دەکرد بۆ ئەوەی بەختی یەکێکیانم هەبێت و شەیدای بکەم و بانگی ماڵەوەم بکات. کاتێك ئەو هاوڕێیەم ئەو چیرۆکەی بۆ دەگێڕامەوە، من نەمتوانم دان بەخۆم بگرم و پێکەنیم، بەڵام دواجار لەخۆشم پرسی "ئایا من لەو دەبەنگیە بەدوورم کە ئەو هاوڕێ ئازیزەم تووشی بووە؟" ئەگەر هاتوو هەر یەکێك تاوتوێ مێژووی ژیانی ڕابردووی بکات، چەندین جۆر ئەو دەبەنگییە دەدۆزێتەوە، ئەوەی دەبەنگی لە تیاترۆ نەیدیبێ ئەوا لەشوێنێکی دیکەی دیوە.

***

هەڵەیەکی کوشندەیە کە یەکێك لە ئێمە وابزانێ کە هەستە دەروونییە جۆراوجۆرەکانی تەنها تایبەت بە خودی خۆیەتی. ئەو هەڵەیەش لەوە هاتووە مرۆڤ مەیلی بەلای شاردنەوەی خەیاڵی خۆی هەیە. دەیەوێ پێنچەوانەکەشی دەربخات. تۆ دەبینی خەڵك باس لە خۆشەویستی حەقیقەت دەکەن، تۆش لەوانەیە باوەڕیان پێ

بکەیت و هەندێکجاریش هەست دەکەی کە تەنها تۆ نەوەک خەڵک لە ناخت دا هەقیقەتت خۆشدەوێ- وا باشترە تۆ بەو نووسین و وتارانە فریو نەدریی، چونکە ئەوان درۆ دەکەن؛ گوفتار و رەفتاریان یەکناگرێتەوە. ئەوان بەر لە هەموو شتێک خۆیان خۆشدەوێ و بەخۆیانەوە سەرسامن، کەچی خۆشەویستی راستی ئەمە بەخشینێکە خودویستییە شاراوەکەی خۆیان پێ پەردەپۆش دەکەن.

***

خۆشەویستی مرۆڤ بۆ خود خۆی هەندێک جار وای لێدەکات کە باوەڕی ئەوەی هەبێت پێویستە خۆی جڵەوی شتەکان بەدەستەوە بگرێت، ئەو خۆی دەتوانێ چاکسازی کۆمەڵگا بکات، بۆیە ئەو بۆچوونی خۆی لە بارەی چاکسازی دەردەخات و پێیوایە ئەو چاکترین باوەڕی شیاوی هێناوە و بانگەشەی سەرکەوتنی دەکات. زۆرجار دەبینین بەقاڵێک کە لە دونیادا شتێک نازانێت لە کێشانی خورما و هەڵبژاردنی کاڵەک نەبێت، کەچی خۆی بەشایەنی ئەوە دەزانێت لە بەرزترین پۆستی دەوڵەت بێت و ئەوتوانای هەیە کاروباری خەڵک بەک کەرەت چاک بکات.

جارێکیان لەناو ئۆتۆمبیل لەتەنیشت شوفێرەکەوە بووم، هەندێک قسەم لەگەڵ کرد بینیم ئەو جۆش وخرۆشی گرتووە دەیگوت: من دەزانم چۆن عێراق چاک دەکەم. ئەو لە قسەکانی تەنها پێویستی بەچەند سێدارەیەک هەبوو تا لەسەر پردەکەی دابنێ و چەندین تاوانبار و ناپاک و بەرتیلخۆریش هەڵدواسێ؛ ئەو کاتە خەڵک دەحەسێنەوە، وەک ئەوەی خوا و پێغەمبەر بیەوێت برایەتی و تەبایان لەنێوان بەرقەرار دەبێت. ئەوکاتە یەکێک لە سەرنشینەکان بەهەمان جۆش وخرۆش هاواری کرد و وتی: " ئەو قسانە چییە دەیکەی؟ تەنها سێدارە چارەسەر نییە، ئەگەر دەسەڵات بەدەست من بێت دەزانم چۆن چاکسازی دەکەم.. " لە بەدبەختی من لێرەدا ئۆتۆمبیلەکە گەیشتە شوێنی مەبەست بۆیە نەمزانی ئەو پیاوە بلیمەتە چۆن بەتەواوی چاکسازی بۆ خەڵک دەکات.

ئەگەر ئۆتۆمبیلەکە هێواش بوایە، نەگەیشتبایە شوێنی مەبەست، ئەوا سەرجەم سەرنشینەکان بەشداریان لەو مشتومڕە توندە دەکرد و هەریەکەیان دەبوونە چاکسازێکی بەزەبر کە دەیتوانی لەماوەی هەفتەیەک کۆمەڵگا دەرباز بکات. کێ دەزانێ لەوانەیە نووسەری ئەو چەند دێرەش لە مشتومڕەکە بەشداربووایە و ئەوانیش لە مەزنی پێشنیارەکان و ژمارەی سێدارەکانی تووشی شۆک دەبوون.

وەک دەردەکەوێت فەیلەسووفان لەمەیانـدا جیاوازییەکیان لەگەڵ خەڵک نییە.خەسڵەتی فەیلەسووفان ئەوەیە، ئەوان قسە دەکەن و کەسێک وەڵامیان ناداتەوە، ئەمەش لە ترسی ئەوەی نەوەک خەڵک بە دەبەنگ و بێگایی ونەزانی ئەوکەسە تۆمەتبار بکەن، هەربۆیەش فەیلەسووفانی کۆن کتێبەکانیان پڕ بووە لە قسەی پڕوپوچ و خەڵکیش باوەڕی پێکردووە. ئەگەر هاتوو فەیلەسووفەکانمان لە یەک شوێن کۆکردنەوە و وتمان لەسەر بۆچوونێکی دروست رێکبکەون بۆ ئەوەی چاکسازی بۆ خەڵک بکەین، ئەوکاتە دەبینین ئەوان وەک سەرنشینی ئۆتۆمبیلەکەی باسمکرد تووشی مشتومڕ و رکابەری دەبن و هەر یەکێکیش وادەزانێ بۆچوونی ئەو دروستترە.

ئەوەی بیەوێت بەڵگە بۆ ئەمە بدۆزێتەوە با بچێتە لای زانایانی بەرێز لە پیاوانی ئایینی و مامۆستایانی زانکۆ و رێبەرە ناسراوەکانی بواری سیاسەت و ئابووری. با تاوتوێی مشتومڕی ئەوان بکات لە دانیشتنە تایبەتەکانیان. هەر یەکێک لەوان وادەزانێ کە راکەی ئەو دروستترە و ئەویش چاکترە بۆ ئەوەی دەسەلات بەدەستەوە بگرێت و چاکسازی کۆمەڵایەتی بکات. بۆیە دەبینی فێڵ لەی مکتر دەکەن وپیلان بۆ یەکتر دادەنێن. هۆکارەکەش ئەوەیە هەر یەکەیان وادەزانێ کە چاکسازی تەنها لەسەر ئەو دێتەدی، ئەوانی دیکە تەنها ناپاکن و دەبەنگ و بەدنیازن و بەرژەندی خۆیان دەوێ. کارەسات لەوە دایە هەر یەکێک لەوانە کۆمەڵێک خەڵکیان بەدەورەوەیە کە ماستاوی بۆ سارد دەکەنەوە و زمان لوسی لە بەرامبەر دەکەن کەچی خۆی

نازانێت ئەو خەڵکە لە پشتملە چی دەڵێن، وا هەست دەکات خەڵک هەموو بەناوی ئەو هوتاف دەکێشن و گۆرانی لە ستایشی ئەو دەچڕن.

***

دەبێت ئەوە لەبیر نەکەین کە ئەو دەبەنگییە لە هەموو کۆمەڵگاکانی دونیا هەیە و بەچەندین جۆرە پەردەپۆش دەکرێت، لە شوێنێک بەهێز دەبێت و لە شوێنی دیکە لاواز دەبێت، بەلام لە هەر شوێنێک هەیە کە مرۆڤی لێ هەبێت. ئەم سروشتە پەیوەستە بە مرۆڤەوە و دەرفەتێک نییە بۆ دەربازبوون لێی، رەنگە خوێنەر تووشی سەرسوورمان بێت ئەگەر بڵێم ئەو سروشتە دەبەنگییە یان ئەو دیدە قاوغییە، لە گرنگترین پاڵنەرەکانن وا لەمرۆڤ دەکەن خزمەتی کۆمەڵایەتی بکات. مرۆڤ وەک لە سەرەتای ئەو بەشە باسمان کرد غەریزییەکی چەسپاوی بۆ خزمەتی کۆمەڵایەتی نییە، وەک ئەوەی لەلای هەنگ و مێروو هەیە. بەڵکو ئەو کاتێک خزمەتی خەڵکەکەی خۆی دەکات کاتێک دەبینێ خۆی شایەنی ئەو خزمەتەیە، وە خزمەتی کۆمەڵایەتیش پێگە و هەیبەت بەتاکەکان دەدات، بۆیە مرۆڤ وەک چۆن بەدوای چێژی دەروونی دەگەرێت، بەهەمان شێوە بۆ خزمەتی کۆمەڵایەتی هەڵپە دەکات.

نکۆڵی لەمەش ناکەین کە ئەو دیدە قاوغییە هەندێجار دەبێتە هۆی فرتوفێڵی چەپەڵ و پیلانگێری کە زیانی لە قازانج زۆرترە. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت بڵێین هەرشتێک بەهای خۆی هەیە، لە دونیادا چاکەیەک نییە خاڵی بێت لە خراپە وەک پێشتر ئیبن خەلدون ئاماژەی بۆ کردووە[٧١]. هەر مرۆڤێک خودی خۆی خۆشدەوێ و بۆ بەرزکردنەوەی هەڵپەیەتی، لە دەرئەنجامی ئەمەش رکابەری زیانبەخش دروست دەبێت وەک چۆن رکابەری سوودبەخش دروست دەبێت. لە توانامندا نییە ئەو دوو رووە لە یەکتر جیابکرێتەوە. شایەنی باسە کۆمەڵگای دواکەوتوو زیاتر هانی تاکەکانی دەدات رکابەری زیانبەخش ئەنجام بدەن، نەوەک سوودبەخش، هەر

[٧١] ابن خلدون، المقدمة، ص ٣٩٠-٣٩١

ئەمەشە لە وڵاتی خۆمان تێبینی دەکەین کە خەڵك زیاتر ڕکابەری لەسەر پێگە دەکەن، نەوەك ڕکابەری لەسەر بەرهەمێکی سوودبەخش. هۆکارەکەش بۆ ئەو بەها کۆمەڵایەتییانە دەگەڕێتەوە کە لەو وڵاتە هەن.

ئێمە تائێستا بە بەهای کۆچبەری و ڕەوەندی (البداوە) سەرسامین، بەوانەی ئەوەی ئێمە بەدوین، بەڵام جلی شارستانییمان پۆشیوە، کەچی بەهای بەداوە بۆ کەسانی بیابان گونجاوە، لەگەڵ ژیانی مەدەنیەتی نوێ ناگونجێ، چونکە کەسی بەدو زۆر حەز لە ناوبانگی باش دەکات ئەمەش بەدەست نایەت ئەگەر تاڵان و ڕاو و ڕووت نەبێت. بەمەش هێرش بکاتە سەر هۆزەکانی دیکە و دوڵتر بگەڕێتەوە لای هۆزەکەی خۆی دەستکەوتەکانی دابەش بکات.

کێشەی ئێمە ئەمڕۆ ئەوەیە کە ئێمە باس لە بیرۆکەکانی شارستانیەت دەکەین کەچی لە ژیانی کردەیی لەسەر نەریتی بەداوە دەڕۆین. ئێمە لەلایەك دەمانەوێت تاڵان بکەین بۆ ئەوەی لەلاکەی دیکە بەپێگە و ویقار دەربکەوین. کەسە مەدەنییەکانیش وەك ئێمە هەڵپەیانە، بەڵام هەڵپەی ئەوان لە زۆربەی کاتدا بەرەو لایەنی بەرهەمی فیکری و ماددی دەڕوات. چونکە هەر یەکێك لەوان دەیەوێت بە بەڵگە بیسەلمێنێت کە لە کەسانی دیکە پێگەی زیاترە، کەچی ئێمە لە پێناو ویقار و پێگە هەڵپە دەکەین، بۆ ئەمەش تاڵان دەکەین لە بری ئەوەی بەرهەمهێن و داهێنەر بین. بۆیە زۆرێك لە ئێمە تاڵان دەکات بۆ ئەوەی داوەت و ئاهەنگی پێ ساز بکات و کۆشکی پێ دروست بکات، کە پێویستیەکانی دەیان جار زیاتر دەبێت، کاتێك ئەمەش دەکەن خەڵك ڕێزیان لێدەگرن و بەزمانیش دەڵێن: "نەخشی هێناوە، عافیەتی بێت"[٧٢].

---

[٧٢] مستەفا بەوردی لەکتێبەکەی بەناوی (عێراق و بەهای بەدو) باسی ئەو دیاردەیەی کردووە(نووسەر)

# بەربەرەکانیٚ و هاوکاریی



شێخ سوهەیل نەجم عاش وەك پێشتر باسمان کرد کتێبێکی لە وەڵامی کتێبەکەی من ( واعیزی سوڵتانەکان ) نووسیوە.سەیر ئەوەیە لە دوای پێشەکی لە لاپەڕەی یەکەمی خوێنەر توشی شۆك دەکات. ئەمەش بەوێنەکردنی کۆمەڵگایەکی یوتۆپی، کەخەڵك لە چاکترین حاڵدان لە برایەتی وچاکە وفۆشی بەزەیی وچەند سیفەتی دیکەی بەرز؛ دواتر نووسەر بانگەشە بۆ خەڵك دەکات کۆمەڵگایەکی سەیروسەمەرە دروست بکات.

نووسەر دەڵێ "..... ئەگەر گریمانەی ئەوە بکەین کۆمەڵگایەك لە چەندین تاك پێکهاتووە ، سیفەتی هەر تاکێك هێزی باوەڕ، باوەڕ بەیەقین، زانست وهۆش ، ئەدەب نواندن لە بەزەیی، مافپێدان، دادپەروەری بێت لەدەوڵەمەندی، داوێن بەخۆدا گرتن بێت لە هەژاری، چاکەکار بێت. لە توانا سەبر بێت، لە مەینەتی تورەیی بەسەر زاڵ نەبێت، دەمارگیری تووشی لاساریی نەکات، سووربوونی تووشی خۆ بەکەمزانینی نەکات، بەهۆی سکەوە ئابڕووی نەچێت، لە تەنگانەدا خەڵك پەنای بۆ بیبات، چاکەی زۆر بێت. زمانی راستگۆبێت وناخی پاك بێت بەتانە و تەشەر و جنێوفرۆش و بوختانکەریش نەبێت، سیتەملێکراو سەربخات و بەزەیی بە هەژار بێتەوە، بەخیل نەبێت، دەستبلاّویش نەبێت، لەپێناو خودا رقی لە شت بێتەوە و هەر لەپێناو

خوداش شتی خۆش بوێ؟ تورەبوون ورەزامەندیشی هەر لەپێناو خودا بێ؟ خۆی حەزی لە چی بێت دەبێت ئەمەشی بۆ خەڵك پێ خۆش بێ؛ رقی لە چی بێت دەبێ؛ بۆ خەڵکیش وەها بێ؟ لەگەڵ چەندین سیفەتی دیکە کە لە تاکەکانی هەبێت، ئایا ئەو کۆمەڵگەیە کامەران نابێت ؟ کێ دەڵێ ئاکاری چاك نابێتە هۆی کامەرانی، ئەو قسەیە بەڵگەو بنەمای نییە"[73].

دەبێ راستی بگوترێت ئەو بیرۆکانە زۆر بەرزن، خەڵك چەند دڵخۆش دەبن ئەگەر سەرلەبەری جێ بە جێ بکەن. بەڵام بەداخەوە دەڵێین ئەو بیرۆکانە لەیەك کاتدا بەرز ونەزۆکیشن، چونکە لەگەڵ ئەو سروشتە ناگونجێت کە مرۆڤ لێی راهاتووە. سەیر ئەوەیە ئەو خەڵکانەی کە ئەم جۆرە ئامۆژگاریانە بڵاودەکەنەوە، کەچی ناتوانن لە ناخی خۆیان جێ بە جێ بکەن؛ بۆیە لە ژیانی کردەیی خۆیان بە بەخیلی دەبەن وهەڵپەیانە وەك کەسانی دیکە ململانێ دەکەن. نامەوێ لێرەدا زەمیان بکەم یان لەئاستی ئەوان کەم بکەمەوە، بەڵکو لەڕاستیدا مەبەستم ئەوەیە بڵێم سروشتی ململانێ وئیرەیی و رکابەریی پەیوەستە بە مرۆڤ و لێی دەرباز نابێت، لەمەشدا جیاوازی لە نێوان زانا ونەزان و پیاوچاك و ناکەس نییە. نکۆڵی لەوە ناکەین جیاوازییەکی رووکەش لە نێوان زاناو نەزان لەمەدا هەبێت، کە ئەوەیە نەزان کاتێك ململانێ دەکات وهەڵپە دەکات کارەکانی بەتەئویل و پاساوهێناوە پەردەپۆش ناکات، بەڵکو بەخەنجەرەکەی دەستی لە سکی نەیارەکەی دەچەقێنێ. بەڵام زانا لە رووکەشدا لەمەیان بەرزترە، ئەو رقی لە نەیارەکەیەتی و رقیشی هەیە و دەیەوێ لەناوی ببات، بەڵام ئەمە راستەوخۆ ئاشکرای ناکات کەچی ئەوانە بە فەرموودە و ئایەت دەشارێتەوە یان بەخۆشەویستی ئیشتیمان و بەرژەوەندی نەتەوە پەردەپۆشی دەکات.

***

[73] سهيل السيد نج العلي، حكم المقسطين، ص٤٠٢

نابێت خوێنەر ئەوە لەبیر بکات، ئەو بەر لەوەی مرۆڤ بێت، ئاژەڵە. بەر لەوەی مەدەنی بێت دڕندەیە، ئەرستۆتالیس هەڵەی کرد کە گوتی:" مرۆڤ بە سروشت مەدەنییە" راستتر مرۆڤ بە سروشت دڕندەیە و سیفەتی مەدەنیەتی دواتر وەرگرتووە. هەرچەندە بە جوانی و زمان شیرینی و بیرکردنەوەی بەرز وئایدیالی خۆی دەربخات ئاژەڵێکی دڕندە لە ناخی دایە. ئەمە ئەو دیاردەیە کە بیرمەندانی کۆن فریویان پێ خواردووە و سروشتەکەی خۆی پێ پەردەپۆش دەکات، بەڵام کاتێک ئەجروبەشی پێ دەکەی و هەرەشە لە بەرژەوەندی و ماڵ و ناوبانگی دەکەی، دەبینی وەک پڵنگێ تووڕە دەبێ ددانی جڕدەکاتەوە دەبێتە سەگی هار.

فەیلەسووفانی کۆن بەدروستکردنی ( ئەو جیهانە یوتۆپیە ) سەرقاڵ بوون، کە خەونیان پێوەدەبینی. لەوە راهاتبوون ئەو کۆمەڵگایە واقعییەی تێیدا دەژین فەرامۆش بکەن. بایەخیان بە پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی خەیاڵی دا مرۆڤ تێیدا دڵخۆش دەبێ و کاروبارەکانی خۆی رێك دەخات. ئەمەش وایکردووە کۆششی فەیلەسووفان لەگەڵ با بڕوات و کەس سوودی لێ وەرنەگرێت. ئەگەر ئەو کۆششەیان لە توێژینەوەی کۆمەڵگای واقیعی سەرف بکردایە وتوێژینەوەیان لە بارەی ئەو رەگەزانە بکردایە کە بەسەری زاڵە ئەوا ئێستا گەنجینەیەکی پڕ بەهای هزریمان دەبوو.

لەنێو بیرمەندانی کۆن تەنها یەك بیرمەند دەرکەوت ئەویش ئیبن خەلدون بوو، کە توانی لە رێگای هاوکارە بیرمەندەکانی جیابێتەوەو توێژینەوە لە بارەی کۆمەڵگا بکات وەك خۆی بێ، سوك کردنی و لەئاست کەم کردنەوەی. بەڵام بیرمەندانی دیکە جگە لە ئیبن خەلدون بە چاوێکی رق وسوکایەتی سەیری کۆمەڵگای واقعیان کردووە، خۆیان بەبەرزتر زانیوە کە کاتە بەنرخەکەی خۆیان بە توێژینەوەی کۆمەڵگای بالا کە لەخەیاڵیان دابووە تەرخان دەکرد.

ئیبن خەلدون باوەڕی وابوو ئەو کۆمەڵگا خەیاڵییەی کە فەیلەسووفان بیری لێ دەکەنەوە، مەحاڵە لەسەر زەوی دروست بکرێت، چونکە پێویستی بەجۆرە مرۆڤێکە

لە شێوەی ئەو مرۆڤە نەبێت کە ئێمە لەگەڵیان دەژین. گومان لەوە دانییە ئیبن خەلدون لە زۆر بۆچوونەکانی هەڵە بوو.

ئیبن خەلدون دەڵێ: " ململانێ ڕەگەزێکی سەرەکی بوو لە ڕەگەزەکانی سروشتی مرۆڤایەتی، هەر مرۆڤێك حەزی لە سەرۆکایەتییە و لە ڕکابەریی و ململانێ لە پێناویدا دوودڵی ناکات ئەگەرهاتوو زانی توانی بۆ ئەوە هەیە"[٧٤] .

ئێستا ئەو بیروبایەی ئیبن خەلدون بۆتە تەوەری سەرەکی چەندین تیۆر کە لەلایەن کۆمەڵناسی دانراوەو زانستی کۆمەڵناسی نوێ قوتابخانەیەکی سەربەخۆیە، ڕێنماییەکانی لە تیۆری ئەو بیرمەندە مەزنە وەردەگرێت[٧٥] . ئیبن خەلدون بەو تیۆرە خزمەتێکی بەرچاوی هزری مرۆڤایەتیی کردووە، زۆرێك لە توێژەرانی هاوچەرخ مەیلیان بۆ ئەوە هەیە ئیبن خەلدون بەباوکی کۆمەڵناسی نوێ دابنرێت.

جێگای داخە دەبینین ئەو بیرمەندە بلیمەتە لەلایەن بیرمەندانی کۆن فەرامۆش کراوە. بەڵێ هەندێك لە بیرمەندانی ئەو سەردەمەمان بایەخی پێدەدەن، باوەڕی ئەوەش هەیە ئەمەیان وەك لاسایی ڕۆژئاواییەکانیان کردووە، چونکە بینیان ڕۆژئاوا مەزنی دەکەن و ئەوانیش مەزنیان کرد. ئەگەر ئەوان لەخۆیانەوە سەیری ئیبن خەلدونیان بکردایە شایەنی باسکردن نەدەبوو. بیرمەندانی ئێمە بەتایبەتی پیاوانی ئاینیش پێیان باشترە توێژینەوە لە بارەی کۆمەڵگایەك بکەن، بەخەیاڵی خۆیان دایانهێناوە. ئەمەش لە بری ئەو کۆمەڵگایەی تێیدا دەژین و لەبەر کێشەکانی دەناڵێنن، لەبەرئەمەش ئیبن خەلدونیان بەبچوك زانی کاتێك بینیان باسی هۆز ودەمارگیری هۆز و بەدو شارنشینی دەکات وئاماژە بە خراپەی هەریەکەیان دەکات. وەك ئەوەی بابەتی لەم شێوەیە لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لەئاکار بێت تەنها بەوە نەمێنێ کە گوێ لە ڕێنمایی و ئامۆژگارییەکانی ئەوان دەگرێت. ئەو کاتەش خەڵك چێژ لە کامەرانی برایەتی دەبینێت کە هیچ کێشەی تێدانابێت .

[٧٤] ابن خلدون، المقدمة، ص١٣٩ وغيرها

[٧٥] Beme and becker,social thought,vol I

سموئیل باتلەر ژیانی کۆمەڵایەتی وەسف دەکات گوایە بریتییە لە داو و چەقۆ، داوەکە خەڵک بەیەکەوە گرێ دەدات چەقۆش پەیوەندی نێوانیان دەبڕێ. ئەمەش مانای ئەوەیە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لە ململانێ خاڵی نابێت هەروەک چۆن لە هاوکاریش خاڵی نابێت. هەردوو بابەت لەژیانی مرۆڤدا پەیوەستە بەیەکترەوە یەکێکیان ناکرێت دەربکەوێت، ئەگەر ئەویتر دەرنەکەوێت و بۆ ئەوەی لاری بکات و بوونی ئەویتر درێژە پێ بدات [٧٦].

کەواتە ململانێ و هاوکاری دوو کۆڵەکەی مرۆڤایەتین. بۆ زانایانی دەروونناسی روون بۆتەوە کە خۆشەویستی ورق لەدەروون دا بەیەکترەوە بەندن، وەک چۆن هاوکاریی و ململانێ لەکۆمەڵگادا بەیەکەوە بەندن. کۆبوونەوەیەکی کۆمەڵایەتی نابێت ئەگەر ململانێ ماندەری نەبێت خێزان کە بە نموونەی برایەتی نێوان تاکەکان دادەنرێت سەرەرای ئەمەش دەبینین خاڵی نییە لە ململانێ. بۆیە ماوەیەکی کورت تێناپەرێت دەبینی هاواری ململانێ لە پشت دیواری خێزانێک لە خێزانەکان دێت زۆرجاریش دەڵێن کەسە نزیکەکان وەک دووپشکن ، وەک پەندەکە ئاماژەی بۆ دەکات .

توغرائی دەڵێ:

**( أعدي عدوك أدني من وثقت به فحاذر الناس واصحبهم علي دخل ) .**

ئەم قسەیە دەروونناسی نوێ لەسەری کۆکە . هەندێک لە زانایانی دەروونناسی ناوبڕی نێوان خۆشەویستی و رق بە تیغی موسێ وەسف دەکەن، هەر لەبەر ئەمەش خۆشەویستی دەبێتە رق و رقیش دەبێتە خۆشەویستی. زۆرجاریش سەرمان لەوە سور دەمێنێ خۆشەویسترین دۆست لە چرکەساتێکدا دەبێتە دوژمنێکی سەرسەخت.

توێژەران ئەمەیان لە کۆمەڵگای بەدو بینیوە، کە هەر هۆزێک بریتییە لە کارلێکردنی هۆکارەکانی بەیەکتر کێشکردن و لەیەکتر دوورکەوتنەوە . کەسی بەدو کاتێک

---

[٧٦] Ogburn and nimkoff, hand of sociology.p232

ڕووبەڕووی هۆزەکانی دیکە دەبێتەوە، ئەوا زۆر پەیوەست دەبێت بەهۆزەکەیەوە ئەوکاتە دەبینێ ڕۆڵەکانی هۆزەکەی خۆشدەوێ و لە هەق وناهەق پشتیگریان دەکات و لەپێناوی ئەوان خۆی دەکات بەقوربانی. بەڵام سەرەڕای ئەمەش هەندێکجار هەست بە ئیرەیی و قین دەکات لە بەرامبەر کەسە نزیکەکان، بەتایبەتی کاتێك بیبینی لە سەرووی ئەون و شتێکیان زیاتر هەیە لە ڕکابەریی تووند دان .

بۆیە دەبینی هۆزەکانی بەدو هێندە گەورەنابن کە دابەش دەبن و زۆر جەنگی سەخت لە نێوان تیرەکانی ئەو هۆزە بەرپا دەبێت بەمەش هەر تیرەیەك دەبێتە قەوارەیەکی سەربەخۆ و نەیاری تیرەکانی دیکە زێدەیی ناکەین ئەگەر بڵێین سەرسەختترین دوژمنی تاکی هۆز برا یان ئامۆزایەتی، بۆیە دەگمەن نییە ئەگەر بیستمان کەسێك براکەی خۆی بکوژێت یان کوڕ باوکی خۆی بکوژێت بۆ ئەوەی سەرۆکێتی بەدەست بهێنێ .

***

ئەگەر چاودێری منداڵ بکەین لە گەشەکردندا، دەبینین لەیەك کاتدا مەیلی بەلای ڕکابەریی و هاوکاریی هەیە. ئەو منداڵە ئەگەر منداڵێکی نزیکی ببینی ئەوا هۆگری دەبێت، بەڵام هێندەی پێناچێ لە یەکتر دەدەن و دەستیان لە یەکتر گیردەکەن، یان یەکتر دەدەنە بەر شەق وقسە .

منداڵ ململانێ لەگەڵ کەسە نزیکەکانی دەکات، کاتێك هەست بەوە دەکات لە شتێك ڕکابەریی دەکات. ئەو لەوانەیە لە سەرەتادا حەزی لەو شتە نەبێت، بەڵام کاتێك دەبینی شتەکە بۆتە هۆی ململانێ ئەوە دەکەوێتە هەڵپە وڕکابەریی لەپێناوی دا. بەلآم کاتێك منداڵەکە لەکاتی ململانێی کەسە نزیکەکەی هەست دەکات پێویستی بەهاوکاری کەسانی دیکە هەیە، ئەوا لە کاتی ڕکابەرییەکە هاوار دەکات و دەگری و بیانوو دەدۆزێتەوە. بەمەش دەیەوێ سەرنجی دایك وبرا ویەکێك لە هاوڕێیە کۆنەکانی رابکێشێت بۆ ئەوەی لە ململانێی ئەو نەیارە نوێیەی هاوکاری بکەن.

کاتێک یەکێک سەیری منداڵان دەکات ململانێ وشەڕەشەق دەکەن، وادەزانێ پیاوانی گەورە ئەمە ناکەن. سوپاس بۆ خوا ئەوان عاقڵن کەچی لەڕاستیدا پیاوانی گەورە لەململانێ وەک منداڵن. یەکێک لە زانایانی دەروونناسی دەڵێ: "پیاو منداڵێکی گەورەیە". پیاو وەک منداڵە رقی لە کەسێک دەبێتەوە کاتێک دەزانێ لەسەر شتێک رکابەریتی بەلام رقی خۆی حەشار دەدات کاتێک دەبینێ سەرپێچی چەمکەکانی کۆمەڵگاکەی دەکات و دژ بەنەریتەکانی ئەوانە بەلام هەرکە دەرفەتێکی بۆ رەخسا، ئەوا رقی خۆی دەردەخات, وەک منداڵ دەکەوێتە هەڵپە وشەڕەشەق. ئەگەر لەبارەی هۆکارەکەش پرسیاری لێ بکەی، ئەوا دەڵێ ئەو لەپێناو خوا یان نیشتمان یان لەپێناو حەقیقەت جیهاد دەکات, کەچی لەڕاستیدا ئەو تەنها لەپێناو خودی خۆی جیهاد دەکات .

ئێمە دەڵێین رکابەریی وهاوکاریی لە لای مرۆڤ پەیوەستە بەیەکترەوە، یەکیان بێ ئەویتر نابێت. لەگەڵ ئەوەشدا کاتێک ململانێ لەگەڵ گرووپێک دەکات، ناچار دەبێت هاوکاریی لەگەڵ گرووپێکی دیکە بکات. بەمشێوەیەش کۆمەڵە وحیزب وقەوارەی سیاسی ولایەنی ئاینیی دروست دەبن. هەرکە لە لایەک ململانێیەکت بینێ بزانە لەلایەکی دیکە هاوکاری هەیە، لەگەڵ ململانێش گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی روودەدات، کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەرەو ئاراستەیەک دەڕوات نازانین کوێیە [٧٧].

***

بیرمەندانی پێشوو لەو بڕوایە دابوون ململانێ خراپەی پەتییە، هیچ چاکەیەکی تێدا نییە. ئەوان لەمەدا هەڵەن، هەڵەی ئەوانیش لەوە دروست بووە کۆمەڵگایەکی خاڵی لە ململانێیان نەبینیوە. ئەگەر گریمانەی ئەوە بکەین خودا وەڵامی نزای ئەوانی دایەوە کۆمەڵگایەکی پڕ لە هاوکاری دروست کرد کە هیچ ململانێیەکی تێدا نەبێت، ئەوکاتە ئەوان وەک نەخۆشێک لە نەخۆشی رادەکەن.

[٧٧] Bogardus,development of social though.p439

بێگومان ململانێ بۆ مرۆڤ زیانبەخشە، لە هەمان کاتیش سوودبەخشە. ململانێ مرۆڤ بەرەو کارکردنی بەبەرهەم وداهێنان هاندەدات .بەململانێ مرۆڤ هەست بەوە دەکات گەشەی کردووە. ئەگەر مرۆڤ بەتەواوی برایەتی هەبووایە زەردەخەنەیان بۆ یەکتر بکردایە ودەستلەملانێی بەکتر بوونایە هەریەکەیان بێ رکابەریی وهەڵپە ورق وکینە ڕێگای خۆی بگرتایە، ئەوا ئەو کات هەستیان بەوەدەکرد مردن بۆ ئەوان لەو ژیانە ساردوسڕە باشترە .

هەندێك لە یوتوپیەکانی ئەمریکا ویستیان کۆمەڵگایەکی ئارام دوور لە هەڵپە بۆخۆیان دروست بکەن. لە سەرەتادا سەرکەوتن، بەڵام لە کۆتاییدا بێزار بوون و رایان کرد. ولیەم جیمس دوای ئەوەی چەند رۆژێك لەگەڵیان ژیا دەڵێ:" وام لێهات ئارەزووی دەنگی دەمانچە وبریسکەی خەنجەر وسەیرکردنی شەیتانم دەکرد". کاتێك ولیەم جیمس لەو کۆمەڵگایە دەرچوو وتی "من دڵخۆشم کە هاتوومەتە جیهانێك بەشێك لە شەڕانگێزیی تێدایە :"[78] .

***

هەندێك لە بیرمەندان ئاماژە بۆ ئەو بەهەشتە دەکەن، وەك بەڵێنێك بە باوەڕداران دراوە. ئەو بیرمەندانە دەڵێن دەبێت سەختترین شوێنی گەڕبوون بێت، چونکە شتێکی تێدانییە جگە لە برایەتی. دەخۆن ودەخۆنەوەو لەگەڵ حۆریان جووت دەبن و زیاتر لەمە شتێکی دیکە ناکەن. بۆیە لەو ژیانە ساردوسڕە بێزار دەبن، ئەگەر کاتێك تێیدا مانەوە ئەی چی ئەگەر بەنەمریی بمێننەوە؟

هەندێك لە پیاوانی ئاییني هەوڵدەدەن وەڵامی ئەمە بدەنەوە دەڵێن:"خەڵکی بەهەشت هەردەم سەیری خەڵك لە دۆزەخ دەکەن و ناخۆشییەکانی ئەوان دەبینن ئەوان خۆشیەکانی خۆیان بەئازاری خەڵکی دۆزەخ بەراورد دەکەن و لە ئەنجامی ئەمەشدا هەست بە کامەرانی دەکەن". کێشەیەك لەو وەڵامە نییە، چونکە لە بنەما

---

[78] James, letters of wiliam james,vol ii.p43

لۆژیکیەکەی لە بیرورای پێشوو باسمان کرد جیاواز نییە، شتێك تەنها بەدژەکەی دەناسرێت شتێك بوونی نابێت تەنها دژەکەی نەبێت.

وەلامێکی دیکە هەیە کە دەکرێت لەو وەلامە دروستتر بێت، سروشتی مرۆڤایەتی دوای مردن دەگۆرێت و وەك ئەو نابێت کە لە دونیا بووە. ئەگەریش لەسەر ئەوە بمێنێتەوە کە لە دونیا لێی راهاتووە، ئەوا نە بەهەشت سوودی دەبێت نە دۆزەخیش زیانبەخش دەبێت - سروشتی مرۆڤایەتی لە ژیانی دونیاماندا ناتوانێت خۆشی وشادی قبوڵ بکات کە لە قورئان بە (سرر مقابل )وەسفکراوە، بەڵکو ئارەزوو و ململانێ و مەیلەی هەیە بۆ ئەوەی لە بێزاریەکانی ژیان و هیچی ئامانجەکانی دووربخاتەوە .

تکام لە خوێنەر ئەوەیە وا نەزانێت من بانگەشە بۆ ململانێ و داوای وازهێنانی هاوکاریی و برایەتی دەکەم، لەڕاستیدا هەرشتێك سنوری خۆی هەیە کە لێی دەوەستێ ، پێشینان وتویانە: هەرکەسێك لە ئاستی خۆی نەوەستێت دەچێتە سەر دژەکەی .

وەك پێشتر باسمان کرد ململانێ و هاوکاریی دووانەیەکن لە یەکتر جیانابنەوە، ئەرکی هەر یەکەیان ئەوەیە ئاستی ئەویتر دیاریبکات و کاری خۆشی لە چوارچێوەیەکی دیاریکراو ئەنجام بدات، کۆمەڵگاش ئەو دوو هۆکارە بەهاوسەنگ رادەگرێت و یەکێکیان بەسەر ئەویتریان زاڵ ناکات .

ئەمەش ئامانجی دیموکراسیەتی نوێیە لە وڵاتەکەی خۆی دا بێگومان، نەوەك لە وڵاتی ئێمە.

***

لە بەشی یەکەم وتمان کۆمەڵگای مرۆڤایەتی پێویستی بە دوو پێ هەیە بۆ ئەوەی بڕوات، ئەو دوو پێیەش بریتین لە دووبەرەی دژبەکتر. سەختە کۆمەڵگاش بەیەك پێ بڕوات. ئەگەر توێژینەوە لە پارەی هەر کۆمەڵگایەك بکەین دەبینین؛ دوو لایەنی تێدایە ململانێ دەکەن؛ بۆ ئەوەی دەسەڵاتیان بەسەر کۆمەڵگا هەبێت. لایەنێك موحافیزکارن دەیانەوێت هەرشتێکی کۆن لەسەر پێیی خۆی بمێنێتەوە؛ باوەریشیان

وایە ناتوانرێت لەوە باشتر بهێنرێت. لە بەرامبەریشدا لایەنێکی پێچەوانەی ئەو هەیە بانگەشە بۆ گۆڕان و نوێبوونەوە دەکات؛ بڕوای بەوە هەیە کە دەتوانێ باشتر بهێنێ. بوونی هەردوو گرووپ لە کۆمەڵگا پێویستە؛ نوێخوازەکان پێش زەمەن دەکەون و کۆمەڵگای بۆ ئامادە دەکەن، کاتێک کۆمەڵگا لەوانە خاڵی بێت، ئەوا لەبەردەم پارودۆخە نوێیەکان ڕووبەڕووی داڕمان دەبێتەوە. موحافیزکارەکانیش هەوڵدەدەن کۆمەڵگا بپارێزن، بێئەوەی هەست بکەن خزمەتێکی گەورە بە کۆمەڵگا دەکەن. چونکە ئەوان پارێزەری ئەمن و سیستەمی گشتین، ئەگەر ئەوان نەبن ئەوا کۆمەڵگا لەبەر زەبری نوێخوازە شۆڕشگێڕەکان دادەڕمێت. واتە پێیەک کۆمەڵگا چەسپاو دەکات و ئەویتریش پاڵی پێوە دەنێت، ڕۆیشتنیش ئەنجام نادرێت ئەگەر کارلێکردنی نێوان جووڵە و وەستان نەبێت.

ئەو کۆمەڵگایەی لە لایەن موحافیزکارەکانەوە بەڕێوەدەبرێت؛ وەک ئاوی پەنگ خواردوو بۆگەن دەبێت. ئەو کۆمەڵگایەی تەنها نوێخوازەکان سەرکردایەتی دەکەن، ئەوا وەک تۆفان یاخی دەبێت هەموو سنوور بەنداو دەبەزێنێ و لە هەموو شتێکی دەکەوێتە ژێر هەڕەشەی لەناوچوون. کۆمەڵگای چاک ئەوەیە بە هێمنی دەجوڵێ بۆگەن نابێت و یاخیش نابێت، هێزەکانی موحافیزکاران و نوێخوازن تێیدا هاوسەنگ دەبن و هیچ کامێکیان بەسەر ئەویتر زاڵ نابێت موحافیزکارەکان هەردەم بانگەشە بۆ پتەوکردنی یەکگرتوویی کۆمەڵگا دەکەن. تەنانەت ئەوان ئەو یەکگرتووە پیرۆز دەکەن وتەکفیری هەرکەسێک دەکەن لە گوێڕایەڵی دەربچێت.کەچی نوێخوازەکان لە لایەن خۆیانەوە بانگەشە بۆ پێشکەوتن و شۆڕش دەکەن و زیاتر بایەخ بە گونجان و پێشکەوتن دەدەن نەوەک یەکگرتوویی.ئەمە دوو بۆچوونی دژ بەیەکترن هەق لە لای هەردووکیانە. ئەمە دوو ڕووی هەقیقەتی کۆمەڵایەتین، یان بە گوزارشتێکی دیکە ئەو دوولایەنە وەک دوو پێیی کۆمەڵگان کۆمەڵگا لە نەوەیەک بۆ نەوەیەکی دیکە بەرەو پێشکەوتن دەبەن.

***

ئەوەی لەم دەرفەتەدا شایەنی ئاماژە بۆ کردنە، ئەو فەرموودانەی پێغەمبەرن لە بارەی ئیسلامەوە کە هەردوو بۆچوون لە خۆیەوە دەگرێت. ئەمەش بەڵگەیە کە پێغەمبەر بەبیرتیژی خۆی درکی بە سروشتی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی کردووە.

لە لایەک پێغەمبەر دەفەرمووێ "جەماعەت رەحمەتە و پەرتبوون ئازارە"، یان دەڵێ: "ئەوەی جیابێتەوە لە ئێمە نییە" یان دەفەرمووێ "دەستی خودا لەگەڵ جەماعەتە ،......" دەفەرموێ "ناکۆک مەبن ئەوانی پێش ئێوە ناکۆک بوون، لەناوچوون ".

کەچی لە لایەکی دیکە دەفەرموێ "هێشتا بەشێکی ئومەتی من لەسەر هەقن، ئەوانی جیابوونەتەوە، زیانیان پێ ناگات تا فەرمانی خودا دێت " دەفەرموێ " لە باخی بوونی خالق دا، ملکەچ بوون بۆ مەخلوق نەهاتووە" چاکە بۆ غەریبەکانە، پیاوچاکن لەناو پیاوخراپان، ئەوانیش زیاتر سەرپێچیان دەکەن لەوەی گوێڕایەڵیان بێت" یان دەفەرموێ " جیاوازی نێوان ئومەتم رەحمەتە "[٢١].

ئەو دژبەیەکە لە فەرموودەکانی پێغەمبەر، ئامانجی ئەوەیە پێغەمبەر بە پێی حاڵەتەکان ئامۆژگاری پەیڕەوکاراتی کردووە. ئەمەش وەک پزیشک بووە کاتێک نەخۆشێک تووشی کەمخوێنی بێت ئامۆژگاری دەکات زۆر بخوات. کەچی ئامۆژگاری قەڵەوێکی تووش بوو بەفشاری خوێن دەکات کەم بخوات. دیارە ئەو پزیشکە لەلای کەسێکی سادەوە قسەکانی دژبەیەکترە کەچی لەڕاستیدا ئەو ئامۆژگارییەکان بەپێی جۆری نەخۆشەکان دەکات.

جێگای داخە دەبیستین پیاوانی ئایینی بەمشێوەیە لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ناگەن، بەڵکو قسەکانی ئەو بە رەها دەزانن کە بۆ هەموو کات وشوێنێک بگونجێت، کەچی ئەو فەرموودانە بۆ چارەسەرکردنی کێشە کاتییەکان گوتراون کە ناوە ناوە یەکێک لە موسڵمانان تووشی دەبوو.

---

[٢١] عبدالقادر المغربي، الواجبات و الاخلاق، ص١٢٣ و١٢٤ و١٢٥ و١٦٣ وغيرها

پێغەمبەر ئامۆژگاری پەیڕەوکارانی دەکات ئاکۆک و پەرتەوازە نەبن. ئەمەش دەبینێ خەڵکەکەی لەسەر هەندێک شت ناکۆکن و کەشیاوی ناکۆکی نییە و ئەمەش لە بەرامبەر دوژمن لاوازیان دەکات. کەچی فەرمانی بە موسڵمانان کردووە هەوڵبدەن لەسەر هەق بن ئەگەر ئەنجامەکەی سەرپێچی جەماعەتیش بێت. چونکە یاخی بوون لە مەخلوق مانای یاخیبوون لە خالق ناگەیێنێ. لەبەرئەمەشە فەرمان دەکات موسڵمانان چاکە بکەن وخراپە نەکەن ئەو ڕێچکەش لە ناوەخنە کۆمەڵایەتیەکەی مانای ئەوەیە مرۆڤ لەسەر هەق سووربێ ئەگەرهاتوو سەرپێچی قەومەکەشی بێت. هەر لە فەرموودەیەکی پێغەمبەر هاتووە "ئەو کەسەی بەناهەق پاڵپشتی قەومەکەی دەکات وەک ئەو حوشترەیە کەوتۆتە چاڵەوەو کوناھی خۆشی لەگەڵ خۆی ڕادەکێشێ "[12] .

ئەوەی جێگای سەرنجە موسڵمانان لەو سەردەمە درەنگانەدا، ئەو فەرموودانە وەردەگرن کە لەگەڵ ئارەزووی ئەوان دەگونجێت ئەوانی دیکەش فەرامۆش دەکەن، سوڵتان و دەستوپێوەندەکانی لە پیاوانی ئایینی ئەو فەرموودانە وەردەگرن، کە فەرمان بە گوێڕایەڵی بۆ سوڵتان دەگەیێنێ، بۆیە کەسێک لە بڕیاری سوڵتان دەربچێ، ئەمە مانای دەرچوونە لە ئومەتی ئیسلام و نەفرەتی خواو فریشتەکانی لەو کەسە بێت. بەڵام حیزبەکانی ئۆپۆزسیۆن کە سوڵتان بەستەمکار دەزانن، پێیوایە گوێڕایەڵ بوونی سوڵتان سەرپێچی گوێڕایەڵی خودایە. ئەمانەش ئەو فەرموودانە دەهێننەوە کە جەخت لەسەر( ئەنجامدانی چاکەو دوورکەوتنەوە لە خراپە ) دەکاتەوە، بۆیە بەلای ئەوان دەستوپێوەندی سوڵتان بەدکار وهەڵگەڕاوەن لە ئایین .

بەمشێوەیە کۆمەڵە جیاجیاکانی ئیسلام بە چەکی فەرموودەکان دەجەنگن و هەر بەو فەرموودانەش یەکتر تەکفیر دەکەن و هەریەکەیان ئەو جۆرە فەرموودەیە وەردەگرێت کە سەرنجی ڕاکێشاوە و ئەوانی دیکە فەرامۆش دەکات.

بەڵام ئەگەر ئەوان بە تێڕوانینێکی واقیعییانە سەیری فەرموودەکانی پێغەمبەر بکەن، ئەوا دەبینن پێغەمبەر لە هەردوو لاوە سەیری هەقیقەتی کۆمەڵایەتی کردووە، دەبێت

پەیڕەوی جەماعەت بکرێت، بزووتنەوەی کۆمەڵایەتیش تەواو ئابێت ئەو کاتە نەبێت هاوکاریی و ململانێی تێدانەبێت ئەمەش بەرەو پێشەوەی دەبات .

مامۆستا عەبدول تعیم کازمی لە کاتی وەڵامدانەوەی کتێبی واعیزی سوڵتانەکان دەڵێ: " ئەو محەمەدەی کە هەموو هەوڵ و کۆششی خۆی بۆ یەکگرتنی ئومەت و تەواو مرۆڤایەتی تەرخان کردبوو، فەرمانی بەرێککەوتن لەسەر یەك بیروباوەڕ، یەك ئایین، یەك کتێب، یەك قیبلە، یەك حیزب داوە . ئایا وادەبینی محەمەد ئەو پەیامە مەزنە خۆی پێچەوانەی قسەکانی خۆی بێت ، سەرپێچی ڕێسا کۆمەڵایەتییە گشتییەکان بکات و حەزی لە جیاوازی بێت و بەڕەحمەتی بزانێ ؟ نەخێرو حاشا خاوەنی ئەو پەیامە مەزنەکە بۆ عالەم ڕەحمەتە، بانگەشە بۆ جیاوازی وئیختیلاق ناکات و هەموو لایەکیش دەزانێ کە جیاوازی دەبێتە هۆی لاوازی و داڕووخان و هەڵوەشانەوەو بەدیهاتنی ئاکارو نەمانی سیستەم "[٨٠٤].

مامۆستا کازمی تەواو بۆ لایەنە خراپەکانی جیاوازی چووە، وەك دەڵێ دەبێتە هۆی لاوازیی و داڕووخان و هەڵوەشانەوە و بەدیهاتنی ئاکار ونەمانی سیستەم هەموو ئەمانە ڕاستن و گومانی تێدانییە . بەڵام مامۆستا دیوێکی تری لە دیوەکانی حەقیقەتی کۆمەڵایەتی لەبادکردووە، ئەویش دەرئەنجام و زیانەکانی نەبوونی جیاوازییە لە کۆمەڵگادا کێشەکە لێرەدا دووڕووی هەیە .

وەك زاناياني کۆمەڵناسی دەیڵێن لەودونیایەدا بابەتێك نییە خاڵی بێت لە خراپی ، هەرچەندیش لە دیدی ئێمەوە باش بێت . بۆیە ئەوەی مامۆستا کازمی لە دەرخستنی خراپییەکانی جیاوازیی دەریدەخات، ئەمە خودی بۆچوونی سوڵتان و دەستوپێوەندەکانیەتی . ئەوان داوایان لەئومەت دەکرد یەکگرتووبن، سەرپێچی فەرمانەکان نەکەن، کەچی لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆن بۆچوونیان پێچەوانەی تێڕوانینی سوڵتان و دەستوپێوەندەکانیەتی . ئەوان دەیانەوێ چاکسازی لە کاروباری ئومەت

[٨٠٤] عبدالمنعم الكاظمي، من كنت مولاه فهذا علي مولاه، ج٢،ص٣١-٣٣

بکەن ، بایەخیش بەوە نادەن ئەوچاکسازیە ببێتە هۆی جیابوونەوە لە فەرمانی سوڵتان، کە گوایە سێبەری خودایە. ئەو دژایەتییەی بەبڕوا بە ئاشکرایی لە سەردەمی هیشام کوڕی عەبدولمەلیک دەبینین. کاتێک زەیدی کوڕی عەلی لە عێراق لە دژی دەسەلاتەکەی راپەڕی لە سەروبەندی ئەو راپەڕینە هیشام نامەیەکی بۆ والییەکەی نارد کە لە عێراق بوو هیشام دەڵێ: "...بزانە تۆ لە پێناو خۆشەویستی و هۆگری دا کارەکەی ، داوای گوێڕایەڵی دەکەی ، کۆکەرەوەی جەماعەتی، کار لە پێناو ئاینی خودا دەکەیت، لەبەر زۆری رقت لەوان نەبێت، با ئەو شوێنەی خۆت تێدا دالدە داوە باوەڕی تۆ بچێت بۆ خودا، تۆبە بێ لە پێناو ئاینەکەت پارێزگاری بێت لە جەماعەت، بەرگری بێت لە بەرامبەر ئەو کەسانەی دەیانەوێ ئەودەرگایە بشکێنن کەخودا فەرمانی کردووە ئێوە بچنە ئەوێ، ئەوانیش بەربەرەکانێ دەکەن."[٨١].

هیشام کوڕی عەبدولمەلیک لەو باوەڕەدایە ئەو (قەدیسە ) بۆیە داوای هۆگربوون و خۆشەویستی و یەکگرتنی نێوان موسڵمانان دەکات کە خودا فەرمانی پێکردووە؛ ئەمە باوەڕی هەموو ئەو سوڵتانە ئەبوو کە خودایان دەپەرست و بەندەکانی خوداشیان تاڵان دەکرد .

کەچی زەیدی شۆڕشگێڕ بۆچوونێکی دیکەی هەبوو، دەگێڕنەوە ئەو رازی نەبوو کەسێک بچێتە ریزی شۆڕشەکەی تەنها ئەو کاتە نەبێت کە بەو شێوەیە بەیعەتی بۆ بکات "ئێمە بانگەواز دەکەین بۆ کتێبی خودا وسوننەتی پێغەمبەرەکەی و جیهاد لە دژی ستەمکاران و داکۆکی کردن لە هەژاران ... " بۆ پێدانی ماف بەشخوراوان و دابەشکردنی داهات بە یەکسانی، قبوڵ نەکردنی ستەمکاری بۆ دامرکاندنەوەی ئەو ئاگرەی ئەهلی بەیت لە دژی ئەواندەی پیلانیان بۆمان هەیە و ماف ئێوە فەرامۆشکردووە پاڵپشتمان دەکات ئایا بۆ ئەمە بەیعەتم بۆ دەکەن ؟ ئەگەر پیاوەکە

---

[٨١] محمد اسحاف النشاشیبي، الاسلام الصحیح، ص٢٧

دەیگوت ( بەڵێ ) ئەو زەید دەستی دەخستە سەردەستی پیاوەکەو دەیگوت "شەهادەت بۆ خودا"[٨١].

لە ئەنجامی ئەو شۆڕشە جیاوازییەکی دوورودرێژ کەوتە نێوان فرقەها، بەتایبەتی ئەوانەی پەیڕەوکاری ئەبو حەنیفە بوون. وەک زانراوە ئەبوحەنیفە پشتگیری زەیدی دەکرد لە شۆڕشەکەی دا چەندین نامە لە نێوان ئەوان هەیە، زەمەخشەری دەڵێ:"ئەبو حەنیفە بەنهێنی فەتوای پاڵپشتی زەید وپێدانی پارەی بۆ ئەو دەدا، دەرچوون لەگەڵ زەیدی لە دژی ئەو دزە زاڵبووە کە بەخەلیفە ناودەبرێت، بەواجب دەزانی"[٨٢].

چەندین ریوایەت هەیە کە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن ئەبوحەنیفە باوەڕی بەوەهەبووە شمشێر لەدژی سوڵتانی زۆردار بەکاربێت[٨٤]. بەڵام پەیڕەوکارانی ئەو نەیانتوانی ئەو ریوایەتانە قبوڵ بکەن وسەنەدەکانیان بە لاواز زانیوە، هەندێکیان وتیان ئەمە درۆ و بوختانە بە ئەبوحەنیفە کراوە، بەڵگەشیان ئەوەبە فەقیهەکانی خەلیفە لەسەر ئەوە کۆکن کە نابێت لە دژی سوڵتان یاخی بوون ئەنجام بدرێت. وەک دەرکەوت پەیڕەکارانی ئەبو حەنیفە بوونە واعیزی سوڵتان، بۆیە تووشی شۆک بوون کە بینیان ئیمامەکەیان وەستان لە دژی سوڵتانەکانیان و سەرچارەی بزێوییەکەیان بە پێویست دەزانی[٨٥].

***

سەیر ئەوەیە نموونەی ئەو ناکۆکییە لە نێو ڕێبەرانی فەڕەنسا لە سەرووبەندی شۆڕش ڕوویداوە، لەوکاتەدا حیزبێکی موحافیزکار دروست بوو بەناوی حیزبی جیروند، ئەوان لە چینی خۆشگوزەران و خاوەن بەرژەوەندی تایبەت پێکهاتبوون، بە

[٨١] المصدر السابق،ص٢١
[٨٢] محمد رضا الشبيبي، مؤرخ العراق ابن الفوطي
[٨٤] الزمخشري، الكشاف، ج١،ص٦٤
[٨٥] الخطيب البغدادي، تاريخ بغداد،ج١٣،ص٣٩٥-٣٩٦

تێڕوانینی ئەو حیزبە شۆڕشی فەرەنسی بەئامانجەکانی گەیشتووەو لە ناوەوەی وڵات کارەکانی تەواوکردووە. بۆیە دەبێت شۆڕش جەنگەکە بباتە دەرەوە بۆ ئەوەی بنەماکانی شۆڕش لە جیهان بڵاوبکاتەوە. بەڵام ڕۆبسپیێر هەڵوێستێکی توندی بەرامبەر ئەو تێڕوانینە هەبوو پێیوابوو ئەو دوژمنەی ڕووبەڕووی شۆڕش وەستاوە لە ناوەوەی وڵاتە نەوەك دەرەوە، شۆڕش دەبێت جەنگێکی ناوخۆبێت، نەوەك جەنگێکی نەتەوەیی، سەرەڕای ئەمەش ڕۆبسپیر وتی "بنەماکانی ئازادی و دادپەروەریی ناتوانرێت لە دەرەوە بەشمشێر زاڵ بکرێت، چونکە خەڵك مژدەبەخشی چەکداریان خۆشناوێت" بۆیە ڕۆبسپیێز داوای لە شۆڕشگێڕان کرد ڕوویان لە وڵاتەکانیان بکەن وبنەماکانی شۆڕش بەرقەراربکەن، بەرلەوەی لە وڵاتانی دیکە ئەنجامی بدەن[86].

***

ئەوەی لە سەردەمی شۆڕشی فەرەنسا و لە سەرەتای ئیسلام ڕوویدا لە هەموو وڵاتێك ڕوودەدات، ئەگەر بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی نوێی تێدادەرکەوێت.موحافیزکاران لە خۆشگوزەران و خاوەن بەرژەوەندیە گەورەکان لە سەرەتادا بەرەنگاری ئەو بزووتنەوەیە دەبنەوە، بەڵام ئەگەرهاتوو بێ خواستی ئەوان سەرکەوت ئەوا دەیانەوێ لە ئاستێك بیروەستێنن وچەسپاوی بکەن. بۆیە لێرەوە بانگەشە بۆچەسپاندنی سیستەمێکی گشتی ویەکگرتنی جەماعەت و بەهێزکردنی جەماعەت لە بەرامبەر دوژمنانی دەرەوە دەکەن ،

کەچی نوێخوازە یاخیبووەکان بایەخ بەهێزی جەماعەت و یەکگرتن نادەن، بەڵکو زیاتر بایەخ بەکارکردن دەدەن لە پێناو بەرقەرارکردنی دادپەروەریی ویەکسانی ئەوە دوای ئەوە. ئەوان بۆچوونیان وایە جەنگی دەرەوە خەڵك بەجۆش وخرۆشی

[86] قدري قلعجي، روبسبير، ص١٥-٥٢

نەتـەوەیی سـەرقاڵ دەكـات و ئەمانـەش پەیوەنـدیان بەبنـەماكانی دادپـەروەریی و یەكسانی نییە .

***

مەقریزی باس لەوە دەكات یوسفی كوڕی عومـەر كە والی عێـراق بـوو لـە سـەردەمی هیشام دا لە سەرویەندی شۆڕشەكەی زەید، ڕۆژێكی هـەیبیێ چـووە سـەر مینبـەر . وتی:" یەكەم كەس كە دەرگای ئاژاوە و خوێنڕشتنی لەسەر خـەڵك كـردووە، عـەلی و هاوڕێیە زەنجییەكەی بوو"[87] . مەبەست لـە زەنجییەكـە عـەمماری كـوڕی یاسـر بـوو، ئەمەش وەك گاڵتەپێكردن بوو بەڕەچەڵەكی دایكی.

وەك دەردەكەوێت یوسفی كوڕی عومەر ئەو بۆچوونەی لـە سـەرداری ئەمەوییـەكان وەرگرتووە؛ چونكە ئـەوان هـەموو شۆڕشـگێڕێكیان بـە دەرچـوو لـە ئـایینی ئیـسلام وملكەچی خوا دەزانی. جولدتسهێر دەڵێ:" ئەمەوییەكان كاتێك لەگـەڵ یاخیبووەكـان و شۆڕشـگێڕان دەجـەنگان گوایـە لەبـەر هۆكـاری ئـایینی ڕاپـەڕیبوون. ئەمەوییـەكان باوەڕیان وابوو ئەوانە دوژمنی ئیسلامن؛ بۆیە ئـەركی ئـەوان بـوو لـە پێنـاو مـەزنێتی ئیسلام و مانەوەیان ئەوكەسـانە بـە شمێشێر تـەمێ بكرێن.. بڕوایان وابوو ناكرێت جیابوونەوە لە نێوان بەرژەوەندی ئیسلام و بەرژەوەندی دەوڵەت بكرێت، ئەوەی ئـەوان لـە دەسـەڵات بەدەسـتیان هێنـابوو، بـەبڕوای ئـەوان سـەركەوتنێكی ئـایینی بـوو. دڵسۆزەكانی ئەوانیش دركیان بەوە دەكرد كـە كـاری ئـەوان دڵـسۆزییە بـۆ ئیـسلام، شاعیرەكانیشـیان لـە ستایشـەكانیان وا باسـی ئـەوانیان دەكـرد گوایـە پـارێزەری ئیسلامن"[88] .

ئەو قسەیەی جولدتسهێر هۆكاری ئەو قسەیەمان بۆ ڕوون دەكاتەوە، كە قازی ئیبن عەرەبی لەبارەی شۆڕشی حوسێن كوڕی عەلی كردوویەتی. ئەویش لە ڕووی ناوەخنـە كۆمەڵایەتییەكەی جیاوازییەكی لەگەڵ قسەی یوسفی كوڕی عومەر نییە ,كە لە بـارەی

---

[87] المقريزي، النزاع والتخاصم،ص٢٩

[88] جولتتسهير ، العقيدة والشريعة في الاسلام، ص٧٢

عومەر وعەلی کردوویەتی. یان ئەوەی هیشام لە بارەی زەیدی کوڕی عەلی کردوویەتی. ئیبن عەرەبی لە بارەی حوسێنەوە دەڵێ:" ئەو بەشمێشری باپیرەی کوژرا"[89] مەبەستی ئەوەیە حوسێن بەشمشێری ئیسلام کوژراوە، چونکە لە دیدی ئیبن عەرەبی لە ئایینی ئیسلام چووە دەرەوە کاتێک لە ئیمامەتی یەزیدی کوڕی معاویە دەرچوو.

ئەمە بەڵام کاتێک گوێبیستی خودی حوسێن دەبین، دەبینین جۆرێکی دیکەیە. حوسێن لە بارەی ئەمەوییەکان وتی:" ئەوانە ملکەچی شەیتانن و تاعەتی ڕەحمانیان جێهێشتووە. بەدکاری بڵاودەکەنەوە. سنووریان بەزاند، داهاتیان تەنها بۆ خۆیانە، حەرامیان حەڵال کرد و حەڵالیان حەرام کرد".

ئێمە نموونەی ئەو مشتومڕە لە کۆبوونەوەی معاویە بەدی دەکەین، کاتێک لەگەڵ ئەو کەسانە کۆبووەوە کە لە قورەیش پەست بووبوون، لەبەر ئەوەی داهات و دەسەڵاتی قۆرخ کردبوو. کورتەی قسەکانی معاویە لەگەڵ ئەوان ئەوەبوو" دەست بەجەماعەت بگرن و پەرتەوازە مەبن". تەبەری ئەو قسانە بەدرێژیی دەگێڕێتەوە و ئەو قسانە دەبینین " ئێوەی عەرەب خاوەن ددان و زمانن بە ئیسلام درکتان بەشەرەف کرد و بەسەر نەتەوەکانی دیکە زاڵ بوون و دەستتان بەسەر میراتی ئەوان داگرت. ئەوەم پێگەیشتووە کە ئێوە بەخراپە باسی قورەیشتان کردووە، کینەتان لەوالییەکانیان هەیە. ئەگەر قورەیش نەبوایە ئەوا وەک پێشتر دەگەڕانەوە سەر ملکەچی. ڕێبەرانی ئێوە ئەمڕۆ بۆتان پشت وپەنان، دەرگای ئەوان لە خۆتان دامەخەن. لە من تێبگەن. وابزانم لە من ناگەن، قورەیش لە جاهیلیەت و ئیسلام دا تەنها بەخودا بەهێز بووە. کەسێک ئەوانی بە فێڵ نەگەڕاندۆتەوە. تەنها خودا نەبێت.

دواتر خودا ویستی، ئەو کەسانەی ڕێزی گرتوون بخاتە سەر ئایینەکەی خۆی، بۆ ئەوەی لە لاوازیی دونیا و ڕۆژی دوایی بەدووریان بگرێت. بۆیە چاکترین کەسانی

---

[89] ابن خلدون، المقدمة، ص٢١٧

هەڵدەبژاردن ، هەڵبژاردنەکەش قورەیش بوو، دواتر ئەو دەسەڵاتەی دا بەوان و خەلیفەش لە نێو ئەوان بوو، کارەکان بەوان نەبێت چاک نابێت. خودا لە جاهیلیەت ئەوانی دەپاراست کاتێك کافر بوون، ئایا دەبێ ئێستا نەیانپارێزێ کە لەسەر ئاینی خودان..."[١٠] نارازییەکان داوای جێ بە جێ کردنی یەکسانی ودادپەروەیی یان دەکرد، کەچی معاویە باسی ئیمامەتی قورەیشیان بۆ دەکات کە گوایە ئەوان پارێزەری ئیسلامن. ئەگەر ئەوان دەستبەرداری ئومەت بن، ئەوا دەسەڵات و سەرکەوتن لەبەرامبەر نەتەوەکانی دیکە لە دەست عەرەب نامێنێت.

هەروەها تێبینی نموونەیەکی دیکە دەکەین کاتێك محەمەد لە سەرەتادا بانگەوازی بۆ قورەیشی خۆشگوزەران کرد، بێنە سەر ئاینی ئیسلام. عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەڵێ:" ڕۆژێك پیاوماقوڵانی ئەوان کۆبوونەوە باسی پێغەمبەری خودایان کرد: هەرگیز هێندە سەبرمان نەبووە کە لەو پیاوەمان گرتووە، خەونی ئێمەی تێکدا و جنێوی بە باوباپیرانمان دا، ئێمەی پەرتەوازە کرد، سووکایەتی بەخواوەندەکانی ئێمە کرد، سەبرێکی مەزنمان لەو گرتووە..."[١١]. عومەری کوڕی خەتاب بەر لە ئیسلام بوونی بیتراوە بەدوای محەمەد دەگەڕا و پرسیاری لێکرا کە بۆچی بەدوای دەگەڕێی، وتی:" محەمەدم دەوێ ئەوەی هەڵگەڕاوەتەوە، ئەوەی قورەیشی پەرتەوازە کرد، ئاینەکەی عەیبدار کرد، سووکایەتی بەخواوەندەکانی کرد، دەیکوژم"[١٢].

لە هەموو ئەوانە سروشتی مشتومڕی نێوان هەردوو بەرەی دژبەیەك لە کۆمەڵگادا ڕوون دەبێتەوە، بەرەی موحافیزکاری یەکێتی جەماعەت و چەسپاندنی هێزەکەی دەوێ، بەڵام بەرەی نوێخوازان چاکسازی کۆمەڵایەتی دەوێت بە چاوپۆشی لەوەی دەبێتە هۆی لاوازیی و پەرتەوازە بوون.

---

[١٠] الطبري، تاریخ الرسل و الملوك،ج٥،ص٨٦
[١١] ابن هشام، السیرة النبویة،ج١،ص٣٠٩
[١٢] المصدر السابق،ج١،ص٣٠٩

***

مانهایم دەڵێ: بیروڕای مرۆڤایەتی لەسەر دوو جۆری دژ بەیەکترە.

یەکەمیان: بیروڕای موحافیزکارە، کە پاڵپشتی سیستەمی باو دەکات و بە (ideo;ogies) ناوی دەبات.

دووەمیان: بیروڕای ئۆتۆپۆسیۆنە، کە داوای سیستەمێکی ئایدیا دەکات و بە(utopias) ناوی دەبات[٩٣].

مانهایم پێیوایە خاوەن بەرژەندییەکان هەردەم خاوەنی بیروڕای موحافیزکارانەن. ئەوان بانگەشە بۆ پاراستنی واقیعی باو دەکەن. بڕوایان وایە لەمە چاکتر نابێت. بەبڕوای ئەوان هەر چاکسازییەک دەبێتە هۆی پشێوی کۆمەڵگا و دروستکردنی دڵەڕاوێ بۆ سیستەمی باو. زۆرێک لە کۆمەڵناسان باوەڕیان بەو بۆچوونەی مانهایم هەیە. لەوانە توێژەری کۆمەڵایەتی بەناوبانگ ڤیبلن. یەکێکی دیکە سیمنەرە کە خاوەن کتێبی" شێوازە میللییەکان" کە ئەو کتێبە بە ئینجیلی کۆمەڵناسی نوێ دادەنرێت[٩٤].

ڤیبلن قسە لە بارەی چینی خۆشگوزەران( Leisure Class) دەکات و بە چینی دەستبەتاڵ ناویان دەبات. دەڵێ ئەو چینە مەیلی بەلای بەرەی موحافیزکارەوە هەیە، زۆڵەکانی ئەو چینە لە هەموو گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی ونوێبوونەوە دەترسێن، چونکە گۆڕانکارییەکان باروودۆخە خۆشگوزارانەکەی ئەوان تێک دەدات. بۆیە بەرژەندییە ماددییەکانی ئەوان وادەکات ئەوان سووربن لەسەر مانەوەی هەر کۆنێک، هەرچەندە زۆر کۆنیش بێت[٩٥].

کەچی سمنەر جیاوازی لە نێوان ئایدیاڵ و بەها کۆمەڵایەتییەکان دەکات. بۆیە لەمەیاندا لە جیاکردنەوەی بیروڕای موحافیزکار و بیروڕای ئۆپۆزسیۆن لە کارل

---

Heberle,social movements,p27 ٩٣
Sumner, the folkways ٩٤
Bagadus,op.cit,p373 ٩٥

مانهایم دەچێت، نموونەی باڵا یان ئایدیاڵ (ideals) بەلای سیمنەرەوە چەکی ناڕەزاییەکانە. بەڵام بەها کۆمەڵایەتییەکان دەسەڵاتدارەکان بەکاری دەهێنن بۆ پاراستنی دەسەڵاتەکانیان ئەگەر ستەمکارانەش بێت. هەر هەمان بۆچوون لە لایەن پرۆفیسۆر سمنەر دەدۆزینەوە کە مامۆستای کۆمەڵناسییە لە کۆلیژی ئۆبرلین لە ئەمریکا[٦٦].

***

دادپەروەریی وامان لێدەکات، ئاماژە بەوە بکەین ئەو تیۆرەی ئەمڕۆ زانایانی کۆمەڵناسی دایانناوە، لەمێژە قورئان باسی کردووە. قورئان لە یەکێك لەئایەتەکانی دەفەرمووێ" وما ارسلنا في قرية من نذير إلا قال مترفوها إنا بما أرسلتم به كافرون"[٦٧] و لە ئایەتێکی دیکە دەفەرمووێ" وكذلك ما ارسلنا من قبلك في قرية من نذير إلا قال مترفوها إنا وجدنا آباءنا على أمة وإنا على آثارهم مقتدون" و" قال أولو جئتكم بأهدى مما وجدتم عليه آباءكم قالوا انا بما أرسلتم به كافرون"[٦٨] هەروەها لە ئایەتێکی دیکە دەفەرمووێ" سأصرف عن آياتي الذين يتكبرون في الأرض بغير الحق وإن يروا كل آية لا يؤمنوا بها وإن يروا سبيل الرشد لا يتخذوه سبيلا وإن يروا سبيل الغي يتخذوه سبيلا"[٦٩].

لە قورئاندا چەندین ئایەتی دیکە هەیە کە بە هەمان مانا دێت، ئایەتەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە خۆشگوزەرانەکان ڕووبەڕووی هەموو بانگەشەیەکی نوێ دەبنەوە و مەیلیان بۆ موحافیزکاریی هەیە لەسەر ئەو بەها و دابونەریتانەی کە لە باوانیانەوە جێماوە. لەم ڕووەوە ئایەتێك هەیە کە مانایەکی کۆمەڵایەتی گرنگی هەیە، خودا لە ئایەتەکە دەفەرمووێ" وإذا اردنا ان نهلك قرية أمرنا مترفيها ففسقوا فيها فحق عليها القول فدمرناها تدميرا" هەندێك لەوانەی تەفسیری ئەو ئایەتەیان کردووە،

---

[٦٦] Sims, social changes.p31

[٦٧] القران، سورة سبأ،اية ٣٤

[٦٨] القران، سورة الزخرف،الايتان٢٣-٢٤

[٦٩] القران، سورة الاعراف، اية ١٤٥

سەریان لەوە سوڕماوە کە چۆن خودا بە خوشگوزەرانەکان تەواوی گوندێك کاول دەکات. لەڕاستیدا ئەو ئایەتە لە ڕووی مانا کۆمەڵایەتییەکەی ڕوونە. پێویست بەوە ناکات لە تەفسیر سەرمان سوڕ بمێنێ. ئەگەر ئەوان لە شارانی خۆشگوزەرانەکان بێدەنگ بن و ملکەچی ئەوان بن، لەسەر ملکەچیش یەککرتوو بن، ئەوا وەك ئەوان شایەنی سزان. لێرەوە دەبینین قورئان جیاوازی لەگەڵ واعیزی سوڵتانەکان هەیە، ئەوان ملکەچی سوڵتانیان بەپێویست زانیوە، ئەگەر ستەمکاریش بێت. کەواتە ملکەچی سوڵتان خۆی لە خۆیدا ستەمکارییە، ئەمیش شایەنی سزادانە. لەمەشدا فەرموودەیەکی پێغەمبەر دەڵێ: "ئەگەر بینیت یەکێك لە ئومەتی من پاڵپشتی ستەمکار دەکات، پەو بڵێ تۆ زاڵمی..."

پوختەی باسەکە ئەوەیە: تایبەتمەندی هەر بانگەوازێکی چاکسازیی نوێ جەماعەت نووشسی پەرتەوازەیی دەکات، چونکە خۆشگوزەرانەکان خۆیان بۆ مەلاسدلوە و بەرپەرەکانێی دەکەن ئەگەر بۆیان بگونجێت. ئەگەر بشێت بانگەوازی بەریقەدار بۆ یەککرتووی جەماعەت هەیە. بزانە ئەمە کاریگەری نییە و تووسقویەك بەخەبەر ناهێنێت. هەموو کارەکانیش بەدەست خودایە.

# گاڵتەجاڕیی عەقڵی مرۆڤ



فەیلەسووفی بەناوبانگی ئەندەلوسی ئیبن توفەیل، چیرۆکێکی فەلسەفی بەناونیشانی (حي بن يقظان)نووسیوە، مەبەستی لە نووسینی ئەو کتێبەش شرۆڤەکردنی سروشتی عەقڵی مرۆڤ بوو بۆ خوێنەر وەک ئیبن توفەیل تێیگەیشتووە. لەو چیرۆکەدا مەزەندەی مرۆڤێک دەکات، لە دوورگەیەکی دابڕاو گەورە بووە، ئاسک شیری پێداوە، هەر لەو دوورگەیە گەورە دەبێت تا دەبێت پیاوێکی تەواو.

ئیبن توفەیل دەڵێ: عەقڵی ئەو مرۆڤە لەگەڵ گەشەکردنی جەستەی گەشەی دەکرد، تا لە دوورگەکە تەواو پێراگەیشت. دەیتوانی بیربکاتەوە و بەئەنجام بگات. تا بیرکردنەوەی ئەبستراکتی(مجرد) گەیشتە ئەو هەقیقەتە گەردوونیانەی کە فەیلەسووفە مەزنەکان پێشتر پێیگەیشتوون.

ئیبن توفەیل دەیەوێت ئەوە بۆ خوێنەر روونبکاتەوە، کە عەقڵی مرۆڤ دەزگایەکی زگماکە و لەخۆیەوە گەشەدەکات، پێویستی بە خوێندن و تێگەیشتن نییە. لەوەدەچێ ئیبن توفەیل وائێبگات ئەگەر عەقڵی مرۆڤ دوور لە هیچوپوچی کۆمەڵگا و

بۆچەڵییەکانی گەشە بکات، ئەوا بیرکردنەوەی دروست دەبێت و دەرئەنجامەکانی ڕاست دەبێت. بۆیە ئیبن توفەیڵ حەز دەکات بیرمەندان لە ئێراماننەکانیان لە کۆمەڵگا دوور بکەونەوە، لە مەزنێتی خۆیان بەرزتر بینەوە. بە واتایەکی دیکە، ئەو داوا لە بیرمەندان دەکات بۆ کۆشکی بلووڕین سەرکەون.

گومان لەوەدانییە ئەو بۆچوونە، بۆچوونی سەرجەم فەیلەسووفانی کۆنە، کەواتە ئیبن توفەیڵ شتێکی نوێی نەهێناوە، چاکەی شتێکیشی لەو بوارە نییە،تەنها ئەوانەبێت بە چیرۆکێکی بەپێز بۆچوونێکی کۆنی بە بەرگێکی نوێ هێناوەتەوە، کەچی چیرۆکی (حي بن يقظان) برەوێکی مەزنی بەلای بیرمەندانەوە هەبوو، بۆچەندین زمانیش وەرگێڕدرا. چەندین فەیلەسووف و نووسەریش لە ڕێبازە جیاوازەکانەوە لاساییان دەکردەوە یان بەشێکیان لەو چیرۆکە دەخواست[100].

سەیر ئەوەیە تا ئەمڕۆ نووسەران و بیرمەندانمان کاریگەری ئەو چیرۆکەیان بەسەرەوەیە و بە دواقسەی بابەتی عەقڵی مرۆڤی دەزانن. ئەوان تائێستا باوەڕیان وایە عەقڵ بەهرەیەکی سروشتییە و لەخۆیەوە گەشەدەکات، جا ئەگەر مرۆڤ لە کۆمەڵگا بژیت یان هەر لەکاتی لەدایکبوونییەوە تەنها و گۆشەگیر بژیت. کەچی توێژینەوە زانستییە نوێییەکان خەریکە بەتەواوی لەسەر هەڵەبوونی ئەو بۆچوونە کۆك بن، بەشێوەیەك ئەمڕۆ ئەمە دەسەلمێنن عەقڵی مرۆڤ بەرهەمێکە لە دروستکراوەکانی کۆمەڵگا، بۆیە گەشە ناکات و پێڕاناگات ئەگەر لەنێو ئاپووڕەی پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان نەبێت[101].

ئەگەر مرۆڤ لەناو ئاژەڵان گەورە بوو، ئەوا وەك ئاژەڵی لێدێت، بۆیە ئەو چیرۆکە کە خەیاڵی فەیلەسووفە مەزنەکەمان دایهێناوە، ئەوا تەنها وەهم و خەیاڵە و لەو جیهانەی تێیدا دەژین بوونی نییە. یەکێك لە شوانەکان لەساڵی ١٩٢٧ منداڵێکی لە لانەی گورگان دۆزییەوە لەنزیك شاری الله ئابادی هیندستان، منداڵەکە تەمەنی

[100] احمد امين ، حي بن يقظان

[101] Mend,mind,self and society

نزیکەی ١٠ ساڵ دەبوو، هەمان هەڵسوکەوتی گورگانی هەبوو. وەک ئەوان لوورەی هەبوو، گژوگیای دەخوارد ولەسەر چوار پەل دەڕۆیشت. سەرەڕای ئەمەش هێرشی بۆ مرۆڤ دەهێنا و دەیگەستن یان خۆی دەگەست. هەندێکجاریش نۆرەی دڕەندەیی بۆ دەهات. کاتێکیش بۆ یەکێك لە بنکە عەقڵییەکانیان گواستەوە؛ ئەوا چەند جارێك هێرشی کردە سەر ئەو پۆلیسانە کە پاسەوانییان دەکرد.[١٠٢]

چەندین بەسەرهاتی دیکە هاوشێوەی ئەو چیرۆکە دەگێڕدرێتەوە کە هەموویان ئاماژە بۆ هەڵەبوونی ئیبن توفەیل دەکەن، وەك دەردەکەوێت ئەو منداڵە هیندییەی کە پێشتر باسمان کرد لە هەندێك ڕوو لە (حەیی بن یەقزان)ی هاوڕێمان دەچێت کە ئیبن توفەیل دایهێناوە. ئەو لەناو گورگان گەورە بوو، لە ئەنجامدا بوو بەگورگ، مەحاڵە ببێتە ئەو فەیلەسووفەی کە فەیلەسووفی گەورەی عەرەب باسی دەکات.

عەقڵی مرۆڤ بەپێی ئەو چوارچێوەیە گەشە دەکات، کە کۆمەڵگاکەی بۆی دروست کردووە. سەیرە داوا لەمرۆڤە بکەین کە لەناو کۆمەڵگایەکی سەرەتایی گەورەبووە؛ فەلسەفەیەکی ئاڵۆزی وەك برگسۆن و بیرکارییەکی بەرزی وەك ئاینشتاینمان پێ بدات. بۆیە بیرمەندانی کۆن سەیرمیان لە خۆیان وخەڵك کرد کاتێك بڕوایان وابوو عەقڵی مرۆڤ ڕەنگدانەوەی هەقیقەتە. ئەوان ئەو هونەرانەی فەلسەفەکاریان خوێندەوە کە لە کتێبی پێشینیانیان بەمیرات ماوەتەوە، ئەوان وتەی فەیلەسووفانی پێشینە ئەزبەر دەکەن ودواتر بە قوتابییەکانی دەدەن؛ بەمەش عەقڵی خۆیان و قوتابییەکانیان لەو قاڵبە دادەتێن بێئەوەی هەست بکەن.

ئەگەر یەکێکیش هات بۆچوونێکی نوێی هەبوو پێچەوانەی ئەو بۆچوونەی ئەوان بوو کەلەسەری ڕاهاتوون؛ ئەوا سەریان سوڕدەمێنێ و کەسەکە بە بەفیزودەبەنگ وەسف دەکەن. چونکە باوەڕییان وایە ئەوانەی لەسەری ڕاهاتوون و تووسیویانن

---

[١٠٢] Sutherland and woodward, introductory sociology, p167-168

چەند بیروڕایەکی مشتومڕ هەڵناگرن، ئەمر وچەسپاون، لە دیدی ئەوان ناکرێت گومان لە هەقیقەت بکرێت، چونکە عەقڵ کەشفی کردووە و ئەوە دوای ئەوە باوەڕی پێهێناوە، بۆیە دەرفەتێک بۆ گومان نییە. یەکێک لەو تایبەتمەندیانەی ئەو سەردەمەمان ئەوەیە، کە هەقیقەتی رەها بەهای لەدەست داوە؛ ئێستا سوڵتانی ڕێژەیی شوێنی ئەوی گرتۆتەوە. ئەوەی بەلای تۆوە هەقە، بەلای کەسانی دیکەوە ناهەقە. ئەوەی دوێنێ جوان بوو، لەوانە ئەمڕۆ دزێو بێت. هەموو ئەمانە بە عەقڵی تۆ دادێت، تۆش بێ ئاگای وەک ئەوەی پەیوەندی بەتۆوە نەبێت.

***

بیرمەندانی کۆن وادەزانن دەمارگیریی بابەتێکی راگوزەر و لەناکاوی عەقڵە، چونکە پێیان وایە عەقڵی مرۆڤ مەیلی بەلای بێلایەنی لە تێڕوانین ودروستی بڕیاردان هەیە. بۆیە کاتێک مرۆڤێکی دەمارگیر دەبینن ئەوا لێی تووڕە دەبن و بەنەفرەتی دەکەن، ناشزانن خۆیان وەک ئەو دەمارگیرن. ئەمەش لە نموونەی ئەو پەندەیە کە دەڵێ: "قەل بە قەل دەڵێ رووت رەش بێت"!. کەچی توێژینەوە نوێیەکان پێیان وایە دەمارگیری سیفەتی سەرەکی مرۆڤە لە عەقڵی مرۆڤ؛ بابەتی بێلایەنی راگوزەر و لەناکاوە، بۆیە لێرەدا دەکرێت نموونەی ئەو شیعرە بهێنینەوە کە دەڵێ:

تعجبین من سقمي　　　　صحتي هي العجب

(تۆ سەرت لە نەخۆشی من سوڕماوە، کەچی لەشساغی من خۆی سەیرە–وەرگێڕ)
کەواتە بۆ ئێمە گونجاو نییە سەرمان لەدەمارگیری عەقڵی مرۆڤ سوڕبمێنێ؛ بەڵکو دەبێت بێلایەنی ئەو عەقڵەمان بەلاوە سەیر بێت.

***

عەقڵ بەپێی هەندێک پێوەر وزانیاری پێشوو بیر دەکاتەوە، زەحمەتە بتوانێت لەسەر بنەمایەکی نەزانراو بیر بکاتەوە. ئەگەر تۆ ویستت بابەتێک بۆ کەسێک شرۆڤە بکەیت و ئەویش زانیاری نەبێت، پێویستە تۆ بەر لە هەموو شتێک نموونەی ئەوتۆی بۆ بهێنیتەوە کە ئەو ئەزموونی کردبێت و لێی راهاتبێت، دواتر ناوەڕۆکی بابەتە

نوێیەکەی بۆ پراکتیزە دەکەیت، ئەمەش تەنها شێوازێکی بیرکردنەوەی خەڵکی بازاڕ و خەڵکی گشتی نییە، بەڵکو شێوازی بیرمەندانیشە. هەرچەندە پێگەی فەلسەفەیان بەرز بێت، ناتوانین لە شتێکی نوێ بگەن ئەگەر لەسەر بنەمای تێگەیشتنی پێشوو نەبێت، هەر لەبەر ئەو هۆکارەشە عەقڵی مرۆڤ نەیتوانیوە درک بە هەقیقەتە گەورەکانی گەردوون بکات، چونکە لە بیرکردنەوەدا سنووردارە بەچەند شتێکی باو لەو جیهانە بەرتەسکەی خۆی، بۆیە زەحمەتە، تەنانەت مەحاڵە عەقڵ درک بە جیهانێکی دیکە بکات، کە لە چەند چەمکێکی تەواو جیاواز بەو چەمکانەی دونیای خۆمان پێکهات بێت.

ئێمە ناتوانین لە خودا، ڕۆح، مادە، کات، شوێن، وزە و هاوشێوەی ئەو شتانە بگەین، چونکە ئەوانە چەند بابەتێکن ناچنە چوارچێوەی پێوەر وئامرازە باوەکەی ژیانمان. ئەو تیۆرەی ئاینشتاین ودواتر بلانك هێناویەتی، یان ئەو توێژینەوانەی کە دوای ئەوان لە بارەی ئەتۆمەوە کراوە، ئەوا زانایانی تووشی شۆك کرد، ئەو هەقیقەتە ڕەهایانەی ئەوانیش پێشتر باوەڕیان پێ هەبوو، دواتر لە ژێر ڕۆشنایی ئەو توێژینەوە نوێیانە بەپێی ئەو شتانەی تێیایدا دەژین، دەبنە هەقیقەتی سنووردار، سەبارەت بە دونیا فراوانەکەی گەردوون و دونیا تەسکەکەی ئەتۆمیش، ئەوا لەسەر ڕەوتێك دەڕۆن ناتوانین بەپێی پێوەرە باوەکانمان درکیان پێ بکەین.

لە یەکێکیان پرسی: مادە چییە؟ وتی: وزەیە. وتیان: وزە چییە؟. وتی: کارەبایە. کە دواجاریش پرسیاریان: کارەبا چییە؟ منگە منگێکی کرد و وەڵامی دەست نەکەوت. ئاینشتاین دەڵێ: کێشەی عەقڵی مرۆڤ ئەوەیە، دەیەوێت گەردوون ملکەچی ئەو پێوەرانە بکات کە لە دونیای خۆی دا لێی ڕاهاتووە، کارەساتیش ئەوەیە ئەو پێوەرە ڕێژەییانە بە ڕەها وئەمر دەزانێت و پێی وایە بەڵگەنەویستن و شایەنی گومان کردن نین. ئەو لە تێڕوانینی خۆی دا لەسەر ئەوە ڕاهاتووە کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دووبارە دەبینێتەوە، ئەمەش وا دەکات باوەڕی بەوە هەبێت ئەوانە ڕێسای

گشتیین و لەسەر هەموو بەشەکانی گەردوون پراکتیزە دەکرێن. ئەو باوەڕە لە نەریت هاتووە کەچی وادەزانێ ئەمە لە هەقیقەتەوە هاتووە"[١٠٣].

مرۆڤ لەوە ڕاهاتووە زەوی بە ڕووتەخت و چەسپاویی ببنێت، کاتێك دەبینی خۆر لە خۆرهەڵاتەوە هەڵدێ و لە خۆرئاواوە ون دەبێت، باوەڕی وایە ئەمە بابەتێکی بەڵگەنەویستەو جێگای گومان نییە، کاتێکیش کۆپەرنیکۆس دێت ودەڵێ: "خۆر چەسپاوە، کەچی زەوی لەخولانەوەدایە". ئەمە مرۆڤی شیگەران کرد، نەیتوانی قبوڵی بکات تا ماوەیەکی زۆر نەبێت. تەنانەت تا ئێستا هەندێك کەس ناتوانن هەرگیز باوەڕ بەوە بکەن.

ئاینشتاین وتی:شتێکی بەڵگەنەویست جێگیر نییە، بەڵکو ئەمانە نەریتی بیرکردنەوەن. ئەوەی شایەنی باسە غەزالی[١٠٤] بۆچوونێکی هاوشێوەی هەیە، کە پێشتر ئاماژەی بۆ کردووە، بەڵام هاوسەردەمانی ئەو تێبینەگەیشتوون، لەوانە هاوڕێیانمان لە ناخی دڵەوە بەگاڵتە پێکردنەوە بڵێن: سەیری ئەو سۆفستاییە بکە، تکۆڵی لە بەڵگەنەویستەکان دەکات، خوا ڕووی ڕەش بکات.

***

بۆ خوێنەر تەنها نموونەیەك لەو(بەڵگەنەویستانە) دەهێنمەوە کە دواتر لەسەر دەستی توێژەرە نوێیەکان تێکشکا، ئەویش چەمکی (کات)ە. خەڵك لەوە ڕاهاتووە لەسەر بنەمای تێپەڕبوونی چرکە وخولەك بیر لە چەمکی کات بکەنەوە، بۆیەی لەلای ئەوان کات بریتییە لە چەند گوزەرکردنی چرکەکان.

ئەگەر پرسیاریان لێ بکەیت کەی کات دەست پێدەکات وکەی کۆتایی دێت؟ ئایا کات لە کاتێك دەستی پێکردووە، کەپێشتر کاتێکی نەبووە؟ ئایا لە حاڵێکدا کۆتایی دێت کە کاتی دیکەی بەدواوە نێت؟ سەریان دادەخەن و لچیان شۆڕدەکەنەوە و پێت

[١٠٣] Barnett,the universe...,p63

[١٠٤] الغزالي، منقذ من الضلال، ص ٦٦

دەڵێن: " واز لە ئێمە بهێنە ". لەوانەیە لەوە بپرسن پرسیارەکان ئەوان بەرەو شێتخانە ببات.

بۆ گەپکردن لە کەسێکی سادەیان پرسی: کات چییە؟. ئەو وتی: کاتی ئێمە زڵتە.
ئەگەر بڕجسۆن ئەو وەڵامی گوێبیست دەبوو بەسەرخۆی شۆی دەکێشا، چونکە کات بەلای ئەو کێشەیەکی فەلسەفی قورسە، کەچی هاوڕێکەمان دەڵێ: کات زڵتە.

هەر کەسێك لەو دووانە بەپێی ئەو تێگەیشتنەی لێی راهاتووە، لە کات دەڕوانێ.
لەڕاستیدا فەیلەسووفانی کۆن زۆر خەریکی چارەسەرکردنی کێشەی کات بوون، هەر ڕێبازێکیان گرتەبەر بەئەنجامێکی خوازراو نەگەیشتن. دواجار ئاینشتاین هات وتی: کات کێشە نییە، بەڵکو کێشە لە عەقڵی فەیلەسووفان دایە. ئەوان لەوە راهاتوون کات بە کۆمەڵێك چرکەی تێپەڕیوو دادەنێن، ئەمەش بەلای ئەوان بووبوو بە بەڵگەنەویست، بۆیە نەیانتوانی لەوە بگەن چۆن کات دەست پێدەکات و چۆنیش کۆتایی دێت.

***

ئەگەر لە کێشەی (شوێن) وردبینەوە، دەبینین تارادەیەکی زۆر لە کێشەی(کات) دەچێت. ئەو پرسیارە فەلسەفیانەی لە بارەی سروشتی کاتەوە دەکرێن، هەمان پرسیار لە بارەی شوێنیشەوە دەکرێن. شوێن ئەو بۆشاییە کە تەنەکانی ئاسمان پێیدا دەخولێنەوە، لەکوێ دەست پێدەکات و لەکوێ کۆتایی دێت؟ ئایا شوێنێك لە گەردووندا هەیە کۆتایی بێت و شوێنێکی دیکەی بەدواوە نەبێت؟

برادەرێکم بۆی گێڕامەوە، گوایە لە منداڵی بیری لەو کێشە قورسە کردۆتەوە: گەردوون چۆن کۆتایی دێت؟ دواجار وێنای ئەوە دەکات کە گەردوون بەدیوارێکی گەرپۆچ دەور دراوە. منیش پرسیم: ئەستووری ئەو دیوارە چەندە کە دەوری گەردوونی داوە. ئایا گەردوونێکی دیکە نییە. ئەو وتی بڕوای ئەوەی هەبووە ئەستووری دیوارەکە بێ کۆتایی بووە، واتە هەر کاتێك بەتەور هەڵکۆڵینی بۆ بکەین، ئەوا ناگەینە کۆتایی.

بێگومـان بـەو هاوڕێیانـە پێکـەنیم، کەچی دەبوایـە پێنەکـەنم و بەعـەقڵی خـۆم پێبکەنم، بەواتەیەکی دیکە بە عەقڵی مرۆڤ پێ بکەنم. عەقڵی مرۆڤ لەوە ڕاهاتووە کە گەردوون وەها ببینێت کە بەشتێك دەورەدراوە کە لە ژیانیدا بەکاریدەهێنێت، بۆیە وادەزانێ گەردوون بەگەردوونێکی دیکە دەورەدراوە، ئەویش بەگەردوونێکی دیکە، و ... هتد، بەمشێوەیە.

ئاینشتاین دەڵێ: گەردوون کووپە، ئەو خۆی لوول دەدات وەك تۆپی لێ دێت، لێرە کێشەیەکی دیکەمان تووش دەبێت: گەردوون لـە سێ ڕەهەنـد پێکهـاتووە: درێژیی وپانی وبەرزیی. گەردوون بەلای کامییان دەچەمێتەوە؟ ئاینشـتاین وەڵاممان دەداتەوە و دەڵێ: ئەو کێشەیە لە دروستکراوی عەقڵی ئێوەیە و ئەنجامی نەریتەکانی بیرکردنەوەی ئێوەیە. ئەو دەڵێ: گەردوون چوار ڕەهەند بەخۆیـەوە دەگرێـت ئـەوەك سێ. کەواتـە گـەردوون بـەلای چوارەم دەچـەمێتەوە، ڕەهەنـدی چوارەمیش کاتـە. بەمشێوەیە بەیەك هەنگاو هەردوو کێشەی کات و شوێنی چارەسەرکرد، کات وشـوێن لە دیدی ئەو بوون بەیەك شت. ئەوەی ماوە دەبێت ئێمەی مرۆڤ لـەو چارەسـەرکردنە تێبگەین. کێ لـەوە دەگات لەوانەیە ئاینشتاین ئێمەی دابێتـە بـەر چەندین زاراوە کەتێی ناگەین. دواتر بانگەشەی ئەوە دەکات کـە کێشـەی چارەسـەرکردووە، کەچی کێشەکە وەك خۆی ماوەتەوە.

دەگێڕنـەوە کـە ڕۆژێـك خوالێخۆشـبوو مـەلا مەشـهور چـۆتە ناوخـەڵك و گرتوبـەتی ئەستێرەی ژماردووە، دواتر ژمارەیەکی زۆری گوتووە کە خوا نـەبێت کـەس نازانێـت چەندە، دواتـر هـاوار لـە خـەڵك دەکـات و دەڵـێ:" ئـەوەی بـاوەڕ ناکـات بـا خـۆی ئەسـتێرەکان هەژمار بکات" دەشزانێ کەس ناتوانێـت ئەسـتێرە بژمێرێ. جا کاتێك ئاینشتاین تیۆری چەمانەوەی گەردوونی دانا، زانایان ئەوەیان لەبارە گوت کە لە بری مەلا مشهورەوە گوتراوە.

کەچی سەیر ئەوەیە ئاینشتاین بە هاوکێشەی بیرکاری بە ئەنجامی پلەی چەمانەوەی گەردوون گەیشتووە، بۆیە ئەرکانـە لەسـەر زانایان پێویستە ئەو پلەیە بە ئامێری

گەردوونی پێوانە بکەن، ئەگەر بینیان دروستە ئەوا باوەڕ بەقسەکانی مەلا ئاینشتاین دەکەن، ئەگەرنا چیتر گوێرایەڵی نابن.

لە ساڵی ١٩٢٢ خۆرگیرانێکی تەواو روویدا. ئەستێرەناسەکان روویان لە ئوستڕالیا کرد، کە لەوێ خۆرگیرانەکە بەتەواوی و روونی دەردەکەوت. بە ئامێرە دیقەتدارەکانیان چاودێری ئەستێرەکانیان دەکرد، لەوێ هەندێک چەند ئەستێرەیەکیان بینی کەوتوونەتە دوای خۆر، ئەمەش مانای ئەوەیە تیشکی ئەو ئەستێرانە لە دەوری خۆر چەماوەتەوە، ئینجا گەیشتۆتە ئەوان. کاتێکیش پلەی چەمانەوەی تیشکەکانیان پێوا، بۆیان دەرکەوت هەمان ئەو پلەیەیە کە ئاینشتاین پێشبینی کردووە. کەواتە تیشکەکان کاتێک بە ئاسمان تێدەپەڕن دەچەمێنەوە، هۆکارەکەش ئەوەیە بەئاسمانێکی چەماوە تێپەردەبن. بەمەش ئەو تیۆرەی نیوتنی لەناوبرد کە دەڵێ تیشکی رووناکی لەسەر هێڵێکی راست دەڕوات.

***

ئەندازەی ئەقلیدس دەیگوت هێڵی راست کورتترە لەنێوان دوو خاڵ؛ کەچی ئاینشتاین ئەو تیۆرەی ئەقلیدسی رەتکردەوە. بەپێی تیۆری ئەو هێڵی لار کورتە لە گەیشتنی نێوان دوخاڵ؛ لەبەر ئەوەی گەردوون چەماوەتەوە، بۆیە دەبێت هەموو ئەو شتانەی بە گەردوون تێدەپەڕن کەوانەیی بن. ئەمەش وایکردووە کە هەموو تەنە ئاسمانییەکان کەوانەیی جووڵە بکەن، هیچ تەنێکیش نییە لە گەردوون بەسەر هێڵی راست بڕوات.

نیوتن بڕوای ئەوەی هەبوو کە کەوانەیی تەنە ئاسمانییەکان بە کاریگەری هێزی کێشکردنە. لێرەوە ئاینشتاین هات گوتی: چەمکی کێشکردن ئەویش لە تەریتی بیرکردنەوەمان هاتووە. ئێمە دەبینین کە موگناتیس ئاسن بۆخۆی کێش دەکات، بۆیە خەیاڵی ئەوەمان کرد کە خۆر هەسارەکان لە ئاسمانێکی کەوانەیی بۆ خۆی کێشدەکات. ئاینشتاین پێیوایە تیۆری کێشکردن هەڵەیە. شتەکانیش کاتێک دەکەونە سەر زەوی بەهۆی کێشکردنەوە نییە وەک نیوتن تێیگەیشتووە، بەڵکو بە کاریگەری

فشاری چەمانەوەی گەردوونە. ئاینشتاین بە چەند هاوکێشەیەکی بیرکاری ئاڵۆز ئەو تیۆرەی پشتڕاستکردۆتەوە. ئەگەر هەوڵ بدەین لەو هاوکێشانە بگەین، ئەوا بە رووتی دەکەوینە سەرجادە(خوایە وەك ئەوەی بەرووتی خەلقت کردووین). یەکێك لە شتە سەیروسەمەرەکانی ئاینشتاین ئەوەیە، ئەو لە ڕێگای ئەو هاوکێشە بیرکارییانەوە بەو بۆچوونانە دەگات کە دووکەس ناتوانێ مشتومڕیان لەسەر بکات. ئەگەر نارەزاییمان لە بەرامبەری دەربڕی ئەوا بەئێمە دەڵێ:" ئێوە لەژێر کاریگەری نەریتەکانی بیرکردنەوە دان"بۆیە وا باشترە لە بەرامبەر ئەو مەلا مۆدێرنە بێدەنگ بین و کاری خۆمان رادەستی خوای گەورە و بەتوانا بکەین.

***

ئاینشتاین بە تیۆرەکەی لە بارەی چەمکی شوێن وکاتەوە، یان ئەوەی بە(شوێنکات) ناوی دەبات، دەرگایەکی کردەوە کە داخستنی ئەستەمە. چونکە کات رەهەندی چوارەمی گەردوونە، لە رەهەندەکانی درێژیی و پانیی و بەرزیی دەچێت. بەمانای ئەوەی کات کۆمەڵێك چرکە وخولەك نییە، بەڵکو راست لەنێو دەستمان هێڵێکی درێژکراودیە وەك هێڵی درێژیی. ئێمەش هەنگاو دوای هەنگاو پێیدا تێپەڕ دەبین، واتە ئەو وەك چرکە و خولەك تێناپەڕێت. دەتوانین مرۆڤ بۆ کات بەوە بشوبهێنین کە چۆن مرۆڤ سواری پایسکل دەبێ، ئەگەر سەیری زەوی بکات وادەزانێ زەوی لەژێر ئەودا دەڕوات، کەچی زەوی وەستاوە و لەڕاستیدا ئەو دەڕوات.

کات لە گەردووندا بە رابردوو و ئێستا و داهاتوویەوە هێڵێکی درێژکراوەیە، ئەو لە شوێنی خۆی وەستاوە و نەدێت، نەدەڕوات، کێ دەزانێ لەوانەیە بوونەوەرێکی دیکە هەبێت بتوانێت ئەو رەهەندە ببینێت بە هەردوو دیوی رابردوو و داهاتوویەوە، وەك ئەوەی ئێمە چۆن سەیری پانتایی ژوورێك دەکەین و ئەویش لە شوێنی خۆی ناجوڵێ. ئەمرۆ ئەو توێژینەوە نوێیانەی لە بارەی دەروونەوە ئەنجام دراون، ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن مرۆڤ بە هێزی دەرکەوتەکانی هەست وخەونەکانییەوە دەتوانێ پێشبینیی هەندێك رووداوی ئاییندە بکات. لەوانەیە پەلێلی بێت، جا ئەو خالق ومەخلوقەی کە

چوار ڕەهەندی هەیە لەوانەیە بەتێڕوانینێکی ڕوون هەموو ئایندەی ببینێ؛ بەهەرحاڵ ئەمە لە ڕابردوودا گریمانەیەکی ناماقوڵ بوو، بەڵام ئەمڕۆ لەژێر ڕۆشنایی توێژینەوە نوێییەکان بەدوور نییە و ماقوڵە، ناشزانین سبەی چی لەو بارەیەوە دێت.

با گریمانەی بوونی هەندێك مێرووڵەی بچووکی کوێر لەسەر ڕووی زەوی بکەین، ئەو مێرووڵانە ناتوانن درك بەوە بکەن کە لە سەرووی خۆیانەوە ڕوودەدەن، بۆیە ئێمە هەندێك بەشی ئەو زەوییە دەڕشێنین کە مێرووڵەکانی پێدا تێپەڕ دەبێت. ئەو هەست بەوە دەکات کە ئێرە و ئەوێ تەڕ بووە، بەڵام نازانێ ئەو تەڕبوونە لە کوێ هاتووە، چونکە ئەو لە دوو ڕەهەند دەژی ڕەهەندی پانی ودرێژی کەچی هەست بە ڕەهەندی سێیەم ناکات، کە بەرزییە بەرەو ئاسمان، ئەو هیچی لە بارەوە نازانێ، کەواتە ئەو نازانێ جیهانێکی مەزنی پڕ لە ڕووداو هەیە.

جینز دەڵێ: مرۆڤ لەو گەڕبوونەی چوار ڕەهەندی هەیە لەو مێرووڵانە دەچێت کە لەسەر ڕووتەختێکی دوو ڕەهەندی دەژیت. مرۆڤ لە جیهانێکی سێ ڕەهەندی دەژیت؛ ئەو جیهانەش سنووردارە لە گەردوون تەنها بەشێکی سادەی دەبینێ، کەچی ئەو ڕووداوانەی کە لە ڕەهەندی چوارەم دەژیت، ئەوا شتێك زیاتر لەو تەڕبوونە نازانێ کە مێرووڵە کوێرەکە درکی پێدەکات. بۆیە جیهانی گەردوون و جیهانی ئەتۆم لە چوار ڕەهەند پێکهاتوون، واتە بەپێی ڕەوتی (کانتشوێن) دەڕۆن وەك ئاینشتاین باسی کردووە. ئەمەش هۆکاری شاراوەی ئەو بابەتە سەیرانەیە کە زانایانی ئەتۆم ئاشکرایان کردووە، کەچی تائێستا ناتوانن شرۆڤەیەکی ماقوڵی بۆ بکەن.

***

لەمیانەی گەشتەکەم بە فڕۆکە بۆ ئەمریکا لە ساڵی ١٩٤٦، تێبینی شتێکم کرد، کە تیۆرەکەی ئاینشتاینم بیرکەوتەوە. بینیم فڕۆکە لەسەر هێڵێکی ڕاست بەرەو ئەمریکا ناڕوات، بەڵکو بەسەر هێڵێکی کەوانەیی دەڕوات بەلای فەرەنسا و ئیرلەندا و دواتر بۆلای دوورگەی نیوفوڵەند دەچێت بەزەریای ئەتڵەسی لەوێشەوە بەرەو ئەمریکا دەڕوات.

من وامدەزانی دەبێت فڕۆکەکە ڕاستەوخۆ بەرەو ئەمریکا بڕوات، لە ڕێگای جەبەل تاریقەوە بۆ دوورگەکانی لازور و لەوێشەوە ڕاستەوخۆ بۆ نیوۆرک، چونکە ئەمە هێڵی ڕاستە. ئەویش بەبڕوای ئەوکاتەم کورت و نزیکترە. سەرم سوڕما، ئەمەشم بە یەکێک لە پسپۆرەکانی فڕۆکەوانی وت، کەچی وەڵامەکەی ئەویش جێگای سەرسوڕمان بوو. ئەو وتی: هێڵی کەوانی بۆ فڕۆکە کورتترە لە فڕینی ماوەدووردا، ئەمەش لەبەر کەوانەیی ڕووی زەوییە. خەڵک لە دێرزەمانەوە لەوە ڕاهاتووە بە سواری گوێدرێژ و هێستر و حوشتر سەفەر بکات. ئەمەش وایکردووە وابزانم کەهێڵی ڕاست کورتترە لە هێڵی کەوانەیی، لەڕاستیشدا کورتترە ئەگەر سەفەرەکە ماوە نزیک بێت، بە شێوەیەک چەمانەوەی ڕووی زەوی زۆر سادە دەبێت و حسێبی بۆ ناکرێت.

کەچی بۆ فڕینی دوور، چەمانەوەی ڕووی زەوی دێتە هەژمارکردن و بۆ ئەمەش نەخشەکانی فڕۆکەوانی جیاوازی لەگەڵ سەرجەم نەخشەکانی دیکە هەیە کە ئێمە لێیان ڕاهاتووین، لەوانە نەخشەی هێستر و حوشتر! بەڕاستیش کاتێک سەیری ئەو نەخشە نوێیانەم کرد لە بەرچاوم نەخشەی ئاڵۆز و شێواو بوون، لەڕاستیشدا زۆر بەدیقەت بوون، بەڵام شێوازییەکە لە عەقڵی منی بەستەزمان بوو.

ئەو جیاوازییەی لە نێوان نەخشەی فڕۆکە و نەخشەی حوشتر هەیە، ئەوا دروستە نموونەیەکی وەك جیاوازی نێوان ئەندازەی ئەقلیدس و ئەندازەی ئاینشتاین بێت. ئەندازەی ئەقلیدس گەردوونێك پێوانە دەکات لە سێ ڕەهەند پێکهاتووە، ئەو جیهانەیە کە تێیدا دەژین. بەڵام ئەندازەی ئاینشتاین سەرەڕای ئەقلیدس، ئەوا ڕەهەندی چوارەم زیاد دەکات ئەویش ڕەهەندی کاتە کە گەردوون بۆی دەچەمێتەوە. کەواتە ئەو بۆ پێوانە گەردوونیەکەی کەوانەیی گەردوون دەخاتە حسێبی خۆی وەك ئەوەی نەخشەکانی فڕۆکەوانی کەوانەیی ڕووی زەوی لە بەرچاو دەگرێت.

لەوانەیە یەکێك بڵێت: ئەگەر باوەڕمان بەوە کرد چەمانەوەی تەنەکانی ئاسمانمان بە چەمانەوەی فەزای دەوروبەری لێکداوە، ئەی چۆن چەمانەوەی خولانەوەی

ئەلیکترۆن دەکەین کە لەناو ئەتۆم دایە، لەگەڵ ئەوەشدا دەزانین دونیای گەردیلە زۆر بچوکە؟ زانایانی ئەتۆم لە وەڵامی ئەو پرسیارانە دەڵێن: فەزای گەردیلە هەرچەندە بچووکیش بێت ئەوا کەوانەییە. کەوانەیی فەزای ئەتۆم گەردیلە لە کاریگەری فشاری دەوروبەری هاتووە کە دەکەوێتە سەر کرۆکی ماددە. ماددەش لە تێگەیشتنی ماددە هەمان بۆچوونیان نییە کە خەڵک هەیانە، بەڵکو ماددە لە تێڕوانینی ئەوان کەوانەییەکی سەختە لە( شوێنکات) هەرچەندە فەزاش لەمەڵبەندی ماددە نزیکبێتەوە ئەو کەوانەیی ئەو زیاد دەکات تا دەگاتە ناوەڕۆکی گەردیلە لەکۆتایی چەمانەوەی دا. کەواتە لەناوخودی خۆیدا بەتوندی کەوانەیی بووە، بەشێوەیەک ئەلیکترۆن ناچارە لەناو گەردیلە بخولێتەوە، بۆئەوەی لەگەڵ کەوانەیی ناو گەردیلەکە بگونجێت.

هەندێک لە زانیان باوەڕیان بەو قسەیەیە کەدەڵێ: ئەو ماددەیەی بەدەست دەگرین لە دروستکراوی هەستەکانمان، واتە ئەو وەهمانەن کە لێی ڕاهاتووە. لەڕاستیشدا ئەوماددەیە شتێک نییە جگە لەفەزای دەوروبەری. تەنها لە پلەی کەوانەیی بەرەو ڕەهەندی چوارەم جیاوازە. بۆچوونێک هەیە دەڵێ: ئەو تەنانەی لە ئاسمانیوونیان وایانکردووە کە فەزای گەردوون چەماوە بێت، کرۆکی هەر ماددەیەکی تەنە ئاسمانییەکان وایکردووە فەزای دەوروبەری زۆر و کەم لوول بخواتەوە. نموونەی لوولبوونی ئەو فەزایە لە شێوەی ئەو ڕایەخەیە؛ لە ژوورێک ڕاخراوە. ئەگەر بەشێکمان گرت و لوولمان دا، ئەوا بەشەکانی دیکە ڕایەخەکە بە پێی ئەو لوولکردنەی سەرەتامان لوول دەخواتەوە.

لەوانەش ئەوە دروست بێت کە دەگوترێت ئەو گەردوونە بەر لە دروستبوونی ماددە فەزایەکی درێژبووە بووە، کەوانەیی و کۆتایی نەبووە. کاتێک خودا ماددەی دروستکرد بۆ مەبەستێک کە ئێمە نایزانین؛ فەزا ئەو کاتە کەوانەیی بوو و ڕەگەزی کات بووە بەشێک لە گەردوون.ئەمەش مانای ئەوەیە کە کات و شوێن بەیەکەوە دروست بوون و ئەوانیش دوو ڕووی یەک هەقیقەتن.

پووختەی قسەکان ئەوەیە ،ئێمە دەچینە سەردەمێك كە بەتەواوی مانای وشە نوێیە و شوێنێك نەماوە بۆ پەڵکەنەویستی رەها و پێوەری گشتی. بوارێك بۆ ئەوە نییە بە شتێك بڵێین ئەمە ناماقوڵە تەنها لەبەر ئەوەی پێچەوانەوەی شتە باوەکانی ئێمەیە. ئەوەی ئەمڕۆ بە ناماقوڵی دەزانین، سبەی دەبێتە ماقوڵ. لەوانە ئەو چەند دێڕەی نووسەر لێرەدا بەفیزەوە باسی دەكات لە لای منداڵ و نەوەکانمان ببێتە خورافیات و پڕوپووچیی. ئەزموونەکان ئەوەیان فێرکردووین کە هەر شتێك لە تێڕوانینی ئێمەوە هیچ بێت، ئەوا رۆژێك لەرۆژان دروست دەبێت. کاتێك پێوەرەکانی بیرکردنەوە دەگۆڕێت کە خەڵك لەبەکارهێنانیان راهاتووە، جێگەی داخە بڵێین: ئیبن توفەیل لەخۆبایی بوو؛ ئەو باوەڕی بەدروستی ئەو چەمکە لۆژیکییانە هەبوو کە لە دەوروبەرە فەلسەفییەکەی لێی راهاتبوو، وایدەزانی هەتاهەتایە بە ڕاستی دەمێنێتەوە.

دەگێڕنەوە: پیاوێکی مولحیدەکان لە لەندەن موحازەرەیەکی بۆ جەماوەرێکی گەورەداوە، ویستویەتی نەبوونی خودا بسەلمێنێت. دوای ئەوەی موحازەرەکەی تەواوبووە، وتویەتی" من ئێستا بەڵگەیەکی هەستیتان پێدەدەم کە خوا بوونی نییە". دواتر یەکێك لە دەستەکانی بەرزدەکاتەوە و دەڵێ ئەو ئاگادارکردنەوەی کۆتایی بەخوا دەدات کە دەستە بەرزکراوەکەی لە ماوەی پێنج خولەك ببڕێت، ئەگەر نەیبڕێ ئەوا ئاماژەیە کە خودا بوونی نییە. ئامادەبووان لەو ماوەیە چاوەڕوانیان دەکرد خودا دەستی ئەو زەندیقە ببڕێت و ئەوانیش بحەسێنەوە. بەڵام زۆر بەداخەوە بەتەواوبوونی کاتەکە بینیان دەستی ئەو بەساغی ماوەتەوە. ئەو پیاوەش بەهەستی خۆشی سەرکەوتنەوە لە شوێنەکە چووە دەرەوە. ئەو بیباوەڕە لە شێوازی بیرکردنەوە جیاوازییەکی لەگەڵ ئیبن توفەیل و ئەوانی دیکە نییە. ئەو لە باوەڕە مولحیدییەکەی دەمارگیرە، ئەوانیتر لە باوەڕە ئایینیەکەیان کە لە باووباپیریانەوە بۆیان ماوەتەوە دەمارگیرن. هەریەکێکیش پشت بەو بەڵگەنەویستانە دەبەستێت کە لێی راهاتووین.

ئەو بەڵگەیەی کە زەندیقەکە هێناویەوە بەدیدی خۆی و هاوڕێیانی بەهێزە، بەڵام لەژێر ڕۆشنایی توێژینەوەی نوێ لاواز و بێ بەهایە. چونکە بینیمان بەهاو پێوەرە باوەکانی خۆی کە لە ژینگە کۆمەڵایەتییەکانی خۆی وەریگرتووە، بەسەر جیهانێکی دیکە دەسەپێنێت کە ملکەچی ئەو پێوەر وبەهایان نابێت. ئەو دەبینێ خەڵک تووڕەدەبن وتۆڵەدەکەنەوە، ئەگەر یەکێك ڕووبەڕوویان بێتەوە، ئەوان ئاگادارکردنەوەی کۆتایی پێ دەدەن. لەو باوەڕەش دایە خودا وەك ئەوان بە سۆز هەڵسوکەوت دەکات. ئەو هاوڕێیەمان لەو پەپوولە بچوکە دەچێت کە لەسەر پشتی فیل وەستاوە کاتێك دەیەوێ بفڕێت بە فیلەکە دەڵێ: "ئاگادار بە من دەمەوێ بفڕم." وادەزانێ ئەگەر لەناکاو بفڕێت، ئەوا فیلەکە هاوسەنگی کێشی خۆی لەدەست دەدات.

زۆربەی برایانمان ئەگەر باوەڕدار بن یان بێباوەڕ، بەمشێوەیە بیردەکەنەوە. هەموو بەڵگەکانیان ڕێژەییە و لە جیهانە سنووردارەکەیان وەرگیراوە. ئەوان نازانن ئەو بەڵگانەیان بۆ ئەو جیهانە ناگونجێت کە ناکۆتاییە. من لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە بوون و نەبوونی خودا بسەلمێنم. ئەوە پەیوەندی بە منەوە نییە و لە سنووری تواناى من نییە. بەڵام ئەوەی مەبەستمە خوێنەر لەوە تێبگات سوودێك لەشتە بەڵگەنەویستەکان نییە؛ چونکە ئەوانیش ڕێژەیین بە پێی کات و شوێن دەگۆڕێن.

***

ئیبن توفەیل و هاوڕێیانی لە بیرمەندانی کۆن باوەڕیان وایە: ئەگەر مرۆڤ لە بیرکردنەوەی بە پێی قیاسی لۆژیکی ئەرستۆ پەیڕەوی بکەن، ئەوا بە هەقیقەتێك دەگەن کە لە هەموو کات وشوێنێك دروستە. کەچی ئەگەر دیقەت بدەینە ئەو قیاسەی ئەرستۆتالیس، دەبینین لەسەربنەمایەکی پڕوپووچ دانراوە، وەك گاڵتەجاڕییەکە کە لە فیلمەکانی سینەما و تەختی شانۆ دەیبینین.

قیاسی ئەرستۆ لەسەر سێ بنەما وەستاوە، ئەوانە بە پێشەکی گەورە(المقدمە الکبری) وپێشەکی بچووك (المقدمە الصغری)و ئەنجام (النتیجە) ناوی دەبەن. ئێمە

لێرەدا نموونەیەك بۆ خوێنەر دەهێنینەوە. كە هەمان ئەو نموونەیەیە كە لەسەردەمی ئەرستۆوە تائێستا سەرجەم پیاوانی لۆژیك بێ شەرم و بێزار بوون ئاماژەی بۆ دەكەن:

١-هەموو مرۆڤێك دەمرێت.(پێشەكی گەورە).

٢-سوكرات مرۆڤە. (پێشەكی بچووك).

٣- كەواتە سوكراتیش دەمرێ.(ئەنجام).

ئەوانیش سەرجی ئەوەیان داناوە، دەبێت دوو پێشەكییە دروست بن بۆ ئەوەی دەرئەنجامەكە دروست بێت. ئەو رەخنەیەی ئاراستەی ئەو قیاسە دەكرێت، زیاتر لەسەر پێشەكی گەورەیە. ئەگەر دەزانین ئەو پێشەكییەش پشت بە بەڵگەنەویستە باوەكان دەبەستێت ئەوا بۆمان روون دەبێتەوە كە ئەواوی قیاسەكە هیچ وپووچە. یادەست بە لێكدانەوەی ئەو نموونە بەناوبانگەی سەرەوە بكەین. دەبینین كاتێك دەڵێن: هەموو مرۆڤێك نامێنێت. وا دەردەكەوێت ئەوان حەزیان لەو نموونەیەیە، چونكە ئەو پێشەكییە گەورە مرۆڤ پێی رازییە و ئەوە دوای ئەوە باوەڕیان بەو قسەیە هەیە. زەحمەتیشە نكوڵی لەو قسەیە بكەین، چونكە كەسێك نەبووە لە مێژوودا لە مردن نەجاتی بووبێت.

لەڕاستیدا هەموو مرۆڤێك دەمرێت، لەناوچوون بەشی هەموانە. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین گومان لە راستیی ئەو قسەیە بكەین كە باوەڕمان پێیەتی، چونكە هەموو ئەوكەسانەمان تاك بە تاك نەبینیوە كە مردوون، مەحاڵیشە توێژەر بتوانێ توێژینەوە لە بارەی ژیانی سەرجەم مرۆڤەكان بكات، كە لەسەردەمی باوكە ئادەمەوە تا ئێستا مردوون بۆ ئەوەی لە مردنیان دڵنیابێتەوە. كێ دەزانێ لەوانەیە یەكێك لە خەڵك مابێت و نەمردبێت. دووبارە دەڵێم ئەو گومانە بە گریمان دانرابوو. من خۆم باوەڕم بەو گومانە نییە، تەنها بۆ ئەوەم هێناوەتەوە كە بۆخوێنەری روون بكەمەوە، دەكرێت گومان لەوشتانە بكرێت كە خەڵك باوەڕی پێیەتی و بە بەڵگەنەویستی دەزانێ.

ئەگەر دیقەت بدەینە بەر ئەو پێشەکییە گەورانەی لە لۆژیک دەهێنرێتەوە، گومانی تێدانییە کە سەرجەمیان گوزارشتی باوە وخەڵک باوەڕیان پێهێناوە، خاوەن لۆژیکەکانیش هەڵی ئەمە دەقۆزنەوە بۆ ئەوەی پێوانە جۆراوجۆرەکانی خۆیان بەسەر بسەپێنن. نموونەی ئەوەی دەڵێن:" هەموو شتێك هۆکاری خۆی هەیە". ئەمە لە دیدی ئەوان یاسایەکی بەڵگەنەویستە نابێت کەس گومانی لێ بکات، ئەمە لە لای ئەوان بە "یاسای هۆکاربوون"ناسراوە. ئەوان بۆ هەموو شتێك لە دەورووبەریان هۆکاری خۆی هەیە، لەوە راهاتوون تا ئەمە بەناخی بیرکردنەوە لۆژیکیەکان شۆڕبۆتەوە. ئەگەر یەکێکیش ناڕەزایی دەربڕێت و وتی:" چۆن زانیوتانە کە هەموو شتێك هۆکاری خۆی هەیە؟ ئایا توانیوتانە هەموو شتەکانی زەوی و ئاسمان بپشکنن بۆ ئەوەی هۆکارە شاراوەکانیان ئاشکرا بکەن؟" پێدەکەنن و دەڵێن ئەمە سۆفستەیە.

***

یەکێکی دیکە لە یەقینە لۆژیکییەکانیان ئەوەیە دەڵێن:" دوو دژبەیەکتر کۆنابنەوە" ئەگەر وتمان: ئەو یەقینەتان لە کوێ هێناوە؟ وەڵامیان ئەوەیە:ئەمە لە پێویستیەکانی عەقڵی دروستە. واتە راستترە بڵێن: ئەمە لە پێویستیەکانی نەریتی بیرکردنەوەیە، کە لەسەری راهاتوون. هەر شتێك بەعەقڵی ئەوان راهاتبێت، لە دیدی ئەوان دروست و بێگەرد دەبێت.

***

ئەمڕۆ زانایان بە تەواوی باوەڕ بە هیچ یەقینێك ناهێنن، تەنانەت ئەگەر هەموو خەڵك لەسەر دروستی ئەو یەقینە کۆك بێت. ماوەیەکی زۆر بەسەر خەڵك تێپەڕی باوەڕیان بە تیۆری کێشکردن هەبوو، کە نیوتن داینابوو. کەس نەیوێرا گومانی لێبکات. وەك بەڵگەنەویستێك بوو کە پێویست بوو بیرکردنەوەی دروست باوەڕی پێ بکات. دواتر روون بۆیەوە کە ئەمەیان گریمانێکی کاتییە، هەتاهەتا بە ڕاستیی نامێنێتەوە. رۆژانێك زانایان باوەڕیان بە بوونی ماددەی(ئەسیر) هەبوو لە گەردووندا، دواتر

دەرکەوت کە ئەمە بوونی نییە؛ دواتر تیۆری (شوێنکات) لەلایەن ئاینشتاین دانرا و شوێنی کێشکردن وئەسیری گرتەوە. کێ دەزانێ لەوانەیە داهاتوو کودەتایەکی شاردبێتەوە، بەشێوەیەک (شوێنکات) بێ شوێن بهێنێتەوە!

***

ولیەم جیمس دەڵێ: هەقیقەت شتێک نییە، تەنها گریمانێکە مرۆڤ مەزەندەی دەکات بۆ ئەوەی لە چارەسەرکردنی کێشەکانی ژیان پەنای بۆ ببات. هەقیقەتی رەهاش بوونی نییە، ئەگەر هەش بێت ئەوا مرۆڤ تێی ناگات، چونکە لە ژیان سوودی بۆ ئەو نییە. مرۆڤ پێویستی بە هەقیقەتی رێژەیی هەیە کە لە کێشەکانی رۆژانەی هاوکاریان دەکات، زۆرجار وەهم بۆ ئەو لە هەقیقەتی رەهای هەڵواسراو بە حەواوە بەسوودترە.

بینیمان چۆن تیۆری ئەسیر و کێشکردن لە دیدی زانایانی نوێ بوون بە وەهم. بەڵام ئەو وەهمە لە کاتی خۆیدا بۆ زانایان سوودمەند بوو؛ چونکە چەندین دیاردەی گەردوونی بۆنەوان شرۆڤە دەکرد و لە چارەسەرکردنی کێشەکان هاوکاری دەکردن.دواتر تیۆری (شوێنکات)هات، کە لە دەستەخۆشکەکانی پێشووی سوودبەخشتر بوو. چونکە کێشە کۆن و نوێیەکانی چارەسەر دەکرد. کەواتە ئەو راستترە. کاتێکیش زانایان تووشی کێشەی دیکە دەبن و ئەو تیۆرە ناتوانێ چارەسەری بکات، ئەوا بەدوای گریمانەیەکی دروستتر و پڕ ئاماتجتر دەگەڕێن. بۆیە مرۆڤ ناچارە چەندین هەقیقەتی نوێ دابهێنێت بۆ ئەوەی چارەسەری کێشە لەناکاوەکانی بکات. ئەو بایەخ بەوەش نادات چ هەقیقەتێکی رەها لە قووڵایی گەردوون حەشار دراوە کە هیچ پەیوەندییەکی بە خەمەکانی ئەو نییە.

***

بیرمەندانی کۆن رەزامەندی لەسەر ئەو بۆچوونە دەرنابڕن؛ ئەوان هەزاران ساڵە لەسەر ئەوە راهاتوون، پێنەگەیشتوون و پێی ناگەن. ئەوان وا خەیاڵ دەکەن کە بەو جۆرە هەقیقەتە گەیشتوون و بەمەش دڵخۆش بوون. ئەگەر ئەوەی دەیلێن راست

بێت، ئەوا دەبێت لەسەر ئەو هەقیقەتە کۆک بن کە پێی دڵخۆش بوون. کەچی تا ئێستا ئەوان مشتومڕی لەسەر دەکەن و لەسەری ناکۆکن؛ هەر گرووپێك بەوە دڵخۆشە کە هەیەتی و لەوە تووڕەیە کە لەلای خەڵکانی دیکەیە.

هۆکاری ئەوجیاوازییە هەمیشەییەی تێوانینیان ئەوەیە ئەوان پشت بە قیاسی لۆژیکی دەبەستن کە لەسەر بەڵگەنەویستە باوەکان بونیادنراوە. ئەوانەش بەپێی کات وشوێن دەگۆڕێن. هەرکۆمەڵگایەك بەڵگەنەویستی خۆی هەیە و باوەڕیشی بەوە هەیە پێوەری هەقیقەتەکەی تاهەتایە نەمرە. ئەوانەی لۆژیك بەکاردەهێنن تەنها بەو شتە باوانە ناوەستن کە خەڵك باوەڕی پێیەتی؛ بەڵکو بۆخۆیان چەندین بەڵگەنەویستی تایبەت دروست دەکەن، وەك شمشێرێك بەدەستی خۆیان بەکاردەهێنن وهێرش دەکەنەسەر هەرکەسێك کە رقیان لێی دەبێتەوە و هەر بیرۆکەیەك رەتدەکەنەوە کە بە دڵی ئەوان نەبێت.

یەکێك لە گاڵتەجاڕییەکانی رێکەوت ئەوەیە؛ ئێستا دەبینین هەقیقەتی رێژەیی بەسەر توێژینەوە سروشتییەکان زاڵە؛ کەچی هاوڕێیانمان هێشتا تەنها باوەڕیان بە هەقیقەتی رەها هەیە لە توێژینەوە کۆمەڵایەتییە و هزریەکانیان. ئەمە زۆر بەزەقی لە توێژینەوە مێژووییەکانیان دەبینین. ئەگەر ئەوان پیاوانێکی مێژوویان خۆشویست، ئەوا دەگەڕێنەوە سەر هەموو ئەو کارانەی ئەنجامیان داوە؛ وە ئەو بیرۆکانەی باسیان کردووە. بۆ ئەمەش چەندین بەڵگەی عەقڵی و نەقڵی کۆدەکەنەوە بۆ ئەوەی بسەلمێنن کار و گوفتاریان دروستە و بۆ هەموو کات و شوێنێك گونجاوە. بەڵام ئەگەر رقیان لە پیاوانێکی مێژوو بێت؛ هەموو کاروگوفتاریان ناهەقییە. تەنانەت ئەگەر هاوشێوەی ئەو کاروگوفتارانەش بێت کە کەسە خۆشەویستەکەی ئەوان ئەنجامی داوە.

حەزناکەم پەنجە بخەمە سەر ئەو جیاوازییانەی لە توێژینەوەکانی ئەوان هەیە؛ لەڕاستیدا چەندین نموونەم دۆزیوەتەوە؛ بەڵام نامەوێ بیانخەمەڕوو، ئەگەر وابکەم دەبێت تا رۆژی مردن قیامەتم بۆ هەڵبسێننەوە. خوێنەر دەتوانێ چەندین نموونە لەو جیاوازیانە لە

قسە ئاساییەکانی ئەوان بدۆزێتەوە کە لە دانیشتنە تایبەتەکانیان ئەنجامی دەدەن. ئەوان ئەگەر رقیان لە کەسێك بوو بینیان پۆشاکێکی شیك و گرانبەهای پۆشیوە؛ ئەوا قسەکانیان بەوشێوەیە دەست پێدەکەن: پۆشاکی گرانبەها سەرپێچی فەرمانی خودا و پێغەمبەرە، دواتر چەندین بەڵگەی عەقڵی و نەقڵی دەهێننەوە کە پاڵپشتی ئەوان دەکات.

ئەوان دوودڵ نین لە کاتێکی دیکە بەڵگەی ئەوە بهێننەوە بۆ ئەوەی بۆچوونێکی پێچەوانەی سەرەوە بسەلمێنن، ئەمە کاتێك ئەگەر تێبینیان کرد ئەوەی رقیان لێ دەبێتەوە جلێکی کۆن و هەرزانی پۆشیوە، ئەوکاتە بەڵگەی عەقڵی و نەقڵی هەردەم لەبەر دەستیان ئامادەیە. لەبەر ئەمەشە راستە ئەگەر بڵێین قیاسی لۆژیکی لە لای ئەوان بارگیرێکە بۆ مەبەست و سۆزی خۆیان لە کاتی پێویست بەکاری دەهێنن. دەیانبینی دەتوانن لەو دانیشتنە بەڵگەی دروستی شتێك بهێننەوە، لە دانیشتنێکی دیکەش بەڵگەی هەڵەی هەمان شت بسەلمێنن. ئەوان لە(پێشەکییە گەورە) کانیان چەندین قسەی شاعیران وپەندی پێشینان و ئەو قسانە بەکاردەهێنن کە لێرە ولەوێ لە کتێبەکان وەریانگرتووە، خوا نەبێت کەس بەراستیان نازانێ. ئەوان سەرەتا سەیری بۆچوونەکە دەکەن، ئەگەر پەسەندیان کرد، ئەوا بەدوای پێشەکی گەورە دەگەڕێن، بۆ پشتڕاستکردنەوە گونجاو بێت. بەڵام ئەگەر نەیاندۆزییەوە ئەوا جیاواز دەبن ، یان لێکدانەوەی بۆ دەکەن. لە هەموو ئەوکاتانەش قیاسی لۆژیکی بەپێی ویستی ئەوانە.

***

زانایانی کۆمەڵناسی لە مشتومڕی تایفەکانی ئاینی بەڕوونترین شێوە ئەو جیاکارانەیان بینیوە، هەموو تایفەکانی ئاینیش لەسەر دوو جۆری سەرەکی دەبن: جۆرێکیان مەیلی بەلای دەسەلاتدارەوە هەیە، جۆرەکەی دیکە مەیلی بەلای رەعیەتەوە هەیە. بۆیە دەبینین هەر تایفەیەك بەڵگەی کۆدەکاتەوە بۆ ئەوەی پشتگیری لە گرووپە خۆشەویستەکەی خۆی بکات هەرچەندە هیچ وپووچیش بێت.

ئەم بۆچوونەی سەرەوە بەشێوەیەکی سەیر بەسەر تایفە ئیسلامییەکان جێ بە جێ دەکرێت. ئەو کتێبانەی پیاوانی ئایینی لە تایفە جیاوازەکانی موسڵمانانەوە بڵاوی دەکەنەوە، پڕن لەو جیاکارییە لۆژیکیانە، تەنانەت کتێبێک نییە خاڵی بێت لێیان. تۆ مێشتا نازانی نووسەر سەر بەکامە تایفەیە کەچی دەزانیت ئاراستەی قیاسە لۆژیکییەکانی بەتەواوی روون و ئاشکرایە.

بۆ نموونە لە کتێبی(العواصم في القواسم) کەلەلایەن لیژنەی لاوانی موسڵمان لە میسر بڵاوکراوەتەوە، دەبینی چەندین جار ستایشی معاویە و یەزیدی کوڕی ومەروان وعەبدولمالیکی کوڕی بەچەندین جۆر کراو، ئەوان ئیمامی پیاوچاک و پیاوچاکی ئاینی بوون، خوا لێیان رازی بێت. کتێبەکە چەندین حەدیس و قسە دەهێنێتەوە بۆ ئەوەی ئاماژە بە چاکەکانی ئەوان بکات و بەشێکی دیکەش فەرامۆش دەکات. بە تێڕوانینی ئەوان معاویە لە دادپەروەریی و لەخواترسی وەك مەهدی بووە؛ پێغەمبەر فەرمویەتی" اللهم اجعله هاديا و مهديا و اهد به".

دەگێڕنەوە رۆژێکیان پێغەمبەر لەخەو هەڵساوە و پێکەنیوە، چونکە لەخەودا خەڵکانێکی بینیوە لە پێناو خودا جەنگاون و لە ناوەراستی دەریا وەك سەرداری خێزان وەستاون. بێگومان مەبەستی پێغەمبەریش لە معاویە بوو ئەوکاتە فەتحی جەزیرەی قوبرسی کردبوو. معاویە بینرابوو لە مینبەری مزگەوتی دیمەشق وتاری بۆ خەڵك دەخوێندەوە وجلەکەی پەپینە بوو، جارێکی دیکەش لە بازاڕ بینرابوو کە دوای خزمەتکارێکەوە سوار بوویوو کراسێکی پەپینەی گیرفانی لەبەرکردبوو. گەورە یارانی دەستیان بە کراسەکەی دەگرت چونکە بە پیرۆزیان دەزانی. سەرکردەی گەورە زەحاك بن قەیس بینراوە کە لە مزگەوتی مەدینە توێژی لە نێوان گۆڕی پێغەمبەر و مینبەرەکەی کردووە. پەردە(قەڕوە) پینەدارەکەی معاویەی پۆشیوە، تەنانەت یەکێك لە ئیمامەکانی فەرمووده معاویەی لەرووی دادپەروەرییەوە لە عەلی بەباشتر زانیوە.

ئەو فەرموودەیەی لە پێغەمبەرەوە ریوایەت کراوە کەدەڵێ:" الخلافە ثلاثون ثم تعود ملكا" . ئەمە لە دیدی نووسەرەوە سەحیح نییە، ئەگەر دروستیش بێت ئەوا لێکدانەوەی دیکە لەخۆیەوە دەگرێت خودا لەبارەی داود(کە باشترە لەمعاویە) وتویەتی" و اتاه الله الملك و الحكمە" واتە پێغەمبەرایەتی دەبێتە موڵك. ئیمام ئەبوزەرعەی رازی پیاوێکی بینی کە زەمی معاویەی دەکرد، ئیمام لە بارەی هۆکارەکەی دەپرسێت. پیاوەکە وەلامی دەداتەوە:" چونکە عەلی کوشتووە". ئیمام ئەبو زەرعە دەڵێ:" دەڵێن خودای معاویە رەحیمە، دوژمنی معاویەش کەریمە، تۆ پەیوەندیت بەو دووانە هەیە. خوا لێیان رازی بێت".

سەبارەت بە دانانی یەزید بە خەلیفە لەلایەن معاویەوە، ئەوا مەبەستی معاویە لە مەترسی پەرتەوازەبوونی گوتاری موسڵمانان ئەرکارەی کردووە. وەك ئەسحابەی گەورە عەبدوڵلا کوڕی عومەر ئاماژەی بۆ کردووە، گوایە سەرەرای ئەمەش یەزید پیاوێکی باش بووە ئیمام لەیس بن سەعد بە میری موسڵمانانی ناوبردووە. ئەگەر بگوترێت یەزید عەرەقخۆر بووە، ئەمە دەبێت دووشاهێدی لەسەر بێت، کێ شاهێدی بۆ دەدات؟ بەڵکو دادپەروەری بەدادی خۆی شاهێدی دەدات. کەچی حوسێن لە شمشێری شەریعەت نووسراوە دوای ئەوە شیعەکانی هانیان دا جیاوازی بخاتە نێوان موسڵمانانەوە.

لەوکاتەی دەبینین ئەو نووسەرە بەڵگەی یەکلاکەرەوەی هەیە بۆ دادپەروەری معاوییە و یەزید و ئەوانیتر، ئەوا نووسەرێکی دیکە لە جۆرێکی دیکە دەبینین ئەویش بەڵگەی یەکلاکەرەوەی هەیە، بۆ بۆچوونێکی پێچەوانەوە. هەرکەسێك وادەزانێ باوەڕەکەی ئەو یەکلاکەرەوەیە و مەنیقەتی رەها لە لای ئەوە.

یەکێك لە پیاوانی ئاینی کتێبێکی بلاوکردۆتەوە تیایدا پشتگیری خۆی بۆ نەریتی لەخۆدان(التطبیر) دەکات، کە لە هەندێك شاری عێراق لەو سەردەمامان باوە. خەڵك لە رۆژی عاشورا بە چەقۆ لەخۆیان دەدەن و هەندێك لە پێناو ئەمەدا دەمرن. لەو

کتێبەدا چەند رستەیەکم بینی دەمەوێ بیگوزاسەوە بۆ ئەوەی خوێنەر لە رووی بەکارهێنانی لۆژیکەوە لەگەڵ تێکستی پێشوو بەراوردی بکات:

" کاتێك بۆ شێوەنی ئەو ئیمامە شەهیدە چەندین پیاوانی گەورەی ئایین بەرگەی زیانی خۆیان گرتووە، لەوانە عەباس کوڕی میری موسڵمان بووە کە چاکترین کوڕی باوکی بووە لە نێوان دوو براکەی حەسەن وحوسێن. دوای ئەوەی بە شمشێرەکەی ریزەکانی ئەهلی کوفەی بڕیوە و گەیشتۆتە کەناری فورات، زۆر تینوو دەبێت، بەشێوەیەك وەسف ناکرێت. دوای ئەوەی ئاوەکەی لە دەمی خۆی نزیك کردەوە بۆ ئەوەی بیخواتەوە، تونێتی حوسێنی برای و ئەهلی بەیتی بیرکەوتەوە، ئاوەکەی رشت و وتی:" ئەی ئاو دەمم لە تۆ نادەم، کاتێك حوسێن براکەم و منداڵەکانی تینوو بن".

"کەواتە چی رێگرە لە بەردەم موسڵمانانی دیکە کە لە پێناو ئەو شێوەنە زیانی خۆیان قبوڵ بکەن، دوای ئەوەی ئەو پیاوە مەزنە قبوڵی کرد؟ مەبەستم عەباس کوڕی عەلییە، کە پێگە بەرزەکەی ئەو فەرامۆش ناکرێت، لە زانینی ئایینی خودا و بڕیارەکانی لە جیاکردنەوەی حەرام و حەڵاڵ. کاتێك ئەمە لەبەرچاو بگرین، پێویست بەوە ناکات حوکمی حەرامبوون بدەین، دوای ئەوەی بنەمای شەرع و رێساکانی زانست هیچ پاساوێك بۆ ئەمە نادەن".

خوێنەر لەو دوو برگەیەی سەرەوە نموونەی توانای کەسانی خاوەن لۆژیکی کۆن دەدۆزێتەوە کە چۆن پێشەکییەکانیان بەپێی ئارەزووی خۆیان دادەنێن، بۆیە نووسەر پشتگیری لە (لەخۆدان) دەکات و بەچاکی دەزانی، چونکە ئەمە لە شێوەنی حوسێنە، لاواندەوەی شەهیدیش بێگومان کارێکی باشە.

ئەگەر بەپێی قیاسی لۆژیکی شیکاری ئەو برگانە بکەین، بەمشێوەیە دەبێت:

١-لاواندنەوەی شەهید چاکەیە(پێشەکی گەورە).

٢-لەخۆدان لاواندنەوەی شەهیدانە(پێشەکی بچووك).

٣- کەواتە لەخۆدان (تەتبیر) کارێکی باشە.(ئەنجام).

لێرەدا بۆ خوێنەر روون دەبێتەوە کە چۆن نووسەر بە قیاسی دروستی ئەرستۆ داکۆکی لە دیاردەی تەتبیر دەکات. تۆ ناتوانی گومان لە پێشەکی گەورە بکەیت، چونکە گومان سیفەتی سۆفستەنەکانە. ناشتوانی گومان لەپێشەکی بچووک بکەیت، چونکە ئەو هاوڕێیەمان نموونەی چیرۆکی عەباس کوری عەلی هێناوەتەوە، چونکە ئەمەش سیفەتی زەندیقەکانە ئەمەش لەتۆمەتی یەکەم بەدترە. بۆیە ناچاری دروستیی ئەنجامەکە قبوڵ بکەیت و کارەکەت رادەستی خودا بکەیت. ئەمەش چاکترە لەوەی بە سۆفستەئە و زەندیقی تۆمەتبار بکرێیت و لە ژیانی دونیا و کۆتایی دا رەوانەی دۆزەخ بکرێیت. ئەگەریش هاتوو گوزاشتەکانی نووسەری یەکەم بەپێی لۆژیکی ئەرستۆ رێکبخەین، ئەوا بێگومان بەو ئەنجامە دەگەین کە نووسەرەکە خوازیاریەتی، هیچ رێگایەکی دیکە نییە، ئەو نموونەیەش بۆ خوێنەر دەهێنینەوە:

١- رێگەنەدان بە پەرتبوونی موسڵمانان واجبە(پێشەکی گەورە)

٢- دانانی یەزید لە پێناو رێگرتن بوو لە پەرتەوازەیی موسڵمانان.(پێشەکی بچووک).

٣- ئەوەی معاویە لە دانانی یەزید ئەنجامی دا واجب بوو لەسەر ئەو (ئەنجام).

موسڵمان ناتوانێت گومان لە دروستی پێشەکی یەکەم و دووەم بکات، چونکە پێشەکی یەکەم دراوەتە پاڵ خودا و پێغەمبەر، پێشەکی بچووکیش پشتی بە بۆچوونی یاوەری گەورە عەبدوڵلا کوری عومەر، ئەوەیان وەک ئەسنێرەیە لە هیدایەت، بۆیە تەنها لەسەر موسڵمان پێویستە خۆی رادەستی دروستی ئەنجامەکە بکات وملکەچ بێت.

***

لەو شرۆڤەکردنە مەبەستم ئەوە نییە زەمی تایفەیەك و کەسێکی دیاریکراو بکەین. بۆ خوێنەر روون بۆتەوە کە کەسانی لۆژیکی کۆن هەموویان تووشی ئەو دەردە بوون، بۆیە جیاوازی لەنێوان تایفەیەکان نییە. لەوانەیە زێدەڕۆیی نەکەین ئەگەر بڵێین هەموو تایفە ئیسلامییەکان لە رووی لۆژیکەوە یەك تایفەن و دروستە بە(تایفی ئەرستۆ تالیسی) ناویان بنێین. ئەوان پیاوێکیان خۆش دەوێ و رقیان لەویترە. بەلام

هەموویان پشت بەبەڵگەیەکی هیچ دەبەستن کە لۆژیکی زانستی نوێ قبوڵی ناکات. ئەگەر ئەوان بەپێی بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی و پێشکەوتنی شارستانی تێڕوانینیان بۆ پیاوەکانی مێژوو هەبوایە ئەوا کەم یان زۆر بەوانمان باوەڕ دەکرد.

کەموکوڕی گەورە ئەوەیە ئەوان بەکردار پرەنسیپی دژ بەیەکتر پەیڕەو دەکەن، کەچی لە ڕووی تیۆرییەوە ڕقیان لێیەتی. ئەوان بە قیاسە لۆژیکییەکانیان بەدوای ئارەزووی دڵیان دەڕۆن، کەچی بانگەشەی ئەوە دەکەن گوایە بەدوای حەقیقەتی ڕەها دەگەڕێن. کەچی لۆژیکی نوێ بە کردار و تیۆر نکوڵی لە بوونی حەقیقەتی ڕەها کردووە. ئەو لە هەر بیرۆکەیەک لایەنێکی دروست لە چوارچێوەیەکی تایبەت دەبینێ. ئەو بیرۆکەیەی لەدیدی تۆ هەڵەیە، لەدیدی خەڵکانی دیکە دروستە. هەرکەسێک بەو چاویلکەیە سەیری حەقیقەت دەکات کە کۆمەڵگا و بەرژەوەندییەکان و گرێ دەروونییەکان بۆیان داناوە. ئەوەی تەنها لەسەر توێژەریش پێویستە ئەوەیە لایەنی ڕاست و هەڵە لە بیرۆکەکە دەستنیشان بکات و دواتر بەشێوەیەکی گشتی تاوتوێی کاریگەرییەکەی بەسەر پێشکەوتنی شارستانیەتی مرۆڤایەتی بکات.

# سۆفسەتە چییە؟



مامۆستا مورتەزا عەسکەری کتێبێکی نووسیوە بەناوی" لەگەڵ دکتۆر عەلی وەردی" لەو کتێبەدا هەوڵ دەدات ئەوەی لە هەردوو کتێبی" واعیزی سوڵتانەکان" و " ریزپەڕەکانی ئەست" پوچەڵ بکاتەوە. ئەوەی ئەو نووسەرە لە رەخنەگرەکانی دیکە جیادەکاتەوە ئەوەیە بایەخی بە لایەنی لۆژیکی داوە. بەگەرموگوڕیش داکۆکی لە لۆژیکی ئەرستۆتالیس دەکات و بێ وچان هێرشدەکاتە سەر لۆژیکی سۆفسەتەکان. مامۆستا عەسکەری من بەوە تۆمەتبار دەکات، گوایە هەواداری سۆفستەکانم و بانگەشە بۆ لۆژیکەکەیان دەکەم و بەرگریان لێ دەکەم. لەوانەیە وابزانێ من لەو تۆمەتە توڕەدەبم و هەوڵی ئەوە دەدەم خۆم بێتاوان بسەلمێنم، ناشزانێ من شانازی بەوە دەکەم سۆفستائی بم، بەلای منیشەوە سۆفستە باشترە لە پڕوپووچییە لۆژیکییەکانی لایەنگرانی لۆژیکی کۆن.

یەکێك لە باشیەکانی سۆفسەتە ئەوەیە دووڕوو نییە. ئەو باوەڕی بە هەقیقەتی ڕێژەیی هەیە لە ڕووی کردار و رەفتارەوە. بەلام ئەوانەی لۆژیکی کۆن بەکاردەهێنن لە ڕووی تیۆرییەوە باوەڕیان بە هەقیقەتی ڕەها هەیە، بەلام لە ڕووی کردارییەوە

سەرپێچی ئەو هەقیقەتە رەهایە دەکەن، وەك لە بەشی پێشوو بینیمان. هەر کۆمەڵێك داکۆکی لەو هەقیقەتە دەکات کە ئەو شارەزووی دەکات، دواتریش بانگەشەی ئەوە دەکات کە ئەو یەکێکە لە داواکارانی هەقیقەتێکی ئەمر کە بۆ هەموو کات و شوێنێك دەگونجێت.

قوتابییەك لە یەکێك لە موحازەرەکانم لە کۆلێژی ئاداب و زانستەکان وتی: "سوودی ئەو کۆمەڵناسییە چییە کە بەیانی و ئێوارە بەسەر سەرمان دەیبارێنی؟ ئێمەش سیستەمێکی کۆمەڵایەتی ئەمرمان هەیە، کە بۆ هەموو کات و شوێنێك دەگونجێ- ئەویش سیستەمی ئیسلامییە- بۆیە شتێکمان لەسەرە ئەویش جێ بە جێ کردنی ئەو سیستەمەیە لە کۆمەڵگاکانمان، ئەوکاتیش مرۆڤایەتی لەگەڵ ئێمە دڵخۆش دەبێت بە فەرمانی خودا". بەقوتابییەکەم وت: "ئەو سیستەمەی کە تۆ باسی دەکەی زانایانی ئایینی لەسەری جیاوازن، هەر کۆمەڵێك پێچەوانەی کۆمەڵەکەی دیکەی هەیە، وەك دەردەکەوێ رێکەوتنی زاناو فەقیهەکانی ئیسلام نەبووە، تەنها لەسەر چەند بابەتێك نەبێت لەوانە پارەی حەمام و سەرتاش و رشتنی ئەو تەحینەی ئەگەر بەریەك کوتن،[١٠٠] لەمانە روون دەبێتەوە کە فەقیهەکانی ئیسلام تەنها لەسەر بابەتە هیچەکان رێکەوتوون کە لە ژیانی گشتیدا بایەخیان نییە، کەچی بابەتی گەورەی وەك خەرجێنەی باج و چۆنیەتی خەرجکردنی سامانی نەتەوە و مافی ئافرەت و هەڵبژاردنی وسوڵتان، ئەوا ئەوان لەسەر ناکۆکن و تائێستاش هەر ناکۆکن. ئەی کەواتە لەکوێ سیستەمێکی ئەمر بهێنین بۆ ئەوەی بۆ هەموو کات وشوێنێك بگونجێ؟."

قوتابییەکە وەڵامی دایەوە و وتی: "پێویستە لەسەرمان ئەو مەزهەبە فقهییانە وەربگرین کە لە عەقڵی سەلیم نزیکن" ئەمە وەڵامێکی نایابە، بەڵام ئەگەر

[١٠٠] مصطفى عبدالرزاق، الاجماع في الشريعة الاسلامية، ص٢١

بگەڕێینەوە سەر قوتابخانە فقهییەکان ئەوا دەبینین هەموویان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە بیروڕاکانیان دروستن و لە عەقڵی سەلیم نزیکن. ئەگەر یەکێکمان قبوڵ کرد ئەوا ئەوانی دیکە لێمان تووڕەدەبن و هێرشمان دەکەن سەر. بە ستەمکار و نەزانی و کوفر تۆمەتبارمان دەکەن. کێ دەزانێ لەوانەیە ئێمە هەڵە بین و ئەوان لەسەر هەق بن. ئەگەر هاتوو مەزهەبەکانی دیکەشمان ناچار کرد کە بەدوای ئێمەوە بن، ئەوا ئەوکات ئێمە هیچ جیاوازییەکمان لەگەڵ سوڵتانێکی زۆردار نییە، لەوانەی مێژوویان پڕ کردووە لە ستەم و هیچ و پووچی خۆیان و واشدەزانن کە ئەوان دادپەروەرن.

ئابێت ئەوە لەبیر بکەین کە ستەمکاران، ئەوانەی هەزاران کەنیزەیان بە سامانی میللەت دەکڕی، ئەوا ژمارەیەکی زۆری فوقەمایان بەدەورە بوو، کە بۆ پاڵپشتی کارەکانی سوڵتان چەندین بەڵگەی عەقڵی و نەقلیان دەهێنایەوە. گوایە ئەمە تەبایە لەگەڵ ئەوەی خوداو پێغەمبەر فەرمانی پێکردووە- ئامین خودای گەورە!

***

گرنگترین شت کە ئەمرۆ گەلانی نوێ سەرقاڵ دەکات، جێ بە جێ کردنی دادپەروەریی کۆمەڵایەتییە. خەڵک ئەمرۆ بایەخ بەوە نادات ئەگەر مشک کەوتە ناو تەحین دەبێت تەحینەکە بڕێژێت، بەڵکو لەوانە مشکەکەش بخوات ئەگەر زانست ئەوە بدۆزێتەوە کە ڤیتامین لە گۆشتەکەی دایە. ئەمرۆ دادی کۆمەڵایەتیی ئامانجی هەموو ڕێبازە هاوچەرخەکانە، ئەمە تەوەری مشتومڕی نێوانیانە. دەتوانین بڵێم ئەو ڕێبازە کۆمەڵایەتییانە بەجیاوازی بۆچوونەکانیانەوە، لە سەر بنەمای تێگەیشتنی سۆفستەکانی کۆن لەدادپەروەریی دەگەن.

ئەفلاتون بڕوای وابوو کە دادپەروەریی بریتییە لە بیرۆکەیەکی ئەبستراکت، دەتوانرێت بە بیرکردنەوەی دروست پێی بگەین. کەچی سۆفستەکان بەپێچەوانەوە پێیان وابوو دادپەروەریی دروستکراوی مێژوو و ئەنجامێکی کارلێکردنی

کۆمەڵایەتییە[١٠٦]. ئەمەش مانای ئەوەیە کە دادپەروەریی بیرۆکەیەکی رووت نییە لەبۆشاییی وەستابێت، بەڵکو دروستکراوی پێشکەوتنی مێژووە. کەسێکیش ناتوانێت دەستنیشانی بکات، ئەوانە نەبێت کە لە پێکهێنانی مێژوو بەشدارن. یەکێک لە پرەنسیپە ناسراوەکانی سۆفستەکان ئەو قسەیەی ئەوانە کە دەڵێ:" مرۆڤ پێوەری هەموو شتێکە" ئەوان بەو پرەنسیپەیان توانیان خزمەتێکی گەورەی مرۆڤایەتی بکەن. پرۆفیسۆر زیلەر دەڵێ:" ئەو خزمەتە بەردەوامە کە سۆفستەکان پێشکەشی فەلسەفەیان کردووە ئەوەیە سەرنجەکانیان خستۆتە سەر توێژینەوە لە بارەی مرۆڤەوە و بنەمای پەروەردەی سیستەماتیکیان داناوە"[١٠٧].

سەرەڕای ئەمەش سۆفستەکان بۆ ئەوە دەچن، کەهەقیقەت بریتییە لە دژبەیەك و رکابەریی، هەر مرۆڤێك بەپێی بەرژەوەندی و ئارەزووی خۆی سەیری هەقیقەت دەکات، لەنێوان ئەو رکابەرییەی هەقیقەتی تاکەکان ئەوا هەقیقەتی مامناوەند دەردەکەوێت، کە بەشێوەیەکی گشتی سوودی بۆ مرۆڤایەتی هەیە[١٠٨]. ئەگەر بیرمەندانی کۆن لەو تیۆرەی سۆفستەکان بەتەواوی تێدەگەیشتن و بایەخی تەواویان پێدەدا، ئەوا بەشێکی گەورەی ئەو ستەمکارییە نەدەبوو، کە لەمێژوودا کەڵەکە بووە. تێبینی ئەوە دەکرێت کەستەمکارانی سەدەکانی رابردوو خاوەن عەقڵیەتێکی ئەفلاتونی بوون، جا هەستیان کردبێت یان نا. بۆیە دادپەروەرییان بە خواستی خۆیان پێوانە دەکرد. دواتر پێیان وابوو کە ئەو پێوانەی ئەوان ئەمر و رەهایە و جێگای مشتومڕ نییە. بۆیە بینیمان ستەمیان لە خەڵك دەکرد و خۆشیان بە دادپەروەر دەزانی. ئەگەر یەکێکیش نارەزایی بوویە ئەوا هاواریان دەکرد" ئەی جەلاد، وەرە لەسەری ئەو زەندیقە بدە". بەمەش زەندیق دەچێتە دۆزەخ ,نەفرەتی خودای لێ دەبێت.

---

[١٠٦] Farrington,greek science.p87

[١٠٧] Zeller,qutlines of history of greek philosophy. P110

[١٠٨] عبدالرحمن البدوي، ربيع الفكر اليوناني، ص ٢٣٠-٢٣٦

ئەمڕۆ گەلانی هاوچەرخ درکیان بەهەڵەی ئەو تیۆرەی ئەفلاتون کردووە لە بارەی چەمکی دادپەروەرییەوە. بۆیە کەم یان زۆر مەیلیان بەلای تیۆری سۆفستەکانەوە هەیە. بۆیە چەمکی دادپەروەریی ئەوەیە کە زۆرینەی خەڵك بۆی دەڕوانێ. ئەمڕۆ خەڵك زیاتر لە پێداویستی و کێشەکانیان دەگەن، نەوەك ئەو لوتبەرزە ئەفلاتونییەی کە لە کۆشکی بلورین دانیشتووە و سەیری دادپەروەریی دەکات. ئێمە نکۆڵی لەوە ناکەین خەڵك هەندێکجار هەڵە دەکەن وهەندێکجاریش فریو دەخۆن، زۆرجاریش وەهم و خەیاڵپلاویی بەرەو بەدکاریی و بێهوودەییان دەبات. بەڵام کاتێك ئەوە دوای ئەوە رکابەریی و مشتومڕدەکەن، هەقیقەتە سوودبەخشەکانیان بەرەبەرە بە بەرچاو روون دەبێتەوە. خەڵکیش ناتوانێت بۆماوەیەکی دوورودرێژ فریو بخوات، بەڵکو دەبێت بەتێپەڕینی رۆژگاری تەمی نەزانیان لەبەرچاو بڕەوێتەوە.

***

لەڕاستیدا سۆفستە فەلسەفەیەك بوو، گرنگییەکی کۆمەڵایەتی هەبوو کە جێگای گاڵتە نەبوو. بەڵام لە بەدبەختی خۆی و بەدبەختی مرۆڤایەتی ژێرکەوت و لە بێشکەدا کوژرا. بەمەش جێگای رق بوو، ژێرکەوتوو هەردەم جێگای رقە. بەمەش بیرمەندان هەر کەموکورییەکانیان دەدا پاڵ ئەو فەلسەفەیە و لە چاکەیان دادەماڵی. سۆفستە خالی نەبوو لە کەموکوڕی بەهەرحاڵ، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە لە ئاست چاکەکانی نابینا بین. یەکێك لە چاکەکانی سۆفستەکان ئەوەبوو رەخنەیان لە بتپەرستی هەبوو، کە ئایینەکانی یۆنانی لێ تەژی بوو، هەر لەبەر ئەوەش بوو خەڵکی عەوام سەرسەختترین دوژمنی سۆفستە بوون[١٠٩]. مامۆستا مورتەزا عەسکەری دەڵێ: "سۆفستەکان گومانیان لە بارەی ئایینەوە بڵاوکردەوە، گاڵتەیان بەدروشمەکانی کرد"[١١٠]. ئەمەشی بە گەورەترین کەموکورییەکانی سۆفستە زانیوە. کەچی ئەوەی

---

[١٠٩] Weber abd perry, history of philosophy.p40

[١١٠] مرتضى العسكري، مع الدكتور الوردي،ص،٧٧

لەبیرکردوە ئەو ئایینەی ئەوان جیاوازی لەگەڵ ئایینی جاهیلییەکان نەبووە کە پێغەمبەر محەمەد و پێغەمبەرانی پێشوو دژایەتیان کردووە.

لەوانە مامۆستا عەسکەری پێی ڕەوا نەبێت ڕەخنە لە هەر ئایینێک بگیرێت، جا ئەو ئایینە هەر جۆرێک بێت. بەمەش ئەو هیچ جیاوازی لەگەڵ پیاوانی ئایینی نییە کە لە هەموو کات و شوێنەکان هەن. بەشێوەیەک ئەوان داکۆکی لە ئایینی باوان دەکەن و بەرەنگاری هەر ڕەخنەگرێک دەبنەوە. ئەوان ئێستا داکۆکی لەئایینی یەکتاپەرستی دەکەن، چونکە ئەوان لە سەردەمی ئایینی یەکتاپەرستی گەورە بوون، بەڵام ئەگەر ئەوان لە ژینگەیەکی بتپەرستی دەبوون ئەوا بەگەرموگوڕی داکۆکیان لە بتپەرستی دەکرد. خوا هەردەم زاناترە. سۆفستەکان هێرشیان کردە سەر خواوەندەکانی گریکی کۆن و گومانیان لە بوونی ئەو خواوەندانە کرد. بەمەش پیاوانی ئەو خواوەندانە و سوودمەندان لەو خواوەندانە تووڕەبوون، ئەوکاتەش پیاوانی ئایینی لە لای خەڵک خۆیان وەک پارێزەرانی کولتووری ئەمریی و بیروباوەڕی باوان و بانگخوازی هەقیقەت دەرخست. کەچی سۆفستەکان بەرەو ڕوویان بوونەوە وتیان" هەقیقەت چییە؟ مرۆڤ پێوەری هەقیقەتە!" من پرەنسیپێکی چاکسازی لەو پرەنسیپەی سۆفستەکان نابینم مەزنتر بێت.

***

یەکێک لەو کەموکوڕیانەی کە دەدرێتە پاڵ سۆفسەتە، ئەوەیە کە گومانی لە ئایینی گریک هەبووە، بێئەوەی ئایینێکی نوێ لە شوێنی ئەو دابنێ. بێگومان ئەو کەماسییە، چونکە تەنها گومان نابێتە هۆی چاکسازی. بەڵکو دەبێت ئەوکەسەی چاکسازی دەکات ئەگەر گومانی لە دروستیی ڕژێمی کۆن هەبوو، ڕژێمێکی نوێ چاکتر لەو دابنێت. کاتێک ئێمە ئەوەیان لە سۆفستە بەعەیب دەگرین، دەبێت ئەوە لەبیر نەکەین کە پرەنسیپێک هەیە دەڵێ:" گومان بنەمای یەقینە". ئەگەر مێژووی هەر بانگەوازێکی ریفۆرمی نوێ بخوێنین، دەبینین بۆ ماوەیەک گومان و سەرسوڕمانی

بەناو خەڵك لە كۆمەڵگا بڵاودەكاتەوە، هەر ئەمەش هەندێكجار بە قۆناغی دامەزراندن ناودەبرێت.

خەڵك ناتوانێ باوەڕ بە ئاینێكی نوێ بهێنێ؛ تەنها ئەو كاتە نەبێت كە گومان لە دروستیی ئەو ئاینە دەكات كە لە باب وباپیرانەیەوە ماوەتەوە، ئەمەش مانای ئەوەیە كە گومانكارەكان بەر لە پێغەمبەرە مەزنەكان دەردەكەون، ئەوانەش گومانەكانیان ڕێگا بۆ بانگەوازی پێغەمبەرەكە خۆش دەكات. مێژووی ئیسلام باسی حەنیفەكانمان بۆ دەكات كە بەر لە بانگەوازی پێغەمبەر محەمەد لە مەككە رقیان لە بتپەرستی بوو گاڵتەیان پێ دەكرد. دەڵێن قورەیش ڕۆژێكیان بۆ ئاهەنگی جەژنێكی بتپەرستی كۆببوونەوەیە؛ چواركەس لەوان لەگەڵ یەكتر قسەیان دەكرد و دەیانگوت" بەخوا بزانن قەومەكەی ئێوە، شتێكی نییە، لە تاریكی دایە. ئەو بەردە چییە لەدەوری كۆدەبینەوە، نابیستێ و نابینێ؛ زیان و قازانجی نییە. لەسەریشی خوێنی قوربانی دەرژێ، ئەی خەڵكینە ئاینێكی دیكە بدۆزنەوە لەو ئاینە باشتر بێت". یەكێكی دیكە لەو حەنیفانە بینراوە كە پشتی خۆی داوەتە دیواری كەعبە و دەڵێ:" خودایە ئەگەر دەمزانی چ ڕوویەك لەلای تۆ خۆشەویستە، ئەوا تۆم دەپەرست، بەڵام نازانم".

هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسان پێیان وایە چاكسازی ئاینی سەرەتا لەمەككە لەسەر دەستی ئەو حەنیفانە دەستی پێكرد، بەڵام محەمەد هات دەستی بەسەرداگرت و پەی خۆی زانی و بەمەش بانگەوازە گەورەكەی ئیسلامی بونیاد دەنێت. من پێموایە ئەو تێڕوانینەی ڕۆژهەڵاتناسان پووچەڵە. ئەوان زیاتر گومانكار بوون، نەوەك بانگخوازی یەقین بن. ئەوان جیاوازییەكی گەورەیان لەگەڵ پێغەمبەر هەبوو. محەمەد وەك ئەوان گومانكار و سەرسام نەبوو، لەڕاستیشدا مێژوو باوەڕدارێكی ڕاستگۆ لە باوەڕ وەك ئەو پیاوە نابینێ، دەگمەن نەبێت. هەڵە نیبێ ئەگەر بڵێین محەمەد لە سەرەتادا سەرسام بوو؛ وەك ئیبراهیمی باوكی پێغەمبەران لە ئاسمانی دەڕوانی، بەڵام هەر كە سروشی بۆهات وەك تیرێك دەرچەوت كە مژدەی ئاینێكی نوێی دەدا،

باکیشی بەوە نەبوو لە ئەنجامی ئەمەدا ڕووبەڕووی چەوسانەوە و سووکایەتی دەبێتەوە.

***

وەک دەردەکەوێت سۆفستەکان لە کۆمەڵگای یۆناندا بەو ڕۆڵە هەڵدەستان کە حەنیفەکان لە مەککە بەر لە هاتنی بانگەوازی محەمەد هەیانبوو. بە گومانەکانیان ڕێگایان بۆ پێغەمبەر خۆش دەکرد، بەڕاستیش ئەو پێغەمبەرە دەرکەوت کە سوکراتی مەزن بوو. وەک زانراوە سوکرات لەسەرەتادا سۆفستایی بوو، دواجاریش هەستی بەوەکرد کە سروشی بۆ دێت، ئەو کاتە بانگەوازەکەی بۆ چاکسازی کرد و هەموو شتێکی لەپێناو کردە قوربانی. تەنانەت هەموو کاروباری خێزانی و کەسیشی لەپێناو بانگەوازەکە فەرامۆش کرد. سوکرات لە ڕێبازی سۆفستە سوودمەند بوو، بەڵام گومانەکانی ئەوانی وەرنەگرت. ئەو باوەڕی وابوو خودا بەسەری زاڵ دەبێت و ڕێگای نیشان دەدا. ئەو باوەڕی ئەوەبوو ئاین ڕێزگرتنی ویژدانێکی بێگەردە بۆ دادپەروەریی خودایی، نەوەک پێشکەشکردنی قوربانی و نوێژ خوێندن و سەرەڕای ئەمەش ئالوودەکردنی دەروون بە تاوان.

من لەوە دەترسم خوێنەر بە زەندیق تۆمەتبارم بکات، چونکە من سیفەتی پێغەمبەرایەتیم بە سوکرات داوە. من تکام لە خوێنەر ئەوەیە باوەڕ بە ئەفسانەی ئیسرائیلییەکان نەکات، کە پێغەمبەرایەتی تەنها لەنێو بەنی ئیسرائیل قەتیس دەکات. لە قورئان ئاماژە بۆ ئەوەکراوە کە خودا بۆ هەر قەومێکی کۆن پێغەمبەرێکی ناردووە. بەدوور نازانرێ سوکرات پێغەمبەر بێت. ئەوەی ژیاننامەی ئەو پیاوە بخوێنێتەوە چەندین خەسڵەتی پێغەمبەرایەتی دەدۆزێتەوە کە لە کەسایەتی ئەو هەبووە. مێژوو باسی ئەو دڵسۆزیی و باوەڕ و قوربانی و سەرقاڵبوونی بە چاکسازیی کۆمەڵایەتیی ئەومان بۆ دەکات، کە دەگمەنە هاوشێوەی لەنێو خەڵک بدۆزینەوە. لە تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەر ئەوەیە کە جیاوازی لەگەڵ مرۆڤی ئاسایی هەیە، لەوەی خودی خۆی فەرامۆش دەکات و لە خودێکی دیکەی فراوانتر دەبتوێنێتەوە. لەوانەیە

ئێمە لە کتێبی داهاتوو بگەڕێینەوە سەر ئەو بابەتە پشتیوان بەخودا،موحافیزکار و توندڕەو و پیاوانی پەرستگەکان لە دژی سوکرات هەڵسانەوە و ژاوەژاویان لە دەوروبەری دروست کرد، ئەمەش بابەتێکە لە ژیانی سەرجەم پێغەمبەران تێبینی دەکرێت، دواجار بینیمان سوکرات دەدرێتە دادگا بە تۆمەتی بێباوەڕیی و نکوڵی کردن لە خواوەندەکان، دادگاش بە خواردنەوەی ژەهرێکی کوشندە دادگایی کرد، بەدڵنیایی ژەهرەکەی خواردەوە دەیزانی ئەو لە دونیای فانییەوە دەچێتە دونیای نەمریی.

سوکرات مرد، بەڵام دەنگدانەوەیەکی مەزنی لە دوای خۆی جێهێشت، خەڵکیش گەڕانەوە سەر یادکردنەوە و باسکردنی چاکەکانی و داتاشینی ئەفسانە لە بارەی سوقراتەوە، وەك زۆربەی خەڵکانی دیکە لەهەموو سەردەمەکانەوە زێدەڕۆیی لەبارەی مەزنی ئەو کرا. ئەو کاتەش ئەفلاتون دەرکەوت، وا خۆی دەردەخست کە قوتابیە دەستپاك و حەوارییە دڵسۆزەکەی سوکراتە، بۆیە دەستیکرد بەنووسینەوەی چەند کتێبێك گوایە ڕێنماییەکانی سوکرات دەقاودەق دەنوسێتەوە.

ئەمڕۆ زۆربەی توێژەران لەو باوەڕەدان کە ئەفلاتون بۆچوونەکانی خۆی دەنووسیەوە دواتر دەیدایە پاڵ سوکرات، بیروڕاکەی خۆی دەنووسیەوە و دەیگوت" سوکرات وتی...هتد." لەمەشدا بە ئەبوهوڕەیرەیە دەچێت کە لەلای معاویە دەژیا و چێژی لە سامانەکەی ئەو دەبینی و کەچی دەیگوت" خۆشەویستم پێغەمبەری خودا بەمنی گوت...هتد."

وەك دەردەکەوێت ئەفلاتون ناوی سوکراتی بۆ بەرژەوەندییە تایبەتەکانی خۆی بەکارهێناوە، لەوانەشە هەوڵی دابێت کوشتنی سوکرات بکاتە بیانوویەك بۆ ئەوەی بەسەر سۆفستە و دیموکراسیەت زاڵ بێت، کە سەختترین دوژمنی ئەو بوون، ئەمەش معاویەمان لە مێژووی ئیسلام بەبیردەهێنێتەوە کە ویستی کراسی عوسمان بکاتە بیانوویەك بۆ گەیشتن بە خەلافەت، ئەوەی لەو ئامانجەش هاوکاری ئەفلاتونی کردووە ئەوەیە کە سوکرات هیچ ڕێنماییەکانی خۆی نەنووسیوە، بەڵکو بەزارەکی

بەناوچەڵکی بڵاودەکردەوە. دواتر ئەفلاتون هات بە خواستی خۆی ئەو ڕێنماییانەی دەنووسیەوە، خۆشی بە تاکە نوێنەری پەیامی سوکرات دەزانی.

ئێمە دەزانین چۆن پەیڕەوکران توانیویانە دەستکاریی پەیامی پێغەمبەرانیان بکەن، سەرەڕای ئەوەی کتێبی نێردراویان هەبووە. ئەفلاتون لەو دەستکارییەش بەتواناتر بووە، چونکە ئەو لە زیرەکی بلیمەت بووە، وەک چۆن معاویە لە زۆرزانی بلیمەت بووە. هەردووکیشیان توانیان بەکراسی شەهید بچنە سەرتەخت. ئەمیان بۆ سەر تەختە بەرزەکەی فەلسەفە سەرکەوت، ئەویتریان بۆ سەر خەلافەتە پیرۆزەکە سەرکەوت. کێ دەتوانێ لەمەباندا مشتومڕیان لەگەڵ بکات، یان بەرپەرچیان بداتەوە؟

یەکێک لە گاڵتەجارییەکان ئەوەیە ئەفلاتون وەها وێنای سوکراتمان بۆ دەکات کە دوژمنی گەورەی سۆفستەکان بووە. هەروەها دەبینین معاویە وەها وێنای عوسمانمان بۆ دەکات گوایە دوژمی عەلی کوڕی ئەبوتالب و ئەو بنەمایانەی شۆڕش بووە کە لەسەردەمی ئەودا دەرکەوتووە. ئەفلاتون بانگەشەی بۆ ئەوەکرد کە ئەو جێگری سوکراتە و لەسەر ڕێگای ئەو دەڕوات. معاویەش خۆی بە جێگری عوسمان زانی و گوایە تۆڵەی ئەو دەکاتەوە. ڕاستیش ئەوەیە هەردووکیان لە بانگەشەکیانیان درۆیان دەکرد.

ئەفلاتون لە سەلیقە و پێکهاتەی کەسایەتی جیاوازی لەگەڵ سوکرات هەبوو. سوقرات بە پەروەردە و باوەڕ دیموکراسیخواز بوو. بەڵام ئەفلاتون ئەرستۆکراتی بوو، کۆیلەی هەبوو. من وادەزانم ئەفلاتوون بووبێ قەڵەمەکەی دەستی بەهەڵ زانیوە بۆ ئەوەی وێنەی سوکرات بەخواستی خۆی بکێشێ و گوایە وەک ئەو خانەدان بووە، ڕقی لە خەڵکی نەدار و ڕووت و ڕەجاڵ بووە و مەیلی بەلای بەرزیی هەبووە.چەندین بەڵگەی مێژووی وا لە من دەکات بڵێم سوکرات لە بنەمای ڕێنماییەکانی جیاوازی لەگەڵ ئەفلاتون هەبووە. وەک چۆن عوسمان جیاوازی لەگەڵ معاویە هەبووە.

من ئەو بەڵگانە بەخوێنەر دەدەم و بڕیاریش بۆ ئەو جێدەهێڵم:

١-سوقرات لە دڵ و دەروون رەوتێکی میللی هەبوو. ئەو هەژار بوو لە خێزانێکی هەژاریش لەدایك بووبوو. باوکی پەیکەرتاش و دایکی مامان بوو. تا مردیش هەر هەژار بوو. هەردەم پەیوەندی بە پیاوی شەقام هەبوو؛ بایەخی بە بەرژەوەندییەکانی ئەو جۆرە خەڵکە دەدا. لەمەیادا جیاوازی لەگەڵ ئەفلاتون هەبوو. ئەفلاتون لە رووی رەچەڵەك و سەلیقە خانەدان بوو. دەوڵەمەند بوو خاوەنی کۆیلە بوو. زۆر رقی لە خەڵکی عەوام و دیموکراسی بوو. بانگەشەی بۆ لەناوبردنی سیستەمی دیموکراسی وڵاتەکەی دەکرد. داوای ئەوەی دەکرد کەمینەی خاوەن عەقڵی باڵا دەسەڵات بەدەستەوە بگرن. لە ئەفلاتون دەگێڕنەوە کە گوتویەتی" سوپاسی خواوەند دەکەن منی بە گریکی دروستکردووە، نەوەك بەربەر. ئازادی کردووم نەوەك کۆیلە. بەپیاوی دروستکردووم نەوەك ژن. لەسەرووی ئەمانەشەوە لە سەردەمی سوکرات منی دروستکردووە". من لەو بڕوایەدام ئەفلاتون رستەی کۆتایی بۆ ئەوە گوتووە خۆڵ بکاتە چاومان.

ئەفلاتون قوتابخانەیەکی تایبەت بە خۆی لە نزیك بێستانی ئەکادیمۆس دروستکردبوو؛ هەر بەئەکادیمیاش ناسرا، پەرستگەیەکی تێدا دروستکردبوو تایبەتی کردبوو بە خواوەندەکانی شیعر. لەوەدا جیاوازی لەگەڵ سوکرات هەبوو؛ خەڵکی لە بازارەکان فێردەکرد و نکوڵی لە خواوەندەکانی کۆن دەکرد بە هەموو جۆرەکانیانەوە. زۆرجاریش بینراوە شتی خواردووە، لە هەمان کاتدا گفتوگۆی لەگەڵ قوتابیانی کردووە.

٢-سوکرات تا ئەوپەڕی سیمایەکی دزێوی هەبوو. سەری کەچەڵ بوو؛ لوتی پان بوو؛ چاوەکانی قوڵ بوون، ئەوەی دەیبینی وایدەزانی حەمباڵە. بەڵام ئەفلاتون جوان و شیك بوو؛ سەرەڕای ئەمەش پێی وابوو جوانی روخسار بەڵگەیە بۆجوانی ئاکار. ئەمەش وەك کەسانی دیکە بوو کە لە هەموو سەردەم و شوێنێك وەهان. نازانم چی لە بارەی دزێویی سوکرات دەڵێ کە خۆی دەکاتە جێگری ئەو.

٣- ئەو فەیلەسووفانەی بەر لە سەردەمی سوکرات ژیاون، بەو هەقیقەتانەی دوای گەڕدوونەوە سەرقاڵبوون، کە هیچ پەیوەندی بە بەرژەوەندییەکانی مرۆڤەوە نەبوو، هیچ پەیوەندی بە کێشە و خەمەکانیان نەبوو. بەکێکیان دەگێڕێتەوە کە تالیس بەدەم ڕۆیشتنەوە دەیڕوانییە ئاسمان، بێ ئاگا کەوتە ناو بیرێکەوە. واتە ئاسمان لە بینینی ئەو زەوییەی لەسەری دەڕوات بێئاگای کردبوو. ئەمە چیرۆکێکی سیمبول ئامێزە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە فەیلەسووفان بە وەهمەکانی جیهانی سەرەوە سەرقاڵ بوون و کێشەکانی جیهانی خوارەوەیان لەیاد کردبوو. بەڵام کاتێک سوکرات هات ئەوا فەلسەفە لە ئاسمانەوە هێنایە سەرزەوی. داوای دەکرد توێژینەوە لەبارەی مرۆڤ و بەرژەوەندییەکانی بکرێت، لە بری ئەوە تێڕامان لەو هەقیقەتە ئایدیالانە بکرێت کە هیچ سوودێکی بۆ مرۆڤ نییە.

کەچی ئەفلاتون دووبارە گەڕایەوە سەر گەڕان لەئاسماندا. جیهانە ئایدیالەکەی خۆی داهێنا کەپێی ناسراوە. گومان لەوە دەکرێت ئەو بیروڕا میسالییانەی داویەتە پاڵ سوکرات بیرۆکەکانی خۆی بن. کە تائێستاش ئەو ئایدیالە بەئایدیالی ئەفلاتون دەناسرێت.

٤-ئەفلاتون تووشی لادانی سێکسی بوو، خوا لێی خۆش بێت. لەگەڵ هەندێک لە فوتابییەکانی وەك غیلمان جووت دەبوو. ئەفلاتون بەدرێژایی ژیانی هاوسەرگیریی نەکرد. لەوانە ڕقی لە ئافرەت بووبێت. کەچی سوکرات هاوسەر و سێ منداڵی هەبوو، بە سەبرێکی گەورەوە بەرگەی زمان و کڕوزانەوەی ژنەکەی دەگرت. لەمەیاندا ئەو لە پێغەمبەر لوت (لوط)دەچێت. کێ دەزانێ لەوانەیە خودی لوت بێت. وەك زانراوە هاوسەرەکەی لوت وەك هاوسەری سوکرات دەمشڕ بووە، قورئانیش ئاماژەی بۆ ئەمە کردووە.

سەیر ئەوەیە گریك لە سەردەمی سوکراتدا وەك قەومی لوت لە رووی سێکسەوە تووشی لادانێکی سەیر بووبوون. مێژوونووسان باسی جۆرێك لە لادانی سێکسی دەکەن لەو شێوەیە بووە کە ئایینییەکان لە قەومی لوتی دەگێڕنەوە. مێژوو

نەتەوەیەکی بەخۆیەوە نەدیوە، بەقەد گریکی کۆن لادانی سێکسیان هەبووبێ، تەنانەت لادانی سێکسیان بە هۆکارێکی پیاوەتی راستەقینە دەزانی. زەواجکردن لەگەڵ غیلمان باوبووە. ئەنگ بووە کوڕێکی خانەدان خۆشەویستی پیاوی نەبووبێت، پیاو چاکەکانی خۆی لە ڕێگای زەواجی شازەوە بە خۆشەویستەکەی دەدا. وا خەیاڵ دەکەم، سوکرات بەرەنگاری لادانی سێکسی بۆتەوە لەناو قەومەکەی خۆیدا. کاتێکیش مرد ئەفلاتوون بە هەوسی خۆی وێنای سوکراتی کردووە کە لەگەڵ سەلیقەی خۆی و قەومەکەی بگونجێ. لەوانە ئەویش بە لادەری سێکس دانا بێت – خودایە پشت و پەنامانی–.

من مەیلم بەلای ئەو بیروڕایە هەیە، بانگەشەی ئەوەش ناکەم کە ڕاستم. لەوانەیە هەندێك زیدەڕۆییم کردبێت، یان هەڵە بم، من حەز ناکەم قسەیەك بکەم، بڵێم جێگای مشتومڕ نییە، یان گومانی تێدانییە، وەك ئەوەی ئەفلاتونییەکان لە نووسین و خوتبەکانیان باسی دەکەن.

***

لەوانەیە ئەفلاتون فیساگۆرسی بێت زیاتر لەوەی سوکراتی بێت. ئەو دەستکاری ڕێنماییەکانی سوکڕاتی کردووە بۆ ئەوەی لەگەڵ بنەماکانی خۆی گونجاو بێت کە ڕێبازی فیساگۆرسی بووە و بانگەشەی بۆکردووە. وەك زانراوە ئەفلاتوون زۆر بەو ڕێبازەوە سەرقاڵ بووە، سەردانی باشووری ئیتاڵیای کردووە، چونکە لەوێ ئەو ڕێبازە بەربڵاوبووە. هەر لەوێش پەیوەندی بە ڕێبەرانی ئەو ڕێبازەکردووە وەدۆستایەتی لەگەڵ ئەوان پتەوکردووە. کۆنفۆرد دەڵێ: "سەرچاوەی سەرەکی کە ئەفلاتوون فەلسەفەکەی خۆی لێوەرگرتووە، ڕێبازی فیساگۆرسی بووە". بڕوای ئەوەمان هەیە کە ڕێبازی فیساگۆرس زیاتر لە ڕێبازی سوکرات لە ئەفلاتوون نزیك بووە، چونکە فیساگۆرس لە پەیڕەوکارانی ئایینی ئورفی کۆن بووە. لەوێشەوە تیپێکی سۆفیگەری دامەزراند، هەوڵی دەدا لەگەڵ هەندێك لە قوتابیانی کۆشەگیر بێت بۆ ئەوەی هەندێك کەشی ئایینی نامۆ ئەنجام بدەن. ئەگەر ناوئۆنی ئەو کەشە

ئاینییە بکەین کە بەپێی ڕێبازی فیساگۆرسی بووە لەڕۆژگاری ئەفلاتون باوبووە، دەبینین لێکچوونێکی سەیری هەیە لەگەڵ ئەو کەشەی کە کۆمەڵەی پەزیدی هەیانبووە، ئەوکات دەبوایە کەسی فیساگۆری ڕێگری لە کۆمەڵێک کار بکات، لەوانە:

١-خواردنی پاقلە.

٢-هەلگرتنەوەی ئەوشتانەی کەوتونەتە سەر زەوی.

٣- گرتنی کەڵەشێری سپی.

٤-پارچە نان.

٥-جوڵاندنی ئاگر بە ئاسن.

٦- ڕنینی سیر.

٧- ڕۆیشتن لەڕێگای گشتی.

٨- خواردنی دڵ.

٩-سەیرکردنی ئاوێنە لە تەنیشت ڕووناکی.

١٠- نیشتەجێبوون لەژێر سایبەیەک،کە باڵندەی سندی و هیندی تێدا بێت و چەندین خاڵی دیکە.

دەتوانرێت بگوترێت لە دوای مردنی فیساگۆرسی ڕێبەر، زیندەڕۆیی لەباوەڕ و ڕێورەسمەکانی کرا، وەک چۆن پەزیدییەکان دوای مردنی شێخەکەیان عودەی کوڕی موسافیری ئەمەوی زیندەڕۆییان کرد، بەلام زیندەڕۆیی پەیڕەوکارانی فیساگۆرس نەبووە ڕێگر لەوەی ئەفلاتون پێیان سەرسام بێت و سەرقاڵی پرەنسیپەکانیان بێت. ئێستا بۆ خوێنەر لە چەند خاڵێکدا ئاماژە بە بوونی پەیوەندییەکی فیکری دەکەین لە نێوان ڕێبازەکەی فیساگۆرس و ئەفلاتون:

١-فیساگۆرس ڕقی لەو جیهانە واقعییە بوو کە تێیدا دەژیا، بەرووکەش و فریودەری دەزانی. وتی: "مرۆڤ لەو دونیایەدا نامۆیە و جەستەش زیندانی ڕۆحە. ئەرکی فەیلەسووفی ڕاستەقینەش ئەوەیە بەسەر ئەو جیهانە نزمە بەرز بێتەوە." هەر لەبەرئەمەش گرووپێکی سۆفیگەریی دروست کرد، کە قوتابیان لەگەڵ مامۆستاکەیان

دەژیان و کاتی خۆیان بۆ خۆڕۆشنبیرکردن تەرخان کردبوو، دوور لە خەمی کۆمەڵگا و شتە پووچەکانی .

پرۆفیسۆر زیلەر دەڵێ: ئەفلاتون لەسەر شێوەی قوتابخانەکەی فیساگۆرس ئەکادیمیای دروست کرد، ئەمەش یەکەم قوتابخانەیە لە مێژووی مرۆڤایەتی دروست بکرێت. ئەفلاتون چەندین ساڵ لەگەڵ قوتابییەکانی لەو قوتابخانەیە لە کەشێکی تەواو فەلسەفی دەژیا. ئەفلاتون وازی لەو ڕێگایەی سوکرات هێنابوو کە لە بازاڕەکان بخولێتەوە و قسە لەگەڵ خەڵکی عەوام بکات. لەولەشە ئەو لادانە سێکسییەی هەیبووە وایکردووە حەز بکات لەگەڵ قوتابییەکانی دوور لە کۆمەڵگا گۆشەگیر بێت. گاڵتۆکەکانیشی لەگەڵ ئەوان بکات بەداب و دینێک.

٢-فیساگۆرس یەکەم کەس بوو کە وشەی (فەلسەفە)ی داناو وتی:" من دانا نیم، دانایی تەنها بۆ خوداوەندە. بەڵکو من فەیلەسووفم". سەیر ئەوەیە دەبینین ئەفلاتون ئەو وشەیە دەداتە پاڵ سوکرات، ئەمەش بۆ تووڕەکردنی سۆفستەکانە. وشەی (سۆفستایی) لە زمانی گریکی بەمانای دانا(حکیم) دێت، کەچی وشەی (فەیلەسووف) بەمانای( ئەو کەسەی دانایی خۆشدەوێت) دێت. بەمەش ئەفلاتون توانی سیفەتی لەخۆبایی بە سۆفستەکان بدات، لەبەر ئەوەی خۆیان بە داناکان ناوبردووە.

٣- فیساگۆرس باوەڕی بە جیهانی ئایدیاڵ هەبوو، وەک چۆن دواتر ئەفلاتون باوەڕی پێبوو. بەلام فیساگۆرس وەها وەسفی ئایدیاڵی کردووە کە بریتیی بێت لە ژمارەکان کە لە دونیایەکی دیکە بوونیان هەیە و بوونەکانی ئەو دونیایەشمان لاسایی ئەو دەکەنەوە. کە ئەفلاتون هات هەنگاوێک دوورتر ڕۆیشت، چونکە ئایدیاڵی بە بیرۆکەی ڕەها دانا. ئەمەش ئاشاردرێتەوە کە لێکچوونێک لە نێوان ژمارەکان و بیرۆکە ڕەهاکان هەیە. دەشگوترێت ئەفلاتون لەکۆتایی ژیانیدا ئیعترافی بەوە کرد کە ئایدیاڵ هەر خودی ژمارەکانە.

٤-فیساگۆرس لە بواری ماتماتیکی کارامە بوو، تەنانەت یەکێک لە تیۆرە ئەندازەییەکان تا ئێستاش بەناوی ئەو ناسراوە. فیساگۆرس نازناوی "گوێدرێژ" بوو، ئەمەش لەبەر سەبر و خۆڕاگری ئەوبوو، لە بواری توێژینەوەی ماتماتیکی. فیساگۆرسییەکان ماتماتیکیان دەکردە هۆکارێك بۆ ئازادکردنی دەروون و پاکردنەوەی لە وەهمەکانی هەست.

ئەفلاتونیش سەرقاڵی ماتماتیك بوو، هەربۆیەش لە دەروازەی ئەکادیمیاکەی نووسیبووی" تەنها ئەوانەی ماتماتیك دەزانن دەچنە ژوورەوە". ئەگەر سەیری لۆژیکەکەشی بکەین کە دواتر بەناوی ئەرستۆی قوتابی ناسرا، ئەوا دەبینین زیاتر لە چەمکی هاوکێشە بیرکارییەکان نزیکە نەوەك چەمکی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان.

***

لێرەدا دەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکرێت ئەو لۆژیکەی ئەرستۆتالیس کە ئەفلاتون لە دیالۆگەکانی باسی کردووە، سەرەتاکەی لەسەر دەستی پارمنیدس بووە. پارمنیدس لە هەندێك بنەما فەلسەفەکانی فیساگۆرسیی بوو. بڕواشی وابوو هەقیقەت ئەزەلی و چەسپاوە، گۆڕانکاری قبوڵ ناکات، هەر گۆڕانکارییەکیش رووبدات ئەوا خاڵییە لە هەقیقەت. ئەفلاتون زۆر بەو بیروڕایە سەرسام بوو، چونکە ئەو هەوڵی دەدا بۆچوونی سۆفستەکان لەناو بەرێت کە باوەڕیان بەگۆڕانی هەقیقەتەکان هەبوو.

لێرەوە دەتوانین بەو ئەنجامە بگەین کە لۆژیکی سۆفستایی کۆمەڵایەتی بوو، کەچی لۆژیکی ئەرستۆ ماتماتیکی بوو. جیاوازییەکی زۆریش لە نێوان لۆژیکی ژمارە و لۆژیکی مرۆڤ هەیە. چونکە هەقیقەتەکانی ماتماتیك نەمرن و بۆ هەموو کات و شوێنێك دەبێت، کەچی هەقیقەتە کۆمەڵایەتییەکان لە گۆڕاندان، ئەوەی بۆ ئەمڕۆ دەگونجێت، سبەی گونجاو نییە. ئەفلاتونییەکان هەوڵیان داوە مرۆڤ بە ژمارەکان پێوانە بکەن، ئەوەیان لەبیرکردووە کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەریاییەکە تەژییە لە شەپۆلی رکابەری و ئارەزووی جیاواز. بۆیە لە توێژینەوەدا پێویست بە میتۆدێکی

تایبەت هەیە، کە لە بنەڕەتەوە جیاواز بێت لە میتۆدی ژماردن و کۆکردنەوە و کەمکردن.

برگسون دەڵێ:" لۆژیکی ماتماتیکی ناتوانێت درك بە هەقیقەتی گۆڕانکاری و بزاوی مەبەستدار ئامانجدار بکات. ئەو لۆژیکە هەقیقەت دەکاتە چەند بەشێکی پەرتوبڵاو، یان بۆ چەند رەگەزێکی سەرەتایی شییان دەکاتەوە. بەمەش هارمۆنیکیی و تەواوکارییە شاراوەکەی نێوانیان لەدەست دەدات. لە جیهانی ژمارەکان ۲+۲ یەکسانە بە ٤، بەڵام لە جیهانی دەروونی دەکات بە ۳ یان ۷ یان ۱۵ یان ژمارەی دیکە. کارلێکردنی کۆمەڵایەتی رەگەزێك بە تاکە بەشداربووەکانی خۆی دەدا، کە پێشتر ئەو رەگەزە بوونی نەبووە. هیچ و پووچیشە ئێمە وەها سەیری دیاردە کۆمەڵایەتییەکان بکەین کە چۆن بازرگانێك سەیری حسێب و ژمارەکانی خۆی دەکات.

نکۆڵی لەوە ناکەین ئەفلاتوونییەکان لە توێژینەوە ماتماتیکیەکانیان سەرکەوتوو بوون، بەڵام زۆر سەیر لە توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکانیان فاشل بوون. لە زانستی جەبر و سێگۆشەناسی و ئەندازە بە پلەیەکی مەزن گەیشتن. کەچی لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان ئاستێکی زۆر نزمیان هەبوو، وەك ئەوەی لە بازنەیەکی بەتاڵ بخولێنەوە. بۆیە شیاوە ئەگەر بیرکردنەوەی کۆن بە شەل وەسف بکەین، چونکە لەسەر یەك قاچ دەڕوات. جارێکیان هەندێك لە نووسینەکانی خەواجە نەصیرەدینی توسیم خوێندەوە کە گەورە فەیلەسوفێکی سەدەی حەوتەمی کۆچییە. تووشی شۆك بووم کاتێك چەندین قسەی بڕوپووچم بەناوی زانستی کەلام خوێندەوە. وەك دەزانین ئەو فەیلەسووفە لە سێگۆشەناسی گەیشتە پلەیەك کە زانانیانی سەدەی بیستەمی سەرسام کردووە.

***

گوتمان و دووبارەشی دەکەینەوە کە فیکری مرۆڤایەتی بە مردنی سۆفستە و سەرکەوتنی لۆژیکی ئەفلاتونی تووشی زیانێکی گەورە بوو. ئەگەر سۆفستە مابووایە

وەك پێشتر بانگەشەی بۆ لۆژیکی ڕێژەیی و گۆڕان دەکرد، ئەو کاتەش گزمەکانمان بەو شێوەیەی ئێستا نەدەبینی. بەهەرحاڵ ئێمە ناتوانین نکۆڵی لە بلیمەتیی ئەفلاتون و بیرۆکە مەزنەکانی بکەین. ناشتوانرێت لەو خزمەتەی ئەفلاتون کەم بکەینەوە کە لە پێناو پێشکەوتنی فەلسەفە ئەنجامی داوە. لەگەڵئەوەشدا دەڵێین ئەفلاتون فیکری مرۆڤایەتی تێکدا زیاتر لەوەی خزمەتی بکات.

ئەفلاتون لەمێژوودا یەکەم دانەر بوو، بەو مانایەی ئەمڕۆ تێیدەگەین. کتێبەکانیشی تا ئەمڕۆ ڕێگایەکە هانی خوێنەرانی دەدا بۆ ڕامان و بیرکردنەوەی قووڵ. سەرەڕای ئەمەش دەتوانین ڕەخنەی ئەوە لە ئەفلاتون بگرین کە ئەو مرۆڤی لە تێڕوانینی دیوەکەی دیکە بێبەش کردووە. ئەو قەڵەمە بلیمەتەکەی ناوی سۆفستەی زڕاند و هانی خەڵکی دا بۆ ئەوەی ڕقیان لەو فەلسەفەیە بێت. بەمەش لایەنێکی هەقیقەتی دۆڕاند کە گاڵتە نەبوو. یارودۆخەکان هاوکاری ئەفلاتونیان کرد قەڵەم بۆ خۆی و پەیڕەوکارانی قۆرخ بکات. چ لەوە دزێوتر نییە قەڵەم لە دەستی دوژمنێکی مەزن بێت.

سۆفستەکان لەسەر دەستی ئەفلاتون و قوتابیەکانی زۆر سەیر تووشی شکست بوو. ئەو کتێبانەش لەناوچوون کە ئەوان نووسیبوویانە. ئێمە ئەمڕۆ شتێکیان لەبارەوە نازانین، تەنها لە کتێبی نەیارەکانیانەوە نەبێت. قوربەسەر ئەو ژێردەستەی دەنگی نییە. لە ئەنجامی ئەمەشدا کتێبەکان تەژی بوون لە زەمکردنی سۆفستەکان. خەڵك تەنها بەقێزەوەن باسیان دەکەن، ئەگەر ئەوان بیانەوێ ڕەخنە لە بیروڕایەك بگرن کە ڕقیان لێیەتی دەڵێن: ئەو سۆفستاییە، تف، خوا ڕووی ڕەش بکات!

***

بیرکردنەوەی مرۆڤایەتی تائێستاش پێویستی بەدوو جۆر بۆچوون هەیە، ڕکابەریی کار لە یەکتر بکەن. ئەوانیش: بیروڕا ئەفلاتونییەکان و بیروڕای سۆفستەکانە. ئەوەیان بەرەو ئاسمان هەڵدەکشێ، ئەویتر بەرەو زەوی دادەبەزێ. لەمەشدا ماهیەتی هەقیقەت لە هەردوو یوو بۆ مرۆڤ دەردەکەوێت. بەڵام زاڵبوون بەسەر

لایەنێك و هێشتنەوەی لایەنێك، ئەوا لەنێوان قوتابخانە زانستییەكان هاتوچۆ دەكات، هەر یەكەیان لایەنێك بۆ خۆی قۆرخ دەكات. ئەمەش بابەتێكە پاڵ بە عەقڵە بەرزەكان دەنێت بەرەوهەورەكان بچن، بێ ئەوەی تۆزێك دابەزێ بۆ ئەوەی بزانێ ژیانەكەی ئێمە چییە و كێشەكانمان چین.

ئەفلاتون توێژینەوەی تیۆریی لە شەقامەوە بەرەو ئەكادیمیا برد، بەمەش لە ژیانی كۆمەلایەتی جیاكردەوە و وایكرد بەفیز بێت و خۆی لەسەرەوەی خەڵكەوە بدۆزێتەوە. بەمەش قوتابیانی زانست لوتبەرز بوون، وادەزانن دەبێت زانست لەوە بەرزتر بێت كە بە كێشەی خەڵكەوە سەرقاڵ بێت. ئەگەریش بیرمەندێك بۆ ئاستی خەڵك دابەزێ ئەوە رقیان لێدەبێتەوە و بە دوژمنێكی هێلبارێ دەزانن. قوتابیانی زانست یان ئەكادیمییەكان دەستیانكرد بە داتاشینی چەندین زاراوەی بریقەدار كە پەیوەندیان بەژیانی كردارییەوە نییە، لە نموونەی زاراوەی هیول و كول و میتافیزیكی و چەندانی دیكە. خەڵكی عەوامیش لە ئاست ئەوان بەسەرسامییەوە دەمیان دەكرایەوە، ئەوانیان بەرەمزی گەورە دەزانی كە گوایە نهێنییەكانی گەردوونیان هەلگرتووە. دواتر خۆشگوزەرانەكان هاتن هانی ئەو هەڵپەرستییەیان دەدا، وەك هۆكارێكیان بەكاردەهێنا بۆ فریودانی عەقڵی خەڵك بۆ ئەوەی بەلا و بەدبەختی لە خۆیان دوور بكەنەوە. هەرچەندە بیرمەندانیش هەڵپەرستیان زیاتر دەبوو، ئەوا خۆشگوزەرانەكان رێزیان زۆرتر بۆ دادەنا.

تا ئێستاش عەوامی خەڵك بەو رەوتە ئەفلاتونییە كاریگەرن. ئەگەر گوێبیستی قسەی ناڕۆشن بن كە پڕ بێت لەو زاراوانەی ئەوان تێیان ناگەن، ئەوا بە هێمای رەوانبێژی بەرز و فەلسەفەیەكی بالای دەزانن. رۆژێكیان پیاوێكم بینی گوێی لە خەتیبێك گرتبوو، زۆر پێی سەرسام بوو. پرسیارم لێكرد" چی تێگەیشتی؟" بە بێومێدی وتی:" ئایا دەتوانم لەوە زاناتر مەزنە بكەم؟" ئەو بەستەزمانە وادەزانێ مەرجەكانی بیرمەند ئەوەیە لە قسەكانی ناڕۆشن بێت. ئەگەر هاتوو قسەكانی رەوان بوون وگوێگران بە ئاسان لە ماناكەی گەیشتن، ئەوا پێگە مەزنەكەی لەدەست دەدا.

سۆفستەکان هەژار بوون، هەر کەسێکیان فێر دەکرد کە پارەیەکی دەدا. ئەوان لەوەدا لە ئەفلاتون جیابوون. چونکە خۆشگوزەران و دەوڵەمەند بوو کۆیلەکانی شەو و ڕۆژ کاریان دەکرد بۆ ئەوەی بژێویەکی ئەو و زەوەند بۆ ئەو دابین بکەن. سۆفستەکان زانستیان کردبووە پیشەیەک هاوشێوەی دارتاشی و ئاسنگەری. ئەفلاتون و خۆشگوزەرانەکانیش لەمە تووڕە بوون. ئەوان دەیانەوێ بە زاراوە بریقەدارەکانیان لە خەڵکی عەوام جیاببنەوە، وەک چۆن بە ماڵ و پۆشاکیان جیاوازن. پرۆفیسۆر ڤیبلن ئەوەی ڕوونکردۆتەوە کە چۆن چینی دەسەڵاتدار هەموو هەوڵێک دەدات بۆ ئەوەی هەندێک دیاردەی ئاڵۆز بۆخۆی دابهێنێت، تا عەوامی خەڵک نەتوانن لاساییان بکەنەوە. بەمەش ئەو چینە هەست دەکەن ئەوان بەرزن و خەڵکیش پاشکۆی ئەوانن، خەڵکیش بیئەوەی هەست بە پیلانێک بکات وا بیردەکاتەوە.

سۆفستەکان خاوەن لۆژیکی دیموکراتی بوون، لە کتێبی رابردووشدا ئەم لۆژیکەم بە " لۆژیکی کرێکار و کۆیلەکان " ناوبرد. ئەو لۆژیکە لەگەڵ ژیان بەڕێوات و لە ڕەوتەکانی دەگات، بەرەنگاری لۆژیکی کۆشکی بلورینیش دەبێتەوە کە خۆشگوزەران و خاوەن کۆیلەکان وەریانگرتووە. یەکێک لە گاڵتەجاڕییەکانی عەقڵی مرۆڤایەتی ئەوەیە عەوامی خەڵک لە گریک رقیان لە لۆژیکی سۆفستەکان بوو، وەک چۆن ئەفلاتون رقی لێبوو. کێشەی خەڵک ئەوەیە زۆرجار لەگەڵ خۆشگوزەرانەکان ڕێگا دەگرن و پێچەوانەی بەرژەوەندی خۆیانن. وەک ئیمام عەلی وەسفی کردوون " ئەوان لەگەڵ هەموو قیڕەیان قیڕە دەکەن و لەگەڵ هەر بایەک دەچەمێنەوە". ئەفلاتونییەکان ئەوانیان فریو دا، ئەوانیش بەدوای هەموو هەڵپەرستێک دەڕۆیشتن، گوایە ئەوان لەدوای کەسانێک دەڕۆن ڕێگای ڕاست و دروستیان گرتووە. لیفنگستۆن دەڵێ: " سۆفستەکان زانستیان سادە دەکردەوە و لەنێو خەڵکیان بڵاودەکردەوە لە شێوەی ( زانست بۆ ملیۆنان کەس) کە ئێستا لە سەردەمی ئێمەدا باوە." کەواتە ئەوان لە شێوەی ویلز و هکسلی و هیوز و چەندین نووسەری دیکەی زانستی بوون

کە کتێبی باویان لەوسەردەمەمان نووسیوە. بۆیە موحافیزکار و توندڕەوەکان ڕقیان لەسۆفستەکان بوو، ئەفلاتونیش ڕێگای ئەواني بە بریقەدار و پوچەڵ دەزانی.

سەدەی نوێ زانستی بۆ ئاستی خەڵك دابەزاند. زانستی کردە پیشەیەك لە پیشەکان؛ ئەمەش وەك ئەوەی سۆفستەکان لە کۆندا ئەنجامیان دابوو. زانستیش سوودبەخش نابێت ئەگەر تەنها نزم بێت و لەگەڵ خەڵك لە بازاڕ وماڵ وکۆڵانەکانیان بڕوات. بۆیە دەبینین پەروەردەی نوێ زیاتر قوتابیان بەرەو خوێندنەوەی کۆمەڵگا دەبات زیاتر لەوەی قوتابیان زاراوە بریقەدارەکان ئەزبەر بکەن، کە هیچ سوودێکی لە ژیانیان نییە.

بیرمەندی نوێ سادەیە، گوێی لە خەڵك دەگرێ، بەتەواوی چین و سەلیقەکانیانەوە. هەوڵ دەدا لە نهێنی شاراوەی دوای کاروبارەکانیان بگات. بەڵام بیرمەندی کۆن کاتێك بەناو خەڵك تێدەپەڕی لوتی خۆی دەگرت و دەیگوت" خوا ئەو ئاکارە نزمە لەناو ببات" ئەگەر دەیبینی هاوڕێیەکی لە شێوەی سۆفستەکان تێکەڵی خەڵك دەبێت ئەوا ڕەخنە و گلەیی ئاراستەی ئەو هاوڕێیەی دەکرد. ئەگەر تاوتوێ هۆکاری ئەو جیاوازییەی نێوان بیرمەندی کۆن و بیرمەندی نوێ بکەین، دەبینین جیاوازییەکە لەوەدایە خەڵك لە ژیانی سیاسی خۆیانەوە لە قۆناغی ستەمکارییەوە چونەتە قۆناغی دیموکراسی. بیرمەندی کۆن لە نزیك ستەمکارەکان دەژیا. ئەو نەیدەتوانی کتێبێك بنوسێ؛ مەگەر یەکێك لە خۆشگوزەرانەکان لەخۆی بگرتایە و بەخششی پێ بدایە. بەڵام لە سەردەمی دیموکراسی نوێدا وێنەکە ئاوەژوو بووە، نووسەر چاوی لەسەر ڕەعیەتە، بۆیە دروشمی بیرمەندی نوێ ئەوەیە ڕەخنە لە دەستەڵاتداران بگرێت و کارەخراپەکانیان ئاشکرا بکات بۆ ئەوەی بەختی لەلای خوێنەران هەبێت.

ئەگەر بگەڕێینەوە ئەو سەردەمەی کە سۆفستە لە وڵاتی گریك بڵاوبۆتەوە، ئەوا دەبینین دیموکراسیەت بەشێوەیەك لە شێوەکان بوونی هەبووە. وەك زانراوە وڵاتی گریك ئەو کاتە یەکەم ئەزموونی دیموکراسی لە مێژوو دەبینی. ئەو جۆرە

دیموکراسیەش وەك ئەوەی ئێستامان نەبووە. لەگەڵ ئەوەشدا لە سیستەمی کارگێڕی وسیاسی و دادوەریی دا پەیڕەوی هەندێك ڕێسای ئازادی دەکرد جیاواز بوو لەو سیستەمەی کۆمەڵگای کۆن بە سیاسەتی شمێشێر پەیڕەوی دەکرد. ئەوکاتە دادگا میللیەکان بڵاوبووبوونەوە، ڕکابەری لە نێوان خەڵك توند بوو، جەدەل یاسایی و پەرلەمانی و فەلسەفی دەرکەوتنێکی سەیریان هەبوو. بەمەش سۆفستەکان بوارێکی فراوانیان بۆ خۆیان دۆزییەوە. پیشەی فێرکردنی جەدەلیان بە هەموو شێوەکانی دەزانی. بەمەش داهاتێکی باشیان هەبوو.

سۆفستەکان بەسێ بابەت خەریك بوون:

١- سادەکردنەوەی زانست و بڵاوکردنەوەی.

٢- هونەری سیاسەت و جەدەلی پەرلەمانی.

٣- فێرکردنی هونەری پارێزەری و بەڕێوەبردنی داوا لە دادگاکان.

ئەوان مەشقیان بە قوتابیەکانیان دەکرد بۆ ئەوەی فێری جەدەلێك بن، پاڵپشتی هەر بۆچوونێك بکەن و هەر بۆچوونێکیش پوچەڵ بکەنەوە. ئەوان دەیانگوت" لەبەر ئەوەی هەقیقەت ڕێژەییە، کاتێك هەقیقەت لەلای تۆ گونجاو بوو، ئەوا لەلای بەرامبەرەکەت گونجاو نییە. کەواتە تۆ شایەتی ئەوەی کاراسەبی لە داکۆکی هەر بیروڕایەك کە تۆ بە گونجاوی دەزانی، جا ئەو بیروڕایە هەرچییەك بێت". ئەم ڕێبازەش ئەفلاتونییەکان توڕە دەکات، بۆیە بەچەندین شێوە وەسفی دەکەن. ناشزانن ئەوان لە ڕووی پراکتیکییەوە پەیڕەوی ئەو جەدەلە دەکەن، کەچی لە ڕووی تیۆرییەوە نکۆڵی لێ دەکەن. لەوانەیە بگونجێ بڵێین سۆفستەکان یەکەم کەس بوون بنەمای پیشەی پارێزەرییان دانا، کاری پارێزەرییش لەڕاستیدا تەنها جۆرێکە لە سۆفستەیی. پارێزەر هێندە جۆری داواکەی بەلاوە گرنگ نییە. بەڵکو ئەو بڕە پارەیەی لەلا گرنگە کە لە بڕی داکۆکی وەری دەگرێت. واتە بایەخ بەوە نادات خاوەنی داواکە لەسەر هەق یا ناهەقە، بەڵکو پرسیار لەو بڕە پارەیە دەکات کە وەریدەگری.

لێرە شایەنی ئاماژە کردنە نابێت بە هەندێك پارێزەر باوەڕ بکەین، کە خۆیان بە هەقخواز دەزانن. ئەوان درۆ دەکەن، کردار ورەفتاریان یەك نییە. پیشەکەیان وادەخوازێ ئەوا داکۆکی لە تێڕوانینی بریکارەکەیان بکەن، بەڵام مەسەلەی هەق و هەقیقەت ئەوا دواتر دێت. پارێزەریش لەوەدا ستەمکار نییە؛ شایەنی گلەییش نییە، چونکە وەك باوە لە هەر کێشەیەکی دادگا، لەهەر لایەکەوە پارێزەرێك یان چەند پارێزەرێك هەبێت. دواتریش دەبێ دادوەر سەیری بەڵگەکانیان بکات و دواجاریش لەسەر بنەما بێلایەنی و دادوەری بریار بدات. ئەمەش وای لە حکومەتە نوێیەکان کردووە پارێزەر بۆ کەسانی هەژار بگرن، مەبەستیش ئەوەیە دادوەر سەیری هەموو لایەنەکانی کێشەکە بکات. یەکێك لە کەموکورییەکانی دادوەر ئەوەیە گوێ لەلایەنێك بگرێت و لایەنەکەی دیکە فەرامۆش بکات. ئێمە نکۆڵی لەوە ناکەین کە چەندین فێڵ و پیلانگێری لە نێوان پارێزەران و دادوەران هەیە، ئەمەش کۆتایی نییە کاتێك مرۆڤ بوونی هەبێ. سەرەڕای بوونی ئەو فێڵ وپیلانانەش کە لەژێر پەردەی دادگا نوێیەکان ئەنجام دەدرێن، کەچی ناتوانین نکۆڵی لە دروستیی ئەو بنەمایە بکەین کە دادگای لەسەر دانراوە. ئەو دادگایانە لەسەر بنەمای رکابەریی و جیاوازی تێڕوانینەکان دەبێت. ئەو رکابەرییەش وادەکات دادوەر رێگای دادپەروەری لە نێوانیان بگرێت.

ئەگەر واز لە دادوەر بهێنین بێ گوێگرتن لە لایەنەکانی داواکە بریار بدات، ئەوا بێئەوەی ئاگادار بێت ستەم دەکات. مافی پارێزەرە لایەنگری بریکارەکەی بکات، پارێزەرەکەی دیکەش هەمان مافی هەیە. بۆیە تەنها لەسەر دادوەر پێویستە هاوسەنگی دروست بکات و دواتر بەپێی دادوەریی بابەتەکان لە یەکتر جیابکاتەوە. لێرەشەوە پێویستە بڵێین دادپەروەریی تەواو لە دونیادا بوونی نییە. دادوەر وەك پارێزەر مرۆڤە. ئەوەی هەست بکات یان نا مەیلی بەلایەکەوە هەیە. بەڵام حکومەتە نوێیەکان هەوڵیان داوە تا بتوانرێت لایەنگیری دادوەر کەم بکرێتەوە. ئەوان وایانکردووە دادگاکان بە کراوەیی بەرێوەبچێت و خەڵك تێیدا ئامادەبن. سەرەڕای ئەمەش پارێزەرێکی گشتی دادەنێت بە" داواکاری گشتی" ناودەبرێت. بۆ ئەوەی

سەرپەرشتی دادگاکردنەکان بکات و چاوی لەسەر بەرژەوەندی گشتی بێت. هەروەک چۆن لەسەر دادوەریش داوەری دیکە هەن بە پلەی جیاجیاوە، بۆ ئەوەی چاودێری بڕیارەکان بکەن و تاوتوێی ئەنجامەکانی بکەن.

لێرەوە بەو ئەنجامە دەگەین کە دادپەروەریی بەرقەرار نابێت تەنها ئەوکاتە نەبێت لایەنەکانی رکابەر و دژیەکتر هاوسەنگ نەکرێن، هەر چەندە ئەوانیش هاوسەنگ بکرێن، ئەوا هەر یەکەیان بانگەشەی ئەوە دەکات هەق لە لای ئەوە و لە هەق نزیکە. ئەمەش مانای ئەوەیە کە دادپەروەریی پێدراوێکی کۆمەلایەتییە، زیاتر لەوەی بیرۆکەیەکی رەها بێت و لە بۆشایی هەڵواسرابێت وەک ئەفلاتون باسی کردووە. ئەگەر لە بابەتی دادپەروەریی بە دوای ئەفلاتون بڕۆین، ئەوا لە ڕێگای ستەمکاریی دەڕۆین واشدەزانین کە ئێمە دادپەروەرین.

***

ئەبو داود لە عەلی کوڕی ئەبوتالب دەگێڕێتەوە، کە عەلی گوتویەتی " پێغەمبەری خودا منی وەک دادوەرێک ناردە یەمەن، منیش لە سەرەتای تەمەنم بووم، زانیاریم لەسەر دادوەریی نەبوو. پێغەمبەر وتی: خوا هیدایەتی دڵت بدات و زمانت رەوان بکات، ئەگەر دووکەس هاتنە لای تۆ بڕیار مەدە تا گوێی لەهەردوو لا دەگری، بەمشێوەیە دادوەرییەکەت بۆ روون دەبێتەوە". مانای ئەو وتەیە ئەوەیە دادوەر ناتوانێ دادپەروەر بێت تا گوێ لە هەردوو لا نەگرێت. ئەمەش تەواو لەگەڵ ئەوەی زانستی نوێ لە بارەی عەقڵی مرۆییەوە باسی دەکات تەبایە. عەقڵ بە سروشتی خۆی جورئی و لایەنگرە. هەرچەندە عەقڵ دروست و بێگەرد بێت، ئەوا ستەمکار دەبێت کاتێک گوێ لە لایەنێک دەگرێت و لایەنەکەی دیکە فەرامۆش دەکات.

هەر سیستەمێکی سیاسی لە سەردەمی نوێ لەسەر ئەو بنەمایە دانراوە، هەر لەبەر ئەمەشە حیزبەکانی ئۆپۆزسیۆن دانراون ومشتومڕی پەرلەمانی دروست بووە. ئەگەر ئەمەش نەبووایە ئەوا ئێستاش دەسەلاتداران سامانی میللەتیان تالان دەکرد، و واشیان دەزانی کە بە فەرمانی خودا حوکمڕانی دەکەن. لۆژیکی نوێ دەلێ"

ستەمکاری لەسەر دەستی هەرکەسێکی تاکڕەو دەردەکەوێت" ئەگەرهاتوو کەسێک نەیێت چاودێری دەسەڵاتدار بکات و بەرپەرچی بداتەوە، ئەوا ئەوکات ئەودەسەڵاتدارە بەدوای شەهوەتەکانی دەکەوێ و واشدەزانێ کارەکانی فەرمانی خودایە." مۆنتیسکۆش ئاماژەی بەمەکردووە لە تیۆرەکەی بەناوی" پشکنین و هاوسەنگی" کە سیستەمی نوێی لەسەر بونیاد دەنرێت. دەتوانین لێکچوونێک لە نێوان مشتومڕی هۆڵەکانی پەرلەمان و پارێزەران بکەین، بەڵام ئەوەی مشتومڕی پەرلەمان بە دەنگدان کۆتایی دێت. ئەگەر لێی قوڵ بینەوە ئەوا هەردوو جۆر جەدەل، یەک سروشتیان هەیە و کۆتاییەکەیان لە یەکتر دەچێت. کەچی ئەفلاتونییەکان بەهەموو ئەمانە رازی نیین، ڕێبازی ئەوان لە بارەی دادپەروەری وەک پێشتر باسمان کرد ئەوەیە ئەوان دادپەروەریی بە بیرۆکەیەکی رەها دەزانن کە خەڵک لە ڕێگای بیرکردنەوەیەکی دروست پێی دەگات. ئەو ڕێبازەش بە خواستی ستەمکار و زۆردارانە. بۆیە بینیمان هەزاران کەنیزە بە پارەی خەڵک دەکڕن، دواتریش ئەفلاتونییەکان دێن بە چەندین بەڵگەی نەقلی وعەقلی پاڵپشتی کارەکانیان دەکەن.

***

بینیمان سۆفستە کاتێک بەناو گریک بڵاودەبۆوە، کە دیموکراسی بەرقەرار بوو. دواتر ئەفلاتون هات لە یەک کاتدا بەرەنگاری دیموکراسی و سۆفستە بۆیەوە، بەمەش توانی زۆر بەمەزنی بەسەر سۆفستە زاڵ بێت. لەوانەیە کەسێک بپرسێت ئەو هۆکارە چی بوو لەو سەرکەوتنە هاوکاری ئەفلاتونی کرد؟ ئێمە ناتوانین نکۆڵی لەوە بکەین کە ئەفلاتون بلیمەتیی و قەڵەمێکی بەبرشتی هەبوو. بەڵام تەنها بەوەندە ناکرێت شرۆڤەی ئەو سەرکەوتنە مەزنە بکەین. وەک دەردەکەوێت ئەوەی هاوکاری کردووە ئەو رژێمە ستەمکارییە بووە کە بە ماوەیەکی کورت دوای مردنی ئەفلاتون دەسەڵاتی گرتە دەست، بەمەش قوتابیەکانی توانیان ئەو کارەی ئەو تەواو بکەن و بەیەکجاریی بەسەر سۆفستە زاڵ بن.

مێژوو پێمان دەڵێ: ئەسکەندەری مەکدۆنی لە ڕۆژگاری ئەرستۆدا ئیمپراتۆریەتێکی مەزنی دروست کرد، ئەوکاتە بە پێی ئاگرو شمشێر حوکمڕانی یۆنانی دەکرد. ئەرستۆ بە چاکی ئەسکەندەری فوتابی پەروەردەکرد، فێری کرد چۆن دەست بەسەر رەعیەت بگرێت و شکۆمەندیی بەدەست بهێنێ. دواتر رۆمەکان بە دوای ئەسکەندەر هاتن، دیموکراسیەتی گریکیان بە جۆرێك لەناو برد وەك گەرەکەی دایکی عومەر گەڕانەوەی بۆ نەبێت.

دوای ئەمە ئیسلام دەرکەوت، لەسەرەتادا ئیسلام دیموکراسی بوو، بەلام دواتر کەوتە دەست سوڵتان و میرانی موسڵمان، بەمەش لە رژێمە سیاسیەکەی دا هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ئەو دەوڵەتانە نەبوو کە بە شمشێر حوکمڕانیان دەکرد، دواتریش ئەفلاتونیەکان لە ئیسلام دەرکەوتن، هاتوچۆیان دەکرد تا چەکی تۆمەتی زەندیق و سۆفستەیان داهێنا، جا فوریەسەر ئەوەی سۆفستە و زەندیق دەبێت. ئەو کاتە سوڵتانەکان (خوا لێیان رازی بێت) بانگەشەی ئەوەیان دەکرد ئەوان خەلیفەی پێغەمبەر و سێبەری خودان لەسەر زەوی، واعیزەکانیش لەگەڵ ئەوان دەیانگوت" ئەمە هەقە و جێگای مشومڕ نیە". یەکێك لە گاڵتەجاڕییەکان ئەوەیە کە فەیلەسوفانی ئیسلام گەڕانەوە سەر ئەفلاتون و ئەرستۆ، ئەو دووانەیان شکۆمەند، تەنانەت پیرۆزیش دەکرد. فارابی لە مەزنکردنی ئەفلاتون گەیشتە ئاستێك لە ریزی پێغەمبەرانی دانا. فارابی سەرۆکی شاری چاکەخوازانی بە ئەفلاتون وەسف کرد کە کراسی پێغەمبەر محەمەدی پۆشیوە. دوای فارابی ئیبن رووشد هات، دەستیکرد بە مەزنکردنی ئەرستۆ، تەنانەت لە سەرووی پێگەی مرۆڤی دانا. وایکرد کە لە بەرزترین وێنەی بێت کە عەقڵی مرۆڤی تێدا دەرکەوتووە. بەمەش ئەوەی روونکردەوە کە لە توانای مرۆڤدایە لە عەقڵی رەها نزیك بێتەوە، ئیبن رۆشد ئەرستۆی بە " فەیلەسووفی خودایی" ناوبرد.

ئولێری دەڵێ:" بیرمەندانی موسڵمان، لۆژیکی ئەرستۆیان وەك تەواوکەری قورئان دانابوو. تەنانەت یەکێك لەوان گوتبووی دانا ناتوانێت بەپێی لۆژیکی ئەرستۆ بژێت،

تەنها ئەگەر لە خەڵك جیابێتەوە، لە ئارەزووەكانی خەڵك و شتە تێزەوەنەكانی ئەوان دووربكەوێتەوە. بۆیە پێویستە فەیلەسووفان و داناپان دەوڵەتی تایبەت بە خۆیان لەناو دەوڵەت دروست بكەن و لەسەر بنەمای خۆشەویستی و زگماكیی بژین و ركابەریی نەكەن. ئەوكات پێویستیان بە پزیشك و دادوەر نییە، بەڵكو دەروونیان بەوە ئاسوودە دەبێت كە لەگەڵ ئەو عەقڵەكاریانە یەكبگرن كە مەعریفە بە مرۆڤ دەبەخشن. ئەمە لە سەردەمێك لە نێو بیرمەندان روویدا كاتێك كە فەرمانڕەواكان بە كەیفی خۆیان دەژیان و كەسێك چاودێریان بكات و ئارەزایی دەربڕێت".

***

جێگای داخە بیرمەندان دەبینین تا رۆژگاری ئەمرۆمان لەو كەشە عەقڵییە دەژین كە فارابی و ئیبن توفەیل وئیبن روشدی تێدا ژیاوە. ئەم قسەیەم لە بارەی پیاوانی ئایینی و زۆربەی ئەو كەسانە جێ بە جێ دەبێت كە خۆیان بە رۆشنبیری نوێ دەردەدەخەن. ساڵی رابردوو موحازەرەی كۆمەڵایەتییم بەو قوتابیانە دەدا كە كۆلیژی مافی عێراقییان تەواوكردووە، تووشی شۆك بووم كە مشتومڕێكی توندم لە شێوەی كۆن لە نێوان ئەوان بینی، هەریەكەیان وایدەزانی كە هەقیقەتی بۆخۆی قۆرخكردووە. ئەو كەسانە ئەوەیان بیرچووە كە ئەو مشتومڕەیان لە هۆڵی دادگا بەسوودە لەوەی دواقسە بۆ دادوەرە. یان ئەومشتومڕە بۆ هۆڵی پەرلەمان سوودبەخشە كە دوا قسە بۆ دەنگدانە، بەڵام لە هۆڵی توێژینەوەی زانستی ئەو جۆرە قسانە زیانیان زۆرترە نەوەك قازانج. سەیر ئەوەیە كۆلیژی مافی عێراقی بەو جیاوازییە غافڵە، ئەو قوتابییەكانی فێری لۆژیكی سۆفستە دەكات و مەشقی مشتومڕیان لە پێناو بیروڕایە دژەكان پێدەكات. دواتر پێیان دەڵێ لۆژیكی هەق، لۆژیكی هەقیقەتی رەهایە و ئەمەش هیچ گومانی تێدا نییە. هەر ئەمە لە كۆلیژی شەریعەش روودەدا، خوا پشتیوانیان بێت. قوتابیان لەوێ باوەڕە باوەكەی خۆیان وەردەگرن لەسەر ئەو بنەمایەی كە تەنها ئایینی هەقە، هیچ ئامەقی تێدا نییە،

ئەگەریش بەوان بڵێی" ئێوە نازانن لەوانەیە باوەڕێکی دیکە چاکتر لە هی ئێوە هەبێت" ئەوا بە زەندیق و سۆفستە تۆمەتبارت دەکەن. هەر دوو تۆمەتیش قورسە.

***

هەندێک لە پیاوانی ئایینی وادەزانن مشتومڕی نێوانیان وەک ئەو مشتومڕەیە کە لە نێوان پارێزەران رووەدەدا. بەشێوەیەک هەر لایەک دەیەوێ بیسەلمێنێ هەق لە لای ئەوە، ئەو کاتە خوێنەر بڕیاری خۆی دەدات دوای ئەوەی سەیری سەرجەم بەڵگەکان دەکات کە هەر دوولا هێناویانە. کەچی لەڕاستیدا مشتومڕی پیاوانی ئایینی جیاوازی لەگەڵ مشتومڕی نێوان پارێزەران هەیە. پارێزەران کاتێک مشتومڕ دەکەن، چەندین دادوەریی بێلایەن ئامادە دەبن، دواتر کە دادوەران بڕیار دەدەن دەسەلاتێکی دادوەریی بڕیارەکانی دەخاتە بواری جێ بە جێ کردنەوە. سەرەڕای ئەمانە دەبینی ئەوەی داواکەی خۆی دۆڕاندووە، هەر لەسەر ڕێچوونەکەی خۆیەتی و گوایە هەق لە لای ئەوە خۆی بە مەزڵوم دەزانێ.

بەلام مشتومڕی ئایینی کێشەکەی ئەوەیە درێژە دەکێشێ، بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار کەڵەکە دەکات و دادوەرێکی بێلایەنیش نییە ململانێیەکە یەکلابکاتەوە. یان بە گوزارشتێکی دیکە: دادگایەکە بێ دادوەرە. زۆرجاریش مشتومڕەکە دەبێتە هۆی هەڵدانەوەی زامە کۆنەکان و ڕشتنی رق و کینە. ئەنجامەکەشی ئەوە دەبێت بەکتر دەکوژن و وادەزانن ئەوان لەپێناوی خودا جیهاد دەکەن. هەندێک لە پیاوانی ئایینی چەند ساڵێک لەمەوبەر کۆنگرەیەکیان لە قودس بەست، مەبەستیان ئەوەبوو لەسەر باوەڕێک یەکگرتوو بن و ئەو دووبەرەکییەی نێوان موسڵمانان نەمێنێ. ئەو کۆنگرەیە مایەی پێکەنینی جیهان بوو. چونکە هەر یەکەیان لەو باوەڕەدابوو بە بەڵگەکانی دەتوانێ ئەندامانی کۆنگرە بهێنێتە سەر مەزهەبی خۆی و یەکگرتوویان بکات. بەمانای ئەوەی هەریەکەیان باوەڕی وابوو کە هەق لە لای ئەوە . یەکگرتنی ئیسلامیش تەنها ئەوکاتە ئەنجام دەدرێت کە پەیڕەوی هەق بکات- ئینشالا-.

ئەوان کۆبوونەوە و دواتر پەرت بوون، ئەنجامەکەش ئەوەبوو هەریەکەیان گەڕایەوە لای قەومەکەی خۆی و دەیگوت" بە هەموو هێزی خۆم داکۆکیم لە هەقیقەت کرد، بەڵام ئەوان گوێیان لە من نەگرت. ئەگەر گوێیان بگرتایە ئەوا جیاوازی نەدەما و بەسەر جیهان زاڵ دەبووین".

***

بیرمەندانی ئێمەش بەوچاویلەکە کۆنە سەیری بابەتەکان دەکەن و لەوە ڕاهاتوون.

# دیموکراسی لەئیسلام دا



لە بەشی رابردوودا ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد حکومەتی ئیسلامی بۆتە زۆردار و ستەمکار، پێشێلی مافەکانی گەل دەکات و سامانیان تالان دەکات و باوەڕیشی بەوە هەیە گوایە سێبەری خودایە لەسەر زەوی، کەچی هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ حکومەتەکانی سەردەمی کۆن نییە. نکۆڵی لەوە ناکەین حکومەتی ئیسلامی بەوە لە حکومەتەکانی دیکە جیادەکرایەوە، قورئانی کردۆتە دەستووری خۆی. بەڵام ئەو جیاوازییە رووکەشە، چونکە قورئان(هەڵگری چەندین رووە) وەک ئیمامی عەلی وەسفی کردووە، بۆیە جیاوازییەکی لەگەڵ ئەو یاسایانە نییە، خاوەنەکانیان بە رۆژ کاری پێدەکەن و بە شەویش پشتی تێدەکەن. بینیشمان زۆردارترین حکومەتی ئەو سەردەمەمان، ئەوانەن کە قورئانیان کردۆتە دەستووری خۆیان.

هارون رەشید یەکێک بوو لەوانەی قورئانی بە ملکەچی دەخوێندەوە وماچی دەکرد و رۆژی چەند جارێک لەسەر نێوچەوانی خۆی دادەنا. بەڵام ئەمە رێگری لەوە نەکرد شەو لەگەڵ بادانی سەماکەرەکان و دەنگی تەمبور بەسەر ببات، دواتریش لە ترسی

خودا لە هۆش خۆی بچێت! . قورئان کتێبێکی خودایی مەزنە, تۆماری شۆڕشگێڕانەی محەمەدە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خۆشگوزەرانەکان دەتوانن بە پێی خواستی خۆیان لێکدانەوە و شرۆڤەی بۆ بکەن. ئەوکاتە لە سروشتی ڕەسەنی خۆی دەریدەهێنن و دەیکەنە کەلوپەلێکی مردووان. کاتێك یەکێك دەمرێت ژمارەیەکی زۆری خوێنەری بۆ کۆدەکەنەوە، بۆ ئەوەی بە خاتمە و رەحمەت گولاوپرژێنی بکەن، خوا لێی خۆش بێت.

***

ئیسلام سەرەتا بە سیستەمێکی دیموکراسی دەستی پێکرد، بەڵام ئەو دیموکراسیەتە رفێنرا، کاتێك معاویە قورئانی بەرزکردەوە و بە موسڵمانانی وت:" وەرن کار بەکتێبی خودا بکەین". ئەنجامی کارکردنیش بەقورئان ئەوەبوو یەزید کاروباری موسڵمانانی بەدەستەوەگرت و وتی:

لعبت هاشم بالملك فلا خبر جا ولا وحي نزل

(واتە بنەماڵەی هاشم یارییان بە دەسەڵات کرد کە هیچ هەواڵ و سروشێکش لەلایەن خوداوە نەهاتبوو)

***

ئێمە کاتێك ئەو خۆشگوزەرانییە قێزەوەنە دەبینین، کە بەسەر سوڵتان و میرانی موسڵمان زاڵبووە، پێویستە ئەو شۆڕشە میللییە مەزنە لەیاد نەکەین، کەهەر یەکە لە ئەبوزەر وعەمار وعەلی کوڕی ئەبوتالب بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو خۆشگوزەرانییە هەر لە سەرەتای دەرکەوتنی لە ئیسلام ئەنجامیان داوە.

ئەو شۆڕشە سەرکەوتوو نەبوو، گومان لەوەدانییە چەند سەدەیەك پەر لەکاتی خۆی بوو، بۆیە هەقی خۆی بوو سەرنەکەوێت. بەڵام لە مێژوودا وەك سیمبولێك بۆ دیموکراسیەتی ئیسلام مایەوە، بوو بەبەڵگەیەکی زەق لەسەر ئەوەی کە حکومەتی ئیسلام لەسەرەتادا لە گەلەوە دەستی پێکردووە، بە گەل دەستی پێکردووە، لە پێناو گەلیش بووە.

ئەو شۆڕشە درێژکراوەی شۆڕشی محەمەد بوو؛ ئەگەر لەسەرەتا و کۆتاییدا توێژینەوە لەسەر ئەو شۆڕشە بکەین، دەبینین دیموکراسییە و دژایەتی سەردارە خۆشگوزەرانەکان دەکات. وا لە خەڵك دەکات لە بەرامبەر خودا و یاسا یەکسان بن. مێژوونووسانی خۆرئاوا دەڵێن حکومەتی گریك یەکەم حکومەتی دیموکراسی و دوایین حکومەتی دیموکراسی بوو لە مێژووی کۆندا. ئەوانە حکومەتی ئیسلامییان بیرچووە کە بە ڕابەرایەتی محەمەد و خەلیفەکانی ڕاشدین بوو. ئەگەر تاوتوێی ژیانی حوکمڕانی ئەوکەسانە بکەین، دەبینین دیموکراسی بوونیان لە پلەیەکە جێگای گاڵتە نییە.

دەگێڕنەوە: ئەبوبەکر بەر لە خەلافەت لەوە ڕاهاتووبوو لە کاروباری مەڕداری هاوکاری دراوسێیە هەژارەکانی دەکرد، کاتێك دەبێتە خەلیفە گوێی لە دراوسێیەك دەبێت دەڵێ: " ئەمڕۆ هاوکاریمان ناکەی؟" ئەبوبەکر وەڵامدەداتەوە: " بەخوا هاوکاریتان دەکەم." بە ڕاستیش هاوکاریان دەکات[٤٤٤]. ڕۆژێکی دیکە پیاوێك جوێن بە ئەبوبەکر دەدات، ئەبو بەرزە دەڵێ: " ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا! لێم گەڕێ با لە ملی بدەم" ئەبوبەکر وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ: " دانیشە ئەمە بۆ کەس نەهاتووە، بۆ پێغەمبەری خودا نەبێت"[٤٤٥].

کاتێك عومەر بوو بە خەلیفە، پیاوێك لە بەردەمی دا وتی: " ئەی عومەر، بەخودا ئەگەر خواروخێچیت لێ ببینین، بەشمشێر ڕاستت دەکەینەوە." عومەریش دەڵێ: " سوپاس بۆ خوا کەسێکی وەها لەو قەومە هەیە، خواروخێچی عومەر ڕاست بکاتەوە". ڕۆژێك پیاوێك لە عومەر توند دەکا و دەڵێ: " لە خوا بترسە ئەی میری موسڵمانان لە خوا بترسە". عومەر دەڵێ: " واز بێنە با ئەو قسەیەت پێ بڵێم.

[٤٤٤] عباس العقاد، عبقرية الصديق،ص ١٦٧
[٤٤٥] الحاكم، المستدرك، ج٤، ص٣٤٥-ص٣٥٥

چاکترین قسە کرابێت ئەوەیە: چاکەتان نییە ئەگەر ئەو قسەیە نەکەن، چاکەمان نییە ئەگەر ئێمەش لە ئێوەی قبوڵ نەکەین"[113].

ئەگەر لە ڕووی کەسایەتییەوە دیقەت بدەینە ژیانی عوسمان، سەرەڕای ئەوەی زۆر شتی لە بارەیەوە دەگوترێت، بەلاّم ديموکراسی بووە. دەڵێن ڕۆژێك پیاوێك خۆی بۆ عوسمان مەلاّس داوە، وەك ئەوەی بیەوێت عوسمان بکوژێت، بەلاّم عوسمان لە دواوە دەیگرێت و دەیخاتەسەر زەوی، پیاوەکە دەڵێ:" ئەی میر موسڵمانان منت ئازار دا". کاتێك عوسمان لە نیازپاکی پیاوەکە دڵنیا دەبێتەوە، لەسەر زەوی دادەنیشێ و دەڵێ:" بباچی ئەو کارەم لێوەربگرەوە، بەخوا وامزانی بەدوای منەوەی" پیاوەکە دەڵێ:" نامەوێ"[114].

دیارە ئەمەی سەرەوە ئاکاری سوڵتانێکی زۆردار نییە، بە سیاسەتی شمشێر و رایەخی مەرگ کاربکات، بەڵکو ئاکاری فەرمانڕەواییەکی دیموکراسیخوازە. ئەگەر کەسوکارە خۆشگوزەرانەکانی عوسمان نەبووان کە دەستیان لە کاروباری وەردەدا، ئەوا ڕاسترین مەزندە ئەوەبوو عوسمانیش وەك دوو خەلیفەکەی دیکە دەبوو.

***

کاتێك عەلی کوڕی ئەبوتالیب لە دوای عوسمان خەلافەتی وەرگرت، لە هەڵسوکەوتی دا بە سەرنجڕاکێشی سیمای دیموکراسیەت دیاربوو. لەوانەیە زێدەڕۆیی نەبێت ئەگەر بڵێین دیموکراسی ئەو پیاوە گەیشتە ئاستێك، زۆرینەی دەسەڵاتدارانی سەدەی بیستەم ناتوانن بەو ئاستە بگەن. لەڕاستیدا ئەو دوایین دەسەڵاتدار بوو لە مێژووی ئیسلامدا خەڵك بەدەوری کۆبوونەوە و بەخواستی خۆیان بەیعەتیان بۆ کرد. ئەو خۆی ئاماژەی پێکردووە دەڵێ:"خەڵك لە پێناو سوڵتانێکی سەردار، تەوەك بۆ ئامانجێکی کاتی، بەیعەتیان بۆمن نەکردووە"[115]. ئەمە سەبارەت بە خەڵك و چینە

[113] بشير بموت، الفاروق عمر بن الخطاب، ص ٩٣-١٤٥
[114] الطبري تاريخ الرسل والملوك،ج ٥، ص١٢٧-١٢٨
[115] عباس العقاد، عبقرية الامام،ص٧٩

تایبەتەکەش سەرجەمیان بەیعەتیان بۆ کرد، تەنها هەندێکیان نەبێت، رەتیان کردەوە بەیعەتی بۆ بکەن. ئەویش سەرپشکی کردن، کەسی ناچار نەکرد، رێگەی بەو کەسانەش دا کەدەیانەویست کەنارگیر بن، پاساوی ئەوانی قبوڵ کرد، وایکرد کەس دەستی لەوان نەدات.[116]

سەیرتر لەمەیان عەبدوڵلای کوڕی عومەر رەتیکردەوە بەیعەت بۆ عەلی بکات و داوای مۆڵەتی سەفەری کرد، کاتێك داوای لێکرا کەسێك لە شوێنی خۆی بە کەفیل دابنێت، ئامادە نەبوو ئەمەش بکات. کەچی ئیمامی عەلی خۆی کرد بە کەفیلی ئەو، مێژوو فەرمانڕەواییەکی بەو جۆرەی بەخۆیەوە نەدیوە، کە کەفالەتی کەسێك بکات، کە رەتیکردۆتەوە بەیعەتی بۆ بکات و ملکەچی بێت. بەخوا ئەوەیان هێمایەکە لە هێماکانی دیموکراسیەت زۆر کەس ناتوانن نموونەیەکی وەها بهێننەوە.

رۆژێك عەلی لەنێو یارانی دانیشتبوو و قسەی بۆ دەکردن، یەکێك لە خەواریجەکان عەلی بەو جۆرە وەسفکرد" خوا وەك کافرێك لە دژی جەنگاوە، کەچی تێنەگەیشتووە" خەڵکەکە هەڵسانەوە بۆ ئەوەی بیکوژن، عەلی وتی:" هێواش، ئەمە، جنێوە، یان داوا لێبوردنە لە خراپەیەك".[117] ئەگەر تاوتوێی هەڵسوکەوتی ئیمام عەلی بکەین لەگەڵ ئەو خەواریجانەی کە کافریان کرد و بەرەوڕوو جنێویان پێدا و لە شوێنی خۆی پیلانیان بۆ گێڕا، شتی سەیرمان بەرچاو دەکەوێت. بە سەبرەوە بەرگەی هەموو ئەمانەی دەگرت. بەتەواوی بەخششی پێدەدان. بە دوورودرێژی گفتوگۆی لەگەڵ دەکردن و تاوتوێی بابەتەکانی لەگەڵ دەکردن، بۆ ئەوەی بیانگێڕێتەوە سەر رێگای راست. شەڕی لەگەڵ نەکرد تەنها لەگەڵ یەك کۆمەڵەیان نەبێت، ئەوانیش ئەو کۆمەڵەیە بوون بە شمشێر رێگایان گرتبوو و ترسیان خستبووە دڵی خەڵك. دواتر عەبدوڵلای کوڕی خەباب و ئەو ژنانەی لەگەڵ دابوون لەسەردەستی ئەوکۆمەڵەیە کوژران. ئیمام عەلی نێردراوێکی نارد بۆ ئەوەی لە بارەی ئەو کارە

---

[116] طه حسین، الفتنة الکبری، ج٢،ص ٤٢

[117] محمد عبده، نهج البلاغة، ج٣،ص٤٥٢

خراپانە پرسیاریان لێ بکات، کەچی نێردراوەکەشیان کوشت. شەڕی لەگەڵ نەکرد تەنها تا کەیشتەی ئەو ئاستەی توانای لەبەر بڕا لە قسەکردن و مشتومڕیان، جارێک بە نوسین و جارێک بەزارەکی قسەی لەگەڵ دەکردن"[١١٨].

دەڵێن یەکێك لە خەوارییجەکان دوای جەنگی صەفەین هاتە لای عەلی، ئەو کەسە ناوی خەریت کوڕی راشید ناجی بوو، بەم شێوەیە گفتوگۆی نێوانیان ئەنجام درا:

خەریت: بەخوا نە گوێڕایەڵی تۆ دەبم، نە نوێژ لە دوای تۆ دەکەم، من بەیانی لە تۆ جیادەبمەوە.

عەلی: جەرگی دایکت بسوتێ. کەواتە بەڵێنی خۆت بەجێ ناهێنێ و لە خوا یاخی دەبی، تەنها زیانیش بەخۆت دەگەیێنی. پێم بڵێ بۆ وا دەکەی؟

خەریت: چونکە تۆ قورئانت کردە سەنگی مەحەك، کەچی خۆت لە حەقیقەت بەدوور گرت، ئەوەشت بەدەست هێنا، باوەڕت بەوکەسانە کرد کە ستەمکاری خۆیانن، من لە تۆ هەڵگەڕامەوە، رقیشم لەوانە، لە هەمووتان هەڵدەگەڕێمەوە.

عەلی: خۆزگە دێیە لام بۆ ئەوە باسی بابەتەکانت بۆ بکەم، تا توێی هەندێك بابەتی ئاییمت بۆ بکەم، هەندێکیان لە بارەی هەقەوە،من لەتۆ ئاگادارترم. لەوانە تۆ بزانی ئێستا تۆ لەسەرخۆ و ئاگادار نیت.

خەریت : من سبەی دێمەوە.

عەلی: وەرەوە، بەڵام با شەیتان فریوت نەدات، بۆچوونی خراپ بەسەرت زاڵ نەبێت. با ئەوانەی نەزانن تووشی لاساریت نەکەن، بەخوا ئەگەر داوای رێنمایی و ئامۆژگاریی بکەیت، ئەوا من رێگای راستت نیشان دەدەم.

خەریت رۆیشت و سبەی و دووسبەیش نەهاتووە. هەر بەهەڵگەڕاوەیی مایەوە، یەکێك لە یارانی عەلی هات و گوتی با خەریت دەستگیر بکرێت و بەڵێنی لێ وەربگیرێ. ئیمامی عەلی وەڵامی دایەوە، وتی:" ئەگەر وا بکەین، هەرکەسێك بە

[١١٨] طە حسین، المصدر السابق، ج٢،ص١١٣-١١٤

تۆمەتێك دەستگیر بکەین، ئەوا زیندانەکان پڕ دەبێت، من بەپێویستی نازانم خەڵك دەستگیر بکەم و سزایان بدەم، تا ئەوکاتەی سەرپێچییەکانیان دەرنەکەوێت"[119].

ئەو وەڵامە دیارکردنێکی رووشنی دیموکراسییەتمان پێ دەدات. ئیمام عەلی لێپێچینەوە لەگەڵ کەسێك ناکات لەبەر بیروڕا و تۆمەتێك کەدراوەتە پاڵی، بەڵکو کاتێك رەعیەت سزا دەدات، ئەگەرهاتوو سەرپێچی بکەن و رێگری بکەن و ئاسایش تێك بدەن. وادەزانم دیموکراسیەتی ئەم رۆژگارەشمان لەسەر ئەوە دەڕوات.

***

ئەوەی لە دیموکراسییەتی ئیمام عەلی جێگای سەرنجە ئەوەیە:—

ئەو کاری بە رێبازی (دەسەلاتداری خوایی) نەکردووە کە پێشان باوەڕیان پێی هەبووە؛ بەڵکو باوەڕی بەوە هەبوو خەڵك دەسەلاتدار هەڵدەبژێرێت. هەر خەڵکیش دەسەلاتی لێ وەردەگێڕێتەوە ئەگەر ستەمکاریی بێت لە فەرمانڕەوایی دا. جارێکیان ئیمام بۆ معاویە دەنوسێ: "... ئەو قەومەی بەیعەتی بۆ من کردووە، پێشتر بەیعەتی بۆ ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان کردووە، شاهیدێکی دیکە نەبوو هەڵیبژێرێت، یان نائامادەبوونێك هەبێت رەت بکاتەوە، بەڵکو شورا بەدەست موهاجیر و ئەنسار بووە، ئەگەر لە بارەی کەسێك کۆبوونەوەو ناویان نا ئیمام ئەمەیان باشە؛ ئەگەر کەسێکیش لەبەر دەستی ئەوان بچێتە دەرەوە و نارازی بێت و تانە بادات، ئەوان دەیگەڕێننەوە. ئەگەریش رازی نەبوو ئەوا لەگەلی دەجەنگن چونکە رێگای خوای نەگرتۆتە بەر، کارەکانیش بەدەست خودایە"[120].

لەوانەیە کەسێك نارازی بێت و بپرسێت" چۆن ئیمام رێگەی بەخۆی داوە کاری شورا تەنها لە موهاجیرو ئەنسار قەتیس بکات، ئایا موسڵمانانی دیکە ئەو مافەیان نییە؟ " ئەمە پرسیارێکی بەجێیە، بەلام بەر لەوەی وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە، دەبێت ئەوە لەبیرنەکەین ئەوکات ئیسلام لە سەرەتای شۆڕشەکەی خۆی دابوو. ئەمەش

[119] ابن ابي حديد:شرح النهج، ج١، ص٢٦٤.٢٦٥
[120] محمد عبده، المصدر السابق،ج٣، ص٨

مانای ئەوەیە حکومەتەکەی زیاتر لە حکومەتی شۆڕش دەچوو، نەوەک حکومەتێکی ئاسایی.

ئەوەش زانراوە حکومەتی شۆڕش لە سەرەتادا ڕێگانادات هەموو کەسێک لە پێکهێنانی بەشدار بێت، تەنها ئەرکەسانە نەبێت کە شۆڕشەکەیان ئەنجام داوە. چونکە ئەگەر ڕێگە بدات خەڵکانی دیکە بێنە ڕیزەکانییەوە، ئەوا نەیارانی دەتوانن کار بکەن گۆڕین و لادانی تێدا ئەنجام بدەن، ئەمەش دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، لە مێژووی هەموو شۆڕشەکانی دیموکراسی تێبینی دەکرێت، تەنانەت زۆر بەزەقی لە مێژووی شۆڕشی فەرەنسی دەرکەوتووە،

ئیمام عەلی دەڵێ:" بەخوا تا ئەو کاتەی ئیمامەت بە ئامادەبوونی تەواوی خەڵک نەچەسپێت، ڕێگەچارەکی دیکە نییە.." ئیمام لێرەدا لەسەرەقە، حکومەتی نوێ ناتوانێ هەڵبژاردنی گشتیی ئەنجام بدات، تا هەموو مەرجەکان فەراهەم نەبن.لەوانە

؛

بڵاوبوونەوەی هۆشیاری دیموکراسیی لە نێوان خەڵک و دامەزراندنی حیزب و بڕەودان بە ڕۆژنامەوانی. سەبارەت بە سەردەمی ئیمام عەلی زۆربەی موسڵمانان تەنها بەڕووکەش لە ئیسلام دەگەیشتن، وەک ئیمام بەڕاشکاویی لە خوتبەیەک ئاماژەی بۆ کردووە[٢٩]. زۆربەیان بەتێگەیشتنێکی دروست لە ئیسلام نەدەگەیشتن، تەنها موهاجیر و ئەنسار نەبێت. ئەوان لەڕۆژگاری مەینەتی هاتنە پاڵ دەعوەی ئیسلام، لەبەرامبەر ئەمەشدا چەوسانەوە و سوکایەتیان قبوڵ کرد، بە واتەی ئەوەی ئەوان لەبەر ترس یان ئارەزوو نەبوون بە ئیسلام، بەڵکو بە باوەڕەوە بوون بە ئیسلام و قوربانیشیان لە پێناو بەخشی.

لەڕاستیدا باوەڕ ئەوەیە کەسی باوەڕدار لە پێناویدا دان بەخۆیەوە بگرێت و خۆی لە قاڵبێکی نوێ بتوێنێتەوە. ئەمەش جیاوازی لەگەڵ باوەڕی ئەو کەسە هەیە کە لە

[٢٩] المصدر السابق، ج٢،ص١٨٠

خۆبەدەستەوەدان باوەڕ دەهێنێن، یان خۆی دەردەخات و چاودەبڕێتە دەستکەوت"[١٢٢]. لە یەکێك لە خوتبەکانی ئیمام عەلی ئاماژەی بەو سوودە کۆمەڵایەتیی و دەروونییانە دەکات کە لە چاوساندنەوەی بڕواداران لە سەرەتای دەعوە هەڵقوڵاون، ئەو دەڵێ: "خودای گەورە بەندە بەفیزەکانی خۆی بەو کەسانە تاقی دەکاتەوە کە لە چاوی ئەوانەوە نەدارن" ئەگەر ئایین لە سەرەتاوە بەهێز و سەرکەوتوو بووایە، ئەوا هەموو خەڵك وەریاندەگرت و بوارێك بۆ تاقیکردنەوە نەدەما. بەڵام خودا بە چەندین ڕێگای سەخت بەندەکانی تاقی دەکاتەوە، بە چەند کۆشش دەیانکاتەوە بەندەی خۆی- تووشی چەندین جۆر فێڵیان دەکات، هەموویان لە پێناو لەناوبردنی فیزە لە دڵیان، بۆ چەسپاندنی چێژە لە دەروونیان"[١٢٣].

قورئانیش ئاماژە بۆ هەمان مانا دەکات و دەفەرموێ:

"أَحَسِبَ النَّاسُ أَنْ يُتْرَكُوا أَنْ يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ" و " ولقد فتنا الذين من قبلهم فليعلمن الله الذين صدقوا وليعلمن الكاذبين"[١٢٤]

هەروەها قورئان بەمشێوەیە وەسفی موهاجیر و ئەنساری کردووە کە دەفەرموێ:

"لَقَدْ تَابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ مِنْ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّهُ بِهِمْ رَءُوفٌ رَحِيمٌ"[١٢٥]

هەروەها دەفەرموێ: " والسابقون الأولون من المهاجرين والأنصار والذين اتبعوهم بإحسان رضي الله عنهم ورضوا عنه وأعد لهم جنات تجري تحتها الأنهار خالدين فيها أبدا ذلك الفوز العظيم "[١٢٦].

[١٢٢] احمد امين، فجر الاسلام،ص ٨٢
[١٢٣] محمد عبده، المصدر السابق،ج٢،ص١٦٨-١٧٢
[١٢٤] القرآن سورة العنكبوت، الايتان ٢-٣
[١٢٥] القرآن، سورة التوبة، اية ١١٨
[١٢٦] القرآن، سورة التوبة، اية ١٠٠

ئەگەر سەیری (سەحیفەی سەجاد)یش بکەین کە لەلایەن زەین عابدینی نەوەی ئیمام عەلی نووسراوە، ئەو بۆچوونەی سەرەوە بەڕوونی دەبینین. دەتوانین بڵێین قورئان و سەحیفەی سەجاد و نەهجی بەلاغە ئەو کتێبانەن، یەک ڕێبازییان هەیە، ئەویش ڕێبازی شۆڕشە لە دژی ستەمکاران[١٢٧].

***

ئەوەی لێرەدا دەبێت ئاماژەی بۆ بکرێت ئەوەیە کە زۆرینەی موهاجیر و ئەنسار لە ماوەی خەلافەتی عەلی چوونە پاڵ عەلی، کەسێک لەگەڵ ئەو ئاکۆک نەبوو چەند کەسێک نەبێت. هەروەها ئەوەی جێگای سەرنجە ئەنساریش هەموویان چوونە پاڵ عەلی تەنها سێ کەس نەبێت چوونە پاڵ معاویە، ئەوانیش نعمان کوڕی بەشیر و موسەیلەمەی بن موخەلەد بوو، لەگەڵ محەمەدی کوڕی موسەیلەمە، دواتر محەمەد لە هەردوولا کەنارگیر بوو.

دەگێڕنەوە کە معاویە ڕۆژێکیان ئەبو هورەیرە و نعمان کوڕی بەشیری، ناردۆتە لای ئیمام عەلی بۆ ئەوەی داوای خوێنی عوسمانی لێ بکەن و سزاکەی بدات، کاتێک گەیشتنە لای عەلی، عەلی سەیری نعمانی کرد و وتی:" قسەم بۆ بکە ئەی نعمان ئایا تۆ لە قەومەکەت ڕاستتری؟ هەموو قەومەکەت لەگەڵ منە، چەند کەسێکی دەگمەن نەبێت، سێ یان چوار، تۆش لەو ڕیزپەڕانە دەبیت؟" نعمان وتی:" خوا چاکت بکات، من هاتووم بۆ ئەوەی لەگەڵت بم پابەندت بم. معاویە پرسیاری ئەوەی لێکردم کە ئەو

[١٢٧] سەبارەت بە کتێبی نەهجی بەلاغەی ئیمام عەلی دەبێت کەمێک ئاگاداریمان هەبێت، ئێمە تکۆڵی لەوە ناکەین ئەو کتێبە تۆماری شۆڕشی عەلییە، وەک چۆن قورئان تۆماری شۆڕشی محەمەدە، بەڵام بەداخەوە کتێبی نەهجی بەلاغە هەندێک وتەی لە خۆیەوە گرتووە، کە ناکرێت بدرێتە پاڵ ئیمام عەلی چونکە پێچەوانەی ئەو بنەمایانەیە کە عەلی بانگەشەی بۆ دەرکرد و لەگەڵ شێوازی نووسینی عەلی یەکناگرێتەوە، هیوامان وایە بگەڕێینەوە سەر ئەوکتێبە و توێژینەوەیەکی کۆمەڵایەتی وردی لەبارەوە بکەین(عەلی وەردی)

قسەیە بگەیەنم بەتۆ، ئومێدی ئەوەم هەبوو لە شوێنێك لەگەڵ تۆ کۆببمەوە، تکام وایە خودای گەورە ئاشتەوایی بێنێتە نێوانتان. بەڵام ئەگەر بۆچوونێکی دیکەت هەیە، من پەیوەبستم بە تۆ و لەگەڵ تۆ دەبم." ماوەیەك نعمان لەگەڵ عەلی مایەوە، دواتر بۆلای معاویە رایکرد، لەبەر هۆکارێك نازانین چییە"[128].

وەك دەردەکەوێت معاویە لەو لایەنەوە هەستی بە لاوازیی هەڵویستی خۆی کرد، بۆیە هەوڵی دا تا ژمارەیەکی زۆر لە موهاجیر و ئەنسار بۆ لای خۆی رابکێشێت، تا لەگەڵ ئەوانەی لایەنگیری عەلین ژمارەیان هاوسەنگ بێت. بۆئەمەش پارەیەکی زۆری خەرج کرد وسەرکەوتووش نەبوو. وەك پێشتر باسمان کرد دوو کەس لە ئەنسار چوونە پاڵ معاویە، کەچی لە موهاجیرەکان تەنها ئەوکەسانە چوونە پاڵی کە بە ماوەیەکی کەم بەر لە فەتحکردنی مەککە کۆچیان بۆ مەدینە کردبوو، ئەوانیش ئەبوهورەیرە، عەمرو کوڕی عاص و موغیرە کوڕی شوعبە بوون. ناشتوانین ئەوانە بە موهاجیری راستەقینە دابنێین، چونکە کاتێك کۆچیان کرد کە ئامازەکانی سەرکەوتن لای محەمەد بوو، ئەوکاتە قورەیش دەترسا موسڵمانان هێرش بکەنە سەر مەککە، هەرکاتێك مەککە فەتحکرا، کۆچکردنیش وەستا، بۆیە گوترا" کۆچ دوای فەتح نییە"[129].

وا خەیاڵ دەکەم معاویە ماوەیەکی دوورودرێژ بیری لەو بابەتە کردبێتەوە، بۆ ئەوەی رێگاچارەیەك بدۆزێتەوە و لاوازیی هەڵویستی خۆی پەردەپۆش بکات. بڕوام وایە دواجار ئەو رێگاچارەیەی دۆزییەوە. دەبینین ئەو ناوهێنانی موهاجیر و ئەنسار لە نووسین وخوتبەکانی فەرامۆش دەکات و لەجیاتی ئەوان وشەی(سەحابە) بەکاردەهێنێت. ناوی سەحابەش مانایەکی فراوانی هەیە، دەتوانێت کەسانێك بەو ناو بناسرێنەوە، جا ئەوکەسانە لە دژی پێغەمبەر جەنگاون، یان لەگەڵی جەنگاون. تەنها موسڵمان گوێی لە فەرمودەی پێغەمبەر بێت و لە مەجلیسی ئەو دابنیشێت و سلاوی

[128] ابن ابي حديد، شرح النهج، ج١،ص٢١٣

[129] ابن خلدون، المقدمة، ص١٣٤

لێ بکات و پێغەمبەریش بڵێ:" بەخێر هاتی" ئەوا ئەرکەسە دەبێتە سەحابە و لە ڕیزی ناوە پیرۆزەکان دەبێت.

ئەبو هورەیرە فەرموودەیەکی بۆ معاویە هێناوەتەوەکە لە پێغەمبەر ڕیوایەتکراوە، دەفەرموێ:" سەحابەکانم وەك ئەستێرەن، بەئاتان بۆ هەریەکیان برد، هیدایەتان دەبێت"وا هەست دەکەم معاویە زۆر بەو فەرموودەیە دڵخۆش بووە، چونکە ئەو فەرموودەیە مافی ئەوەی پێدەدات بەعەلی بڵێت:" بەقەد تۆ سەحابەم لایە، من وەك تۆم". لەڕاستیشدا معاویە ژمارەیەکی زۆر سەحابەی لە نموونەی ئەبوهورەیرە و موغەیرەی کوڕی شوعبە و مەڕوان کوڕی حەکەمی هەبوو. ئەوان دونیایان پڕکرد لە فەرموودەی پێغەمبەر سەلات و سەلامی خوای لێ بێت. معاویە بڕێك پارەی بەهەر کەسێك لەوانە دەدا فەرموودەیەکی پێغەمبەری بۆ بهێنن، کەئەو پێی ڕازی بێت. بڕە پارەکەش زۆر بوو جێی گاڵتە نەبوو. کەچی ئەو موهاجیر و ئەنسارەی کە لەگەڵ عەلی بوون، دەرکەوتن ئەوان لە چاو ئاپووڕای سەحابە خوایان لێ ڕازی بێت، وەك دڵۆپەی دەریان[30].

معاویە بەوەندە ڕازی نەهێنا، بەڵکو نکوڵی لە مافی شورای موهاجیر و ئەنسار کرد، ئەم مافەشی بە سەحابە نەدا، بەڵکو تەنها بە خەڵکی شامی دا.

کاتێکیش ئیمام عەلی مافی شورای موهاجیر و ئەنساری بەبیرهێنایەوە و ئەو نووسیویەتی دەڵێ:" ئەهلی شام ڕازی نەبوون، تەنها بە شەڕکردنی تۆ نەبێت بۆ وەرگرتنەوەی خوێنی عوسمان. ئەگەر ئەمە بکەم ئەوا شورا لە نێوان موسڵمانان دەبێت، بەڵام حیجازییەکان ئەوان فەرمانڕەوابوون بەسەر خەڵك و ئەو مافەیان هەبوو. بەڵام کاتێك وازیان لەو هەقە هێنا، ئەوا فەرمانڕەوای سەر خەڵك تەنها ئەهلی شامە"[31].

---

[30] ابن ابی حدید، المصدر السابق، ج١،ص ٣٥٨
[31] عباس العقاد، عبقرية الامام،ص ٩٠-٩١

خوێنەر تێبینی ئەوە دەکات، معاویە لە وەڵامەکەی ناوی موهاجیر و ئەنساری نەهێناوە کە لە قورئان بەو ناوانە هاتووە، بەڵکو ناویان بە(حیجازییەکان) دەبات. دواتریش بە کوشتنی عوسمان تۆمەتباریان دەکات. بەمەش بەتێڕوانینی ئەو، ئەوکەسانە لە ئەنجامی ئەو ڕووداوەدا مافی شورا و ڕاوێژیان لەدەست داوە. حوکمڕانی سەر خەڵکیش تەنها ئەهلی شامە، چونکە ئەوان داوای خوێنی عوسمان دەکەن.

ئەوەی دیقەت بداتە باروودۆخی خەڵکی شام لەو کاتەدا؛ دەزانێ ئەوان ئەوکات نە شورایان زانیوە و نە باوەڕیشیان پێ هەبووە. ئەوان لە مێژوو بەوە ناسراون، کە ملکەچترین کەسن بۆ فەرمانڕەوا، جا ئەو فەرمانڕەوایە هەرکەسێك بێت. ئەمەش بەمانای ئەوە دێت کە شورا لەو کاتەدا لە لای ئەوان بۆتە ملکەچی. مەسعودی دەڵێ:" ملکەچی خەڵکی شام بۆ معاویە گەیشتە ئەو ئاستەی نوێژی هەینیان لە ڕۆژی چوارشەممە لەدوای معاویە کرد، ئەمەش ئەو کاتە بوو کە معاویە دەیویست بچێتە صەفەین"[١٤٢]. معاویە هەر لە زووەوە خەڵکی شامی لەوە ڕاهێنابوو ملکەچی سوڵتان بن و مشتومڕ لەسەر کارەکانی نەکەن. لە سەردەمی عوسمان بینیمان معاویە نەیدەهێشت هیچ قسەزانێك تێکەڵی خەڵکی شام بێت. کاتێك ئەبوزەڕ تێکەڵ بەهەژارانی شام بوو، قسەی لەبارەی ئەو ڕەوتە هاوبەشییە بۆ دەکردن کە دەیزانی، معاویە نامەیەکی بۆ عوسمان ناردووە دەڵێ:" ئەبوزەڕ دەیەوێت خەڵکی شام تووشی خراپە بکات".جگە لەمەش کاتێك معاویە لە شەقامەکانی شام دەڕۆیشت ئەوا پاسەوان و داردەستی لەگەڵ دابوون، کەژاوەکەی تەواو لە شێوەی قەیسەرەکان بوو.

کەچی عەلی کوڕی ئەبوتالب بەمشێوەیە لە کوفە نەدەڕۆیشت. دەگوترێت بەتەنیا لە شەقامەکانی کوفە دەڕۆیشت و قسەی لەگەڵ میوەفرۆش و گۆشتفرۆش دەکرد، لەگەڵ دوکاندارەکان دادەنیشت. لەکاتێ بەرەو صەفەین دەڕوات، هەندێك لە کوێخا و

---

[١٤٢] المصدر السابق،ص١٥

موڵکدارەکانی ئەنبار دەبینن و بەرەو ڕووی دەچن و کڕنۆشی بۆ دەبەن وەك ئەوەی لە پێشتر ڕاهاتبوون، بەڵام ئەو دەڵێ:" ئەمە چی دەکەن؟" وتیان:" ئێمە دروستکراوین بۆ ئەوەی میرەکانمان مەزن بکەین." بەڵام ئەو دەڵێ:" بەخوا بەم شێوەیە میرەکانتان سوودیان بۆ ئێمە نابێت، بەم شتانە خۆتان تووشی زەحمەتی دونیا و قیامەت دەکەن"[١٣٣]. کاتێکیش ئیمام عەلی لە صەفەین گەڕایەوە، قەڵغانەکەی ونکرد. بینی لەلای کەسێکی مەسیحییە، پیاوەکەی گرت و هێنایە لای قازی کوفە. ئیمام لە تەنیشت پیاوە مەسیحییەکە وەستابوو، بۆئەوەی قازی کێشەکەیان یەکلا بکاتەوە. ئیمام نەیتوانی بەڵگە بهێنێتەوە، بۆیە قازییەکە قەڵغانەکەی دا بە مەسیحییەکە، ئەویش بردی و ئیمامیش سەیری دەکرد..."[١٣٤].

***

مامۆستا عەباس مەحموود عەقاد دەڵێ:" ململانێی نێوان عەلی ومعاویە تەنها ململانێی ئەبوو لەسەر شتێك کە بەسەرکەوتنی یەکێکیان کۆتایی بێت، بەڵکو ناکۆکی نێوان دوو سیستەمی پێچەوانە و دووجیهانی ڕکابەر بوو. یەکێکیان نوێنەرایەتی خەلافەتی ئایینی دەکرد و ئەویتریان نوێنەرایەتی دەوڵەتی دونیایی دەکرد"[١٣٥].

بۆیە مەسەلەکە هێندە سادە نییە وەك پیاوانی ئایینی و بیرمەندانی کۆن تێگەیشتوون، بەڵکو ڕاستتر پەیوەندی بە ململانێی نێوان دیموکراسیەت وستەمکاریی هەیە. یان پەیوەندی بە ململانێی نێوان ڕاوێژکردن وملکەچیی، ململانێی نێوان سیستەمی دادپەروەریی و یەکسانی و ستەم و تاکڕەویی هەیە.

مامۆستا موحیدین خەتیب دەڵێ:" ئەهلی سوننە، ئەوان خوادەپەرستن پێیان وایە عەلی و ومعاویە و سەحابەکانی تری پێغەمبەری خودا، هەموویان لەسەر (هەق) بوون، لە پێناوی دا دڵسۆز بوون...هتد". دەمانەوێ لە بارەی (هەق) پرسیار لە مامۆستا

---

[١٣٣] محمد عبده، المصدر السابق،ج٣،ص ١٦٠

[١٣٤] عباس العقاد،ص٤١

[١٣٥] المصدر السابق،ص٨٠

بکەین، ئەگەر مەبەستی لە دەوڵەتی قەتحکردن بێت بەناوی خوداو پێغەمبەر، ئەوا بۆچوونەکەی پەسەندە. بەلام دەبینت معاویە لە عەلی بە باشتر بزانێت، ئەوەك یەکسانیان بکات. چونکە عەلی جیاوازیی خستە نێوان موسڵمانان و مێزەکەی ئەوانی لاواز کرد، کەچی معاویە ئەوانی کۆکردەوە بەرەو فەتحکردنێکی فراوان و ناوەدانییەکی مەزنی بردن. بەلام لێرەدا دەتوانین بڵێین عەلی بە تێڕوانینێکی دیکە سەیری عەقی دەکرد، پێیوابوو ئیسلام ئایینە بەر لەوەی دەوڵەت بێت. بۆیە زیاتر لەپێناو دادپەروەریی و یەکسانی جەنگا، نەوەك فەتحکردن و زاڵبوون.

***

هەندێك لە رۆژهەڵاتناسان محەمەد بەوە تۆمەتبار دەکەن، گوایە لە شێوەی جەنگیزخان بووە، سەرکردەیەکی(بەدو) بووە، میللەتەکەی بەرەوتالان و زاڵبوون بردووە. بۆیەش لایەنگرانەی بەرەو شەڕ بردووە، رەوایەتی بەشەڕ داوە، پێچەوانەی ئەوەی مەسیح ئەنجامی داوە. ئەوان ئەوەیان بیرچووە کە محەمەد لەسەرەتای دەعوەی ئیسلام وەك رێچکەی مەسیح رۆیشتووە، بە ئاشتەوایی بانگەشەی بۆ خودای خۆی دەکرد و هاتی دەدان لێبووردە بن و سەبریان هەبێت، چاکە وخراپە لەیەکتر جیابکەنەوە. نزیکەی ١٢ ساڵ لەسەر ئەو رێچکەیە ماوەیە، لە ئەنجامی ئەوەشدا قورەیش بۆ کوشتنی کۆبوونەوە، هێندەی نەمابوو سەرکەون، ئەگەر خودا داوی جاڵجاڵۆکە و هێلکەی کۆتری بۆ نەرەخساندبوایە وەك باس دەکرێت[١٢٦]. ئەگەر ئەو کات قورەیش لە کوشتنی پێغەمبەر سەرکەوتوو بوایە، ئەوا محەمەد وەك مەسیحی برای دەچووە مێژوو، ئەوکاتیش مێژوونووسان جیاوازییەکیان لە نێوان یەدی نەدەکرد.

[١٢٦] لەڕاستیدا ئەوەی جاڵجاڵۆکە و کۆتر لە ئەشکەوتە کردیان لە پاراستنی پێغەمبەر و هاوڕێیەکەی ئەوا رووی مێژووی گۆڕی، مێژوو رووداوێکی وەها بچووکی بەخۆیەوە ئەبینیوە کە ئەو دەرئەنجامە کۆمەڵایەتییە گەورەی لێبکەوێتەوە.(عەلی وەردی)

هەرکاتێك محەمەد بەساغ و سەلامەتی دەگاتە مەدینە؛ ئەوا سەبارەت بە قورەیش دەست بە گۆڕینی پلانەکەی دەکات. دوای ئەزموونێکی تاڵ کە لە مەککە بەسەری تێپەڕیبوو، بۆی دەرکەوت کە قورەیش ملکەچی بانگەشەی نابن بە شمشێر نەبێت. بۆی دەرکەوت کە عەرەبیش نابن بە موسڵمان تەنها دوای سەرکەوتنی بەسەر قورەیش نەبێت. چونکە عەرەب دەیانگوت:" با محەمەد جەنگ لەگەڵ هۆزەکەی خۆی بکات، ئەگەر سەرکەوت دیارە بەڕاستی پێغەمبەرە"[137]. پرۆفیسۆر تۆینبی دەڵێ:" ئایا محەمەد پاشایەتی دەویست، یان پێغەمبەر بوو مەبەستی چاکسازی بوو؟" تۆینبی لەوەلامدا دەڵێ:" ژیاننامەی محەمەد لەسەرەتای بانگەشەکەی دەریدەخات، کە لە باوەڕدا بۆ پەیامەکەی راستگۆ بووە، بەلام دوای کۆچکردن گۆڕانکاری لە ژیاننامەکەی روودەدات، مەبەستیشی ئەوە بوو ئەو لە کۆمەڵگایەك دەژی جیاوازیەکی گەورەی لەگەڵ کۆمەڵگاکەی مەسیح هەبووە"[138]. توێژینەوە کۆمەلایەتییە نوێیەکان لەو بۆچوونەدا پشتگیری تۆینبی دەکەن؛ ئەو عەرەبانە کە پێغەمبەر لە ناویان دەرکەوت خاوەن بەهای بەدەویی بوون. ئەو بەهایەش هێز بەمانای هەق دادەنێت، بۆیە مەیلیان بەلای باوەڕی پێغەمبەرێکی بێ هێز نییە، تەنانەت تا ئێستاش بەدوەکان هێز بە بەڵگەی راستیی دەزانن. یەکێك لە پەندەکانیان ئەوەیە دەڵێ" هەق بە شمشێر وەردەگیرێت و بێ هێزیش پێویستی بە شاهێدە"[139].

مێژوو باسی ئەوەمان بۆ دەکات، محەمەد ماوەیەکی زۆر لە مەککە مایەوە و بەشێوەیەکی ئاشتییانە بانگەشەی بۆ ئایینەکەی کردووە؛ بەلام خەڵك بەرەوپێشوازی نەچووە، چەند کەسێکی نەبێت، ئەوکەسانەش خەڵکی مەککە و

[137] ارنولد: الدعوة الى الاسلام، ص ٤١

[138] Toynbee, stud of history, V.III,P.468-469

[139] بەوردی شارتوێی ئەو بابەتە دەکەین لەکتێبی دراماتورمان بەناوی (عێراقی و بەهای بەدوەکان) (عەلی وەردی)

مەدینە بوون کە دواتر بە ناوی موهاجیر و ئەنسار ناسران. بەڵام سەبارەت بەعەرەبی بیابان ئەوکات تەنها کەسێك بووە ئیسلام ،ئەویش ئەبوزەری غەففاری بوو. بەزمی ئەو پیاوەش سەیرە !.

کەچی دوای فەتحکردنی مەککە، بەدوەکان بە فەوج دەهاتنە ناو دینی خودا. ساڵێك دوای فەتحکردنی مەککە بە ساڵی وەفدەکان(عام الوفود) ناسراوەن ئەمەش لەبەر زۆری هاتنی وەفدی هۆزە عەرەبییەکان بوو بۆ لای پێغەمبەر. پرۆفیسۆر نکلسۆن ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، جەنگی بەدر یەکەم رووداو بووە سەرنجی هۆزە عەرەبییەکانی بۆ لای محەمەد راکێشاوە و بەهۆی ئەو جەنگەوە بە محەمەد سەرسام دەبن. نیکلسۆن لەبارەی جەنگی بەدرەوە دەڵێ:" هەرچەندە عەرەب کەم بایەخیان بە ئاینی محەمەد دەدا، بەڵام دواجار نەیانتوانی هیچ بکەن تەنها ئەوە نەبێت رێز لەو پیاوە بگرن، کە خانەدانەکانی مەککەی ملکەچ کرد"[14]. لە ئەنجامدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، محەمەد بۆ حەزکردن لە جەنگ و زاڵبوون رێگای جەنگی نەگرتۆتە بەر وەك هەندێك لە رۆژهەلاتناسانی دوژمنی ئیسلام بۆی دەچن، بەڵکو بەناچاری پەنای بردۆتە بەر جەنگ. ئەگەر ئەوها نەبووایە، ئیسلام لە کەنداوی عەرەب نەدەبوو. لەراستیشدا جەنگەکانی محەمەد تەنها رووبەك بوون لە رووەکانی ئەو شۆڕشە کۆمەلایەتییەی ئەنجامی دابوو. شۆڕشگێرانیش لە هەموو سەردەمەکان لە سەرەتای بانگەوازی دا رێگای ئاشتیانە دەگرنەبەر. ئەگەر لایەنگریان زۆر کۆبۆوە بەشێوەیەك بتوانن لە جەنگ هاوکاریان بکەن، ئەوا هێرشی کوشندە دەکەنە سەر نەیارەکانیان، بە شێوەیەك پێگەی کۆمەلایەتی و خۆشگوزەرانییان لەناو دەبەن.

***

ئیبن ئیسحاق کە یەکەم کەسە ژیاننامەی پێغەمبەری نووسیوەتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خودا بەر لە بەیعەتی عەقەبە رێگای بەشەرکردن نەدا، خوێنرشتنی بۆ

[14] Nicholson, Literary History of the Arabs, p174

حەلاڵ نەکرابوو، بەڵکو فەرمانی دەکرد موسڵمانان دوعا بکەن و لە ئازارچەشتن دان بەخۆدابگرن. لە کافرانیش خۆش دەبوو. قورەیش ئەوکاتە زۆرترین ئازاری موسڵمانانی دەدا، لە زێدی خۆیانی وەدەری دەنان. هەندێك لەسەر ئایینەکەی خۆیان پەرێشان دەبوون، هەندێك ئازاریان دەچەشت، هەندێك زێدی خۆیان بەجێهێشت و چوونە حەبەشە. هەندێکی دیکەش بۆ مەدینە. لە هەموو رووبەکەوە قورەیش بەرەنگاری ئایینی خودا دەبوونەوە، بەمشێوەیە خودای گەورە رێگای بی پێغەمبەر دا تا بجەنگێ و بەسەر ئەو کەسانەی سەرکەوێ کە ستەمیان کردووە، یەکەم ئایەتیش کە لە بارەی رێگەدان بەجەنگ و حەڵاڵکردنی خوێنی ئەرکەسانەی زوڵمیان کردووە، ئەو ئایەتەیە کە خودا دەفەرموێ:

" أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا ۚ وَإِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ الذين اخرجوا من ديارهم بغير حق إلا ان يقولوا ربنا الله ولولا دفع الله الناس بعضهم ببعض لهدمت صوامع وبيع وصلوات ومساجد يذكر فيها اسم الله كثيرا ولينصرن الله من ينصره إن الله لقوي عزيز الذين إن مكناهم في الأرض اقاموا الصلاة وآتوا الزكاة وأمروا بالمعروف ونهوا عن المنكر ولله عاقبة الأمور "[٦١١]، [٦١٢].

ئەمە ئەو ئایەتەیە کە یەکەم جار لە مێژووی ئیسلامدا رێگەی بە شەڕکردن داوە، خوێنەر دەتوانێ لەو ئایەتە تێبینی سێ خاڵ بکات:

١-خودا رێگەی بە موسڵمان نەداوە جەنگ بکەن، تەنها لەبەر ئەوە نەبێت ئەوان ستەمیان لێکراوە لە ئەنجامی باوەڕبوونیان بە بیرۆکەیەك.

٢-رکابەری کۆمەڵایەتیی و بزاوی کۆمەڵایەتیی، بابەتێکی سروشتییە. ئەگەر ئەمە نەبێت، ئەوا ئایینێك نەبوو بۆ خوا پەرستی.

[٦١١] القرآن، سورة الحج ، الايات:٣٩-٤٢

[٦١٢] ابن هشام، السيرة النبوية، ج٢، ص١١١

٢- ئەگەر موسڵمانان بەسەر دوژمنانیان سەر بکەون، ئەوا نوێژ دەکەن و زەکات دەبەخشنەوە، کار بەچاکە دەکەن و لە خراپە دوور دەکەونەوە. خواش کەسێک سەردەخات کە ئایینی خوای سەرخستنەوە.

لەڕاستیدا، ئێمە ناتوانین لە ڕەوابوونی جەنگ لە ئیسلامدا تێبگەین، تەنها بەتێگەیشتنی ئەو ئایەتە نەبێت. دەبێت درک بەوە بکەین کەجەنگین بنەمای کۆمەڵایەتی گرنگی لە خۆیەوە گرتووە. لەو ئایەتە دەردەکەوێت کە ئیسلام شۆڕشێکی کۆمەڵایەتییە، ستەملێکراوەکان بۆ مافەکانی خۆیان لە ژیاندا دەجەنگن، لەگەڵ خۆشگوزەرانەکانیش بۆ ئەوە دەجەنگن، تا سیستەمی دادپەروەریی و یەکسانی بەرقەرار بکەن، فەرمانی خودایان لە نێودا بڵاوبکەنەوە.

ئەمە ئەو هەقە بوو کە ئیمامی عەلی تێگەیشتبوو و جیهادی بۆ دەکرد، نەوەک جیهادکردن بۆ فەتحکردن و زاڵبوون، وەک معاویە و واعیزی سوڵتانەکان تێگەیشتبوون. کەواتە ئیمام عەلی سەرەتا بایەخ بە بەرژەوەندی دەوڵەت نادات، بەر لەوە بایەخ بەو گەلانە دەدات ، کە دەوڵەت حوکمڕانیان دەکات. واعیزی سوڵتانەکان دەڵێن: معاویە لە سیاسەتی گەلاندا لە عەلی بەتواناتر بوو.عەلی بە سیاسەتی دیموکراسی موسڵمانانی پەرتەوازەکرد، کەچی معاویە خەلافەتەکەی سەرچاوەی بەرەکەت و یەکگرتن و سەرکەوتنی موسڵمانان بوو. ئەو کەسانە درک بەوە ناکەن کە ناتوانرێت کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لەسەر یەک بۆچوون رێکبخرێت؛ تەنانەت ئەگەر جوبرائیل بەڕێوەی ببات. هیچ بوارێک بۆ ئەمە نییە کە ململانێی مرۆڤایەتی سروشتێکی کۆمەڵایەتییە، وەک پێشتر باسمان کرد. بۆیە کەسێک بیەوێت خەڵک لەسەر یەک بۆچوون بێت، ئەوا وەک ئەوەیە بیەوێت بەری ڕۆژ بە بێژینگ بگرێت. لەبەر ئەوەشە دەبینین ئەو جەماعەتەی کە لە سەردەمی معاویە بە شێوەیەکی کاتی یەکگرتوو بوون، هەرکە مرد موسڵمانان خراپتر لە جاران کەوتنەوە ململانێی. موسڵمانان تەنها بۆ ئەوە لە سەردەمی معاویە یەکیان گرتبوو، بۆ ئەوەی لە دوای مردنی معاویە قووڵتر و توندتر پەرتەوازە بن.

جا راستە ئەگەر بڵێین کەسێك بیەوێت جەماعەتێك بەکیخات، ئەوا دەیەوێ هۆکارێکی دیکە بۆ جیابوونەوە زیاد بکات. پوختەی کارەکەشی ئەوەیە بۆ جەماعەتە جیاجیاکان، جەماعەتێکی دیکە زیاد دەکات. ئەگەر سوڵتانێك بیەوێت بە زەبر رەعیەتەکەی ملکەچ بکات، ئەمە دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوەی زیاتر. جا ئەگەر ئەوەی بەئاشکرا ناڕەزایی دەربەبڕێت ئەوا بەتهێنی خۆی مەڵاس دەدات، وەك دەگوترێ هەموو نشارێك تەقینەوەی لێ دروست دەبێت. یەزید هەوڵی دا بە رێگای توندوتیژی موسڵمانان ملکەچ بکات، لە ئەنجامی ئەمەش کوشتارگەی کەربەلا و مەدینە و روخانی کەعبە روویدا. لە دوای رووداوی (الحرە) خەڵکی شام بە خەڵکی مەدینەیان دەگوت:" بەیعەت بۆ ئەوە بکە کە تۆ کۆیلەی یەزیدی".ئەگەر رازی نەبووایە ئەوا دەیانکوشت. ئەمەش کوشتارگەیەکی گەورە بوو، بە مەنجەنیقیش لە کەعبەیان دەدا و هاواریان دەکرد" گوێڕایەڵی، گوێڕایەڵی"[143].

لە ئەنجامی ئەو کوشتارانەش، ئەوا بێئومێدی و بەدبەختی بەناوخەڵك بڵاوبووەوە.ئەوانەی بانگەشەیان بۆ گوێڕایەڵی دەکرد، نەیاندەزانی لە ئەنجامی کوشتنی هەرکەسێك لەسەر دەستی ئەوان، ئەوا دە کەسی تر هەست بە بەدبەختی دەکەن و هەڵێك دەقۆزنەوە بۆ ئەوەی لە دژی میری موسڵمانان راپەڕن. واعیزی سوڵتانەکان یەکگرتوویی موسڵمانانیان بۆ فەتحکردنی جیهان دەوێت. ئەگەر لێیان بپرسین " مەبەست لەو فەتحە چییە؟" دەڵێن:" بۆ بەرزکردنەوەی وشەی خودایە" وەك ئەوەی لە تێڕوانینی ئەوان خودا سوڵتانێك بێت، بیەوێ دەسەڵاتی گەلە هەڵبژاردووەکەی خۆی بەسەر گەلانی تر بسەپێنێ. خوالێخۆشبوو مەعروف رەصافی دەڵێ:" ئەو مەبەستەی کە محەمەد بۆی دەچوو تەنها ئاینێکی نەبوو، بەڵکو دەیەویست راپەڕینێکی گەورە ئەنجام بدات و رەوتێکی عەرەبی گەورە بێت،

[143] احمد فريد الرفاعي: عصر المأمون، ج١،ص٢٩

کۆمەڵایەتی و سیاسی بێت. عەرەب ئەنجامی بدات بۆ ئەوەی دەسەڵاتیان بەسەر خەڵکانی دیکەوە بێت. ئەگەر شیاو بێت پشت بە نووسراوەکانی ئەو قەومە ببەستین لە فەرموودە و قسەکان، دەڵێین ئەو لە ڕاپەڕینە عەرەبییەکە دەیویست سوڵتان و پاشایەتی بۆ قورەیش بێت و لە ڕێگای قورەیشەوەش بۆ عەرەب بێت"[٤١٤].

جێگای داخە دەبینین شاعیری گەل کە لە هەموو ژیانی دا دژی زۆرداران بوو، کەچی پەیامەکەی پێغەمبەر بەمشێوەیە ترێوە وەسف دەکات. دیارە ئەوەی هانی داوە ئەو قسانە بکات، ئەو فەرموودانەیە کە لە کارگەی ئەبوهورەیرە و هاوشێوەکانی دەرهاتوون. ئەو فەرموودانە معاویە فەرمانی دروستکردنی داون و پارەیەکی زۆری بۆ هەڵڕشتووە تا بەو شێوە دزێوە وێنەی ئیسلام دەکێشن. دواتریش ڕۆژهەڵاتناسان دێن پشت بەو فەرموودانە دەبەستن، بۆیە بە پێغەمبەر دەڵێن" پێغەمبەری جەنگ". من باوەڕم بەوە هەیە کە پێغەمبەر بەرزتر و بەشکۆترە لە کەسانی وەك جەنگیزخان و تەیمورلەنگ، وەك ئەوەی مامۆستا فەتحی ڕەزوان بە شۆڕشگێڕی مەزن وەسفی دەکات. بەڵام ئێمە ناتوانین لەو شۆڕشەی بگەین، تا ئەوکاتە نەبێت کە ناوتوێی ژیاننامەی قوتابییەکەی بکەین کە ئەویش عەلی کوڕی ئەبوتاڵیبە. بە توێژینەوەی ژیانی ئەو قوتابیە دڵسۆزە، درك بەنهێنییەکانی مامۆستا دەکەین.

محەمەد شۆڕشگێڕ بوو، بە شۆڕشگێڕیش مرد. عەلی ئەبوتاڵیبیش کە قوتابی ئەو بوو، هەروا ژیا و هەرواش مرد. بۆیە دەبینین موهاجیر و ئەنسار کە لە کاتی تەنگانە لەگەڵ محەمەد بوون، لەگەڵ عەلی دەبن کاتێك عەلی شۆڕشێکی نوێ لە دژی قورەیش بەرپا دەکات. نەیارەکان عەلی بە خوێنڕێژی موسڵمانان وەسف دەکەن، بەهەمان شێوە نەیارانی محەمەد، ناو لە محەمەد دەنێن(پێغەمبەری جەنگ). ئەوانەی ئەو

---

[٤١٤] معروف الرصافي، آراء الرصافي،ص٧٥

جۆرە وەسفانە بەکاردەهێنن، وا دەزانن بەرەنگاربوونەوەی ستەم و زۆرداریی کارێکی زۆر ئاسانە، تەنها چاکسازیی بە خوتبە و ئامۆژگاری بریقەدار دەکرێت!.

عەلی لە یەکێک لە خوتبەکانی دەڵێ:" کاتێک لەگەڵ پێغەمبەری خودا بووین، لەگەڵ باوکان و کوڕان و برا و مامەمان دەجەنگایان، ئەمەش زیاتر باوەڕ و ئایینی پێ دەبەخشین.سەبری بۆ ئازارەکان پێ دەخشین، لەگەڵ موکڕبوون بۆ جیهاد کردن لە دژی دوژمن. بەخوا ئەگەر وەک ئێوەمان بکردایە ئەوا ئایین کۆڵەگەی نەدەبوو، ساوەڕیش نەدەڕوا، سوێند بەخوا ئەوکات خوێنمان دەڕشت و پەشیمانیش دەبووینەوە"[١١٥]. ئەو وشانەی عەلی لە ناوەڕۆکە کۆمەڵایەتییەکەی لە ناوەڕۆکی ئەو ئایەتانە دەچن کە ڕێگای بە موهاجیر و ئەنسار داوە شەڕ بکەن. ئیمامی عەلیش ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئایین ناچەسپێت بە خەبات و بزاوی کۆمەڵایەتی نەبێت. کۆچکردنیش شتێک نەبووە جگە لە خەبات و قوربانی دان و جێهێشتنی کەسوکار و سامان لە پێناو بەرەنگاربوونەوەی زۆرداران و ستەمکاران.

ئەوەی لێرەدا پێویستە ئاماژەی بۆ بکرێت، ئەوەیە موسڵمانان لە بارەی مانای کۆچکردن(هیجرەت) بۆچوونی جیاوازیان هەیە. هەندێک لەوان پێیان وایە لە دوای فەتحکردنی مەککە، هیجرەت نەماوە، وەک پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد. کەواتە موهاجیرەکان ئەو کەسانەن بەر لە فەتحی مەککە بە دوای پێغەمبەر ڕۆیشتوون. ئەوەی درەنگتر ڕۆیشتووە، ئەوا دروست نییە بە موهاجیر ناوببرێت. وەک دەردەکەوێت ئەو بۆچوون ڕەزامەندی عەلی و قورەیشی لەسەر نییە.

سەبارەت بە عەلی، ئەو پێیوابوو هیجرەت لە دوای جەنگی بەدر نەماوە. لە یەکێک لە نامەکانی بۆ معاویە ئاماژەی بۆ ئەم خاڵە کردووە[١١٦]. چونکە معاویە پشتی بە چەند موهاجیرێک دەبەست کە دوای جەنگی بەدر چوونە لای پێغەمبەر لەوانە

---

[١١٥] محمد عبده، المصدر السابق، ج١، ص ١٠٠-١٠١
[١١٦] محمد عبده، المصدر السابق، ج٣، ١٣٥

ئەبوهورەیرە و کوڕی عاص بوون. بە بڕوای ئیمام عەلی ئەوانە موهاجیری ڕاستگۆ نەبوون. چونکە کاتێک زانیان سەرکەوتن بۆ محەمەدە، ئینجا کۆچیان کرد. موهاجیری ڕاستەقینە بە لای ئیمام عەلی ئەوکەسانەن پەیوەندیان بە پێغەمبەر کرد لە ڕۆژگارێك ئیسلام سەرنەکەوتبوو.

سەیر ئەوەیە دەبینین قورەیش پێیان وایە کۆچکردن و هیجرەت بەردەوامە، نە بە جەنگی بەدر و نە بەفەتحکردنی مەککە نەبڕاوەتەوە. بۆیە قورەیش لە سەردەمی ئەمەوییەکان شامیان بە ماڵی کۆچکردن(دار الهجرە) ناودەبرد. ئەمەش لە قسەکانی سەرکردە ئەمەوییەکە بەدی دەکەین، کە لەسەردەمی یەزید هێرشی کردە سەر مەدینە. ئەو سەرکردەیە ڕووی قسەکانی لە خەڵکی شام دەکات و دەڵێ:" ئێمە خاوەن عەلی و خاوەن ماڵی هیجرەتین، بەخوا مەزندە دەکەم خوا زیاتر لە خەڵکی هەر شارێکی دیکە موسڵمانان لە ئێوە ڕازییە"[١١٧].

ئیبن خەلدون باس لە یەکێك لە سەحابەکانی پێغەمبەرمان بۆ دەکات، کە لەسەردەمی حەجاج گەڕاوەتەوە بادیە، بۆیە حەجاج پێی دەڵێ:" ئایا تۆ هەڵگەڕایتەوە، بوویتەوە ئەعرابی؟"[١١٨] حەجاج بەو قسەیە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە گەڕانەوە بۆ بادیە وەك هەڵگەڕانەوەیە لە ئایین و بەجێهێشتنی هیجرەتە. بۆیە دەبینین ئەمەوییەکان موسڵمانان بۆ دوو جۆر دابەش دەکەن: ئەعرابی(عەرەبی بەدو لە بیابان– وەرگێڕ). جۆری دووەمیش: موهاجیر. موهاجیر لە تێڕوانینی ئەوان ئەو کەسەیە ژیانی بەدو جێدەهێڵێت و لەگەڵ سوپاکەی ئەوان دەکەوێت کە بەدوای فەتح و دەسکەوت لە جیهان دەگەڕێن.

وەك دەردەکەوێت وەهابییەکانی ئەو سەردەمەمان لە بابەتی هیجرەت ڕێگای ئەمەوییەکان دەگرنەبەر، چونکە ئەوان لە ساڵی ١٩١١ وە دانیشتنی ژێر خێوەتگە و

---

[١١٧] أنیس النصولي، الدولة الأمویة في الشام، ص٧٦

[١١٨] ابن خلدون، المقدمة،ص ١٢٤

ڕەشماڵیان جێهێشتووە، لە شوێنێکی جێگیر دەژین و خانووی قوڕ دروست دەکەن بە(هیجر) ناوی دەبەن. سەرەڕای ئەمەش هۆزەکانی نەجد لاسایی یەکتر دەکەنەوە، واز لە ژیانی بادیە دەهێنن و بە جاهیلیەتی ناوی دەبەن. ژیانی تویش بە ئیسلام ناودەبەن و بە دانیشتوانی (الهجر)یش دەڵێن برایان(الاخوان)، ئەو برایانەش باوەڕیان وایە کە خەڵکی شارنشین گومڕان و داگیرکردنی نەتەوەکانی دیکە ئەرکێکە خودا دەیخاتە سەر شانی برایان. جیهاد لە لای ئەوان بە نەتەوەکانی دەوروبەر دەستی پێکرد، خوایە بمانپارێزی. هەر یەکێك بەو هیجرەتەی ئەوان تێدەپەڕی ئەوا لە مەترسیدا دەبوو. ئەگەر سمێڵی درێژبووایە ئەوا ئەو موهاجیرانە هێرشیان دەکرد، بەناچاری سمێڵی ئەوکەسیان کورت دەکردەوە ئەگەر کراسەکەشی درێژ بووایە ئەوا مقەستێکیان لێ دەدا"[149].

ئەو جۆرە موهاجیرانە ئەو کارانەیان لەفەتحکردنی مەککە و تایف و مەدینە ئەنجام داون، ئەو کوشتارانەی کە ئەنجامیان داون دڵتەزێنن. ئەگەر هاتوو بتوانن وڵاتانی تر لە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات فەتح بکەن، ئەوا شکۆمەندی ئەمەوییەکان دەگێڕنەوە، لە پێناوی خودا و پێغەمبەر پیاوان دەکوژن و ژن و منداڵان تاڵان دەکەن!"[150].

***

عەلی کوڕی ئەبوتاڵب پێیوابوو ئیسلام بۆ ئامانجێکی دیکە هاتووە نەوەك ئامانجی فەتحکردن، وەك ئەمەوییەکان و وەهابییەکان و ئەوانی دیکە تێی دەگەن. بۆیە دەبینین دەیگوت هیجرەت لە دوای جەنگی بەدر وەستاوە، لە ڕۆژگاری خەلافەتی خۆیدا زۆر پشتی بەو کەسانەی بەدر دەبەست و هەر بەوانیش هەڕەشەی لە معاویە دەکرد. جارێك بۆ معاویەی نووسیوە و دەڵێ:" من بە سوپایەکی گەورەی موهاجیر و ئەنسار دێم، نەوەی بەدر و شمشێرەکانی هاشمیین، کە شمشێر و ڕمەکانیان شوێنی خۆیان لە برا و خاڵ و باپیر و کەسوکارت دەناسنەوە. ڕۆژی زاڵمانیش دوور

[149] حافظ وهبة، جزيرة العرب في القرن العشرين، ص ٢٧٣-٢٢٧
[150] علي الوردي، وعاظ السلاطين،ص ٣٢١

نیيه"[١٥٠]. دەگوترێت ئەشتەری نوخەعی، دوای کوژرانی عوسمان هاتەلای عەلی گوایە بەیعەتی بۆ دەکات، عەلی دەڵێ" ئەمە بۆ تۆ نییە، بەڵکو بەدەستی شورا و خەڵکی بەدرە، ئەوان هەر یەکێکیان دانا، ئەو خەلیفەیە. گوێدەبیستەوە و ئاوتوێی بابەتەکە دەکەین"[١٥١]. بۆیە عەلی بایەخی بە ئەشتەر و کەسانی دیکەی عەرەب ئەداوە کە دوای تەمانی مەیتەتی محەمەد بوونەتە ئیسلام. بەڵکو ئەو بەتایبەتی سەیری خەڵکی بەدر و بە گشتیش سەیری موهاجیر وئەنسار دەکات. ئەهلی بەدر گەورەترین پێگەیان لە ئیسلامدا هەیە، چونکە ئەوان لەو جەنگە گەورەدا جەنگیان لە دژی قورەیش کرد، مەبەستیشیان تەنها بەرەنگاربوونەوەی ئەو زۆردار و ستەمکارانە بوو، بەدرییەکان چاویان لە دەسکەوت و دەسەڵات نەبوو[١٥٢].

قورەیش هەردەم کوژراوەکانی جەنگی بەدری بیر دەهاتووە، دوای ماوەیەکی زۆریش هەوڵی دەدا تۆڵەیان بکاتەوە. دکتۆر تەها حوسێن دەڵێ:" لەڕووداوی (الحرد) کە لەسەر فەرمانی یەزید کوڕی معاویە ئەنجام درا، حورمەتی ئەنسار تێکشکێنراو هەشتا کەس لە بەدرییەکان کوژران، مەبەستی قورەیش ئەوەبوو تۆڵە لەو کەسانە بکاتەوە، کە لە بەدر بەسەریان زاڵ بوون، فێرێی ئەوانی تێکشکاند[١٥٣]. ئەوەی جێگای سەرنجە کاتێك ئیمامی عەلەوی جەعفەر کوڕی محەمەد دەچێتە سەر گۆڕی عەباس کوڕی عەلی کە لە شەڕی کەربەلا لەگەڵ حوسێنی برای کوژرا، دەڵێ:" شەهادەت لەبەرامبەر خودا دەدەم، کەتۆش لەسەر رێگای بەدرییەکان و موجاهیدەکان لەپێناو خوا رۆیشتی". ئیمام جەعفەر بڕوای وایە قورەیش لە جەنگی کەربەلا ویستویەتی تۆڵەی بەدر بکاتەوە، عەباس و براکەشی لە شۆڕشەکەیان لەسەر رێچکەی بەدرییەکان دەڕۆیشتن کە لە دژایەتی ستەمکاران بوو"[١٥٤].

[١٥٠] محمد عبده، المصدر السابق، ج٣، ص٠٤
[١٥١] عبدالله العلايلي، سمو المعنى، ص٦٥
[١٥٢] TOYNBEE,OP,CIT,V,III, P468-469
[١٥٣] طه حسين، في الادب الجاهلي، ص١٣٦
[١٥٤] انيس النصولي، المصدر السابق، ص ١٣-١٤

یەکێك لەو سەیروسەمەرانەی لێکۆڵەر لەو قۆناغەی مێژوو دەیدۆزێتەوە ئەوەیە: کاتێك معاویە لە عەلی جیابووەوە، دەیگوت جەماعەتی موسڵمانان لەگەڵ ئەو دان و عەلی لەو جیابۆتەوە. معاویە بۆ ئەو نێردراوانەی عەلی نووسیوە: "...دواتر: ئێوە بانگەشە بۆ گوێڕایەڵیی و یەکگرتوویی جەماعەت دەکەن، ئەو جەماعەتەی باسی دەکەن لەگەڵ ئێمەن. گوێڕایەڵیش بۆ برادەرەکەی ئێوە قبوڵ ناکەین(مەبەست عەلییە) چونکە ئەو خەلیفەکەی ئێمەی کوشت و جەماعەتەکەی ئێمەی پەرتەوازە کرد. بکوژەکەی دالدە داوە و داوای کوشتنی ئێمە دەکات".

خوێنەر سەری لەو قسەیەی معاویە سوڕدەمێنێ. کاتێك معاویە لە ئیمامی سەردەمی خۆی یاخی دەبێت، کەچی دەڵێ عەلی لەو یاخی بووە، ئەو مەسەلەیەش جێگای سەرنجە! ئەو بەڵگەیە چییە کە معاویە دەستی پێکردووە؟ بەلای منەوە قسەکانی معاویە لەو بارەیەوە ئەوەیە، عەلی بەدوو بابەت تۆمەتبار دەکات، یەکەمیان: عەلی لە ئیمامەتی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان پێشتر دەرچووە، بەڵام بەناچاری بەیعەتی ئەوانی کردووە. دووەمیش: عەلی عوسمانی کوشتووە، بکوژەکەی دالدە داوە. بێگومان ئەو دوو تۆمەتە دروست نییە، بەڵام معاویە توانی کەسانی ئەوها بدۆزێتەوە، لەو بارەیەوە بانگەشەی بۆ بکەن و فەرموودەی بۆ دابنێن. بەمەش معاویە توانی بە خەڵك بڵێ ئەو لەسەر ڕێچکەی سێ خەلیفەکە دەڕوات و ئەو جەماعەتی پشتگیری ئەوانی کردووە، پشتگیری ئەویش دەکەن بەتایبەتی ئەو والی خەلیفەی کوژراو بووە و داوای خوێنی ئەو دەکات.

معاویە نەیتوانیوە بە ئاشکرا بانگەشەی ئەوە بکات لە عەلی باشترە و لەو زیاتر شایەنی خەلافەتە، چونکە ئەو بانگەشەیە لەلایەن موسڵمانان قبولکردنی ئاسان نەبوو، بۆیە معاویە ناچار بوو خۆی بە شوێنکەوتەی خەلیفەکانی دیکە بشوبهێنێت. ئەو قێڵەش لەلایەن زۆر موسڵمانانی ئەو سەردەمە قبولکرا.

***

ئیمام عەلی وەلامی معاویە دەداتەوە و دەڵێ" .....دواتر: ئێمە و ئێوە وەك یاسـتکردووە و هـۆگری و جەماعەتەکـەمان یـەك بـوو، دواتـر جیابووینـەوە و ئێمـە باوەڕدار و ئێوەش تکۆڵیتان کرد، ئەمڕۆ ئێمە ئیستیقامەتمان گرت و ئێوەش فتنـە، موسڵمانانی ئێوە تەنها ناچار کراون"[١٥٦]. ئەوەیان روونە کە معاویە لـە نووسـینەکەی داوای یەکگرتوویی موسڵمانان دەکات. وەلامی عەلیش ئەوەیـە یـەکگرتوویی ئـەنجام نادرێت، ئەگەر خەڵکێك رێگای دروستیان گرتبێت و ئیستقامەتیان هەبێت لە بەرامبەر ئەواتیش کەساتی فیتنەچی هەبن، کەواتە دەردەکەوێت ئیمام عەلی زیاتر بایـەخ بـە پێداگری لەسـەر راستی دەکاتـەوە و کۆششـی بـۆ دەکـات، نـەوەك یـەکگرتوویی موسڵمانان.

معاویە عەلی بەوە تۆمەتبار دەکات: گوایە موسڵمانانی پەرتەوازە کردووە. کەچی عەلی معاویـەی بـەوە تۆمـەتبار دەکرد، کـە سـتەم لـە موسـڵمانان دەکـات. بەمیەش موسـڵمانان بـوون بـەدوو بەشـەوە: تایفـەی جـەماعـەت و تایفـەی دادپـەروەریی. ئـەو تایفەیەی پشتگیریی معاویەی کرد، بانگەشەی بۆ یەکگرتوویی موسڵمانان دەکرد، کە لە رۆژگاری ئەبوبەکرە و عومەر هەبوون. کەچی ئەو تایفەیـەی لەگـەڵ عـەلی بـوون، بانگەشیان بۆ ئەو دادپەروەرییە دەکرد: کە لە سـەردەمی ئەبوبەکر و عومـەر هـەبوو. گومان لەوە نییە یەکگرتوویی و دادپەروەریی، لە رۆژگاری ئەبوبەکر و عومـەر بووە، بەلام ئەمە کاتیی بووە ناتوانێت بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بەردەوام بێـت. کۆمـەڵگای پێشکەوتوو ناتوانێ بـە تـەبایی و یـەکگرتوویی بمێنێتـەوە. بەتایبەتی ئەگـەر هـاتوو هۆکاری شارستانیەتی تێی هاتەناوەوە، ئەوکاتە دەبێت کۆمەڵگە ببێتـە دوویـەش یەکێکیان ئەوانەی بەزۆرداری خۆشـگوزەرانن، گرووپـی دووەمیش ئەوکەسـانەن کـە دژی ئەو زۆردارییە ستەم دەکەن.

[١٥٦] محمد عبده، المصدر السابق، ج٣، ١٣٤

ئیمام عومەری کوڕی خەتاب ئاماژەی بۆ ئەمە کردووە، کاتێک بینی لە ئەنجامی فەتحکردن، دەستکەوت بەسەر موسڵمانان دەبارێت. ئەبویوسف دەڵێ:" کاتێک دەستکەوتەکانی وڵاتی فارس بۆلای عومەر هێنرا، چاوی بەشتی وەها کەوت لە زێڕ و زیو و مرواری، بۆیە گریا". عەبدولرەحمان کوڕی عەوف وتی:" ئەمە جێگای سوپاسگوزارییە، بۆچی دەگری؟" عومەر وەڵامی دایەوە:" بەڵێ بەڵام خودا شتێکی وەهای بە قەومێك نەداوە، کە لە دوژمنایەتی و ڕق و قینەی بەدواوە نەهاتبێت"[٢٤٧].
لەزۆر نووسەری موسڵمانی ئەو سەردەمەم بینیوە، وەك معاویە بیردەکەنەوە. ئەوان باس لەو یەکگرتووەی سەردەمی عومەر دەکەن و دەیانەوێ ئەو یەکگرتنە تا ئەو سەردەمەمان بەردەوام بێت. بۆیە تووڕەیی خۆیان بەسەر عەبدوڵلای کوڕی سەبائی دەڕێژن، چونکە بە بۆچوونی ئەوان عەبدوڵلا هۆکاری پەرتەوازەکردنی موسڵمانان بووە.

معاویە هۆکاری پەرتەوازەبوونی موسڵمانانی دەدایە پاڵ عەلی کوڕی ئەبوتالب. بەڵام دەردەکەوێت ئەوان بوێریی ئەوەیان نەبووە عەلی بەم شێوەیە لە لای معاویە وەسف بکەن، بۆیە کەسایەتی ئەفسانەیی عەبدوڵلایان بۆ داهێناوە جگە لە جنێوا چەندین نەفرەتی ساردو گەرمیان لێدەکرد.

ئەوەی نووسینەکانی نەشاشیبی و نصول و خەتیب و صەلاح و ئەوانی دیکە بخوێنێتەوە، ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە بەڕوونی دەبینێت. دەتوانین ئەو کەسانە بە بانگخوازی یەکگرتوویی جەماعەت ناو ببەین، ئەوان یەکگرتوویی جەماعەت لە سەرووی هەموو شتەکانی دیکە دادەنێن، بایەخ بەوەنادەن ئەگەر ئەو یەکگرتنە لەسەر حسێبی ستەم و زۆرداریی بێت. مەبەستی ئەوان ئەوەیە کۆمەڵی موسڵمانان یەکگرتوو و سەرکەوتوو و فەتحکار بێت، کەچی ئەو هەڵپەرستی و بەکۆیلەکردنەی ڕوویدەدا بە تێڕوانینی ئەوان بابەتێکی کەم بایەخە. لەوانەیە زێدەڕۆیی نەکەین ئەگەر

---

[٢٤٧] ابو یوسف، کتاب الخراج، ص ٥٥،٦٥

بڵێین ئەوان نووسەرانە ڕۆڵی ئەبو هورەیرە لە شانۆی سەدەی بیستەم دەبینن. ڕەوتی ئەمەوی لە نووسینەکانی ئەوان دیارە. بۆیە دەبینین یاخیبوونی معاویە لە عەلی بەدروست دەزانن، کەچی حوسێن بەهەڵە دەزانن کە لە یەزید یاخی بووە، چونکە پێیان وایە جەماعەت لەگەڵ معاویە و یەزیدی کوڕی بوون، کەچی عەلی و کوڕەکەی بەداخەوە موسڵمانانیان پەرتەوازەکرد.

دەڵێن کاتێک حوسێن بە ڕووی یەزید وەستاوەتەوە، کوڕی عومەر پێی گوتوە: " هاوارت بۆ دەهێنم ئەی باوکی عەبدوڵڵا موسڵمانان لە یەکتر جیا مەکەوە". حوسێن لەوەلام دەڵێ: " بەخوا کوڕی عومەر ئەگەر باوکت لەژیان بوایە ئەوا پشتگیری دەکردم". لێرەدا تێبینی دەکەین دوو بۆچوونی دژبەیەکتر لێکدانەوە بۆ ئاین دەکەن، یەکێکیان بە یەکگرتوویی موسڵمانانی دەزانێت و ئەویتر بە شۆڕشێکی دەزانێ لەدژی ستەمکاران. ئەم دوو بۆچوونەش لەهەموو سەردەمەکان دەبینین، بانگخوازانی سوڵتان بانگەشە بۆ یەکگرتوویی موسڵمانان دەکەن، نەیارەکانی ئەوانیش بانگەشە بۆ بنەمەکانی دادپەروەری و یەکسانی دەکەن. ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە هەموو پێغەمبەران لایەنگری بۆچوونی دووەمن، بۆیە مەیلیان زیاتر بۆ پەرتەوازەکانی جەماعەت هەبوو، نەوەک یەکگرتنی. قورئانیش لە چەند ئایەتێک ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە. قورئان دەفەرموێ" كان الناس امة واحدة فبعث الله النبيين مبشرين ومنذرين وانزل معهم الكتاب بالحق ليحكم بين الناس فيما اختلفوا فيه وما اختلف فيه إلا الذين اوتوه من بعد ما جاءتهم البينات بغيا بينهم"[٤٥٨] هەروەها دەفەرموێ"ولو شاء الله ما اقتتل الذين من بعدهم من بعد ما جاءتهم البينات ولكن اختلفوا فمنهم من آمن ومنهم من كفر ولو شاء الله ما اقتتلوا ولكن الله يفعل ما يريد"[٤٥٩].

---

[٤٥٨] القران، سورة البقرة، اية ٢١٣

[٤٥٩] القران، سورة البقرة، اية ٢٥٣

ئەمە وەڵامی قورئانە بۆ قورەیش، کاتێك محەمەدیان بە پەرتەوازەکردنی جەماعەت تۆمەتبار کرد. ئەو وەڵامەش هاوشێوەی وەڵامی عەلییە بۆ معاویە، کاتێك معاویە بە پەرتکردنی موسڵمانان تۆمەتباری کرد وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد.ئەوەی جێگای ئاماژە بۆکردنە، ئەوا ئینجیل ئاماژەی بۆ هەمان بۆچوون کردووە، ئینجیل بۆمان دەگێڕێتەوە کە مەسیح بە قوتابییەکانی وتووە:" ئایا وادەزانن من هاتووم ئاشتەوایی بە زەوی ببەخشم؟ نەخێر، بەڵکو بەریەککەوتن و دابەشبوونە. پێنج کەس لەماڵێکدا بەسەر دوو دابەش دەبن، سێیان لە بەرامبەر دوو. دووان لەبەرامبەر سێ. باوك لە کوڕ، کوڕ لە باوك، دایك لە کچەکەی، کچ لە دایکەکەی. خەسوو لە بووك، بووك لە خەسوو جیادەبنەوە"[٦٦٠].

ئەو تێڕوانینەی ئینجیل ئەوەی قورئان و تەنەنجی بەلاغەش ئاماژەی بۆ دەکات، لەڕاستیدا پرەنسیپی دیموکراسیەتی نوێیە. چونکە خودی دیموکراسی فەلسەفەی ململانێیە. دامەزراندنی حیزبەکانی ئۆپۆزسیۆنیش تەنها وێنەیەکە لە وێنەکانی ململانێیە نەمرەکە. لە ئەتەوە نوێیەکانیشمان بینیوە: کوڕ لە حیزبێکە کە ئەیاری حیزبەکەی باوکیەتی. کچی ئۆپۆزسیۆنی حیزبی دایکیەتی. وەك ئەوەی عیسا باسی کردووە. مێژوونووسانی ژیاننامەی پێغەمبەر باس لەوە دەکەن خەڵك لە سەرەتای هاتنی ئیسلامدا هەر بەو شێوەیە دابەش بوونە. لە جەنگی بەدر ئەبوبەکر لەگەڵ محەمەد بوو، کەچی عەبدولرەحمانی کوڕی لەگەڵ قورەیش بوو. هەروەها عەلی لەگەڵ محەمەد بوو، کەچی عەقیلی برای لەگەڵ قورەیش بوو. بەدوور نەبوو کە باوك برا بکوژێت و براکان باوك بکوژن. ئەمەیە نەریتی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیی. بۆیە دەبێت دوو بەش بێت، بەشێکیان دەسەڵاتخواز و بەشەکەی دیکە ئۆپۆزسیۆنە.

ئەوانەی بانگەشە بۆ یەککگرتوویی دەکەن، لە ناخی دڵیانەوە لە واعیزی سوڵتانەکانن، ئەگەرچی بەپێچەوانەی ئەمە خۆیان دەردەخەن. بۆیە لە سەردەمە

[٦٦٠] عباس العقاد، عبقرية المسيح، ص ١٠٥

کۆنـەکان ببینیـان ئـەوان کارەکـانی خۆیـان پـەردەپۆش کـردوون، ئەگـەر یـەکێك ڕووبەڕووی زۆردارێك ببوایە ئەوا پێیان دەگوت:" بڕۆ ماڵەوە، موسڵمانان لـە یـەکتر جیامەکەوە".

***

هەرکەسێك بانگەواز بۆ چاکسازی بکات، دەبێت بەو بانگـەوازە نوێیـەی یـەکگرتوویی ئەتەوەیـە هەڵبوەشـێنێتەوە. ئـەو جیاکردنـەوەی بـۆ ئـەوەی سـەر لـەنوێ لەسـەر بنەمایەکی نوێ بونیادی بنێتەوە. بۆیە دەبیـنین هـەموو بزاوە کۆمەڵایەتییـەکان لـە یەك کاتدا ڕووخێنەر و بونیادنەرن. ئەو سیستەمی نوێ دەڕووخێنێت بۆ ئـەوەی لـە شوێنی ئەوسیستەمێکی نوێ بونیاد بنێت، لە سیستەمی کۆن دادپەروەرتر بێت.

دەگێڕنـەوە ئەبوبـەکر لـە سـەرەتای خەلافەتەکـەی خـۆی دا، دەمەقاڵێ لەگـەڵ ئەبوسـوفیان کـردووە، کـە زەعیمـی قـوڕەیش بـوو. دەنگـی بەسـەر ئەبوسـوفیان بەرزدەکاتەوە و قسەی پێدەڵێ، ئەبو قحافەی باوکی ئەبوبەکر لەوێ ئامـادە دەبێ و بەکوڕەکـەی دەڵـێ:"ئـەی ئەبوبـەکر دەنگـت لەسـەر کـوڕی حـەرب نـزم بکـەوە" ئەبوبەکریش وەڵامی باوکی دەداتەوە و دەڵێ:" ئەی ئەبوقحافە ئیسلام هەندێك ماڵی بونیادنـاوە پێشـتر نـەبوون، هەنـدێك ماڵیشـی داڕوخانـد کـە لـە جاهیلییـەت دروستکرابوون، ماڵی ئەبوسوفیان لەو ماڵانەیە کە تێکدران"[١٦١].

ڕووداوێکی هاوشێوە لە سەردەمی خەلافەتی عومەر ڕوویداوە. ڕۆژێکیان عومەر لە ئەبوسـوفیان تووڕە دەکـات و سـوکایەتی پێـدەکات. لەوکاتـەدا هنـد هاوسـەری ئەبوسوفیان دێتەدەرەوە، جنێو بە ئیمام عومـەر دەدات و دەڵـێ:" واز بهێنـە کـوڕی خـەتاب، ئەگـەر ئـەم ڕۆژە نەبوایـە ئـەوکارەت بکردایـە دەنگـی شمشـێرت بەسـەر سەرتەوە دەبوو"[١٦٢]. ئەوکاتە عومەر ڕوو لە قیبلە دەکات ودەڵێ:" سوپاس بۆ خـوا ئیسلام و موسڵمانانی سەربەرز کرد، عومەری کوڕی خەتاب پیاوێك لە عودەی، ئێستا

---

[١٦١] المقریزی: النزاع والتخاصم، ص١٩
[١٦٢] محمد الأزرقی، أخبار مكة، ص١٩٠

لە مەککە فەرمان بەسەر ئەبوسوفیانی کوڕی حەرەب دەکات کە گەورەی عەبد مناف بوو، ئەویش گوێڕایەڵی دەبێت". جارێکی دیکە ئەبوسوفیان و کۆمەڵێک لە خانەدانەکانی قورەیش دەیانەوێ بچنە لای عومەر و ڕێگەیان پێنادرێت، کەچی ڕێگە بە بیلال حەبەشی وسوهەیبی ڕۆمی و سەلمانی فارسی دەدرێت. ئەبوسوفیان زۆر تووڕە دەبێت. دواتر دەڵێ:" ئەی پیاوانی قورەیش، ئێوە کە خانەدان و پاڵەوانی عەرەبن لەبەر دەرگا وەستاون، کەچی ڕێگە بە حەبەشی و فارسی و ڕۆمی دەدرێت" یەکێك هاوار دەکات ودەڵێ" ئەی ئەبوسوفیان لۆمەی خۆتان بکەن و گلەیی لە میری موسڵمانان مەکەن؛ ئەوان بانگەوازیان قبولکرد، ئێوە بانگەوازتان بۆ کرا ڕەتتان کردەوە، لە ڕۆژی دوایی ئەوان پلەیان بەرزترە و باشترن." ئەبو سوفیان دەڵێ:" خێر لە شوێنێك نییە بیلال لێ بێت"[١٦٣].

ئەو وەسفەی کە ئەبوبەکر و عومەر بۆ ئیسلام کردوویانە، لەو قسانە دەچێت کە زانایانی کۆمەڵناسی ئەمڕۆ لە وەسفکردنی هەر بزاوێکی کۆمەڵایەتی نوێ دەیکەن،هێبیری دەڵێ:" هەموو بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی لەیەك کاتدا ڕووخێنەر و بنیادنەرە، ئاسان نییە ڕەگەزی ڕوخێنەر لە ڕەگەزی بنیادنەر لە سروشتی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان جیا بکەینەوە، ئەوەی نەیڕووخێنێت، ناتوانێت بونیاد بنێت. جا شۆڕش ڕێسا کۆنەکە دەڕوخێنێت کە پیاوە دەسەڵاتدارەکانی پێشوویانی بەرزکردۆتەوە، بۆ ئەوەی لە شوێنی ئەو ڕێسای نوێ دابنێت و ژێردەستەکان سەربخات"[١٦٤]. قورئان ئاماژەی بۆ نموونەیەکی لەو جۆرەی سەرەوە کردووە، کاتێك باسی شۆڕشی موسا دەکات لە دژی فیرعەون و دەقەرموێ:" **ونريد أن نمن على الذين استضعفوا في الأرض ونجعلهم أئمة ونجعلهم الوارثين** "[١٦٥] زانایانی کۆمەڵناسی سیستەمی کۆمەڵایەتی بە پێستی مار دەشوبهێنن، مار ساڵی چەند

---

[١٦٣] المقريزي، المصدر السابق،ص١٩
[١٦٤] Heberie.Social Movement, p366-377
[١٦٥] القران، سورة القصص، اية ٥.

جارێك پێستی خۆی دەگۆڕێت. ئەگەر وا نەبێت ئەوا پێستەکەی بەسەرلاشەیەوە بۆگەن دەبێت، بۆیە پێستە کۆنەکەی دادەکەنێت و پێستێکی گونجاوتر لەگەڵ جەستە لە شوێنی ئەو گەشە دەکاتەوە.

هاوڕێیانی لۆژیکی کۆن لەو تێڕوانینە ناگەن. بەبڕوای ئەوان سیستەمی کۆمەڵایەتی هەتاهەتایە دەمێنێتەوە و گونجاوە، بۆیە ئەوان بانگەواز بۆ خەڵك دەکەن بگەڕێنەوە سەر ئەو سیستەمە کۆنەیان، کەسەدان ساڵ لەلای خەڵك باو بووە. کەچی لۆژیکی نوێ دەڵێت گونجاو ماوەیەکی زۆر بەگونجاوی نامێنێتەوە، بێگومان بەتێپەڕبوونی کات خراپ دەبێت. بۆیە پێویستە لەسەر کۆمەڵگا هەر ماوەیەکی زەمەنی دەسەڵاتدارانی خۆی بگۆڕێت، لێرەشەوە پرەنسیپی دەستاودەستکردنی بەردەوامی دەسەڵات لە وەزارەت وسەرۆکایەتیەکانی سەدەی نوێ هاتووە.گوتمان و لێرەش دەیڵێینەوە کە دیموکراسیەتی نوێ تەنها شۆڕشێکی سپییە، بەشێوەیەك گەل لە ماوەیەکی دیاریکراو بەهۆی هەڵبژاردنەوە دەسەڵاتدارانی خۆی دەگۆڕێت، ئێستا گەلان کاغەزی دەنگدان بۆ ئەو مەبەستە بەکاردەهێنن ، کە لە کۆندا شمشێری لە پێناو بەکاردەهات[٦٦٦].

لێرەدا نابێت ئەوە لەبیر بکەین، کە شۆڕشی دیموکراسی لەپڕێکدا سپی نەبووە، بەڵکو لەسەرەتا سوور بووە، ماوەیەکی زۆریش وەها مایەوە. ئەمڕۆ ئێمە کە سوودە لەو شۆڕشە سپییە وەردەگرین، پێویستە ئەو پاڵەوانانەمان بیرکەوێتەوە کە خوێنیان لە پێناو پێشکەوتنی رشتووە. کاتێك شکۆمەندی بە شۆڕشی فەرەنسی وئینگلیزی و ئەمریکی و ئەوانی دیکە دەدەین، دەبێت شۆڕشەکەی عەلی و حوسێن و زەید و ئەوانی دیکەش بەرز رابگرین کە گیانی خۆیان کردۆتە قوربانی ئەو پرەنسیپانە؛ کە ئێمە لەو سەردەمەدا بەرهەمەکەیان وەردەگرینەوە.

***

[٦٦٦] علي الوردي، وعاظ السلاطين،ص٤٠٧

لە کتێبی واعیزی سوڵتانەکان وتم: عەلی کوڕی ئەبوتالب شۆڕشگێڕ بوو، بە شۆڕشەکەشی جەماعەتی موسڵمانانی لەیەکتر جیاکردەوە. بەو قسەیە خەڵك لە من تووڕە بوون. هەندێك هەوڵی کوشتنی منیان دا، چونکە لە دیدی ئەوان من بوومە دوژمنی عەلی[١٦٧]. یەکێك هاتەلام وتی:" چۆن دەڵێی عەلی شۆڕشگێڕ بووە، ئەو دوای مردنی پێغەمبەر لە ماڵی خۆی دانیشبوو تا بەیعەتی خەلافەتی بۆ کرا". یەکێکی دیکە بەمنی گوت:" شۆڕش لە وشەی (گا=الثور) هاتووە لەزمانی عەرەبی دا، مانای شۆڕشگێڕ ئەوەیە لەهەڵچوون و تووڕەیی لە گا دەچێت." سێیەم کەسیش وتی:" عەلی لە بژی هیچ میرێکی سەردەمی خۆی نەوەستایەوە، بەڵام کاتێك بەیعەتی بۆ کرا معاویە لە بەرامبەری وەستایەوە".

کارەساتی ئەو کەسانەیە ئەوەیە تێناگەن و ویستی تێگەیشتنیان نییە. ئەوان باوەڕیان وایە وشەی شۆڕش لە عەرەبی لەوشەی (گا) هاتووە، ئەمەش ماناکەی ئەوەیە هەڵچوون و ئاژاوە و خوێنڕشتنە. گومان لەوەدا نییە ئەوان ئەو مانایەیان بەپێی لۆژیکی کۆن لێکداوەتەوە، ئەو لۆژیکەی لەژێر سێبەری سوڵتان و زۆردارەکان دەڕوێ، بە پاشماوەی خوانی ئەوان گەشە دەکات.

گوایە لە زۆرزانیی خۆیانە، ئەوان سیفەتی شۆڕشگێڕیی لە عەلی دادەماڵن و بە معاویەی ئەیاری دەدەن، دواتر دەڵێن ئەوان عەلیان خۆشدەوێ(گیانمان فیدای ئەو بێ) سەیرتر ئەوەیە نووسەرێك لە فەیسەڵیەوە دێت و وێنای ئەوە دەکات کە ڕۆژی قیامەت هاتووە، نووسەری ئەو چەند دێڕە لەبەردەستی پێغەمبەر و ئیمام عەلی دراوەتە دادگا. دواتر گوایە دەخرێتە ناو ئاگر و خەڵکی قیامەت لەبەر ئەو هاوار دەکەن، بەڵام ئەوکاتە شتێك دادی نادات و بەنەفرەت بێت دەخرێتە دۆزەخەوە.

---

[١٦٧] ئەگەر هەندێك ڕێکەوتی چاك نەبووایە ئەوا من ئەمڕۆ لە گۆڕدابووم و شەهیدی زەندیق بووم، کەس داخی بۆم نەدەبوو.(عەلی وەردی)

راستە ئەگەر بڵێین ئەوانە لە دەستوپێوەندی معاویەن، ئەگەر لە ڕووکەشیش خۆشەویستی خۆیان بۆ عەلی دەردەبڕن، ئەوانە شێوازی بیرکردنەوەیان جیاواز نییە لە بیرکردنەوەی ئەبوهورەیرە و واعیزەکانی دیکە کە ملکەچی بۆ سوڵتان بەملکەچی خـودا دەزانـن و جـەختیش لەسـەر یـەکگرتووی موسـڵمانان دەکەنـەوە.دەکرێت بگوترێت کە ئەبوهورەیرە لەوانەش باشتر بووە، چونکە ئەبوهورەیرە پارەیەکی زۆری لە معاویە وەرگرت و یەکێک بوو لە پیاوە پەرێزەکانی. کۆشکی بونیادنا و ژنی لـە کچـە خانەدانـەکان هێنـا، و دونیـا بـۆ ئـەو بـوو. کەچـی ئەوانـەی دیکـە دونیـا و قیامەتیان دۆڕاند، ئەمەش دۆڕانێکی گەورەیە.

دەبێ ئەوان بزانن ئەو بۆچوونانە هی سەردەمی کۆن بوون، بـۆ ئـەو سـەردەمەمان نـاگونجێن کـە تێیـدا دەژیـن. ئـەمڕۆ جیهـان لـە شۆڕشێکی کۆمەڵایـەتیی مـەزن و گۆڕانێکی فیکریی مەزندایە. بۆیە پێویستە لـەوە بگـەن کـە شـۆڕش لـە قسـەکانمان مانای ئەوە نییە لە سروشتی گا و گامێش هاتووە، بـەڵکو چـەند پرەنسـیپێکی نـوێن فەرمانڕەواکـەمان دەهێنێتـە ئاسـتی مـرۆڤ و لێپێچـینەوەیان لەگـەڵ دەکـات و چاوەدێرییان دەکات. لە چەمکە نوێیـەکان چەمکێک نییـە بـاس لـەحوکمی خـودایی و جەماعەتی موسڵمان و خەلافەتی خودا بکات.

جـا دیموکراسـیەتی نـوێ، پرەنسـیپی حـوکمی خـودایی گۆڕیـوە بـۆ پرەنسـیپی لێپرسینەوە و چاودێری وەک مۆنتیسکۆ وتویەتی. ئەمڕۆ فەرمانڕەوا بۆتـە یـەکێک لـە خـەڵک، خـەڵک بـۆ بـەڕێوەبردنی کاروبـاری گشـتی خۆیـان بـەکاری دەهێـنن. ئەگـەر ببینیش ئەو سەرۆکە کردەوەکانی خوارووخێچە، ئەوا زلەیەک لـە ڕووی دەدا و لەسـەر کورسیە ئەرمونیانەکەی دەیهێنێتە خوارەوە. شۆڕش لە چەمکە ڕاستیەکەی وەک هێربێری باسی دەکات، مەرج نییە پەیوەست بێت بە توندوتیژی[١٦٨]. ڕەنگە کەسێک لە ماڵی خۆی دانیشتووە، بەڵام بە شۆڕشگێر دادەنرێت، لەبەر ئەوەی باوەڕی بە

[١٦٨] Herberie,op.cit,p367

مافەکانی مرۆڤ هەیە وەک ئەوەی لە شۆڕشی فەرەنسی و بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە مەزنەکان هاتووە. ئەگەر پەیڕەوی بۆچوونی واعیزی سوڵتانەکان بکەین، ئەوە دەبێت حیزبە دیموکراسییەکان دابخەین و ڕۆژنامە سیاسیەکان ڕابگرین، سەرکۆنەی ئەو بۆچوونانە بکەین کەپێچەوانەی بۆچوونی ئێمەن. تەنها ئەمەش بە بیانوی ئەو بابەتانە جیاوازی دەخاتە نێو موسڵمانانەوە و نەتەوە لە بەرامبەر ئەو دوژمنە لاواز دەکات کە خۆی بۆ مەڵاس داوە.

ئەو کەسانە ئەوەیان لەبیرکردووە، کە ستەم زیاتر لە مشتومڕ وململانێ زیانی بۆ میللەت هەیە. لە وتە ئاینییەکان هاتووە" کوفر بەردەوام دەبێت، بەڵام ستەم بەردەوام نابێت". ئەو نەتەوەیەی ململانێی حیزبەکانی تێدایە، لە ڕووی مانەوە بەهێزترە لەو نەتەوەیەی کە دەسەڵاتداری ستەمکارە و ڕەعیەتیش بێدەنگە. لێرەدا تێبینی ئەوە دەکرێت ئەو یەکگرتووە زیاتر ڕووکەشە لە نەخۆشی دەچێت، نەوەک سیستەمێکی زیندوو. یەکگرتووە بە زەبری شمشێر، ئەوکاتەش کە شمێشر دەچێتەوە کالانەوە دەبینی ئەو یەکگرتنە وەک خانوێکی داڕماو دەکەوێتە سەر زەوی.

***

واعیزی سوڵتانەکان وادەزانن خەباتکردن لە دژی ستەمکاران کارێکی زۆر ئاسانە، ئەو بابەتە بە تێڕوانینی ئەوان وەک بابەتەکانی دیکەی چاکسازی کۆمەڵایەتییە، تەنها پێویستی بەوەیە ئامۆژگاری بیرقەدار بەسەر خەڵک بخوێنێ" ئەی خەڵکینە ستەم مەکەن، خوا ستەمکارانی خۆش ناوێت." کاتێک ئەو قسانە دەکەن وادەزانن ستەمکار کە گوێبیستی ئەوان دەبێت، واز لە ستەمکاریی دەهێنێ. ئەوەیان لەبیرکردووە کە ستەمکار درک بەوە ناکات خۆی ستەمکارە، بەڵکو وادەزانێ دادپەروەرترینی خەڵکە و زۆرترین جیهاد لەپێناوی خودا دەکات.

ستەمکار کاتێک گوێ لە واعیزەکان دەگرێت و ئەواتیش زەمی ستەمکاریی دەکەن، ئەوکاتە ستەمکار زۆر دڵخۆش دەبێت، چونکە وادەزانێ مەبەستیان زەمکردنی

دوژمنەکانیەتی، سەبارەت بەخۆشی ئەو زەمکردنە ئایگرێتەوە. چۆن شایەنی زەمە؟ گوایە ئەو لەسەر کتێبی خودا و سوننەتی پێغەمبەر دەڕوات. ئەمەش هۆکارێک بوو وایکرد ستەمکاری سەردەمە کۆنەکان واعیزەکان مەزن بکەن و بەخششیان پێبدەن و چەند مزگەوتی گەورەیان بۆ دروست بکەن. هەرچەندە واعیز زۆر هاواری لە دژی ستەمکاری بکردایە، ئەوا لە دڵی ئەو ستەمکارانە نزیک دەبوو، چونکە ئەوان زەمی زوڵم دەکەن، کەچی ئەو هاوڕێ زۆردارەمان خۆی بە دادپەروەر دەزانێ. واعیز چەندین شێوازی ڕەوانبێژی بۆ ووتەکانی بەکاردەهێنێ. کە بەلای زۆردارانەوە جوان و دەڵێن: "دەمخۆش، خودا شوێنەت زۆر بکات" دواتریش لە شوێنەکە دەردەچن و دڵیان پڕە لە دوعا بۆ ئەو بەندە چاکانە، کەچی بەندەکان لەسەر مەینەتیەکەی خۆیان دەمێننەوە.

ئەو وەعزە ئایابانەخاوەنەکانیان کۆششێکی زۆریان بۆ هونەرەکانی رەوانبێژی و زمانەوانیی داوە، دواتر لە حەواوە یەک لەدوای یەک فڕێی دەدەن، لە بەدبەختی مرۆڤ لە دێرزەمان ئەو جۆرە وەعز و خوتابانە تەنها بە شەپۆلەکانی هەوا بڵاودەکرانەوە، کەچی ئێستا بە شەپۆلەکانی ئەسیر و ڕوناکی بڵاودەکرێنەوە بەتایبەتی دوای دامەزرانی تەلەفزیۆنەکان. خوا پشتیوانمان بێت. بەهەر حاڵ ئەو خوتابانە تەنها شەپۆلەکانی هەوا دەجوڵێنن، وەک ئەو باوەشێنەی کە بەندەکان لە ئاغاکانیان دەکرد، بۆیە ئەو ئامۆژگاریانەش بۆ حەسانەوە و شێلاندنە. ئەو سەردارانەش پێویستیان بە یەکێکە شێلانی بۆ بکات و بیحەسێنێتەوە.

***

پێغەمبەر محەمەد دەڵێ" ئەگەر بینیت ئومەتی من لەوە دەترسێ بەرەوڕوو بەستەمکار بڵێ تۆ ستەمکاری، ئەوا لە چاکسازی ئەو بێئومێد دەبێت"[٦٦٩]. کەواتە بابەتەکە ئەوە نییە تۆ بەرەهایی بێ دەستنیشان کردن، زەمی ستەمکاریی بکەیت،

---

[٦٦٩] عبدالقادر المغربي، الاخلاق و الواجبات، ص ١٦٠

بەڵکو دەبێت بەڕەورووی بەکەسە بڵێی " تۆ ستەمکاری". خەڵکی لە سەردەمی نوێدا ئەمەیان دەکات، تەنانەت گەیشتە ئەوەی بە فەرمانڕەوا بڵێن" ئەی گەورەمان دابەزە تۆ یەکەڵکی حوکمڕانیت نییە".

لە جەنگی دووەمی جیهان فشاری ئەڵمان بۆ سەر بەریتانیا زیاد بوو؛ یەکێک لە ئەندامانی پەرلەمانی بەریتانیا بە سەرۆکوەزیرانی گوت:" لاریمان نییە لەپێناو وڵات بجەنگین، بەڵام لاریمان لەوەیە لەژێر سایەی سەرکردایەتی پیاوێکی سەرلێشێواوی وەک تۆ بجەنگین." هەواڵەکە لە ڕێگای ئاژانسەکانەوە بە هەموو دونیا بڵاوبویەوە. کەسێکیش بەو ئەندامەی نەگوت جیاوازی دەخەیتە ناو خەڵک و نەتەوە ئاواز دەکەیت. ئەو قسەیەش یەکێک بوو لە هۆکارەکانی کەوتنی سەرۆک و دانانی کەسێکی بەتواناتر لەشوێنی ئەو. بەمەش بەریتانیا لە جەنگدا سەرکەوتنی بەدەستهێنا.

# عەلی وعومەر



ململانێی نێوان شیعە وسوننە لە دوایین شێوەدا وەك ئەوە دەردەكەوێت ململانێی نێوان عەلی و عومەر بێت، وایلێهاتووە خەڵك بە شیعە دەڵێن(خزمانی عەلی) و بە ئەهلی سوننەش دەڵێن(خزماتی عومەر). ئەمەش بە ئاشكرا لە سەردەمی عوسمانییەكان لە عێراق دەركەوت، كاتێك ركابەریی نێوان سەفەوییەكان و عوسمانییەكان توند بوو. لەوكاتەوە خەڵكی عەوام بە شێوەیەكی سەیر بەو بابەتەوە سەرقاڵن، تەنانە بیرئەرێكی سادە وادەزانێ عەلی و عومەر لە ژیانی خۆیاندا رق وقینەی نێوانیان زۆر توند بووە.

دواتر ستایشكار و حیكایەخوانەكان ئاگرەكەیان خۆشتركردووە. هەر كۆمەڵێك زێدەرۆیی لە چاكەی خۆشەویستەكەی خۆی كردووە، بۆئەوەی چاكەی نەیارەكەی بشكێنێ. ئەوەی تاوتوێی ئەو كتێبانە بكات كە لەو رۆژگارەمان لە بارەی ئەو بابەتەوە بڵاودەبنەوە بەروونی ئەمەی بۆ دەردەكەوێت. لێرەوە حەزناكەین پەنجە بخەینە سەر ئەو كتێبانە، نامانەوێ ئاوازێكی دیكە بۆ تەمبورەكە زیاد بكەین.

کێشەی عەقڵی مرۆڤایەتی ئەوەیە ئەگەرهاتوو جەختی کردە سەر خراپەکاریی یان چاکەکاریی کەسێک، ئەوا زێدەڕۆیی تێدا دەکات. ئەو ئەگەر کەسێکی خۆشەویست، سەرجەم کارەکانی ئەو کەسە بە چاکە لەقەڵەم دەدات. بەڵام ئەگەر رقی لێبوو ئەوا هەمووی دەکاتە خراپەکاریی. ئەمەش بابەتێکە لە ژیانی رۆژانەمان تێبینی دەکەین. کەسی خۆشویستراو لە هەموو گوفتار و رەفتاری چاکەکارە، ئەگەر شتێکی خراپەمان لێبینی کە شایەنی داشۆرین و زەمکردن بێت، ئەوا بە لۆژیک پاسا و بیانووی بۆ دەهێنینەوە. بێگومان هەق بە کارەکەی دەدەین. شاعیرێکی عەرەبی ئاماژەی بۆ ئەمە کردووە و دەڵێ:"

**عين الرضا عن كل عيب كليلة ولكن عين السخط تبدي المساويا.**

"چاوی رەزامەندی وەک شەوە کەموکوڕییەکان نابینێ، کەچی چاوی رق هەموو کەموکوڕییەکان دەردەخات"

***

چەند کەسێکی بیانی لەبارەی ململانێی نێوان عومەر و عەلی پرسیاریان لێکردم " سەرچاوەکەی ئەو ململانێیە چییە؟" ئەو پرسیارە گرنگییەکی کۆمەڵایەتی هەیە. بیانییەکان کە سەرەتای مێژووی ئیسلام دەخوێننەوە دەبینن پاکی و بێگەردی لە نێوان عومەر و عەلی هەیە. عومەر زەواجی لەگەڵ کچی عەلی کردووە. یاراتی عەلی ویلایەتی گرنگیان لە سەردەمی عومەر وەرگرتووە. عومەر لە چەندین بابەت راوێژی بە عەلی دەکرد و ستایشی دەکرد. عەلی بەهەمان شێوەی ستایشی عومەری دەکرد دوای مردنیشی وەک لە نەهجی بەلاغە هاتووە[170] بەباشی باسی کردووە.

جا ئەو هۆکارە چییە، وایکردووە دوای مردنیان لەیەکتر دوور بکەونەوە، کەچی لەژیانیان بەتەواوی لەیەکتر نزیک بوون؟ لێرەوە ئەفلاتونییەکان دێن و هەوڵدەدەن ئەو دیاردە کۆمەڵایەتییە سەیرە بە لۆژیکە کۆنەکەیان شرۆڤە بکەن. هەندێک لەوان

---

[170] محمد عبده، نهج البلاغة، ج ١، ص ٢٤٩

دەڵێن"هەموو هۆکارەکە بۆ ئەو ئەریتە دەگەڕێتەوە ،کە عەبدوڵلای کوڕی سبائە، ئەو عەلی وا دەرخست کەرقی لە عومەرە، بەو جیاوازییە دژێوەش ئیسلامی تووشی کاولکاری کرد"هەندێکی دیکە دەڵێن:" نەخێر و هەزار نەخێر، هۆکارەکە خودی عومەر بوو، ئەو رقی لە عەلی بوو، دەیویست زیان بە عەلی بگات و لە چاکەکانی عەلی کەم دەکردەوە کە وەک رۆژی رووناک دیار بوون".

توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکان بەیەکەوە، پێچەوانەی هەردوو بۆچوونن. یەکەم تێڕوانین هیچ وپووچە و وەرناگیرێت، ئاسان نییە بۆ کەسێک هەرچەندە بلیمەتیش بێت لە زۆرزانی و فێڵ، ئەوا ناتوانێت ئەو کارەساتە تووشی ئیسلام بکات، بێ ئەوەی کەسێک رووبەرووی بێتەوە و سزای بدات. بۆچوونی دووەمیش بێمانایە. رووداوە مێژووییەکان ئەوە ناسەلمێنن کە عومەر رقێکی تۆدی لە عەلی بووە، ئەگەر وابووایە هاوسەرگیری لەگەڵ کچی عەلی نەدەکرد و هاوڕێیانی عەلی لە ویلایەتە گرنگەکان نەدەکرد بەوالی.

***

نکۆڵی لەوە ناکەین هەندێک رکابەری و ناکۆکی لەنێوان عەلی وعومەر راستەوخۆ دوای مردنی پێغەمبەر روویدا، بەتایبەتی لە ژیانی خاتوو فاتیمەدا، چەندین مێژوونووسیش ئاماژەیان بۆ ئەو رووداوانە کردووە، بەڵام ئەمە بابەتێکی کاتیی بوو، وەک زانراوە بە مردنی فاتیمە کۆتایی هات. ئەوکاتە عەلی بەیعەتی بۆ ئەبوبەکر کرد و پاڵپشتی کرد. هەر ئەوکارەشی لەگەڵ عومەر کرد، کاتێکی خەلافەتی وەرگرت.

ئێمە دەزانین زۆرجار ناکۆکی و دەمەقاڵێ دەکەوێتە نێوان برادەران. خوا لەنێو مرۆڤدا هاوڕێیەتی دروست نەکردووە بێ ناکۆکی و دەمەقاڵێ بێت، هەرچەندیش دۆستایەتییان قووڵ بێت. ئەو ناکۆکییەی لەنێوان برایان دروست دەبێت دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی باوە، لە هەموو سەردەم و شوێنێک روودەدات. جا ناکۆکی نێوان عەلی و عومەر لە دوای مردنی پێغەمبەر لەبارەی خەلافەتەوە بوو، چونکە عەلی وایدەبینی خۆی لە کەسانی دیکە شایەنترە، کەچی عومەر دەیەویست خەلافەت بۆ ئەبوبەکر

بێت، بۆئەوەی خۆی لەدوای ئەو وەریبگرێت. ئەمە بابەتێکی ئاساییە جێگای سەرسوڕمان نییە. هەموو مرۆڤێك مافی خۆیەتی چاو بڕێتە سەرۆکایەتی ئەگەرهاتوو هەستیکرد توانای هەیە. لەسەر ئەوەش سیستەمی دیموکراسی بونیادنراوە کە ئیسلام بە(نیزامی شورا) ناوی دەبات. بۆیە ئێمە گلەیی لە پیاوێك ناکەین کۆشش بۆ وەرگرتنی سەرۆکایەتی بکات. بەڵکو گلەیی لەوە دەکەین کاتێك سەرۆکایەتی وەردەگرێت بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی و کەسوکار و زاواکانی قۆرخی دەکات.

ئەفلاتونییەکان دەیانەوێ مرۆڤ بۆ سەرۆکایەتی کۆشش نەکات، ئەو کۆششکردنە بە تێڕوانینی ئەوان ئەنگیەکی گەورەیە. ئەو تێڕوانینەشیان لە ڕەوتە سوڵتانییە کۆنەکەیان وەرگیراوە. سوڵتان دەیەوێت کارەکە تەنها بۆ خۆی بێت و کەسیش بەرەنگاری نەبێتەوە، بۆیە واعیزەکان هەردەم بە خەڵکیان گوتووە داوای سەرۆکایەتی نەکەن، بۆ ئەوەی بابەتەکە بەدروستی بەدەست سوڵتانەکەیان بمێنێتەوە و خوا شکۆمەندی بکات.

کەچی لە سیستەمی دیموکراسی بۆ گەیشتن بەدەسەڵات رکابەری لەنێو چەندین کەس دەکرێت، بۆ گەیشتن بەکورسی دەسەڵات. ئەگەر ئەو رکابەرییەش نەبێت، ئەوا زۆرداران بەسەر خەڵکەوە زاڵ دەبن و کۆشش و ماڵی خەڵکی بۆ ئارەزووە تایبەتەکانی خۆیان بەکاردەهێنن. گومانم لەوە نییە عومەر خەلافەتی بۆ خۆی ویستووە. لەپێناوی ئەمەش چەندین ڕێگای گرتۆتەبەر. بەڵام کاتێکیش دەسەڵاتی گرتەدەست ئەوا بەچاکی بەکاری هێنا و ئیمامێکی دادپەروەر بوو کە نموونەی لەمێژوودا کەمە. وەك دەردەکەوێت عەلی لەسەرەتادا لە عومەر تووڕە بوو. بەڵام کاتێك بینی دادپەروەرە و لەسەر هەق لە گلەیی کەس ناترسێت، ئەوا بەخەلافەتی ئەو ڕازی بوو.

بە بڕوای من عەلی کوڕی ئەبوتاڵب خەلافەتی بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی نەدەویست، بەڵکو بۆ ئەوەی بوو پرەنسیپەکانی شۆڕشگێڕی گەورە محەمەدی کوڕی عەبدوللا جێ بە جێ بکات. لەبەر ئەوەش دەبینین لە هەموو کەسێك گوێڕایەڵتر

بووە، ڕێز و ئامۆژگاری بۆ ئەبوبەکر و عومەر هەبووە. ئەوانیش هەر ئەوکارەیان دەکرد کە عەلی دەیویست. کەواتە کە ئامانجەکە جێ بە جێ بوو ئەوا ناکۆکییەکەش نامێنێ.

هەندێک لەوانەی زێدەڕۆیی دەکەن، دەڵێن عەلی لەترسان لە بەرامبەر عومەر تەرمی نوواندووە. لەبەر ئەوەش ڕازی بووە کچەکەی خۆی بدات بە عومەر، چونکە عومەر هەڕەشەیەکی توندی لێکردووە. هەندێکیش دەڵێن عومەر لەگەڵ خودی کچی عەلی زەواجی نەکردووە، بەڵکو ژنێکی لە جنۆکە هێناوە لە شێوەی کچی عەلی بووە و کچی عەلیش لە ماڵەوە پاکیزە بووە.

ئەو قسانە گونجاوە خەڵک لە چایخانە بیکات، بەڵام شایەنی ئەوە نییە لەسەر مێزی توێژینەوەی زانستی دابنرێت. چونکە لەڕاستیدا عەلی و ئەبوبەکر و عومەر هەر هەموویان لە یەک حیزب بوون، ئەویش حیزبی شۆڕشەکەی محەممەد بوو. بۆیەش بینیمان بەربەرەکانی قورەیش دەکەن و سەلمان فارسی و بیلالی حەبەشی و سوهەیبی ڕۆمی لەسەرووی قورەیشەوە دادەنێن. ئەگەر ڕۆژێک لەڕۆژان ناکۆکییەکی تەنك لە نێوانیان هەبووە، ئەمە مانای ئەوە نییە ئەو ناکۆکییە دەبێتە دروشمی ململانێیەکی کۆمەڵایەتی گشتیی و خەڵك لە پێناویدا یەکتر بکوژن و جنێو بە یەکتر بدەن.

***

ئێستاش دەگەڕێینەوە سەر ئەو پرسیارەی کە لەسەرەتای ئەو بەشەوە کردمان: ئەو هۆکارە چی بوو، کە ناکۆکییەکی توندی لە نێوان عومەر و عەلی دوای مردنیان دروست کرد؟ ئەوە لە خوێنەر ناشاردرێتەوە ماوەیەکی زۆر ئەم بابەتی مێشکی منی قووڵ شۆك کرد. ئەو پرسیارە دەبێت هەموو توێژەرێکی کۆمەڵایەتی بایەخی پێ بدات، بەتایبەتی ئەگەر توێژەر لە وڵاتێك بێت ململانێی نێوان خزمانی عەلی و خزمانی عومەر توند بێت.

دوای توێژینەوەیەکی دوورودرێژ بینیم معاویە رۆڵێکی گەورەی هەبوو لە وروژاندنی ئەو رکابەرییە. چەندین هۆکاری دەروونیی و کۆمەڵایەتیش لەمەیاندا هاوکاریان کردووە. رەنگە یەکێك بپرسێت: ئایا معاویە لە وروژاندنی ئەو ململانێیەی نێوان عومەر و عەلی چ سوودێکی دەبینی؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە دەبێت خۆمان بخەینە شوێنی معاویە و بە تێڕوانینی ئەو سەیری بابەتەکان بکەین.

کەموکوڕی مێژوونووسەکانی ئێمە ئەوەیە بە دیدی ئێستامان سەیری رووداوەکانی رابردوو دەکەن و بەپێوەری ئەو سەردەمەمان پێوانەی دەکەن. ئەمەش هۆکاری کەمتوانایی ئەوانە لەچارەسەرکردنی ئەو لوغزانەی لاپەڕەکانی مێژوو لەخۆیان گرتووە. مێژوونووسی راستەقینە ئەو کەسەیە لەو واقیعە بژیت، خۆی یەکێك بێت لە کارەکتەرەکان، زەینی خۆی پڕ بکات لەو چەمکانەی کە ئەوکات باو بوون. لەبەرئەوەش بوو ئێمە ناتوانین لە ململانێی نێوان عەلی ومعاویە بگەین بەو پاشکۆ فیکریی و کۆمەڵایەتییانەی کە لەو ململانێیە دروست بوون. تەنها دەبێت کێشەکە لەسەرەتاوە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەین، بگەڕێینەوە سەر ئەو رۆژەی کە بەیعەتی خەلافەت بۆ عوسمان کرا. لەوکاتەش تۆوی چاوبڕینە خەلافەت لە لای معاویە شین بوو. خەلافەتی معاویەش شتێك نییە تەنها بە شێوەیەك لەشێوەکان درێژکراوەی خەلافەتی عوسمان بووە.

***

کاتێك عومەر مرد، هەڵبژاردن بۆ خەلافەت تەنها لە نێوان دووکەس بوو، ئەوانیش عوسمان و عەلی بوو. عەبدولرەحمان کوڕی عەوف رێگەپێدراو بوو کە بەیعەتی یەکێکیان یەکلا بکاتەوە. شەوی بەر لە بەیعەت بۆ عوسمان، کوڕی عەوف تا بەرەبەیان لەگەڵ عەلی کۆبووەوە و قسەی لەگەڵ کرد و لێی پاڕایەوە. کەسێك نازانێ ئەو شەوە چی روویداوە، کوڕی عومەر دەڵێ:" ئەوەی بەتۆی گوت من دەزانم

ئەوا بێ ئاگایانە ئەو قسەیە

عەبدولرەحمان چی بە عەلی و عوسمان گوتووە، ئەوا بێ ئاگایانە ئەو قسەیە

دەکات"[171].

کاتێك بەیانی خەڵك لە مزگەوت کۆبوونەوە. کوڕی عەوف یەکەمجار بەرەو عەلی

رۆیشت و وتی" بەڵێن و پەیمانی خودات لەسەرە، دەبێت بە کتێبی خودا وسوننەتی

پێغەمبەر و ژیاننامەی دوو خەلیفەی دوای ئەوان بڕۆین". عەلی وتی:" تکام وایە

بەپێی زانینی خۆم و ئیجتهادی خۆم کار بکەم". کوڕی عەوف خۆی وادەرخست کە

لە وەڵامەکەی رازی نییە؛ بۆیە دواتر بەرەو عوسمان چوو و قسەکانی عەلی بۆ

دووبارە کردەوە ئەویش لەوەڵامدا گوتی:" بەڵێ". ئەوکاتە عەبدولرەحمان کوڕی

عەوف بەیعەتی بۆ عوسمان کرد و خەڵکیش دوای ئەو بەیعەتیان بۆ کرد.

ئەو چیرۆکە زۆربەی مێژوونووسان لەسەری کۆکن، بەڕاستیش چیرۆکێکی سەیرە و

چەندین نهێنی گەورە دەشارێتەوە. چی وایکرد کوڕی عەوف بەیعەت بۆ عەلی بکات و

دواتریش لێی پاشگەزبێتەوە؟ لێرەدا رۆژهەڵاتناسان دەکەونە گومانەوە، خەیاڵی

بوونی پیلانگێڕی دەکەن. گوایە پیلانگێڕییەکە بەشەو رێکخراوە، ئامانجیش ئەوە

بووە عەلی بەهەر هۆییەك بێت لەخەلافەت لابدرێت وعوسمان لە شوێنی ئەو

دابنرێت[172]. بەهەرحاڵ، ئەو وشەیەی (بەڵێ) کە عوسمان خەلافەتی پێ وەرگرت بۆ

ئەو کارەسات بوو، چونکە خەڵك چاوەڕوانی ئەوەیان لە عوسمان دەکرد کۆپییەکی

راستەقینەی دوو خەلیفەکەی پێشووی بێت. یان لە خواپەرستی و سادەیی و

دادپەروەریی لەسەرووی ئەوانەوە بێت. ئەمەش بابەتێکی زۆر ئەستەم بوو یاخود

مەحاڵ بوو، بەتایبەتی بۆ پیاوێکی وەك عوسمان.

چونکە عوسمان یەکێك بوو لە پیاوە دەوڵەمەندەکان، لە پۆشینی جلی نەرم و

خواردنی چەور و ماڵی فراوان راهاتبوو. سەرەڕای ئەمانەش لە ماڵێکی خۆشگوزەران

[171] عباس العقاد، ص١٤٢

[172] بەوردی لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو لایەنە دەکەین ئەمەش لە کتێبی داهاتوومان بەناوی" هەقیقەتی ئاناماده لە ئیسلامدا" (عەلی وەردی)

و خێزانێکی دەمارگیر و بەقیز گەورە بووبوو. یەکێك لە سیفەتەکانی دیکەی عوسمان ئەوەبوو زۆر نەرم و شەرمن و لێبوردە بوو، زۆر زەحمەت بوو داوای یەکێك لە کەسوکار نزیك و بەناز‌ەکانی رەت بکاتەوە. هێشتا عوسمان خەلافەتی بەتەواوی وەرنەگرتبوو، کە جیاوازییەکەی ئەو لەگەڵ عومەر بەڕۆشنی دەرکەوت. بێگومان لەسەرەتادا ئەو جیاوازییە زۆر سادە بووە، بۆیە ئەوەی توێژینەوەیەکی لۆژیکی رووتی بۆ بکات بایەخێکی ئەوتۆ بەو جیاوازییە نادات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بابەتە کۆمەڵایەتییەکان زۆر کەم ملکەچی لۆژیك دەبن. خەڵك لە بابەتەکانی خۆیان بە لۆژیکی رووت بیرناکەنەوە، بەڵکو بە بەراورد و زێدەڕۆیی بیردەکەنەوە، بۆیەش هەندێکجار جاڵجاڵۆکە لە چاوی ئەوان دەبێتە وشتر.

عوسمان تاڕادەیەکی زۆر بەدبەخت بوو، ئەو لەدوای عومەری کوڕی خەتاب خەلافەتی وەرگرت، رکابەرەکەشی عەلی کوڕی ئەبوتالیب بوو. ئەو دووپیاوەش زەمانە ناتوانێت نموونەیان لە ڕووی خواپەرستی و زوهد بێنێت. کەواتە هەر کارێك کە عوسمان ئەنجامی دەدات، دەبوایە سەرنجی خەڵك رابکێشێت و بەراوردی بکەن بەوەی دوێنێ عومەر ئەنجامی داوە و عەلیش سبەی ئەنجامی دەدات. ئەوەی کێشەکەش ئاڵۆز دەکات ئەوەیە، قورەیش بە خەلافەتی عوسمان دڵخۆش بوو- لەکەس شاراوە نەبوو کە هێندەی ئەمابوو لەخۆشیان باڵ بگرن. قورەیش زۆر عوسمانی خۆش دەویست، دایکان کاتێك لەئامێزیان سەمایان بە منداڵەکانیان دەکرد دەیانگوت:

احبك والرحمن حب قريش عثمان

" بەخوا تۆم خۆشدەوێ، وەك خۆشەویستی قورەیش بۆ عوسمان"

***

شایەنی باسە، سێ توێژی ئەوکات رقیان لە قورەیش بوو:

١-ئەنسار یان خەڵکی مەدینە: ئەو دوژمنایەتییەی نێوان قورەیش و خەڵکی مەدینە لە جەنگی (بەدر)ەوە دەستی پێکرد، بۆیە گوتراوە کارەساتی(الحره) کە

لەسەردەمی یەزید لە مەدینە ئەنجام درا، وەك تۆڵەكردنەوەی قورەیش بوو: چونكە ئەوان لە بەدر سەربەرزی قورەیشیان تێكشكاند و پیاوماقوڵانی قورەیشیان كوشت[١٧٣].

٢-موهاجیرەكان: ئەوانەی كە قورەیش لەسەرەتای بانگەوازی ئیسلام دەیچەوساندنەوە. ئەوان لەبیریان نەكردبوو كە قورەیش ئەوكات چی بەسەرئەوان هێنابوو. مرۆڤ ئازارەكانی رابردووی بەئاسانی لەبیر ناكات.

٣- ئەعراب، یان هۆزەكانی عەرەب: ئەوانە قورەیشیان بە خۆسەپێنەر دەزانی كە دەیویست هەموو چاكەیەك بۆخۆی قۆرخ بكات. مشتومڕێكی دوورودرێژ لە سەردەمی عوسمان لە نێوان ئەوان و قورەیش روویدا[١٧٤].

ئەو سێ توێژەش، جەماوەری موسڵمانانی ئەوكاتەی پێكدەهێنا. ئەمەش واتای ئەوەیە عوسمان لە كاتێكی ناسك بوو بەخەلیفە، هەموو چاوەكان چاودێرییان دەكرد و لەدوای هەڵەی ئەو دەگەڕان. هەركە هەڵەیەكی دەكرد خەڵك دەیانكرد بە هەرا و زێدەڕۆییان لە گێڕانەوەی دەكرد. كوڕی عومەر دەڵێ" هەندێك شت لە عوسمان بەعەیب زانرا، ئەگەر عومەر ئەنجامی بدایە ئەوا شتێك نەدەبوو"[١٧٥]. ئەو قسەیە خاڵی نییە لە ڕاستی. عومەر لەسەر خۆی و كەسوكاری توند بوو، لە بەرامبەر قورەیشیش توند بوو. لەبەر ئەوە جەماوەر لێی رازی بوو، ئەگەر هەڵەیەكی بكردایە چاوپۆشیان دەكرد، چاوی رەزامەندی هەموو عەیبێك دادەپۆشێ.

هەموو مرۆڤێك هەڵە دەكات. گرنگ سۆزی خەڵكە بەرامبەر ئەو كەسەی هەڵە دەكات. ئەگەر خۆشیان ویست ئەوا بیانو بۆ هەڵەكەی دەدۆزنەوە و پەردەپۆشی دەكەن. بەڵام ئەگەر رقیان لەو كەسە بێت، ئەوا چاكەكانیشی دەكەن بە خراپە. جا مرۆڤ لەهەر شوێنێك بێت ئەمە سروشتی مرۆڤە. مامۆستا صادق عەرجون دەبەوێت

---

[١٧٣] طه حسین، في الأدب الجاهلي، ص١٣٦

[١٧٤] الطبري، تاریخ الامم و الملوك، ج٥ ص٨٦

[١٧٥] محمد جادالمولى، انصاف عثمان، ص٢٦

داکۆکی لە عوسمان بکات و دەڵێ:" کەسوکاری عوسمان خەڵکێکی هەژار و کەمدەرامەت بوون؛ بۆیە پێویستیان بە هاوکاری عوسمان هەبوو. عوسمان بەرلەوەی خەلافەت وەربگرێت دەستی لەگەڵ کەسوکاری کراوە بوو زۆر بەخشندە بوو. ڕەوا نییە کەسێك پێگەی گەورەتر وەربگرێت لە کەسوکاری دابڕێت. لەوانەیە ئەو پێگە بەرزەی عوسمان وەریگرتووە، پێویست دەکات زیاتر خەرج بکات کاتێك دەزانێت ئەمەش لەگەڵ دادپەروەر و ڕاستی بەریەکتر ناکەوێت".

دواتر مامۆستا عەرجون باس لە کەسە نزیکەکانی ئەبوبەکر وعومەر دەکات؛ دەڵێ:"لەوانەیە ئەوان توانایان لە پەیداکردنی بژێوی لە کەسوکاری عوسمان زیاتر بووبێت؛ بۆیە پێویستیان بە هاوکاری ئەو دووپیاوە نەبووە؛ لە ماوەی خەلافەتیاندا"[٢٢٦] . ئەو داکۆکییە جێگای قبوڵکردنە. بەڵام بەداخەوە خەڵك بەو جۆرە بیرناکەنەوە. چەمکە لۆژیکیەکان تەنها لەلای خاوەنەکانیان شایەنی پەسەندکردنن؛ کەچی خەڵك چەمکی تایبەت بە خۆی هەیە. ئەوانەی دەیانەوێ بە قیاسی لۆژیك بایەتەکانی کۆمەڵگا پێوانە بکەن، ئەوا تووشی شکستێکی گەورە دەبنەوە.

***

عوسمان ئەو برایەی کە لەدایکی بوو، ناوی وەلید بن عەقبە بوو، لە کوفەی دانا. وەلید بە بەدکاری و خواردنەوەی مەی بەناوبانگ بوو. دەگوترێت ڕۆژێکیان لە مزگەوتی کوفە پێشنوێژی دەکرد؛ کاتێك تەواو بوو بەخەڵکی گوت:" دەتانەوێ بۆتان زیاد بکەم" خەڵك بەمە لێی تووڕەدەبن و هێرشی دەکەنەسەری، ئەنگوستیلەکەی لەدەست دەکەنەوە و ئەویش ئاگادار نییە؛ دواتر هێنایانە لای عوسمان و لێرەوە بابەتی چیرۆکەکە دەست پێدەکات. عوسمان لەو کەسەی دەپرسی کە ئەنگوستیلەکەی هێناوە:" تۆ بینیوتە براکەم مەی بخواتەوە؟" پیاوەکە

[٢٢٦] صادق ابراهيم عرجون، عثمان بن عفان،ص١٠٢

دەڵێ:" پەنا بۆ خوا بێنیم، ئەو ورگی دەرپەڕیبوو، ئەنگوستیلەکەم لە دەستی کردەوە، ئەو سەرخۆش بوو ئاگادار نەبوو".

وەك دەردەکەوێت عوسمان بەو شاهیدییە ڕازی نەبووە و کەموکوڕی لێگرتووە، لێرەوە عەلی دێتە ناو بابەتەکە و داوا لەعوسمان دەکات وەلید کەنارگیر بکات و سنووری بۆ دابنێت. دەمەقاڵێ لە نێوان ئامادەبووان دروست دەبێت، هەندێك لایەنگیری عەلی دەکەن و هەندێکی دیکەش لایەنگیری عوسمان دەبن. دواجار عوسمان ناچار دەبێت وەلید بهێنێتەوە مەدینە. قامچییەکە بۆ عەلی فڕێ دەدات بۆ ئەوەی جەڵدە لە وەلید بدات، وەلید لەوکاتە بەعەلی دەڵێ" ئەی خاوەنی باج(مکس)" ئەوکاتە عەقیل لەو قسەیە تووڕە دەبێت و ئەویش جنێو بە وەلید دەدات و ئەوکاتەش وەلید دەکەوێتە بەرقامچی عەلی وعەلی وەلید دەخاتە سەرزەوی و قامچەکەی بەرز دەکاتەوە ئەو کاتە عوسمان دەڵێ" مافی ئەوەت نییە، ئەوە بکەیت" . عەلی لەوەڵامدا دەڵێ" بەڵێ ئەگەر خراپەیەکی وەها بکات، دەبێت هەقی خودای لێوەربگیرێتەوە". کاتێکیش عەلی لە لێدانی وەلید دەبێتەوە و دەڵێ" با قورەیش بانگی جەلادەکانی بکات"[١٧٧].

ئەو چیرۆکە لە ڕووی کۆمەلایەتیی ودەروونییەوە گرنگییەکی زۆری هەیە. مێژوونووسانی کۆن بایەخیان بەو لایەنە نەداوە، بەڵکو لەسەر پەیوەندی عوسمان بە بابەتەکەوە ناکۆکیان لەنێوان دایە. هەندێکیان گوتیان عوسمان لەسەرەحەق بوو، کاتێك نەرمی لەگەڵ وەلید نواند، چونکە شاهیدەکان بەراستی نەیانبینی بوو وەلید مەی بخواتەوە. ئەو جۆرە مێژوونووسانە پێیان وایە قەومەکە لەگەڵ وەلید دەمارگیرییەکیان کردووە، کەئەو مافەیان نییە. بۆیە لە کاتی جەلەدەکردنی عوسمان

---

[١٧٧] ئەو قسەیە لەلایەن چەندین مێژوونووسانی نموونەی تەبەری ئیبن حەنبەل و مەسعودی و واقیدی بەچەندین شێوەی جیاوازە دەگێڕنەوە. بەڵام من پوختەکەم گواستۆتەوە(عەلی وەردی).

بە وەلیدی برای دەڵێ" ئەی برام سەبر بگرە، خوا توانات پێدەبەخشێ و ئەو قەومەش دان بەتاوانەکەیان دەنێن"[٦٢٨].

هەندێك لە مێژوونووسانیش پێچەوانەی ئەو بۆچوونەیان هەبوو، پێیان وابوو هەڵوێستی عەلی دروست بووە. ئێمە لێرەدا بەلامانەوە گرنگ نییە کامیان لەسەرهەق بووە، خەڵك بایەخ بە پاساوی شەرعی نادەن، هێندەی بایەخ بەو کەسە دەدەن کە حوکمی شەرعی لەسەر جێ بە جێ دەکرێت. لە بەشی پێشووش وتمان بیرۆکەی رووت هیچ بایەخێکی نییە، کاتێك بە جەواوە دەوەستێ و دوور لە خەم و کێشە کۆمەلایەتیی و دەروونییەکانی خەڵك دەبێت. فەرمانڕەوای دادپەروەر لە زۆر گوفتار و رەفتاری سەرپێچی شەرع دەکات، کەچی خەڵك لێی رازین و ملکەچی دەسەلاتی ئەون و باوەڕیشی پێدەکەن. پاساوی شەرعی هەرکەسێك دەیەوێ بیهێنێتەوە هەرچەندە ستەمکاریش بێت. سۆفستاییەکان لە کۆندا راستیان گوتووە دادپەروەری زیاتر لە کۆمەڵگا پەیدادەبێت، نەوەك بیرۆکەیەکی ئەبستراکت بێت و لە دونیای خەیاڵدا بوونی هەبێت. بۆیە ئەگەر سەیری ئەو پاساوە شەرعییە بکەین کە عوسمان هێناویەتی، دەبینین لە رووی لۆژیکی ئەبستراکتەوە دروست بوو، چونکە شاهێدحاڵیی تەواو نابێت تەنها ئەگەر بەبینین بێت. فەقیهەکانیش لەو بوارەدا توێژینەوەی وردیان هەیە. لێرەدا بوار بۆ وردەکاری نییە. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا کێشەکە لۆژیکی و بیرکاریی نییە، بەڵکو کۆمەلایەتیی و دەروونییە. لۆژیکی کۆمەڵگاش تەواو لەلۆژیکی ژمارەکان جیاوازە، وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد.

***

ئەوەی جێگای سەرنجە عومەری کوڕی خەتاب، سیاسەتێکی پەیڕەو دەکرد لە شێوازی عوسمان جیاواز بوو. زۆرجار دەبینین سەرپێچی دەقی شەرعی کردووە، بۆ راگرتنی هاوسەنگی نێوان قورەیش و خەڵکانی دیکە. قورەیشی تەنگەتاو کردبوو و

---

[٦٢٨] الطبري، المصدر السابق، ج٥ص ٦٠-٦١

زۆرجاریش زیاتر لەوەی شەرع دایناوە سزای قورەیشی دەدا، بۆ ئەوەی ئاسوودەیی بخاتە دڵی موهاجیر و ئەنسار بەتایبەتی و دڵی ئەعراب بەشێوەیەکی گشتی. ئەوەی دەیەوێت دادپەروەری لە نێوان خەڵک بکات دەبێت سەرەتا هەستی خەڵک لەبەرچاو بگرێت نەوەک دەقی یاسایی، چونکە دەقی یاسای دادپەروەر و ستەمکار بەیەکەوە بەکاری دەهێنن.

دەگێڕنەوە کوڕێکی عەمرو کوڕی عاص لە میسر لە سوارچاکیدا گرەوی لەگەڵ ئەعرابییەک کرد، کاتێک ئەعرابییەکە بەپێشی کەوت، کوڕەکەی هێرشی کردەسەر و دارعەساکەی لەسەری دا، وتی: " ئەمە بگرە، من( ئیبن ئەکرەمین) م " دیار ئیبن ئەکرەمین نازناوێکی عەمرو کوڕی عاص بووە. کاتێک عومەر کوڕی خەتاب بەو ڕووداوە دەزانێت عەمرو کوڕی عاص و کوڕەی هێنایەوە مەدینە. کاتێک لەلای وەستان، عومەر بە پیاوەکەی گوت" ئەو قامچیە بگرە و لە ئیبن ئەکرەمین بدە" ئەو پیاوە زۆری لە کوڕەکەی عومەر دا ، تا شەکەتی کرد، دواتر عومەر وتویەتی:" لەسەری عەمرو بدە، بەخوا کوڕەکەی تەنها بە هۆی سوڵتانەکەی لە تۆی داوە" دواتر ڕووی لەکوڕی عاص دەکات وەدەڵێ:" چۆن خەڵکتان کردۆتە کۆیلە ، کەچی ئەوان بە ئازادی لەدایک دەبن"[١٧٦].

ئەوانەی لۆژیکی کۆن بەکاردەهێنن بەو دادپەروەریەی عومەر ڕازی نین، دەڵێن دەڵێن" ئەگەر کوڕ تاوانی هەبووە ئەوا تاوانی باوک چییە، تا لەگەڵ کوڕەکەی سزا بدرێت؟" ئەو خەڵکە بیریان چووە ستەمی کەم دەبێتە هۆی دادپەروەریی زۆر، دادپەروەری ڕەهاش زۆر سوود بەخەڵک ناگەیەنێ، بۆیە پێویستە هەندێک دادپەروەریی لەگەڵ ستەم تێکەڵ بکرێت بۆ ئەوەی ئامانجە کۆمەڵایەتیەکانی بپێکێت. کاتێک عومەر باوکی بەتاوانی کوڕ سزادا، چیرۆکێکی خۆشی بۆ خەڵک خوڵقاندووە تا لە دانیشتەکانیان باسی بکەن. ئەو چیرۆکەش وادەکات خەڵک لە دادپەروەریی

[١٧٦] بشیر یموت، الفاروق، ص٧٨

حکومەتەکەی دڵنیا بێت، جا بابەتەکە زیاتر کۆمەڵایەتییە. گرنگ ئەوەیە خەڵک هەست بەدادپەروەری بکات، ئەوەک خودی دادپەروەری.

ڕۆژێکیان گەنجێکی لەخۆبایییم بینی، کوڕی یەکێک لەخۆشگوزەرانەکان بوو. ئۆتۆمبیلەکەی لێدەخوڕی و دووکەنیزەی بەئازیشی لەگەڵدا بوو. ئەو لێخوڕینەکەی پێچەوانەی سیستەمی هاتووچۆ بوو، بە ئۆتۆمبیلەکەی دەڕۆیشتە سەرشۆستە و ڕێبوارەکانی دەترسان لەوەی لێیان بدات. ئەمەش بۆ ئەوەی کەنیزەکەی پێبکەنن. بەڕاستیش دوو کەنیزەکە پێدەکەنن. ئەوکات عومەری کوڕی خەتابم بیرکەوتەوە، هیوام خواست سەرلەنوێ دەربکەوێتەوە، بۆ ئەوەی دارعەساکەی لەو مێردمنداڵە لەخۆباییە بدات و لەسەری باوکیشی بدات. ئەگەر ئەو باوکەی نەبووایە ئەوا ئەو مێردمنداڵە حەمباڵێکی زەلیل دەبوو لە مەیدان، لەژێر قورسایی دەیناڵاند.

لەوانەیە ئەو بۆچوونە لەلایەن پیاوانی ئایینی و خاوەن ئایدیاڵی ئەفلاتونی جێگای قبوڵکردن نەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین بەدڵی ملیۆنان کەسە، ئەمەش تەواوە بۆ ئەو کەسانەی داوای دادپەروەریی کۆمەڵایەتی دەکەن. ئامانجی پێویست لەلایەن حکومەتی دادپەروەر ئەوەیە دڵی زۆرینە ئاسوودە بکات. بایەخ بەوە نادات کە کۆمەڵێک کەس تووڕەبن، لەوانەشە تووڕەیی ئەوکەسانە دادپەروەریی بەهێزتر و ڕۆشنتر بکەن.

ئەوەش لە عومەر زانراوە فەرمانی کردووە یەکێک لە کوڕەکانی چەڵندەی لێ بدرێت، کاتێک بیستویەتی مەی دەخواتەوە. ئەم کوڕەشی لەژێر قامچی مرد. هەندێک لە توێژەرانی هاوچەرخم بینیوە هەوڵی دەدەن عومەر لەوکارە بێتاوان دەربخەن، چونکە کارەکە بەزەبر دەزانن کە شەرع قبوڵی نییە. ئەوکەسانە درکیان بەوە نەکردووە زەبری عومەر لەسەر کوڕەکەی ئەگەر ستەمیش بێت، ئەوا سوودی بۆ خەڵک دەبێت. ئەمە متمانە دەخاتە دەروونیان و بەرەو هاوکاریی حکومەتیان پاڵ دەنێت. کێشەیەکیش نییە ئەگەر کەسێک لەو پێناوە دەمرێت.

فەرمانڕەوای دادپەروەر لەگەڵ ڕەعیەتەکەی وەك باوکێکی بیرتیژە لەگەڵ کوڕەکانی، لەوانەیە باوك هەندێکجار ناچار بێت یەکێك لە کوڕەکانی بۆ ئەوەی تاوانێکی کردبێت سزا بدات، ئەمەش بۆ ئەوەی کوڕەکانی دیکە هەست بەوە نەکەن جیاوازیان لەنێوان دەکرێت و هەموویان بەیەکچاو سەیر دەکات. لێرەشەوە ئەو پرەنسیپە دروست بووە کە دەڵێ: " دادپەروەریی ئەوەیە هەندێکجار ستەم بکەیت". کەچی کێشەی لۆژیکی ئەفلاتونی ئەوەیە دادپەروەریی بە تەواوی دەوێت خاڵیی بێت لەستەم، ئەم بابەتەش تەنها لە ئاسمان هەیە. بەڵام لە زەوی دەبێت دادپەروەریی بە کەمێك ستەم متوربە بکرێت بۆ ئەوەی بەرهەمی هەبێت.

***

خوێنەر سەری سووڕدەمێنێ کاتێك دەبینێ خەڵك لە بەرامبەر عوسمان ئەوشۆڕشە توندە ئەنجام دەدەن، کەچی دواتر لە بەرامبەر متەوەکیل وکەسانی دیکە لە سوڵتانە تزمەکان ڕاناپەڕن، کە هەزاران کەنیزەیان بەپارەی میللەت دەکڕی و شەویشیان لەنێو دەنگی تەمبوور و بادان بەسەر دەبرد. هۆکارەکە ئەوەیە عوسمان خەلافەتی لەدوای عومەر وەرگرت، ڕکابەرەکەشی عەلی کوڕی ئەبوتاڵب بوو، کەچی متەوەکل خەلافەتی لەزۆردارێك بەمیرات مایەوە، زۆردارێکیش ڕکابەری دەکرد، لەلای ڕەشید سێ هەزار کەنیزە هەبوو، کەچی متەوەکل چوار هەزار کەنیزەی کڕیبوو. جیاوازیش لەنێوان سێ و چوار زۆر سادەیە و بەسەر کەسەوە ئەرك نییە.

لەڕاستیدا عوسمان یەك لەسەر دەی ئەوە کارانەی نەکردووە کە زۆرداران لە سوڵتانە موسڵمانەکان کردوویانە. ئەو هەزاران کەنیزەی نەکڕیوە، کاری دزێو و بەدی ئەنجام نەداوە، خوێنی هیچ کەسی نەڕشتووە. هەموو ئەوکارانەی کردوویەتی ئەوەیە جلێکی نەرمی پۆشیوە و ژنەکەی خۆی بەخشڵ ڕازاندۆتەوە و کۆشکێکی گەچی دروستکردووە، کە هەیوانەکانی بڵند بوونە. هەندێك بەخشش و ویلایەتیشی بە کەسە نزیکەکانی خۆی داوە. کەس سەرنجی ئەو کارانەی نەدەدا ئەگەر لە سەردەمی

مته‌وەکیل و ڕۆژگاری ڕەشید بوویا. گرنگیەکەی ئەتها ئەوەندە بوو لە سەردەمی عوسمان بوو. بابەتەکانیش بە هاوشێوەی خۆیان بەراورد دەکرێن.

ئەگەر هۆشیاریی سیاسی لەنێو خەڵك بلاَبویەوە، ئەوا ئەستەمە بتوانرێ بە پاساوی شەرعی و ئەرگومێنتی لۆژیکی بەسەر خەڵك زاڵ بیت. ئەو بابەتە بەبەراوردکردن لەگەڵئەوەی دوێنێ ڕوویداوە تێبینی دەکرێت. لە سەردەمی عوسمانییەکان ڕێژمان لە دەسەلاَتدارێك نەدەگرت، تەنها ئەگەر دزێکی مەزن بووایە و بایەخی بە ماڵی گشتی نەدابوایە. بەلاَم ئێستا بەکاریگەری ئەو بیرکردنەوەیەی لە ڕۆژئاواوە بۆمان هاتووە دەمانەوێت دەسەلاَتدار وەك ئێمە موفلیس بێت بۆ ئەوەی پێی ڕازی بین و ڕێزی بگرین. هێشتا نیعمەتی نەباریوە، دەبینین ڕقمان لێی دەبێتەوە و چەندین چیرۆکی بێزارکەری لەسەر دادەتاشین. لە بارودۆخێکی وەها بوارێك بۆ دەسەلاَتدارەکە نییە، تەنها ئەوە نەبێت خۆی نەدار نیشان بدات ئەگەر نەداریش نەبێت.

عەمرو کوڕی ئومەیەی زەمەری بۆمان دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێکیان چێشتی خەزیرەی لەگەڵ عوسمان خواردووە(جۆرێك خواردن بووە بە قیمەی گۆشت و ڕوون و خوێ و ئارد دروستکراوە وهەندێك جاریش ماستی تێدابووە-وەرگێڕ) دەڵێ چاکترین خواردن بووە کەتامی کردووە. عوسمان دەڵێ:" خوا لێت ڕازی بێت کوڕی خەتاب؛ تۆ چ جارێك ئەو خزیرەیەت لەگەڵ خواردووە؟". عەمرو وەلاَمی دەداتەوە و دەڵێ:" بەڵێ؛ کاتێك پاروەکەم بۆ دەمم دەبرد هێندەی نەدەما بکەوێت. گۆشتی تێدا نەبوو، چەوری بوو بەلاَم ماستی تێدا نەبوو". عوسمان وتی:" تۆ ڕاستی. عومەر خوا لێی ڕازی بێت ماندوو بوو. بەخوا ئەوەی لە شوێنی بهوات، بەلاَم بەخوا لە ماڵی موسڵمانانم نەخواردووە. لە ماڵی خۆم دەخۆم. تۆ دەزانی من لە قورەیشدا لە

هەموویان دەوڵەمەندتر بووم و بازرگانییەکەم لە هەموویان باشتر بوو. ئێستاش ئەو خواردنانە دەخۆم کە نەرم و شل بێت"[١٨٠].

بێگومان زەمەری ئەو بیانوەی عوسمانی قبوڵ کردووە و پێی رازی بووە. ئەگەر خوێنەریش لە شوێنی ئەو بووایە قبوڵی دەکرد، بەتایبەتی ئەو خەزێرە بەتامە بخوات. بەڵام کێشەکە ئەوە نییە کەسێك یان دووان یان چەند کەسێك بیانوەکە قبوڵ دەکەن، بەڵکو گرنگ ئەوەیە جەماوەری خەڵك رازی بکات، ئەمەش ئەوکات کارێکی ئاسان نەبووە. ئەوان لەوە راهاتبوون کە عومەر دەستی بەخۆیەوە گرتبوو خەرجی هێندە نەبوو، نایانەوێ عوسمانیش لە رێچکەی ئەو لابدات، جا پاساوی هەرچییەك بێت. خەڵك بایەخ بەوە نادات عوسمان پارەی خۆی خەرج کردووە یان پارەی موسڵمانان، بەڵکو ئومێدیان لە خەلیفەکەیان ئەوەیە خەم لە لاوازترین کەسی رەعیەتەکەی بخوات و پارەکەی هەمووی لە هەژاران خەرج بکات بۆ ئەوەی شایەنی ئەوە بێت ئەمیر بێت. عەلی کوڕی ئەبوتالیبیش ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە لە سەروبەندی خەلافەتەکەی گوتویەتی: "چۆن لەخۆم رازی دەبم پێم بگوترێت میری موسڵمانان، ئەگەر لە زەحمەتییەکانی زەمانە لەگەڵ موسڵمانان بەشدار نەبم و لەبژێویدا لەوان خراپتر نەژیم"[١٨١].

***

ئەوەی جێگای سەرنجە، لە دوایین رۆژەکانی عوسماندا، قین لە دڵەکانی ئەو هوتافیان بەناوی دوو کەس دەهێنا، ئەوانیش عومەر و عەلی بوون، وەك ئەوەی بەو دوو ناوە رووبەڕووی عوسمان ببنەوە. لەوکاتەش عوسمان وەك ئەوە بوو بکەوێتە نێوان دوو بەرداشەوە، یەکێکیان رێبازەکەی عومەر بوو، ئەویتریش چاکەخوازی عەلی بوو.

---

[١٨٠] عباس العقاد، معاوية بن أبي سفيان، ص ١٢٠-١٢١
[١٨١] محمد عبده، نهج البلاغة، ج٣، ص٨١

ئەبوزەڕ بە عوسمانی دەگوت:" لەسەر ڕێبازی هاوڕێیەکەت بڕۆ، قسەی کەست نابەنەسەر". ئەو ڕستەیەشمان لە سەرچەم قین لەدڵ و ئەرکەسانە بیستووە کە ئامۆژگاری عوسمانیان دەکرد، تەنانەت شیعریشی لەبارەیەوە گوتراوە[182]. ئەرکاتەی خەڵک چار لەدوای چار ناوی عەلیان دەهێنا، عوسمان ناچار بوو فەرمانی دەرکردنی عەلی لە مەدینە بدات، بۆ ئەوەی خەڵک واز لە هوتافی ناوی ئەو بهێنن[183].

مێژوونووسان باس لەوە دەکەن کە عوسمان لە ڕۆژەکانی کۆتاییدا ئیرەیی لە عومەر و عەلی هەبووە. هەندێکجار گلەیی لە عەلی کردووە، زۆرجاریش لە سەرسامی خەڵک بە عومەر بێزار بووە. ڕۆژێکیان عوسمان خوتبەی بۆ خەڵک دا و وتی:" ...دواتر: هەموو شتێك ئەهامەتی خۆی هەیە، هەموو بابەتێك کەموکوڕی هەیە. ئەهامەتی ئەو ئومەتە و کەموکوڕی ئەو نیعمەتە ئەوەیە، ئەوان عەیب لە هەموو شتێك دەگرن و تانەوتەشەر لە هەموو شتێك دەدەن. ئەوشتانەیان دەوێت کەحەزیان لێیەتی و ڕەتی ئەو شتانە دەکەنەوە کە ڕقیان لێیەتی. بەخوا عەیبتان لە عەلی گرت و بەو شێوەی کە بۆ کوڕی خەتابتان بڕیار دابوو، بەڵام ئەو بەپێیەکانی ئێوەی نرم کردەوە و بەدەست لە ئێوەی دا ، بەزمان سەرزەنشتی کردن، تا لە هەموو ئەو شتانەی ڕقتان لێدەبێتەوە و یان حەزتان لێیەتی ملکەچی بوون. کەچی من لەگەڵتان نەرم بووم، شانی خۆم بۆ ئێوە داناوە، دەم ودەستم لە ئێوە گرت. کەچی ئێوە بەرەو ڕووم دەبنەوە. بەخودا لەبەر ئەوەیە من شکۆمەندترین کەس و نزیکترین پاڵپشتان و کەسێکی زۆریشم هەیە. بەخوا کەمتەرخەم نەبووم لە گەیشتن بەوەی لەدڵم دابوو ئەگەر ئێوە ناکۆکیتان لەسەر نەبوایە. ئەوە چاکەیە کەیبێ بگەیت. ئەگەر ئەو چاکەیەشم بەدەست نەهێنایە، ئەوا نەدەبووم بە ئیمام[184].

---

[182] عبدالبر، الاستيعاب، ج٢، ص٤١٠

[183] عباس العقاد، عبقرية الامام،ص٧٤

[184] طه حسين، الفتنة الكبرى،ص ج٦،ص ٢٠٤-٢٠٥

لەو خوتبەیە دەردەکەوێت کە عوسمان لە بەرامبەر عومەر هەستی بە چ ئازارێکی خەفەکراو کردووە، ئەو خۆی لە عومەر بەچاکتر زانیوە. بەڵام لەبەرئەوەی عومەر لەگەڵ خەڵک توندبووە، ئەوا خەڵک ملکەچی بووە و ڕێزیان لێگرتووە. کەچی ئەو نەرم و لێبوردەیە، بۆیە خەڵک پێی دەوێرن.

عوسمان لە بەرامبەر عەلیش هەستی بە ئازار دەکرد. جارێک دەچێتە لای عەباس، گلەیی لە عەلی دەکات و دەڵێ:" ئەی خاڵ، عەلی پەیوەندی لەگەڵ من پچڕاندووە.. بەخوا ئەی نەوەی عەبدولموتەلیب ئەگەر ئێوە بوونایە ئەوە ئەوەتان لە بەنی ئەمیم و عودەی دەبینی، بەڵام عەبدولمەناف هەقی ئەوەیان هەیە ڕکابەری نەکرێن و ئیرەیان لەبەرامبەر نەکرێت"[185]. عوسمان وا هەستدەکات عەلی لەبەر خەلافەت ئیرەیی پێ دەبات، لەبەر ئەمەش خەڵکی لێ هاندەدات. بەدوور نازانرێت (بەنی ئومەییە) لەوبارەیەوە زۆر شت بەگوێچکەی عوسمان بچرپێنن، چونکە ئەوان دەمارگیرییەکی بنەماڵەیی توندیان هەیە، بۆیە ئاساییە هەر ڕکابەرییەک بە دەمارگیریی بنەماڵەیی تۆمەتبار بکەن. عوسمانیش ناتوانێت بە قسەکانی ئەوان کاریگەر نەبێت و تێڕوانینی ئەوانی نەبێت، چونکە ئەوان کەسوکاری ئەو بوون و دەوریان دابوو. بۆیە ئەو لەشتێک ناگات، تەنها لەژێر ڕۆشنایی ئەو ترسە نەبێت کەئەوان بۆیان دروست کردووە.

تەبەری دەگێڕێتەوە: عوسمان ڕۆژێکیان لە مزگەوت خوتبەی داوە، کەسانێک هەڵساونەتەوە و ناڕەزاییان لە بەرامبەر دەربڕیوە. مشتومڕی نێوانیان توند دەبێت، تا خەڵک وردەبەردە هەڵدەگرنەوە و تەپوتۆز بەرز دەبێتەوە، هەندێک دەچنە سەر مینبەر بۆ ئەوەی پارێزگاری لە عوسمان بکەن. پیاوانی(بەنی ئومەییە) بەرەو ڕووی عەلی دەچن بەیەک وشە دەڵێن" عەلی ئێمەت تووشی شەکەتی کرد. ئەمەت تووشی میری موسڵمانان کرد، بەخودا بۆ ئەوەی بە ویستی خۆت بگەیت، دونیا کاوڵ

---

[185] البلاذري، انساب الاشراف، ج٥،ص١٢

دەکەیت"[186]. عەلی بەتوڕەیی لەبەر ئەوقسانە هەڵدەستێتەوە. ئەمە مانای ئەوەیە پیاوانی بەنی ئومەییە عەلییان بەوە تۆمەتبار دەکرد، کە لەدوای هەرجوڵانەوەیەکە لەدژی عوسمان ئەنجام دەدرێت. ئەگەر خەڵك لە مزگەوت لەیەکتر بدات. ئەوان وا دەزانن عەلی لەدوای ئەوکارەیە. وەك ئەوەی عەلی هیچ کارێکی دیکەی نەبێت، تەنها بەدوای ئەوە رابکات، بەهەموو شێوەیەك خەڵك لەعوسمان هان بدات. ئەمەوییەکان دەتوانن ئەوکارە لە بەرامبەر نەیارانیان بکەن، چونکە لەسەرەتای دروست بوونیان لەوە ڕاهاتوون. کەچی عەلی لە جوامێریی و پاکی دەروونی خۆی دا کۆشەگیر بووە و لەو کارانە دوور بووە.

عوسمان ڕۆژێکیان لەگەڵ عەلی کۆدەبێتەوە ودەڵێ:" ئەی باوکی حەسەن ئەگەر تۆ بتەوێت ئەوا خەڵك لەگەڵم دەبێت و کەس سەرپێچیم ناکات" عەلی دەڵێ:" ئەگەر سامان و هەموو شتە جوانەکانی دونیام هەبێت، ناتوانم خەڵك لە بەرامبەر تۆ بوەستێنم. بەڵام من ڕێگایەکی چاکترت بۆ ئەو مەبەستە نیشان دەدەم: کارەکانت با وەك کاری ئەبوبەکر و عومەری برات بێت. ئەوکاتە منیش کەسی تۆ دەبم و کەسیش سەرپێچیت ناکات"[187]. وەك دەردەکەوێت عوسمان قەناعەتی بەو قسەیە نەهاتووە. ئەو خۆی وەك ئەبوبەکر و عومەر بە دادپەروەر دەزانێ، لەوانەشە خۆی بە چاکتر لەوان بزانێت. بۆیە گوایە نەهامەتیەکە تەنها لەبەر عەلی و یارانی عەلییە. کەچی عەلی بەجۆرێکی دیکە سەیری ئەو بابەتەی دەکرد. بەبڕوای عەلی قورەیش سەرچاوەی نەهامەتەکییانی عوسمانن. بۆیە هەردەم ئامۆژگاری عوسمانی دەکرد لە قورەیش توند بکات، وەك عومەر لەگەڵیان توند بوو. بۆ عوسمان چاکتر بوو قورەیش لێی توڕەبن، نەوەك جەماوەر و خەڵك.

لێرەشەوە کێشەیەکی کۆمەڵایەتی قوت دەبێتەوە، کە تائێستا توێژەران تاوتوێی دەکەن. هەندێك لە والییەکانی عوسمان لە شوێنەکانی دیکە کەسانێك بوون لە

---

[186] الطبري، المصدر السابق، ج٥، ص ١١٣

[187] عبدالحسين الاميني، الغدير، ص٧٥

پیاوانی بەتی نومەییە بوون. ئەوان توانای کارگێڕی و جەنگیان هەبوو، بەڵام لە ڕووی ئایینی و کۆمەڵایەتی بێزراو بوون، ئەمەش لەبەر بەدڕەوشتیە دیارەکە و کوفرە شاراوەکەیان بوو. عەلی ئامۆژگاری عوسمانی دەکرد ئەوانە سەرەڕای تواناکەیان کەنارگیر بکات، چونکە خەڵك ڕقیان لەوانەیە. گوێڕایەڵیش بۆ خواستی خەڵك ڕەگەزێکی گرنگی چەسپاندنی دەوڵەتێکی چاکەکارە.

من وا خەیاڵ دەکەم عەلی ئەوکاتە سەیری ئەو کەلێنەی کردووە کە لەڕووی دەروونییەوە لە نێوان حکومەت و گەل دروست بووە. حکومەت هەر چەندە چاك بێت، بەڵام چاکەکەی کەموکوڕی دەبێت ئەگەر متمانەیەکی هاوبەش لەنێوان دەسەڵاتدار و خەڵك نەبێت. عومەریش لە دانانی والییەکانی هەر سەیری ئەو خاڵەی دەکرد. ئیبن خەلدون باس لەوە دەکات جارێکیان عومەر یەکێك لە والییەکانی لەسەر کار لابردووە، والییەکە دێتەلای ئیمام عومەر دەڵێ" بۆ منت لابرد ئەی میری موسڵمانان؟" ئایا هۆکارەکە کەمتوانایی بوو، یان ناپاکی؟" عومەر دەڵێ: لەبەر هیچ کامێکیان نەبوو، بەڵام نەمویست زیرەکییەکەت بەسەر خەڵك بسەپێنم"[١٨٨].

لەمەوە ڕوون دەبێتەوە گونجانی دەروونی لە نێوان دەسەڵات و فەرمانڕەوا هۆکارێکی پێویستە لە بەرقەراربوونی دادپەروەریی کۆمەڵایەتیی. بەڵام ئەگەر ئەو کەلێنە دروست بوو، ئەوا پێوەرەکان لەناودەچن و توانا و بەهرەکان پەرتەوازە و بێ سوود دەبن. بۆیە دەتوانم لەوبارەیەوە بڵێم: سەرچاوەی نەهامەتی عوسمان دوژمنایەتی نێوان قورەیش و موسڵمانانی دیکە بوو. یان بەواتایەکی دیکە لەبەر دەرکەوتنی ئەو بۆشاییە دەروونییەی نێوان دەسەڵاتدار و خەڵك بوو. کاتێکیش ئەو کەلێنە لە کۆمەڵگا دروست دەبێت، ئەوا بەتێپەڕبوونی ڕۆژگار فراوان دەبێت. ئەو کاتە شتێك سوودی نییە تەنها ئەوە نەبێت دەسەڵاتدار لە بەرزاییەکەی دابەزێت و لەسەر زەوی بگەوزێ، ئەمەش کارێکی ئەستەمە بەدەگمەن خەڵك ئەنجامی دەدات.

---

[١٨٨] ابن خلدون: المقدمة، ص١٨٩

بۆیە هەڵەیە بڵێین شۆڕش بە ئاراستەی خودی عوسمان بوو، بەڵکو راستتر دژی قورەیش بوو، بەڵام عوسمان تەنها سیمبولێك بوو، قورەیش خۆی لەپشتی ئەو سیمبولە حەشار دابوو. شۆڕشگێرانیش عوسمانییان کردە پێناوێك بۆ تۆڵەکردنەوە لە قورەیش. لەڕاستیدا عوسمان بەتەواوی مەیلی بەلای قورەیش ئەبوو. دروستە ئەگەر بڵێین ئەو لە نێوان ماڵ و مزگەوت تووشی سەرسوڕمان بووبوو. کاتێك دەچووە مزگەوت تۆبەیی و ناڕەزایی خەلکی دەبینی و تووشی پەشیمانی دەبوو، دەگریا. بەڵام کاتێك دەگەڕایەوە ماڵ کە زاوا و کەسوکاری دەبینی ئاراستەکەی دەگۆڕا و بەپیر بانگەوازەکانی ئەوان دەچوو.

وەك زانراوە عوسمان لە سەروبەندی راپەڕینەکە(گەڕابووەوە و تۆبکار بوو) وەك هەندێك لە مێژوونووسان وەسفی دەکەن. ئەمەش سەیر نییە. چونکە ئەو پیاوێك بووە رەچەڵەکەکەی لەلایەن دایکیەوە هاشمی بوو، لەلایەن باوکیەوە ئەمەوی بوو. لەسەرەتای بانگەوازی ئیسلام تاکە موسڵمانی قەومەکەی بوو، ئەمەش بەدوور نازانرێت لە ململانێیەکی دەروونی دابووبێت. ئەگەر ماڵە خاڵەکانی هانیان دەدا لەگەڵ محەممەد بێت و قوربانی لەپێناوی بدات. ئەوا ماڵە مامەکانی بەرەو ئاراستەیەکی دیکە هانیان دەدا، بۆ ئەوەی سۆزی لەگەڵ قورەیش هەبێت. بۆیە مەزندەی ئەوە دەکرێت پاشماوەی ئەو ململانێیە لەکاتی وەرگرتنی خەلافەتیش لە ناخ و دەروونی مابێت، بۆیە بینیمان جارێك بەرەو بەتی ئومەییە دەڕوات و جارێکی دیکەش پەشیمان دەبێتەوە و تۆبە دەکات. لێرەوە دەتوانرێت بە تۆبەکار وەسف بکرێت، وەك ئەوەی ئەو دوودڵی هەبێت، یەکێك لەگەڵ شۆڕشگێڕان بێت و دڵەکەی دیکەشی لەگەڵ قورەیش بێت.

بلازری دەڵێ: " کاتێك شۆڕشگێران لە عوسمانیان توند کرد، عەلی هاتە ناوبژیوانی و پەیمانێکی لەگەڵ نووسی ئەمە دەقەکەیەتی" بەناوی خوای گەورە و میهرەبان: من عەبدوڵلا عوسمان میری موسڵمانان، ئەوەی کە باوەڕداران و موسڵمانان لێی تووڕەبوون: من بۆ ئێوەم، بۆ ئێوە کار بە کتێبی خودا و سوننەتی پێغەمبەر دەکەم،

بەشی بەشخوراو بدرێت، کەسی ترساو دڵنیا بکرێتەوە، دەرکراو دەگەڕێتەوە، سەرپازەکان لە وڵاتانی بێگانە نامێننەوە، شت فەراهەم دەبێت. عەلی کوڕی ئەبوتالیب تۆێنەری باوەڕداران وموسڵمانانە بۆ ئەوەی عوسمان بەو نوسراوە پابەند بێت".

دواتر عەلی بە عوسمان دەڵێ:" بڕۆ دەرەوە قسەیەکی وەها بکە، خەڵک گوێبیستی بێت لێت قبوڵ بکەن. خوا شاهێدی ئەوەی ناو دڵی تۆیە. وڵات هەمووی لە تۆ هەڵساوەتە سەرپێ. لەوە دڵنیامەبە کە کاروانێکی دیکە لە کوفە یان بەسرە یان میسر بێت، ئەوکات دەڵێی ئەی عەلی لەگەڵیان بڕۆ. ئەگەر منیش ئەوە نەکەم ئەوا پێم دەڵێی پەیوەندیت بڕیم و سوکایەتیت دەرهەق بەمکردووە." دوای ئەوە عوسمان دەچێتە دەرەوە تۆبە و ئیستغفاری خۆی رادەگەیەنێت و دەڵێ:" ئەوەی هەڵەی کردووە با تۆبە بکات. من یەکەم کەسم ئامۆژگاری وەردەگرم، ئەگەر من هەڵەم کرد ئەوا با پیاوماقوڵانتان بێنە لام و بە رای خۆیان بمگێڕنەوە. بەخودا ئەگەر بەندەیەك بمباتە سەر هەق، دەچمەسەر رێگای، هەموو رێگاکان بەرەو خودا دەچنەوە". خەڵك بەمە دڵشاد دەبێت و بەشادییەوە لەبەردەرگای کۆدەبنەوە. بەڵام مەروان دەچێتە لای خەڵکەکە و رێگەیان لێ دەگرێت و دەڵێ" رووڕەش بن، ئەو کۆبوونەوەتان چییە؟ میری موسڵمانان سەرقاڵە، ئەگەر پێویستی بە یەکێکتان بێت ئەوا بانگی دەکات" ئەو هەواڵە دەگاتە عەلی و ئەویش بەتوڕەیی دێتە لای عوسمان و دەڵێ" ئەگەر لە مەروان رازی بێت، ئەوا ئەو تەنها دەیەوێت خراپی بۆ ئاینەکەت دروست بکات و عەقڵت فریو بدات. ئەو دەیەوێت لابدات ودواتریش پشتگیریت ناکات. منیش لەمەودوا نایەمەوە و سەرکۆنەت بکەم"[١٨٩]. ئەو گێڕانەوەیەی بەلازری زۆرینەی موسڵمانان لەسەر دروستی رووداوەکە کۆکن، بەڵام بەپێی ئارەزووی خۆیان لەسەر هەندێك وردەکاری جیاوازن. مێژوونووسان بە شێوەی جیاواز دەیگێڕنەوە و وەردەکاری زۆری دەخەنە ناو کەبەلازری باسی ناکات، بەڵام تایبەتمەندی بەلازری

---

[١٨٩] البلاذري: المصدر السابق، ج٥، ص٦٢

ئەوەیە کە ئەو لە گێڕانەوەی ڕووداوەکان زۆر دابپەروەر بووە، ئەمەش وایکردووە جێگای متمانەی توێژەرانی کۆن و نوێ بێت.

من زۆر کتێبم لە بارەی ئەو شۆڕشە خوێندۆتەوە، بەڵام بەلای‌ی بە گێڕانەوەکەی پوختەی ئەو شۆڕشەمان پێ دەدات. بەشێوەیەک پرەنسیپەکانی شۆڕش بە ڕوونی و بەکورتی تێدا تۆمارکراوە و جۆرە لێکچوونێکیشی بەو جاڕنامەیەی مافی مرۆڤ تێدایە کە لە شۆڕشی فەرەنسییەوە هاتووە. سەرەڕای ئەمەش ئەو گێڕانەوەیە هەڵوێستی عوسمان و عەلی و مەڕوان لە بارەی شۆڕش بۆ ئێمە دەردەخات. بینیمان عەلی نوێنەری شۆڕشگێڕان بووە لای عوسمان، مەڕوانیش لە لای شۆڕشگێڕان نوێنەری عوسمان بوو. عوسمانیش لە نێوان هەردوولا جێگر نییە. جارێک گوێ لەعەلی دەگرێت و جارێکی دیکەش گوێ لە مەڕوان دەگرێت. ئەم بارەش مایەوە تا ڕووداوەکە ڕوویدا.

***

عەلی شۆڕشی دژ بە عوسمان و هەڵوێستی عوسمان وەسف کردووە و دەڵێ: "تاکڕەویی کرد، خراپ تاکڕەوییەکەی بەکارهێنا. ترساندتان، ترسەکەتان خراپ بوو. خوا ناوبژیوانی ئەو کەسانەیە کە تاکڕەو و ترسێنەرن"[190]. نەمبینیوە وەسفێک لەوە جوانتر بێت. بەرپرسیارێتی شۆڕش ناکەوێتە سەر ئەستۆی خودی کەسێک. ئەوەیان شۆڕشێکە وەک شۆڕشەکانی دیکەی مێژوو. لەسەرەتادا بەشێوەی کەلێنێکی سادەی نێوان دەسەڵاتدار وخەڵک دروست دەبێت. دواتر ئەو کەلێنە فراوان دەبێت و بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار بارودۆخەکە ئاڵۆز دەبێت. هەر لایەکیان هەنگاو دەنێت، ئەوا بەرامبەرەکەی هەنگاوەکەی درێژتر دەبێت. ئەمە وەک ئەو دەمەقاڵێ و سەرزەنشتە بێ مانایەی لە نێوان دوو پیاو دروست دەبێت و توند دەبێت. قسەیەک لەو، قسەیەک لەم. تەنها چەند چرکەساتێکە دەبینین خەنجەر رادەکێشن و خوێن دەڕژێ؛ دواتر جەنگێک لە نێوان دوو هۆزەکەورەکە دروست دەبێت. لەخوا بترازێ کەسێک

---

[190] محمد عبده، المصدر السابق، ج،ص٧٢

ئەنجامەکەی نازانێت. لەمەش خراپتر بەدوور نازانرێت. ئەو شۆڕشانەی لە هەموو سەدەکانی مێژوو ڕوویانداوە، هەر بەمشێوەیە بوونە. خەڵک لەبەر ستەم ڕاناپەڕن، بەڵکو لەئەنجامی هەستکردنیان بە ستەم ڕادەپەڕن، هەستکردن بەستەم کاریگەری بەسەر خەڵک لە خودی ستەم گەورەترە،

ئەو خەڵکەی لە دژی ئەو زۆردارانە وەستاونەتەوە، کە خوێنی ڕشتوون و برسی کردوون و جەلادەکانی خستۆتە گیانی ئەوانەوە بۆ ئەوەی بەقامچییەکانیان لە پشتە ڕووتەکانی ئەوان بدەن. خەڵک لەدێرزەمانەوە، ئەوە دوای ئەوە لەو کارانە ڕاهاتووە، بۆیە ئەوان ئەو کارانە بەئاسایی دەزانن و پێیان وایە ناڕەزایی لە بەرامبەریان بێ هوودەیە. بەڵام زۆر بەگەرمی ڕادەپەڕن کاتێک پرەنسیپی نوێی کۆمەڵایەتی لە نێویاندا بڵاودەبێتەوە، ئەوا جۆش وخرۆش و ڕەوانبێژی و هێزی ڕەخنەیان پێ دەبەخشێت.

دەگوترێت شۆڕشی فەرەنسا زیاتر لە ئەنجامی ئەو بیروڕایانە بەرپابووە، کە لەلایەن ڤۆڵتێر و ڕۆسۆ و مۆنتیسکیۆ بڵاوکراوەتەوە. نەوەک لە ستەمکاریی و نەداریی خەڵک، دواتریش سەلمێنرا کە فەرەنسییەکان ئەو کات بژێوییان لە گەڵ ڕووسیا وئەڵمانیا و ئیسپانیا زۆر باشتر بووە، کەچی بۆ خەڵک لەوێ شۆڕشی کرد و لەشوێنەکانی دیکەش نەبوو؟! هۆکارەکە هەستکردنی خەڵکە بەستەم ، نەوەک خودی ستەمکاریی.

کەواتە بابەتەکە ڕێژەییە و ڕەها نییە. بۆیە ڕاستە ئەگەر بگوترێت ئەوەی خەڵکی لە دژی عوسمان هان دا، ئەوا عومەری کوڕی خەتاب بوو. بەڵێ، بەراکشاویی لەگۆڕەکەی خەڵکی هان دەدا. چونکە ژیاننامەکەی دوای مردنی لەلای خەڵک وەک (گرێبەستێکی کۆمەڵایەتی) بوو، بۆیە دەیانخوێندەوە و دەیانگوت: " کوا ڕێچکەی عومەر؟" وەک پێشتر ئیمام عەلی ئاماژەی بۆ ئەمە کردووە لەبارەی عومەرەوە وتویەتی: " خودایە، وڵاتی عومەر! ئەو شتەکانی ڕاستکردەوە و چارەسەری کێشەکانی کرد، ڕێچکەیەکی دانا، فتنەیەکی جێهێشت.. کۆچی کرد و ئەوانیشی لە

ڕێگای ئاڵۆز جێهێشت، گومڕا ڕێگای خۆی نادۆزێتەوە و کەسی هیدایەتی هەبێت سەقامگیر نابن"[١٦١].

***

ئەفسانەکان دەڵێن بزوێنەری گەورەی شۆڕشی لە دژی عوسمان (کوڕی سەبائی) بووە، من سەرم لە عەقڵی ئەوکەسانە سوڕدەمێنێ، ئەو شۆڕشە گەورەیە دەدەنە پاڵ کەسێك شتێکی ئەوتۆی لەبارەیەوە نازانین، ئایا دەگونجێ کەسێك خەڵك لەعوسمان هان بدات و عوسمانیش هیچ لە بارەی ئەو پیاوە نەزانێ. ئەگەر تاوتوێی قسەکانی عوسمان بکەین، دەبینین ناوی کوڕی سەبائی نەهێناوە، ئایا پیاوانی بەنی ئومەییە ناوی ئەو پیاوەیان لە عوسمان شاردۆتەوە یان عوسمان ئاگادار بووە، بەڵام لەبەر هۆکارێك ناوی نەبردووە؟ بینیمان عوسمان ڕەخنەی لە خەڵك دەگرت، لەبەر ئەوەی بەعومەر سەرسام بوون، ڕقیشی لە خەڵك بوو، چونکە خەڵك بەناوی عەلی هوتافیان دەکێشا. خودی پیاوانی بەنی ئومەییە جارێك ناوی کوڕی سەبائی نابەن، ئەگەر بەراستی ئەو پیاوە بوونی هەبووە بۆچی سزایان نەدا و دەستگیریان نەدەکرد؟ یان بەلایەنی کەمەوە بەوپیاوەیان نەگوت: "خودا ڕووت ڕەش بکات".

تەبەری دەڵێ: عەبدوڵلا کوڕی سامت، ئیبن سەبائی هێناوەتەوە لای معاویە و پێیگوتووە، بەخودا ئەوە ئەو پیاوەیە کە ئەبوزەڕ ناردویەتی"[١٦٢]. ئێمە زۆر سەرمان لەوە سوڕدەمێنێ، کە بۆچی معاویەی کوڕی سەبائی بە ئازادی هێشتۆتەوە، بۆچی سزای نەداوە و زیندانی نەکردووە، هیچی پێنەگوتووە. کەچی ئەبوزەڕ دەچەوسێنێتەوە و دووری دەخاتەوە و ئازاری دەدات. کوڕی سەبائی دونیای لە دژی عوسمان هەڵساندۆتەوە وەك مێژوونووسان باسی دەکەن، کەسێکیش لە والییەکانی عوسمان لێپرسینەوە لەگەڵ ئەو پیاوە ناکەن، دەستبەسەری ناکەن و سزای نادەن، بەڵکو ئازادی دەکەن بۆ ئەوەی لە شارەکان بگەڕێت و بیروڕای خۆی بڵاوبکاتەوە.

---

[١٦١] محمد عبده، المصدر السابق، ج٢، ص٢٤٩

[١٦٢] الطبري، المصدر السابق، ج٥، ص٦٦

لەبەرامبەریشدا دەبینین ئەبوزەڕ وعەمار وكوڕی مەسعود و چەندانی دیكە لە بانگەشەكارانی شۆڕش بە نەعل لێیان دەدرێت و بە قامچی جەڵەدەیان بەردەكەوێت و لەزەوی دەربەدەر دەكرێن.. هاندەری سەرەكی ئازادە و ئازی پێدەدرێت، كەچی ئەوانەی بێ گوناهن و ئەوانەی هاندراون ئازار دەكێشن ئەمە مێژوونووسان باس لەوە دەكەن، پاڵنەرەكە ئازادە و پاڵنراویش سزادەدرێت. ئەمەش لوغزێكە لە لوغزەكانی مێژووی ئیسلام كە دەبێت پەردەی لەسەر لابدرێت.

***

مەقریزی دەگێڕێتەوە، گوایە كەسێك لە ڕۆژگاری خەلافەتی عوسمان پێشبینی كەسی دوای ئەوەی كردووە و بەشیعر دەڵێ:"

ان الامير بعده علي وفي الزبير خلف رضي.

(واتە لە دوای عوسمان، عەلی دێت و لە دوای ئەویش زوبێر)

كاتێك كەعبی ئەحبار گوێبیستی ئەو قسەیە دەبێت، دەڵێ:" بەڵكو خاوەنی ئەسپە بەڵەكە" مەبەستی معاویە بووە. كاتێك ئەو قسەیە بۆ معاویە دەگەڕێتەوە ئەوا معاویە بە كەعبی ئەحبار دەڵێ:" ئەی باوكی ئیسحاق ئەوە چی دەڵێی، ئەوەتا عەلی و زوبێر و یارانی محەمەد لێرەن؟" كەعبی ئەحباریش وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ:" تۆ خاوەنەكەی دەبیت"[123]. لێرەدا دەوەستین و دەپرسین:" ئەو كەعبی ئەحبارە كێیە؟ مەبەستی چی بووە؟ لە كوێی زانیوە كە خەلافەت لە دوای عوسمان لەبری عەلی و زوبێر، بەمعاویە دەدرێت؟

وەك زانراوە، كەعبی ئەحبار پیرەپیاوێكی جولەكە بووە، ناوەكەی كەعب كوڕی ماتعی كوڕی هیسوع بووە. لە سەردەمی عومەردا لە یەمەنەوە هاتووە. دواتر بۆتە ئیسلام و چۆتە شام، كاتێك معاویە والی شام بووە، كەعبی كردۆتە ڕاوێژكاری خۆی و جۆرێك ڕێزی پێداوە. دواتر كەعب گەڕاوەتەوە مەدینە، لەوێ بەوە ناوبانگی

---

[123] المقريزي: النزاع والتخاصم، ص ٣٤-٣٥

دەرکردووە، گوایە سێ ڕۆژ پێشتر پێشبینی مردن و کوژرانی عومەری کردووە[٦٤].
لێرەدا جێگای ئەوەیە بەسەرسوڕماوی بپرسین: ئەو پیاوە چۆن پێشبینی کوشتنی عومەری کردووە، ئایا لە ئەستێرەناسی یان لە زانستی لم شارەزایی هەبووە؟ هەندێك لە توێژەران قورەیش بەوە تۆمەتبار دەکەن کە دەستیان لە کوشتنی عومەر هەبووە. ئایا کەعبی ئەحبار ئەمەی زانیوە؟ لە چ سەرچاوەیەك وەریگرتووە؟ ئایا بۆ ئەمەی بەڕوونی بەعومەر ڕانەگەیاندووە بۆ ئەوەی ئەجاتی بدات؟ وەلامی ئەو پرسیارانە لە کتێبەکانی مێژوو نادۆزینەوە. کەعب بانگەشەی ئەوەی کردووە گوایە وەسفی عومەری لە تەورات دۆزیوەتەوە بەمەش توانیویەتی ڕۆژی کوشتنەکەی دیار بکات. ئەمە بانگەشەیەکی سەیرە عەقڵی ئێمە قبوڵی ناکات. نازانم چۆن عەقڵی خەڵکی ئەو زەمانە قبوڵی کردووە. من زیاتر لە جارێك تەوراتم خوێندۆتەوە، نە سیفەتی عومەر و نە ڕۆژی کوشتنەکەم نەدۆزیوەتەوە. لەوانەیە ئەو تەوراتەی کەعبی ئەحبار جودابێت و کۆپی تایبەت بە خۆی هەبووە.

بەهەرحاڵێك بێت، کەعبی ئەحبار لە دوای کوشتنی عومەر وەك موفتی و عەلامەیەك بووە، هەرمەپرسە. خەڵك کاتێك شتێکیان لە تەفسیری قورئان بەلاوە ڕوشن نەبووایە دەهاتنە لای کەعب و پرسیاریان دەکرد، ئەویش پڕ بەدەمی خۆی دەیگوت: "ئەمەمان لە تەورات دۆزیوەتەوە". تەنانەت دەگوترێت لە دانیشتنێکی معاویەدا کوڕی عەباس و کوڕی عومەر لەسەر تەفسیرکردنی ئایەتێك ناکۆك دەبن و دواتر معاویە بەدوای کەعبی ئەحبار دەنێرێ و ئەویش دەڵێ: "بەهەمان شێوە لە تەوراتیش هەیە"[٦٥]. چۆن ئەو پیاوەی ئاینی جوولەکە توانیویەتی لێکدانەوە بۆ بابەتە قورئانییەکان بکات، کە کوڕی عەباس و کوڕی عومەر لەسەری ناکۆك بوونە؟ ئایا ئەمە سەیر نییە؟ کەعبی ئەحبار تەنها بەوەندە نەوەستاوە، بەڵکو ئەفسانە

---

[٦٤] احمد امین، فجر الاسلام، ص١٦١
[٦٥] محمد خلف الله، الفن القصصي في القران، ص١٦٥-١٦٦

ئیسرائیلییەکانی لە نێوان موسڵمانان بڵاوکردۆتەوە[166]. بێگومان شتی وەهای تیاخستووە ئێمە نازانین و ئاماجەکەشی نازانین، موسڵمانانیش ئەو ئەفسانانەیان وەک ئەوە وەرگرتووە سروشی نێردراو بێت و قابلی مشتومڕ نەبێت.

کاتێک ململانێی نێوان عوسمان و ئەبوزەڕ لەسەر گەنجینەی سامانەکە توند دەبێت، کەعب لایەنگیری عوسمان دەکات و ئەو شتانە دەهێنێتەوە؛ کە پاڵپشتی بیروڕای عوسمان دەکات و لەدژی ئەبوزەڕ دەبێت، ئەمەش ئەبوزەڕ ناچار دەکات کە هێرشێکاتە سەر کەعب و لەسەری بدات. عوسمانیش لەمە زۆر تووڕە دەبێت. ئەبوزەڕ دەیگوت:" نابێت ئەو کەسەی زەکات دەدات تەنها بەوەندە رازیبێت، بەڵکو دەبێت برسی تێر بکات و پارە بەهەژار بدات و چاکە لەگەڵ دراوسێ بکات" کەچی کەعب دەڵێ: "تەنها ئەوەندە لەسەر دەوڵەمەندەکان واجبە زەکات بدەن". ڕۆژێک عوسمان بە ئامادەبوونی ئەبوزەڕ وکەعبی ئەحبار دەپرسێ:" ئایا دەشێ ئیمام هەندێک پارە بەقەرز ببات، کاتێک بارودۆخی باش بوو بیگێڕێتەوە؟"[167] کەعب دەڵێ:" کێشەیەک نییە." ئەبوزەڕ هەڵدەستێتەوە و دەڵێ:" ئەی منداڵە جو، تۆ ئایینی خۆمان فێر دەکەیت"[168].

ئێمە تووشی شۆک دەبین، کاتێک دەبینین مێژوونووسان بەرپرسیارێتی شۆڕش دەخەنە ئەستۆی جولەکەیەکی نەناسراوی وەک کوڕی سبائی، کەچی پیری ئەحباری جولەکەکان فەرامۆش دەکەن، کە یاری بەعەقڵی خەڵک کردووە و ئەفسانەی لەنێو ئەوان بڵاوکردۆتەوە و وەک موفتییەکی گەورە لە مەجلیسی خەلیفە دانیشتووە. لایەنگرانی بەنی ئومەییە لەم سەردەمەمان دەڵێن کوڕی سەبائی بۆ فێڵ و کارلکاری بۆتە موسڵمان، چونکە قین لەدڵ بووە. نازانم چی لەبارەی کەعبی ئەحبارەوە دەڵێن ئایا دڵسۆزی ئیسلام بووە و ئەو ئایینەی خۆشویستووە؟ مەسەلەیەکی پێشینیان

---

[166] احمد امين،ضحى الاسلام، ج٢،ص٩٧
[167] البلاذري، المصدر السابق، ج٥، ص٤-٥
[168] طه حسين، المصدر السابق،ج١،ص١٦٤

هەیە دەڵێ:" خۆشت ویست هەر قسە بکە، رقت لێی بوو هەر قسە بکە" ئەمە بۆ پیاوانی بەنی ئومەییە و کەسانی دیکەش دەگونجێ. ئەوان پێیان وایە کوڕی سەبائی پیاوێکی نیاز خراپ بووە، گوایە خەڵکی لە دژی عوسمان هانداوە و بەناوی عەلی هوشافی کێشاوە. کەچی کەعب کە پێشبینی ئەوەی کردووە معاویە دوای عوسمان خەلافەت دەگرێتەدەست. ئەوا بەبڕوای ئەوان کەسێکی باوەڕداری پیاوچاک بووە، ڕاستگۆ بووە لەبەر گلەیی خەڵک لە ڕێگای خودا لاری نەبووە.

بەدوور نازانین کەعبی ئەحبار یەکێک بێت لە سیخوڕەکانی جولەکە، بە فێڵ موسڵمان بووبێت. ئێمە دەزانین جولەکە لەسەرەتادا بەرەنگاری ئیسلام بوونەوە و پیلانیان بۆگێڕا و لە دژی ئیسلام بوون بە هاوپەیمانی قورەیش. بەڵام کاتێک لە جەنگی بەدر موسڵمانان بەسەر قورەیش سەردەکەون، یەکێک لە جولەکەکان دەڵێ:" سکی زەوی باشترە لە پشتەکەی(پەندێکی عەرەبییە) دوای ئەوەی شەرەفمەندترین کەس و سەردار و گەورەی عەرەب و خەڵکی حەرەم و ئەمین لەناوچوون"[١٦٦].

ئەوکاتە جولەکە چاوی قورەیش بوون بەسەر موسڵمانانەوە. هاوپەیمانێتی ئەوانیش لەگەڵ قورەیش لە سەروبەندی جەنگی خەندەق مەترسیەکی گەورە بوو بەسەر موسڵمانانەوە لە مەدینەدا. سەرکەوتنی محەمەد بەسەر قورەیش مسۆگەر نەبوو، تا ئەوکاتەی بەتەواوی جولەکە لە کەنداوی عەرەب دەرکران. دەتوانین بڵێین دوای دەرکرانیشیان هەر چاودێری قورەیشیان دەکرد و هیوای سەرکەوتنی قورەیشیان دەخواست.

لەوانەیە ئەوکاتە ئەوان لە پەیوەندییەکی نهێنی دابووبن، هاوپەیمانێتی هەرچەندە کاتی بەسەر بچێت، بەڵام لایەنەکانی لەبیری ناکەن، بەتایبەتی کاتێک جەنگێکی درێژخایەن بێت لەگەڵ دوژمنێکی هاوبەش. کاتێک محەمەد قورەیشی ملکەچ کرد ولوتبەرزی ئەوانی تێکشاند کە لەسەردەمی جاهیلیەت هەیانبوو، ئەوکاتە جولەکە لە

[١٦٦] محمد حسنین هیکل، حیاة محمد،ص٢٢٦

شوێنی خۆیان کپ بوون و چاوەڕوانی گۆڕانکارییەکانیان دەکرد، من مەزەندەی ئەوە دەکەم ئەوکات کەعبیان ناردووە و بۆئەوەی هەواڵیان بۆ بنێرێت و هاوکاری قورەیش بکات لە گێڕانەوەی سەرفرازی کۆنیان، لەوانەشە ئەمە هۆکارەکە بێت کە وایکردووە کەعب بە معاویە بڵێت:" تۆ خاوەنەکەی". کێ دەزانێ لەوانەیە ناوی معاویەی لە تەورات بینی بێت!.

***

ئەو کێشەیەی لە سەروبەندی شۆڕش رووبەڕووی عوسمان دەبویەوە، ئەوەبوو دوودڵ بوو لەوەی واز لە خەلافەت بهێنێ وخەلافەت بگەڕێنێتەوە لای شورای موسڵمانان، یان خۆی رادەستی شەڕ بکات. دکتۆر تەها حوسێن مەیلی بە لای ئەو قسەیەوە هەیە کە دەڵێ عوسمان لە دوایین رۆژەکانی بانگی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصی کردووە بۆئەوەی بیێتە نێرەراوی ئەو لە لای عەلی، پێی بڵێت بۆ ئەوەی جەنگ هەڵنەگیرسێ با مەسەلەی خەلافەت بگەڕێتەوە شورای موسڵمانان، ئەوان یەکێکی دیکە دابنێن، بەڵام بەر لە گەیشتنی سەعد عوسمان کوژراوە"[200].

کەچی مامۆستا موحیدین خەتیب بەتەواوی ئەو رووداوە رەتدەکاتەوە و نکۆڵی لێدەکات، ئەو دەڵێ:" بۆ عوسمان رێگەپێدراو نەبووە خۆی کەنارگیر بکات لە خەلافەت." ئەو چەندین فەرموودەی پێغەمبەر دەهێنێتەوە کە لەمەیاندا پاڵپشتی عوسمان دەکەن. بۆئەوەی بەبڕوای مامۆستا خەتیب خەلافەت وەک کراسێک بووە لەبەری کردووە، پێغەمبەری خوداش فەرمویەتی:" ئەی عوسمان، ئەگەر خودا رۆژێک ئەوکارەی بەتۆ راسپارد، ئەوا موناقیقەکانیش ویستیان ئەو کراسە لەبەربکەیتەوە، تۆ کراسەکەت لەبەرنەکەیتەوە" سێ جاریش ئەمەی گوتووە"[201]. بە تێڕوانینی خەتیب، عوسمان بە دەستی خۆی کارەسانەکەی بۆخۆی هێناوە. چونکە ئەگەر عوسمان کراسەکەی دابنایە ئەوا ئاژاوەکە فراوانتر دەبوو خوێنی موسڵمانان دەڕژا.

[200] طه حسین، المصدر السابق، ج١،ص٢١٤
[201] ابن العربي، القواصم و العواصم،ص١٣٧

ئەگینا خوێنی خۆی دەڕژی بۆ ئەوەی ئاژاوەکە دابمرکێنەو و خوێن نەڕژێت. لێرەوە خەتیب دەڵێ:" بە خواستی خۆی عوسمان خوێنی خۆی کردە قوربانی، ئەمە چ چاکەیەکی گەورەیە بۆ ئێمە ئەنجام درابێت، ئەو ئەوروپایەی کە مرۆڤ کۆیلە دەکات بەناوی فیداکاریی، کەچی خواستی مرۆڤی تێدا نییە"[202].

من سەرسوڕمانیم لە بارەی ئەو بیروڕایە تەواو نابێت کە مامۆستا خەتیب ئاماژەی بۆ دەکات. ئەو کوشتنی عوسمان بە دامرکانەوەی ئاژاوە دەزانێت، ئەمەش لەبیر دەکات لە ئەنجامی کوشتنی عوسمان چی بەسەر موسڵمانان هاتووە، کە تا ئێستاش بۆ ئێمە مەینەتییە. باشتر بوو خەتیب بڵێ: دەستبەرداربوونی خەلافەت لەلای عوسمانەوە وایدەکرد بکەوێتە دەست عەلی، بەڵام کوشتنی دەبووە هۆکاری ئەوەی دەسەلات بکەوێتە دەست معاویە. چونکە ئەگەر عوسمان بەهێمنی دەستبەرداری خەلافەت بووایە، ئەوا کارەکان ئاسانتر دەبوون و دروستترین بۆچوونیش ئەوەیە عەلی دەبووە خەلیفە. بەڵام کوشتنی عوسمان هەلێکی زێرینی بە معاویە دا، توانی کراسەکەی عوسمان بکاتە دروشمی خۆی. بەتایبەتی ئەوکاتەی ئەو کراسە پیرۆز بوو، بووە کراسی خودا، ئەمەش وایکرد خەڵکی شام دەوری معاویە بدەن و بگرین و هاوار بکەن(ئیمامەکەمان بەزوڵم کوژرا).گەیشتوومەتە ئەو قەناعەتەی کە عوسمان لەپێناو کراسەکەی کوژراوە. ئەگەر ئەو کراسە پیرۆزەش نەبوایە ئەوا معاویە خەلافەتی وەرنەدەگرت، هەرچەندە کەعبی ئەحباریش ناوی ئەوی بۆ پاڵپشتی لە تەورات بهێنایە.

سەیرە دەبینین عوسمان رادەستی شەڕ دەبێت، کەچی رێگا نادات هاورێیانی بەرگری لێبکەن وشمشێریان لەپێناو ئەودا هەڵکێشن، بۆیە هاورێیانی گوێڕایەڵی فەرمانەکەی دەبین و دەوروبەری چۆڵ دەکەن. کەچی پیاوانی بەنی ئومەییە سەرپێچی فەرمانەکەی دەکەن و پەرتەوازە نابن، بۆیە دادەبەزنە سەر شەقام و

[202] المصدر السابق،ص١٣٧

شەڕەشمشێر لەگەڵ شۆڕشگێڕان دەکەن وەك ئەوەی لە جەنگێکی ڕاستەقینە دابن[203]. ئیبن عەرەبی دەڵێ:" عوسمان بەپەلە بۆ کردنەوەی دەرگای ماڵەکەی چوو، بەدەستی خۆی کردییەوە، شۆڕشگێڕان لە هەڵچوون دابوون چوونە ژوورەوە و کوشتیان"[204].

عەلی معاویە بەوە تۆمەتبار دەکات کە ئەو پیلانی کوشتنی عوسمانی داناوە[205]. ئەمەش دوور نییە، ئەستەم نییە معاویە کەسێکی نزیکی خۆی کە تەمەنی نزیك ۹۰ ساڵە بکاتە قوربانی بۆ گەیشتنە بەو پاشایەتییە فراوانە. ئەگەر عوسمان نەدەکوژرا، ئەوا ماوەیەکی دیکە لەسەر جێگاکەی دەمرد. بەڵام ئەگەر دیقەت بدەین کوشتنی عوسمان بۆ معاویە بەسوودتر بوو. ئەوەی سەیرە دەگێڕنەوە گوایە معاویە داوای لە عوسمان کردووە ئەگەر بکوژرێت ئەوا مەقی تۆڵەکردنەوەی پێ بدات، عوسمانیش وتویەتی:" با ئەو مافە بۆ تۆ بێت، با خوێنم ون نەبێت". لەوەش سەیرتر ئەوەیە معاویە بۆ وەرگرتنی تۆڵەی عوسمان لە سەردەمی عەلی دونیا کاول دەکات، کەچی کاتێك بەئامانجی خۆی دەگات خوێنی عوسمان لەبیر دەکات[206]. گومان لەوەدا نییە، معاویە خەلافەتی دەویست، داوای تۆڵەکردنەوەی خوێنی عوسمانیش تەنها هۆکارێك بوو بۆ گەیشتن بەو ئامانجە. معاویە لە هەوادارانی سیاسەتی میکیاڤیللی بوو کە باس لەم پرەنسیپە دەکات" ئامانج پاساو بە هۆکارەکان دەدات"[207].

***

کەچی معاویە بینی داواکردنی خوێنی عوسمان بەتەنها بەو ئامانجەی ناگەیێنێ، چونکە زۆرێك لە موسڵمانان بەپیر ئەو بانگەوازە ناچن. زۆریەشیان ڕقیان لە عوسمان بوو، چونکە سەرپێچی ڕێچکەی عومەر و ئەبوبەکری کردووە، بۆیە دەبوایە معاویە

---

203 طه حسین، المصدر السابق، ج۱، ۲۱٤
204 ابن العربي، المصدر السابق، ص۱۳٤-۱۳۵
205 ابن عبد ربه، العقد الفرید،ج۲،۲۲۳
206 عباس العقاد، معاوية بن أبي سفيان، ص۱٤۵-۱٤۹
207 الآلوسي، مختصر التحفة الاثني عشرية، ص۳

پاساو بۆ ئەوسەرپێچییە بدۆزێتەوە و سەرپێچی بداتە پاڵ عەلی، ئەمەش بەلای ئەو ئەستەم نەبوو، سیاسییەکی فێڵباز بە پڕوپاگەندەکانی دەتوانێ جاڵجاڵۆکە بکاتە حوشتر و مێشیش بکاتە گامێش وەك دەگوترێت.

بەهەر حاڵێك بێت، معاویە دەیویست ئەوە بەخەڵك بلاوبکاتەوە، کە عەلی نەیاری ئەبوبەکر وعومەر بووە و رقی لەوان بووە، ئەوانیش رقیان لە عەلی بووە و هەوڵیان داوە بە بچووك نیشانی بدەن. ئەبوجەعفەری نەقیب دەیگوت:" معاویە شتی وای لە بارەی عەلی بلاودەکردەوە، گوایە بە بیری بهێنێتەوە کە ئەبوبەکر و عومەر هەقی ئەویان بردووە، ئەمەش دۆزەخی گەورە بوو، تەنها لە بەدکاری خەڵکی شام نەبوو لە بارەی عەلی، بەڵکو خەڵکی عێراقیش باوەڕیان بە ئیمام بوونی دوو شێخەکە هەبوو(مەبەست ئەبوبەکر و عومەرە)"[٢٠٨]. معاویە لەگەڵ نەیارانی پەیڕەوی سیاسەتی(پەرت بکە و زاڵبە)ی دەکرد، بۆیە بینیمان جیاوازی و ناکۆکی دەخستە نێوان نەیارانی، ئەمەش بە دروستکردنی گومان و پرسیاری شەرمەزارکەرانە بوو، بۆیە مشتومڕی دەخستە نێوانیان، بەمەش دەیخستنە چاڵەکەوە[٢٠٩]. نموونەیەك بۆ ئەمە لە جەنگی صەفەین روویدا، ئەو نزیك بوو لە دۆڕان، کەچی فەرمانی بە پیاوەکانی کرد کە قورئان بەرزبکەنەوە و بەخەڵکی گوت:" وەرن بە قورئان حوکم بکەین" بەمەش یارانی عەلی بوون بەدوو بەشەوە، بەشێکیان گوتیان بەلێ، ئەویتریش وتیان نەخێر. ماقوڵ نییە معاویە دوای جەنگی صەفەین واز لە پیلانگێڕی بهێنێت، بەڵکو دەبێت سیخوڕەکانی خۆی بخاتە ریزی لایەنگری عەلی و بۆ ئەوەی پرسیار لە بارەی عەلی وعوومەر بکەن: کامیان باشتر بوو؟ لایەنگرانی عەلیش وەك بینیمان ڕێزیان لە عومەر دەگرت، لێرەوە ئەو کەلێنە دروست دەبوو، کە معاویە سوودێکی زۆری لێ وەردەگرت.

---

[٢٠٨] ابن ابي حديد، شرح النهج، ج٣،ص٤٤٧-٤٤٨

[٢٠٩] عباس العقاد، المصدر السابق،ص٦٤

لێلکردنی ئاو هۆکارێکی سەرکەوتووانەیە, کە هەردەم ڕاوچییەکان بەکاری دەهێنن. لەوبڕوایەدا نیم کە معاویە بەشێوەیەك لە شێوەکان لە بەکارهێنانی ئەو هۆکارە دوودڵ بێت. بۆیە کاتێك یارانی عەلی لە صەفەین گەڕانەوە؛ بۆ دوو کۆمەڵ دابەشبوون و هەریەکەیان جێنێوی بەویتریان دەدا. ئەوانە لەسەر پاڵپشتی عەلی مانەوە بەناوی (شیعە) ناوبران، بەڵام ئەوانەی لەوە دەرچوون و بە ناوبژیوانەکە ڕازی نەبوون بە خەواریج ناوبران. کاتێك شیعە لە کوفە جێگیر بوون، جۆرێکی نوێ لە مشتومڕ و دەمەقاڵێیان لەنێوان دروست بوو؛ مشتومڕەکەش لەسەر ئەوە بوو: عەلی و عومەر کامیان باشترن؟ گومانم لەوە نییە کە سیخوڕەکانی معاویە دەستێکی درێژیان لەوروژاندنی ئەو جۆرە مشتومڕە نەزۆکە هەبووە. سیخوڕێك دەداتە ئەڵقەکانی مزگەوت و وای نیشان دەدا کە کەسێکە لە ڕووی خۆشەویستی و دڵسۆزییەوە سەرسەختترین یارانی عەلییە. بەدوو دەست چەپڵەی لێ دەدا و دەیگوت:" بەڵاکە ئەوەیە لە ئەبوبەکر و عومەرەوە بۆمان هاتووە. ئەوان هەقی عەلیان لەسەرەتاوە برد، دواتریش وایکرد کەسانی وەك معاویە لە عەلی یاخی بن".

کاتێك خەڵکیش گوێیان لەوە دەبێت، لەنێو خۆیان دابەش دەبن؛ هەندێکیان دەڵێن:" بەخوا فلان ڕاست دەکەی" هەندێکیش دیکەش دەڵێن:" نەخێر، ئەبوبەکر و عومەر لە وەرگرتنی خەلافەت هەقیان زیاتر بوو" لێرەوە مشتومڕەکە توند دەبێت و دەبێتە ئەپوتۆز. سەیر نییە ئەو جۆرە مشتومڕانەش لەبارەی ئەو بابەتانەوە نەزۆکن و بە تێپەڕبوونی ڕۆژگاریش ئاڵۆز دەبن, لەئاستێك ناوەستێ. ئەو جۆرە مشتومڕە لە هەندێك ڕووی لەو مەسەلە بێزەنتییە بەناوبانگە دەچێت کە لە بارەی هێلکە و مریشك گێڕدراوە. کامیان لەویتریان دروستبووە؟ هەرکەسێکی خاوەنی بڕوا دەتوانێت دونیا پڕ بکات لە بەڵگەی ئەوەی کە هێلکە سەرەتایە، یان مریشك سەرەتایە, بۆیە ناتوانرێت مشتومڕەکە لە ئاستێك بوەستێت. بەتایبەتیش ئەگەر قیاسە باوەکەی لۆژیکی تێدا بەکاربێت، کە دەتوانی بەو قیاسە هەموو بۆچوونێك پشتڕاست بکەیتەوە یان پوچەڵی بکەیتەوە.

عومەر و عەلی دوو پیاوچاک بوون، هەریەکەیان بەرێزە لەویتریان جیاواز بوو، وەك چۆن پیاوچاکان لەگەڵ یەکتر لەچەند لایەنەکەوە جیاوازن. ئەو جیاوازییەش لە لای کەسێك کە خۆشەویستی بۆ هەردووکیان هەبێت گرنگی نییە. بەلام کەسێك بیەوێت جەخت لەسەر لایەنێك بکاتەوە و لایەنێکیش فەرامۆش بکات, ئەوا دەتوانێت هەزاران بەلگەی نەقلی و عەقلی بۆ فراوانکردنی کەلێنەکەی نێوانیان بهێنێتەوە. معاویە دەیویست ئەو بۆشاییە فراوان بکات، کە لە نێوان عەلی و عومەر هەبوو. لەو کاتەش دەیویست جیاوازی نێوان عومەر وعوسمان کەمبکاتەوە، بۆئەمەش چەندین پارەی زۆروزەوەندی بەو کەسانە دەدا کە فەرموودەیان دەگێرایەوە، تا فەرموودەی لەوشێوەیە دابنێن عوسمان لەگەڵ ئەبوبەکر و عومەر بخاتە لایەك و عەلیش بە تەنها لەبەرەی دژی ئەوان دابنێت. شیعەش لە کوفە سەرقاڵی ئەو بابەتە بوون و بابەتی معاویەیان لەبیرکرد. تا ئیمام عەلی لێیان بێزار بوو گلەیی لێدەکردن، کە خۆیان بە بابەتێکی وەها سەرقاڵ کردووە، بۆ ئەمەش سەرزەنشتێکی توندی دەکردن.

***

دکتۆر تەها حوسێن مەیلی بەلای ئەو قسەیەوە هەیە, کە لەنێو یارانی عەلی دا ئەشعەس کوڕی قەیس سیخوڕی معاویە بووە[210]، هەر ئەویش قبڵی بەرزکردنەوەی قورئانیان لەگەڵ کوڕی عاص داناوە بۆ ئەوەی بەرپەرچی عەلی بدەنەوە. منیش بەدووری نازانم لە نێوان یارانی عەلی دەیان سیخوڕی وەك ئەشعەس هەبێت, کە لەلایەن معاویە بۆ ئەوە رەوانەکرابن تا مشتومڕی کۆن و گومان بخەنە ناویان کە چارەسەریان نییە. لەوانەشە سیخوڕی دیکەی خەواریج هەبن، بۆیە بینیمان خەواریجیش لەنێو خۆیاندا کەوتنە ململانێ، وەك چۆن شیعەش کەوتنە ململانێ. لە بەشەکانی پێشوودا وتمان ململانێ هۆکارێکە بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی، مەبەستمان ململانێی بوو لەسەر پرەنسیپ کە لەسەر بنەما کۆمەڵایەتیەکان ئەوەك

[210] طه حسین، المصدر السابق، ج٢،ص٨٨-٩٠

لەسەر بنەمای تێڕوانینی کەسەکان،بەڵام ئەو ململانێیەی لەسەر بنەمای تێڕوانینی کەسەکە، ئەمەیان کۆمەڵگە بەرەو دواوە دەبات نەوەک بەرەوپێشکەوتن.

ململانێ لەسەردەمی عوسمان لەبارەی بنەماکانی دادپەروەری و یەکسانی بوو، کەچی معاویە ئەمەی ئاوەژووکرد و وایکرد لەبارەی عەلی و عومەر بێت: کامیان باشترە؟ بەمەش خەڵک خەباتی عەلیان لە بەرامبەر معاویە بیرچوو. بە چاکە کەسییەکانەوە سەرقاڵ بوون، هەر یەکێك دەیویست باس لە چاکەی کەسە خۆشەویستەکەی بکات، بۆ ئەوەی کەموکوڕی کەسەکەی دیکە دەربخات. من کاتێك ئەو کتێبانە دەخوێنمەوە، کە لەلایەن نووسەرە لووتبەرزەکانی ئەو سەردەمە لەلایەن چاکەی عەلی و عومەر نووسراون، وەك ئەوەیە دەستی معاویە لەو نووسینانە ببینم. دەستی ئەو نەزان و زۆردارەی کە دەزانێ کار لەکوێ دەکات. ئەو بە خەڵك پێدەکەنی و خەڵکیش خەریکی ئەو مشتومڕە هیچ و پووچەی خۆیان بوون و نەشیان دەزانی بوونەتە گاڵتەجاڕی دونیا.

***

کۆمەڵێك هاتنە لای عەلی پرسیاریان لەبارەی ئەبوبەکرەوە، کرد زۆر توڕە بوو، وەڵامێکی توندی ئەوانی دایەوە بەوەی ئەوان سەرقاڵی ئەو بابەتەن کەچی معاویە بە خواستی خۆی دێ و دەچێ، کەسیش بەرەنگاری نابێتەوە[٢٦٨]. پیاوێك لە مزگەوت وەستا و لەعەلی پرسی: "چۆن قەومەکەتان ئێوەی گەیاندە ئەو شوێنە، کەچی ئێوە لەسەر هەق بوون؟" مەبەستی ئەبوبەکر و عومەر بوو. عەلی بەتوڕەیی وەڵامی دایەوە گورتەکەی ئەوەبوو "واز لەوە بهێنە، با باسی ئەوە بکەین کە ئێمە تێیداین، ئەویش بابەتی معاویەیە"[٢٦٩].

بە عەلییان گوت، کەسانێك هەن لەیارانی بەخراپە باسی ئەبوبەکر و عومەر دەکەن، بۆیە بەئازارەوە چووە سەر مینبەر و وتی: "کەسانێك چ پەیوەندیان بەوە

[٢٦٨] المصدر السابق، ج٢،ص١٠

[٢٦٩] الالوسی، المصدر السابق، ص٣١

هەیە باسی برایانی پێغەمبەری خودا و دوو وەزیرەکەی پێغەمبەر و دوو هاوڕێیەکەی دەکەن کە دوو گەورەی قورەیش بوون و باوکی موسڵمانان بوون. من بێگومانم لەوەی دەگوترێت و ئەوقسانەش سزای لەسەرە." دەگوترێت ئەو گوتویەتی " جێگای قبوڵ نییە کەسێك من لە ئەبوبەکر و عومەر بەباشتر بزانێ، وەك بوختانکەرێك لەو کەسە دەدەم". خوێنەری سەرسام دەبێت، کە دەبینێ عەلی هەڕەشەی لێدانی ئەوکەسانە دەکات، ئەگەر ئەو لەئەبوبەکر و عومەر بەباشتر بزانن. کەچی لەقورئان و سوننەت نەهاتووە ئەگەر سەحابەیەك لە یەکێکی دیکە بەباشتر دابنرێت، ئەوا تاوانێك بێت شایەنی سزا بێت. وەك دەردەکەوێت عەلی ئەمەی کردووە کاتێك بینی مشتومڕ لە بارەی چاکەی سەحابەکانەوە دەکرێت، ئەمەش وادەکات بەشتی لاوەکی سەرقاڵ بن و پەرتەوازە بن. ئەو کارەی عەلی وەك هەڕەشەیەك بوو بۆ سیخوڕەکانی معاویە، کە بەڕووکەش عەلییان خۆشدەویست و لەدواوەش خەریکی پیلانگێڕان بوون.

***

معاویە بەنهێنی لەسەر پیلانەکانی بەردەوام بوو، بۆیە شاندێکی نارده لای عەلی و نامەیەکی ئەویان لابوو. بەپێی گێڕانەوەکەی بەلازری معاویە لەنامەکەی دەڵێ:" بەناوی خودای گەورە و میهرەبان. لە معاویەی کوڕی ئەبوسوفیانەوە بۆ عەلی کوڕی ئەبوتالیب،... دواتر، خودا محەمەدی بە زانینی خۆی هەڵبژارد و کردیە ئەمینی ڕاسپاردەکەی و پێغەمبەر بۆ خەڵك، دواتر موسڵمانانی دیکەی کردە پاڵشت و پشتگیری ئەوان بەقەد چاکەکانیان لە ئیسلامدا پێگەیان لای محەمەد هەبوو، ئەوان لەپێناو خودا و پێغەمبەر بوون. خەلیفەکەی، دواتریش خەلیفەکەی ئەو خەلیفەیە و سێیەمیش خەلیفەکە بوو بە زوڵم کوژرا، عوسمان. ڕقت لە هەموویان بوو، لەدژی هەموویان بووی، بە چاوی ڕق و کینە و قسەی ڕەقی تۆ، هەتاسەسواریت، ئەمەمان زانیوە، خۆت لە خەلافەتی ئەوان دوادەخست. لە هەموو ئەمانەش وەك حوشترێکی

لقاوکراو بوویت، لێیان دەخوڕی"[٢١٣]. دەتوانین لەپشت دێڕەکانی ئەو نامەیە مەبەستی معاویە بدۆزینەوە. ئەو دەیەوێت تەحەدای عەلی بکات و فاتی بدات نکۆڵی لە چاکەی خەلیفەکان بکات و جەخت لەسەر چاکەکانی خۆی بکاتەوە. بەڵام عەلی لەوە بەرزتربووە بکەوێتە داوی معاویە ، بۆیە بەهێمنی وەڵامی معاویە دەداتەوە و لەبارەی ئەو دوو خەلیفەیە دەڵێ:" بەخوا پێگەی ئەوان لە ئیسلام مەزن بووە، نەمانی ئەوان بۆ ئیسلام زامێکی قوڵ بووە، خوا لێیان خۆش بێت و پاداشتی چاکەکەیان بداتەوە"[٢١٤].

کاتێك معاویە ئەو وەڵامە دەخوێنێتەوە، دەزانێ لەفێڵەکەی سەرکەوتوو نەبووە. کوڕی عاص ئامازەی بۆ دەکات کە وەڵامێکی دیکە بنووسێت لەگەڵ یەکەم گونجاو بێت، بۆ ئەوەی عەلی توڕە بکات، وابکات عەلی قسە بە ئەبوبەکر و عومر بڵێت. ئەمەش دەبێتە بەڵگەیەك بەبەرچاوی خەڵك و هەڵوێستی عەلی لاواز دەکات، کوڕی عاص دەڵێ:" عەلی پیاوێکی سەرەڕۆ و لوتبەرزە، لەقسە بەسەری زاڵ نابێت، تەنها بە ستایشکردنی ئەبوبەکر و عومەر نەبێت"[٢١٥].

بۆیە معاویە نامەیەکی دیکە دەنوسێ و هەر لەسەر ئاوازی پێشوو دەخوێنێ، ستایشی ئەبوبەکر و عومەر بەسەر عەلی دەکات و باس رقی عەلی بۆ ئەوان دەکات. عەلی وەڵامی دایەوە، وتی:" پێتوایە چاکترین کەس لە ئیسلام فلان و فلانە. باسی بابەتێکت کردووە ئەگەر رووبدات پەیوەندی بەتووە نییە. تۆ خۆت باسی چاکەی خەڵکی دیکە دەکەیت، چ پەیوەندیەکت بەوە هەیە کێ چاکترە، کامە سەرۆکی باشترە، ئەوانەی بەناچاری بوونە موسڵمان و کوڕی ئەوانەی بەناچاری بوونە موسڵمان، چ پەیوەندیتان بەجیاکردنەوەی موهاجیر و ئەنسار و جیاکردنەوەی پلە و چینی ئەوان هەیە. چەند دوورە! کەسێك لە ریزی ئێمە نییە هاتۆتە نێوانمان و

---

[٢١٣] طه حسین، المصدر السابق، ج٢ص٧٦
[٢١٤] ابن أبي الحدید، المصدر السابق، ج٣ص٤٠٧-٤٠٨
[٢١٥] المصدر السابق،ج٨،٤٤٠٣

قسەمان لەسەر دەكات، ئەی مرۆڤ بەزەییت بەخۆت بێتەوە، دەستڕۆیشتنی خۆت بناسە، بەوشێوەیەی كە خودا دروستی كردووی، چ پەیوەندیت بەوە هەیە كێ ژێر دەكەوێت و كێ سەردەكەوێت. تۆ بەدوای مەرامێك ئەمسەر و ئەوسەر دەكەی"[٢٦٦].

عەلی معاویە بەو شێوەیە وەسف دەكات" تۆ بەدوای مەرامێك ئەمسەر وئەوسەر دەكەی" بەمانای ئەوەی معاویە بۆ گەیشتن بە مەرامی خۆی بەراوردی نێوان سەحابەكان دەكات، هەر كامێكیان باشتر بێت ئەوا هیچ پەیوەندییەكی بە معاویە نییە، چونكە لەپێگەی ئەوان نییە، بۆیە مافی نییە هەڵسەنگاندنیان بۆ بكات، ئەگەر معاویە ئەو نامەیەی بۆ هەر كەسێكی دیكە دەنارد، ئەوا ئەو كەسە هەڵدەچوو، شانازی بەخۆی دەكرد و ستایشی خۆی و زەمی نەیارەكانی دەكرد، بەمەش معاویە دەتوانێت بەخەڵك بڵێت:" سەیر بكە ئەو پیاوە چۆن زەمی ئەبوبەكری سدیق و عومەری فاروق دەكات، خودا لێیان رازی بێت". بەڵام عەلی لە وەڵامەكەی باسی ئەو پیاوانەی بەخراپە نەكرد وەك معاویە پێشبینی دەكرد، بەڵكو ستایشی ئەو دووپیاوەی كرد و وتی" ئەوان لەموهاجیرەكانی سەرەتا بوون، كەسێك مافی نییە بەراوردیان بكات ، چونكە لەیەك ئاست و وەك یەك چاكەكار بوون". كاتێك ئەو وەڵامەی عەلی دەخوێنینەوە، هیچمان لەدەست نایەت تەنها سەرسامی نەبێت بەو بەرزیی و دووربینیەی ئەو، كەچی موسڵمانانی ئەو سەردەمەمان لەوە ناگەن و هەزمی ناكەن، چونكە ئەوان زیاتر لە ئاكاری معاویە نزیكن نەوەك عەلی، بۆیە دەبینین بە بەراوردكردنی سەحابە خەریكن لەسەر رێچكەی معاویەن، ئەمەیان لەبیر كردووە كە ئامانجی عەلی قووڵتر و رێگای دروست بووە،

***

لەكاتێكدا معاویە نامەی بۆ عەلی دەنوسی و بەوە تۆمەتباری دەكرد، گوایە ركابەریی ئەبوبەكر و عەلی كردووە و تیرەیی لەبەرامبەر ئەوان هەبووە و لێیان یاخی

[٢٦٦] محمد عبده، المصدر السابق، ج٣، ص٣٤-٣٥

بووە، کەچی لەهەمان کاتدا نامەی بۆ محەمەدی کوڕی ئەبوبەکر نووسیبود، لەنامەکەی دا هەر ئەودوو پیاوە بەوە تۆمەتبار دەکات گوایە ستەمیان لەعەلی کردووە و ماف عەلییان خواردووە. مەسعودی دەڵێ: محەمەد کوڕی ئەبوبەکر نامەیەکی بۆ معاویە ناردووە. لەنامەکەدا سەرکۆنەی دەکات لەبەر ئەوەی لە ئیمام عەلی یاخی بووە، باسی چاکەکانی عەلیش دەکات، لەبەر ئەمە معاویە وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ: " لەمعاویە کوڕی صەخرەوە بۆ (ئەو کەسەی بەخشندەیە لە بەرامبەر باوکی) محەمەد کوڕی ئەبوبەکر....دواتر: نامەکەی تۆم بۆ هاتووە باسی ئەوەت کردووە کە خودا بە توانا و دەسەڵاتی خۆی چی بەخشیوە، کاتێک پێغەمبەرێکی ناردووە. بەڵام قسەکانت لاوازی تێدایە. باوکیشت سەرسەخت بووە. باسی چەکاکەکانی عەلی کوڕی ئەبوتالیبت کردووە، ئامازەت بە رابردووە کۆنەکەی و نزیکایەتی ئەو کردووە. ئێمە هەموومان لەگەڵ باوکت چاکەکانی کوڕی ئەبوتالیبمان دەزانی کە مافی ئەو پاساوی بەسەر ئێمەوە هەبووە. کاتێک خودا ئەوی بۆ پێغەمبەرەکەی هەڵبژاردووە، سەلات و سەلامی لەسەر بێت. کەچی باوکت و فاروق مافی ئەویان پێشێل کرد وسەرپێچی فەرمانەکەیان کرد. لەسەر ئەمەش رێکەوتن و هاوکار بوون. ئەگەر ئەمە دروست نەبێت، ئەوا باوکت کارەکەی کردووە و ئێمە شەریکی باوکت بووین. ئەگەر باوکت ئەو کارەی ئەنجام نەدایە، ئێمەش سەرپێچیمان لە عەلی کوڕی ئەبوتالب نەدەکرد و خەلافەتمان رادەست دەکرد. بەڵام بینیمان باوکت ئەو کارە دەکات و ئێمەش وەک ئەومان کرد. جاری گلەیی لە باوکت بکە و واز لەوانیتر بهێنە. سەلامت لێ بێت"[٢٤٧].

وەک دەردەکەوێت معاویە دەبەوێت ململانێیەک لە نێوان عەلی و دوو خەلیفەکەی دیکە دروست بکات، بابەخیش بەوە نادات زەبرەکە بەر کێ دەکەوێت. ئەو جارێک

---

[٢٤٧] المسعودي: مروج الذهب، ج٢،ص٣١٥-٣١٦

دەڵێ عەلی رکابەری دوو خەلیفەکەی کردووە و ئیرەیی بەوان بردووە. جارێکی دیکەش دەڵێ ئەوان رقیان لە عەلی بووە و مافیان خواردووە. هەرچۆنێک بێت لەو نێوانەدا معاویە قازانج دەکات. چونکە دەبینی دوو خەلیفەکە لەریزی ئەون. جا ئەو دوو شێخە لەسەر هەق بن یان نا، ئەوا معاویە ئارەزوو دەکات لە ریزی ئەوان بێت. باسی هەر چاکەیەکی ئەوان بکرێت ئەوا ئاراستەوخۆ بۆ ئەو هەژمار دەکرێت. بێگومان ئەمە فێڵ و تەڵەکەیە، زوو یان درەنگ موسڵمانی پێ فریو دەدات.

***

ئەمڕۆ کە کتێبی دەمارگیرەکان لە شیعە وسوننە دەخوێنینەوە، کاریگەریی ئەو فێڵە ئەمەوییە بەئاشکرا دەبینین. هەردوو لایەنیش خەریکە ئەوە لەبیردەکەن کە معاویە چی بەئیسلام کردووە. سەرجەم ئەو مشتومڕەی لە نێوانیان هەیە لەبارەی ئەو رکابەرییە دروستکراوەیە، کە گوایە لە نێوان عەلی و دوو خەلیفەکەی دیکە هەبووە. دەمارگیرە شیعەکان هەموو بەرپرسیارێتی ئەو ستەمی لە مێژووی ئیسلام روویداوە دەخەنە ئەستۆی ئەبوبەکر و عومەر. بەبڕوای ئەو دەمارگیرە شیعانە ئەو دووکەسە رەوابیان بەو ستەمە داوە کە بەرهەق بە ئەهلی بەیت کراوە و دەرفەتیان بە بەنی ئومەییە داوە زیاتر لەسەر ئەو ستەمە بڕۆن. لە بەرامبەریشدا ئەهلی سوننە شتەکان ئاوەژوو دەکەنەوە و معاویە بە ئیمامێکی سالح دەزانن، گوایە لەسەر رێگەی ئەبوبەکر و عومەر رۆیشتووە. کەواتە ستەمێک نەبووە و ئەوانیش بەمە خەمبار نابن وەک لە ئایەتە قورئانییەکە هاتووە( ولا هم یحزنون).

کەواتە ئەو دوو شێخە لە نێوانیی هەردوو لادا وەک(هێڵی پێشەوە)ن بۆ بەرگریی و هێرش بەکاردێن. شیعە هێرشیان دەکەنە سەر بۆ ئەوەی ئەو خەلیفانە ئاشکرا بکەن کە لەدوای ئەو دووانە هاتوون. سوننەش بەرگریی لەو دوو پیاوە دەکەن بۆ ئەوەی پەردەپۆشی مێراتی موسڵمان بکەن کە لەدوای ئەو دووانە هاتوون. ئەو مشتومڕەش لەنێوان ئەو دوولایەنە بەردەوامە و لە ئاستێک ناوەستێ. هەر لایەنێکیش

بۆ بۆچوونەکەی پشت بە لیستێکی دوورودرێژی بەڵگەی نەقڵی و عەقڵی دەبەستێت و لۆژیکی (ئەرستۆتالیس)یش لەیەک کاتدا پشتگیری هەردوو لایەن دەکات!.

***

سوننەکان دەڵێن: عومەر بۆ ماوەیەکی زۆر معاویەی کرد بە والی شام، کەنارگیری نەکرد، دەستی بەسەر ماڵەکەی دانەگرت، وەک ئەوەی لەگەڵ والییەکانی دیکە ئەنجامی دەدا. ئەگەر معاویە پیاو چاک نەبووایە ئەوا عومەر لێی ڕازی نەدەبوو، کەچی شیعەی هیچی دیکەیان بەدەستەوە نییە، تەنها ئەوە نەبێت لەگەڵ معاویە جنێو بەعومەریش بدەن. لێرەوە سیفەتە دژبەیەکەکان لە هەردوو لا کەڵەکە دەبن و بە تێپەڕبوونی ڕۆژگاریش زیاتر دەبێت. ئەگەر هەردوو لا دادپەروەر بن؛ ئەوان دەبێت بزانن معاویەی سەردەمی عومەر، هەر ئەو معاویە نەبووە کە پاش مردنی عومەر هەبوو. معاویە کەسێکی زۆرزان بووە زانیویەتی کوێ نیسک دەهێنێ. چەندین بەڵگە هەن ئاماژەمان بۆ دەکەن کە معاویە لەسەردەمی عومەر کەسێکی نەرم بووە؛ لەبەردەستی خەلیفەکەی ملکەچ بووە و بە هەموو شێوەیەک خەلیفەکەی ڕازی کردووە. بەڵام هەرکە عومەر دەمرێت ئەوا معاویە دەبێتە سوڵتانێک سەر بە خەڵک دادەوێنێ. تەنانەت دروستە بڵێین معاویە لە ڕۆژگاری عوسماندا خۆی خەلیفەی ڕاستەقینە بوو. ئەو کات لە نێوان عەلی و عوسمان گفتوگۆیەک لەبارەی معاویە دروست دەبێت، کەچی عوسمان پاساوی ئەوە دەبێت گوایە عومەر معاویەی کردۆتە والی. عەلی وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ:" لەڕێی خودا پێت دەڵێم: ئایا دەزانی معاویە زیاتر لە (یەرفا)[218] لە عومەر دەترسا، کەچی معاویە بەئاگاداری تۆ سەرپێچی دەکات و دواتریش بە خەڵک دەڵێ: ئەمە" فەرمانی عوسمانە." ئەمانە دەزانی و نایگۆڕی"[219]. کەچی شیعە و سوننە نایانەوێت لەمە تێبگەن. سوننەکان ئارەزووی

---

[218] بەپێی چەند سەرچاوەیەک یەرفا یەکێک بووە لە دەستوپێوەندەکانی عومەری کوڕی خەتاب (وەرگێڕ)

[219] صادق عرجون، المصدر السابق، ص١٦٨

ئەوە دەکەن معاویە بە پیاوێکی چاک بزانن جا لە ژیانی عومەر بێت یان دوای مردنی بێت، شیعەش ئارەزووی ئەوە دەکەن لە هەردوو قۆناغدا معاویە بە پیاوێکی خراپ بزانن. ئەوانە هەموویان وەك ژمێریارێك کە چۆن مامەڵە لەگەڵ ژمارە دەکات، وەها مامەڵە لەگەڵ کەسایەتی مرۆڤ دەکەن، ئەگەر ژمارە سێ بێت هەر سێیە و هەرگیز نابێتە چوار.

***

یەکێك لەو راستییانەی کە دەبێت ئەو گێلانە تێبگەن، ئەوەیە: عومەر و عەلی لە یەك کۆمەڵە بوون و ئاراستەیان لەیەك نزیك بووە. هیچ مێژوونووسێك ناتوانێ نکوڵی لەوە بکات کە یارانی عەلی لە خەلافەتدا پشتگیری عومەرییان کردووە و یارانی عومەریش لە خەلافەتدا پشتگیری عەلیان کردووە. ئەو سەحابانەی کە تەشیعیان بۆ عەلی کرد، لە سەردەمی عومەر سەرکار و سەرکردە بوون و بە فەرمانی خەلیفە و بە هاوکاری خەلیفە خزمەتی ئیسلامیان دەکرد، ناوی هەندێکیان دەهێنین: عەممار کوڕی یاسر، سەلمان فارسی، بەرای کوڕی عازب، حوزەیفەی کوڕی یەمان، سەهلی کوڕی حەنیف، عوسمانی کوڕی حەنیف، حەجەڕی کوڕی عودەی، هاشمی مرقال، مالك ئوشتەر، ئەحنەفی کوڕی قەیس ، عودەی کوڕی حاتەمی تەی[220]، کاتێکیش عومەر سەفەری بۆ شام کرد عەلی لە مەدینە لە شوێنی ئەو دانیشت[221].

لە لایەکی دیکەوە دەبینین، ئەوانەی بەیعەتیان بۆ عومەر کردووە و لە خەلافەتەکەی پشتگیریان کردووە، هەر ئەو کەسانەن کەدواتر بەیعەتیان بۆ عەلی کردووە و لەژێر ئاڵای ئەو جەنگاون. زۆرینەی موهاجیر و ئەنسار بەیعەتیان بۆ عەلی کردووە. ئەمەیان بابەتێکە گومانی تێدا نییە. عەلی چەند جارێك باسی ئەوەی کردووە ئەوانەی بەیعەتیان بۆ کردووە، هەر ئەو کەسانەن کە بەیعەتیان بۆ ئەبوبەکر و عومەر کردووە. کەسیش وەڵامی ئەو قسەیەی نەداوەتەوە و بەدرۆی نەخستۆتەوە.

---

[220] سيد امير علي، مختصر في تاريخ العرب،ص٤٤

[221] محمد حسين الزين، الشيعة في التاريخ، ص٩٤-٩٨

ئالوسی دەڵێ: هەشت سەد سەحابەی بەیعەتی ڕەزوان لە صەفەین لەژێر ئاڵای عەلی لە دژی معاویە دەجەنگان، سێسەدیان کوژران[٢٢٢]، سەحابەی ڕەزوانیش ئەوانە دەستبژێرێك بوون لە سەحابە وموهاجیر وئەنسار. بەیعەتی ڕەزوانیش لە ساڵی حودەیبیە بوو، ئەوکاتە موهاجیر و ئەنسار بەیعەتی خۆیان بۆ پێغەمبەر نوێکردووە و دەریانخست کە لەپێناوی دەمرن. ئەمانەش جیاوازییان لەگەڵ ئەو کەسانە هەیە کە دوای فەتحکردنی مەککە بوون بە ئیسلام. زۆرینەشیان مونافیق بوون، لەترسان بوون بە موسڵمان نەوەك بەئارەزوو. ئەوانە بەڵگەی مێژوویی زەقن، دەبێت بە بەرچاوی موسڵمانانی شیعە و سوننەوە بێت، هەروەها دەبێ تێبگەن ,نەوەك خۆیان بەو مشتومڕە نەزۆکە سەرقاڵ بکەن کە سوودێکی بۆ ئەوان نییە.

بێگومان عەلی وا خۆی دەبینی، لە ئەبوبەکر و عومەر زیاتر شایەتی خەلافەتەدا، بەڵام بۆشمان هەیە بپرسین: ئایا عەلی ئەمەی بۆ بەرژەندی تایبەتی خۆی بوو یان بۆ بەرژەندی موسڵمانان بوو؟ ئەگەر مەبەستی بەرژەندی موسڵمانان بێت، ئێمە پێمانوایە بۆ ئەمەی بووە، ئەوا ئەو کات بایەخ بەوە نادات کە خۆی یان کەسێکی دیکە خەلافەتی بەدەستەوە دەبێت، ئەگەر بەرژەندی موسڵمانان مسۆگەر بێت.

خەلافەت هۆکارێك بووە نەوەك ئامانج. بۆیە دەبینین عەلی بەیعەت بۆ هەریوو شێخەکە دەکات و بۆیان دڵسۆز دەبێت و نوێژیان لەپشت دەکات. ئەمە ئەوکاتە بوو بینی لە خەلافەتیدا ئەوان لەسەر ڕێگای ڕاست و دادپەروەریی دەڕۆن. بۆ ئەمە قسەیەکی هەیە کە لە کاتی بەیعەتی عوسمان کردوویەتی وەدەڵێ:" زانیوتانە من لە کەسانی دیکە شایەنترم، من ئەوە دەکەم بۆ ئەوەی موسڵمان بەدوور بن لە کێشە، ئەگەر ستەمەکە تەنها بۆ منیش بێت[٢٢٣]، من بۆ چاکە و خواپەرستی کردوومە، ئەوان

[٢٢٢] الالوسي: مختصر التحفة الثني عشرية، ص٣

[٢٢٣] وەرگێڕانی بەڵاوەتی ئەو تێکستانەی ئیمام عەلی کوڕی ئەبوتالب بۆ کوردی کارێکی ئاسان نییە، بەتایبەتیش کاتێك دەزانرێت تێکستەکە کۆنە، بەڵام بۆ گەیشتن بەنزیکترین مانای

ڕکابەرییان بۆ زێڕ وزیو کردووە"[٦٢٤]. ئەو چەند وشەیەی سەرەوە کلیلێکمان بۆ کەسایەتی ئیمام عەلی پێ دەدات. ئەوا بەڕاشکاوی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە جیاوازی گەورە لە نێوان ئەو ستەمە هەیە کە لەودەکرێت، لەگەڵ ئەوستەمەی لە موسڵمانان دەکرێت. هەر یەکەیان ڕووی خۆی هەیە، ئەو بایەخ بەوە نادات ستەملێکراو بێت کاتێك موسڵمانان ڕازین و ئاسوودەن.

زۆرێك لە خەڵك بە شێوەیەك لەشێوەکان هەست دەکەن ستەمیان لێکراوە، لەو دونیایەشدا سیستەمێکی کۆمەلایەتی نییە هەموو خەڵك ڕازی بکات. بەلام جیاوازی لەنێوان سیستەمێك و سیستەمێکی دیکە ئەوەیە کە زۆرینەی خەڵك هەست بە ستەم و زۆرداری دەکەن. کەسی دڵسۆزیش ئەوەیە کە بەدوای زۆرینەی خەڵك بچێت و بۆچوون و بەرژەوەندی خۆی لەبیر بکات. ئێمەش بڕوامان وایە ئیمام عەلی وەها بووە. عەلی بەخەلافەتی دوو شێخەکە ڕازی بوو، کەچی برایانی شیعە بەوە ڕازی نابن کە ئیمامەکەیان پێی ڕازی بووە. وەك ئەوەی دەیانەوێ ئیمامەکەیان لەو دوو شێخە تووڕە بێت و نەفرەتیان لێ بکات چونکە خەلافەتیان لەدەست دەرهێناوە. ئەوەی جێگای سەرنجە معاویە عەلی بەو شێوە ئاوەژوویە نیشان داوە، بۆ ئەوەی بەخواستی خۆی نێچیرەکانی بگرێت. دواتریش شیعە هات بۆچوونی معاویەیان وەرگرت و زۆر بەداخەوە بۆچوونی عەلییان فەرامۆش کرد.

دەگێڕنەوە لە کاتی جەنگی صەفەین عوبەیدوڵلای کوڕی عومەر بانگی محەمەدی کوڕی عەلی دەکات بۆ ئەوەی شەڕە شمشێر بکەن، بەلام عەلی ڕێگا بە کوڕەکەی نادات. دواتر محەمەد قسە بە عوبەیدوڵلا دەڵێ و ناوی باوکی تۆزێك بەرقەوە دەهێنێ، عەلی دەڵێ:" کوڕەکەم ناوی باوکی مەهێنە، تەنها بەچاکە باسی بکە"[٦٢٥].

---

ڕستەکانی، ئەوا پشت بەچەند سەرچاوەیە بەستراوە کە لێکدانەوەیان بۆ وشەکان کردووە.(وەرگێڕ)

[٦٢٤] محمد عبدە، نهج البلاغة، ج ا،ص ١٢٠-١٢١

[٦٢٥] علي الهاشمي النجفي، محمد بن الحنيفة، ص١١٤

ئەمە لەلایەن کەسانی بە متمانەی شیعە ریوایەتی بۆ کراوە، کەچی خەڵکی سادەی شیعە تێناگات، یان لەوانەیە نەیانەوێ لەوە بگەن کە ئیمام عەلی فەرمان بە کوڕەکەی دەکات تەنها بەچاکە ناوی ئیمام عومەر بهێنێ. کەچی خەڵکی عەوامی شیعە نەفرەتکردنی عومەریان کردۆتە شەریعەتێك و هەردەم لەسەر زاریانە. هەندێك برادەر باسی ئەوەیان بۆکردم، کە عەوامی شیعە لە چەند ناوچەیەکی دوورەدەست و لاچەپ هەموو ساڵێك لەرۆژێکی دیاریکراو جەژنێك دەکەن بەناوی "عید زەهرا" لەو رۆژەدا بەبۆنەی کوشتنی عومەرەوە ئاهەنگ دەگێڕن. لەو ئاهەنگەشدا چەندین کرداری نابەجێ ئەنجام دەدەن کە هیچ سەلیقەیەکی دروست قبوڵی ناکات و کەسیش نییە رەخنەیان لێ بگرێت و بەربەرچیان بداتەوە.

لەوانە ئەمە بەربەرچدانەوەی کرداری هەندێك سوننە بێت، کە کاتی خۆی ئاهەنگیان لە رۆژی عاشورا دەگێڕا، ئەمەش هەستی بریندار کردنە. شیعەش بەمە دەیانەوێت هێرشبکەنە سەر سوننە، ئەمەش بە لێدانی شازیزترین پیاویان، بۆیە جەژنی زەهرایان داهێناوە. ناشزانن ئەوان بەو کارەیان سوکایەتی بەخانمی فاتیمەی زەهرا و عەلی مێردی دەکەن. فاتیمەی زەهرا و ئیمامی مێردی زۆر لەوە بەرزتر و مەزنتر بوون بەو کاری قێزەوەنی وەها رازی بن. ئێمە لەبەر ئەو کارە گلەیی لە خەڵکی سادە ناکەین، بەڵکو گلەیی لە پیاوانی ئایینی دەکەین کە ئەمە دەزانن و بەربەرچییان نادەنەوە. وەك دەریشدەکەوێ، ئەوان تەنها دەیانەوێت خەڵك لەوان رازی بێت و بایەخ بەشتی دیکە نادەن. نان لە دیدی ئەو پیاوە لەحەقیقەت گرنگترە، ئەوە کاری ئەو خەڵکە تەنها ئەوانە نەبێت کەخودا رەحمیان پێدەکات.

***

ئەوەی شایەنی باس بێت، خەڵکی سوننەش لە لایەکی دیکەوە تووشی نەخۆشییەك بوون، هاوشانی نەخۆشی شیعەکانە. ئەوان بانگەشە بۆ ئەوە دەکەن عەلیان خۆشدەوێ و پەیرەوکاری دڵسۆزی ئەون، بەڵام دواتر بێ دوودڵی داکۆکی لە معاویە دەکەن و پاساو بۆ کارەکانی دەهێننەوە و دەڵێن "خوای لێی رازی بێت".

ئەوەی معاویەی خۆشبویّ وەك ئەو كەسەیە كە رقی لە عومەر دەبیّتەوە. هەردووكیان بەپێی خواستی خۆیان وێنای مێژوو دەكەن و پەند و عیبرەتە كۆمەلاّیەتییەكەش فەرامۆش دەكەن. عومەر دادپەروەر بووە، كەچی معاویە ستەمكار بووە. ئەوەی ستەمكاری خۆشبویّ لە سیاسەتی نەتەوەكاندا بابەتی دادپەروەری لەیاد دەكات و پاساو بۆ زۆرداران دەهێنێتەوە. ئەوەی شكۆمەندی بە ستەمكار دەدات، بەرپرسیاریّتی ستەمەكەی دەكەوێتە ئەستۆ. پێغەمبەر فەرمویەتی:" ئەوەی كاری قەومێكی خۆشبوێت، ئەوا لەگەلّ ئەوان حەشر دەكرێت". ئێمە بۆیە مێژوو دەخوێنین بۆ ئەوەی لە رۆشنبیركردنی خۆمان و پەروەردەی مندالەكانمان سوودی لێوەرگرین. بەلاّم ئەگەر هاتوو بۆ ئەوەی مێژوومان خوێند تا بۆ پیاوێك دەمارگیر بین، بێ ئەوەی پرەنسیپەكانی لەبەرچاو بگرین، ئەمە بەلگەیەكە كە ئێمە غیلبازیین نەوەك چاكساز. مامۆستا سەعید ئەفغانی دەلیّ:" راست بوو عەلی خاوەن هەق بوو. ئیمامێك بوو گوێڕایەلّی بۆ ئەو فەرزبوو. معاویە موجتەهیدێك بوو بەپاداشت هەلّە بوو"[٢٢٦]. ئەگەر معاویە موجتەهید بێت، ئەوا هەموو زۆردار و ستەمكاران وەك ئەو موجتەهیدن. تۆ ئەو شەریعەتە روونانەی كە پێغەمبەران و چاكەخوازانی كۆمەلاّیەتی هێناویانە لەلایەك دابنیّ. ئەوكاتە دزێك كەرێگریی دەكات، دەتوانێت بانگەشەی ئەوەبكات موجتەهیدە. نیرۆنیش دەتوانێت بانگەشەیەكی وەها بكات، هەر تاوانبارێكیش ئەوەندە پاساوی هەیە بۆ كارەخراپەكانی بهێنێتەوە.

***

ئەو مەزەهەبە بەسەرمنەوە زالە، كە لەسەرەتادا شیعە و سوننە بانگەوازیان بۆ خەلافەتی راشدین كردووە، بۆیە بۆ ئەو مەبەستەش لە پالّ ئیمامی عەلی دەجەنگان، بەلاّم معاویە هەولّی دا كەلێنێك لە نێوان یارانی عەلی و یارانی عومەر بدۆزێتەوە، بۆ ئەوەی شوێنی خۆی بكاتەوە. بە تێپەڕبوونی رۆژگار لە هەولّەكانی سەركەوت. یارانی

---

[٢٢٦] سعید الافغانی: ابن حزم الأندلسي، ص٢٥٣

عەلی بەرەو توندڕەویی و یارانی عومەریشی بەرەو میانڕەوی برد.خراپەکاریش لە زێڕێیی و توندڕەویی دایە. بەبڕوای من چاکترین کەس کەنوێنەرایەتی ئیسلامی کردووە، شەهیدی مەزن زەید کوڕی عەلی بووە. ئەو پیاوە لە هەردوولا شوێنی زامەکانی دوژمنیەوە و دەستی بە چارەیەکی مامناوەندی گرت. ئەمڕۆ پێویستە ژیاننامەی ئەو شەهیدە بخوێنین بۆئەوەی ژیانی ئێستامانی پێ ڕۆشن بکەینەوە.

زەید لە دژی بەنی ئومەییە وەستایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دوو شێخەکەی خۆشدەویست و بەچاکترین شێوە ڕێزی بۆ دڵسۆزی و دادپەروەریی ئەوان دادەنا. تەبەری دەڵێ:" لەکاتی شۆڕشی زەید بەرامبەر بە ئەمەوییەکان، کەسانێک لە شیعە توندڕەوەکان هاتنە لای زەید و بەمشێوەیەی خوارەوە گفتوگۆیان لەگەڵ کرد":

پیاوەکانی شیعە: رەحمەتی خودات لێ بێت، قسەت لەبارەی ئەبوبەکر و عەلی چییە؟

زەید: خوا لێیان خۆش بێت. لە یەکێکی کەسوکارم بەبیستووە خۆی لەودووانە پەنا بگرێت و تەنها بەچاکە باسی ئەو دووانەیان کردووە.

پیاوەکان: کەواتە داوای خوێنی ئەهلی بەیت ناکەیت. ئەو دووانەش بوون دەسەلاتیان لەدەستی ئێوە دەرهێنا؟

زەید: لەبارەی ئەو بابەتەوە ئەوەندە دەڵێم ئێمە لە هەموو کەسێک زیاتر شایەن بووین، بەڵام قەومێك دەسەلاتیان قۆرخکرد و ئێمەیان بەدوور گرت، نێوانمان بەکوفر نەگەیشت. ئەوان دادپەروەر بوون لەگەڵ خەڵك بەکتێبی خودا و سوننەت حوکمڕانیان کرد.

پیاوەکان: کەواتە ئەو پیاوانەی ئێستا(مەبەست ئەمەوییەکانە) ستەمیان نەکردووە، ئەگەر ئەوانی پێشوو ستەمیان نەکردبێت، کەواتە بۆچی شەڕ لەگەڵ کەسانێك دەکەیت بەستەمکاریان دازانی؟

زەید: ئەمانەی ئێستا وەك ئەوان نین بۆ من و بۆ ئێوە و بۆ گیانی ئێوە، بەڵکو بەپێی کتێبی خودا و سوننەتی پێغەمبەر بانگەوازتان بۆ دەکەین، دەبێت

سوننەتەکان زیندوو بن و بیدعەکان دابمرکێنەوە. ئەگەر ئێوە وەڵاممان بدەنەوە ئەوا دڵخۆش دەبین، ئەگەر رازی نین ئەوا من وەکیلی ئێوە نیم. پیاوە توندڕەوەکانی شیعە بەو قسەیە رازی نەبوون و رۆیشتن. بۆیە زەید بە(رافیزە) ناوی دەبردن.[٢٢٧] جگە لە تەبەری چەندین مێژوونووسی دیکە ئەو بەسەرهاتەیان گێڕاوەتەوە، من بەهەموو وردەکارییەکەی بە ڕاستی دەزانم. سەرەڕای ئەمەش لێکچوونێکی گەورە لەنێوان تێڕوانینی زەید و عەلی باپیرەی دەبینم، هەردووکیان ڕێچکەی دوو شێخەکە و ڕێچکەی بەنی ئومەییە لە یەکتر جیادەکەنەوە. هەرکەسێکیش بە بێلایەنی و بە دادپەروەریی سەیری ئەو بۆچوونە بکات ئەوا بەدروستی دەزانێت. ئەمە پایەتێکی دادی کۆمەڵایەتییە، سوودی بۆ عەوامی خەڵک هەیە و مەسەلەیەکی تایبەت نییە. لێرەوە سەرچاوەی هەموو توندڕەوییەکانی شیعە و سوننە دەردەکەوێت. ئەوانەی ڕقیان لە عومەر دەبێتەوە، دادپەروەرییەکەی فەرامۆش دەکەن و ئەوانەش معاویەیان خۆش دەوێت و ستەمەکەی لەبیر دەکەن. لەونێوانەش دا ناوبژیوانەکە ون دەبێت.

***

پیاوانی بەنی ئومەییە یەکەم کەس بوون یارییان بە ئیسلام کرد و لە ڕێگای خۆیان دوورخستەوە، ئەمە هەقیقەتێکە خەریکە هەموو توێژەرانی بێلایەن لەسەری ڕێکدەکەون. نازانم بۆچی موسڵمانان لەسەر ئەو هەقیقەتە کۆک نابن، تا بحەسێنەوە و ئاسوودەبن. ئیسلام پیاوانی بەنی ئومەییەی ملکەچ و زەلیل کرد. ناتوانن ئەمە لەبیر بکەن کەئەوان مرۆڤن. ئەستەمە مرۆڤ زامەکانی ڕابردووی لەبیر بکات، بەتایبەتی ئەگەر دەمارگیریی بۆ هۆز لە دەمارگیریی بۆ خودا زیاتر بێت. هەندێک بۆ بەرگری کردن لەبەنی ئومەییە دەڵێن:" ئیسلام ئەوەی پێشووی خۆی لەیاد دەکات"، واتە ئیسلام هەموو ئەو گوناهانە لەبیر دەکات کە موسڵمان بەر لەئیسلام

---

[٢٢٧] الطبري، المصدر السابق، ج٨، ص٢٧٢

بوونی ئەنجامی داوە. ئەمە راستە، بەڵام کێشەکە ئەوەیە خودی موسڵمانەکە گوناهەکانی رابردووی لەبیر ناکات، لە ئەستی وەک گرێیەکی دەروونی دەمێنێتەوە.ئەمەش هەستی پێ بکات یان نا، هانی دەدات پیلانگێڕی لە ئیسلام بکات. ئەمەش زیاتر لە خەڵکانی دیکە بەسەر بەنی ئومەییە جێ بە جێ دەبێت، لەبەرئەوەی ئەوان لەسەرەتادا سەرسەختترین دوژمنی ئیسلام بوون و بەردەوام بۆ ماوەی بیست ساڵ دژایەتییان دەکرد و پیلانیان بۆ دەگێڕا. کەچی یەکێک لە سەیرترین شتەکانی زەمانە ئەوەیە دوای بیست ساڵ دەسەڵاتیان بەسەر ئیسلام زاڵ دەکەن.

بیست ساڵ لە دژی ئیسلام جەنگان ودوای بیست ساڵ حوکمڕانی ئیسلامییان کرد. ئەمەش گاڵتەجارییەکە نموونەی لە مێژووی گەلاندا دەگمەنە. لێرەشدا سەیر نییە کەیەکەم شۆڕشی گەورە لە مێژووی ئیسلامدا لەلایەن موهاجیر وئەنسار ئەنجام بدرێت، بەنی ئومەییە عوسمانیان کوشت بۆ ئەوەی لە جێگادا ئەمرێت و دوژمنە سەرسەختەکەیان کە عەلی کوڕی ئەبوتالیبە خەلافەت وەربگرێت. کاتێکیش عەلی خەلافەتی وەرگرت، ئەوا خاتوو عائیشە و تەڵحەی و زوبێریان لە عەلی هان دا. کاتێک عەلی بەسەر ئەوانە سەرکەوت، سەر لەنوێ کێشەیان بۆ دروست کرد. ئارام نەبوونەوە تا خەلافەتیان بەدەست هێنا. گۆڕەپانەکە بۆ ئەوان خاڵی بوو تا بەخواستی خۆیان یاری بکەن.

کاتێک خوتبە ونامەکانی ئیمام عەلی دەخوێنینەوە، دەبینین سەرجەم رەخنە و گلەییەکانی ئاراستەی بەنی ئومەییە دەکرێت. لە تێڕوانینی عەلی ئەوان هۆکاری مەینەتییەکانی ئیسلامن. کەچی موسڵمانان ئەو قسانەی ئیمام عەلی لەبیر دەکەن و مێژووی ئیسلام بە خواستی خۆیان شرۆڤە دەکەن. تەنانەت موسڵمانان لە بێئاگایی گەیشتوونەتە حاڵەتێک پەردەپۆشی کارەکانی بەنی ئومەییە دەکەن. شیعە گلەیی لە عومەر دەکەن و سوننەش بەرپرسیارێتی دەخەنە ئەستۆی ئیبن سەبائی. پیاوانی

بەنی ئومەییەش دەیانەوێت ئەمە بەناو موسڵمانان بڵاوبکەنەوە. خۆیان قازانجیان کرد وزیانیش بۆ ئیسلام.

***

جەنگی جەمەل یەکەم جەنگە لە مێژووی ئیسلامدا، کە موسڵمانان لەگەڵ یەکتر جەنگاون. کاتێک موسڵمانان لەسەردەمی عومەر یەك بەرە بوون و لەگەڵ دوژمنێکی هاوبەش دەجەنگان، کەچی لەو جەنگەدا یەکتریان دەکوشت. ئەمە ئابڕووچونێکی کۆمەڵایەتی بوو، کە جێگای داخە. بەڵام کێ ئەمەی وروژاند؟. مێژوونووسان دەڵێن: عائیشە و تەڵحە و زوبێر لەوکارە پەشیمان بوونەوە. ئەگەر ئەمە راست بێت ئەمە بەڵگەی ئەوەیە ئەوان بە خواستی خۆیان ئەو شەڕەیان نەکردووە. بەڵکو پاڵیان ناون و یەکێك بووە هانی داون. خاتوو عائیشە لە زەمەنێکی زووەوە رقێکی زۆری لەعەلی بوو. گومانمان لەوە نییە، بەڵام رقی کەسی شتێکە و تێوەگلان لەو ئابڕووچوونە کۆمەڵایەتییە شتێکی دیکەیە.

جێگای مشتومڕ نییە کە خاتوو عائیشە یەکێك بووە لەژنە چاکەکان. کەسی چاکیش بە سۆزی تایبەتی خۆی لە ئاژاوەیەکی گەورە تێوەناگلێ کە هیچ سوود و ئامانجێکی نەبێت. بۆیە دەبێت لەپشت عائیشەوە کەسێك هەبێت، چالی بۆ هەڵکەند بێ. پێغەمبەر محەمەد دەفەرموێ:" خودا ئەو وەسوەسەیەی دڵی ئومەتەکەم حسێب ناکات، ئەگەر کاری پێنەکات و قسەی لەسەر نەکات"[٢٢٨]. کەچی خاتوو عائیشە ئەوەی لەبەرامبەر عەلی لە دڵی دابوو کاری پێکرد و قسەی پێکرد. ئەی کێ بۆ ئەمە هانی دا؟ موحیدین خەتیب دەیەوێت پاساو بۆ کارەکانی عائیشە بهێنێتەوە و دەڵێ:" عائیشە لەگەڵ گەورە سەحابەکان کۆبۆوە، بۆئەوەی بیروڕا بگۆڕنەوە کە چی بکەن. کاتێك نێردراوەکان زانیان ئەوانە پاکن و لە ئارەزوو دوورن، بۆیە بڕیاریان دا لەگەڵ عائیشە بەرەو عێراق بچن. بۆئەوەی لەگەڵ میری موسڵمانان لەبارەی

[٢٢٨] حمدي عبيد، الاحاديث النبوية، ص١٣

سزادانی سەبەئییەکان ڕێك بکەون کە بەشداریان لە خوێنڕشتنی عوسمان کردووە، بەوپێیەی کە ئیسلام واجبی کردووە. لە خەیاڵی عائیشە و ئەو کەسانەدا ئەبوو کەدەڕۆن شەڕ لەگەڵ عەلی دەکەن، بەتایبەتی تەڵحە و زوبێر، کەپێغەمبەری موژدەی بەهەشتی پێداون. لە خەیاڵی عەلییش ئەبوو ئەوان موژمن و لەگەڵی دەجەنگن."[229].

ئەگەر ئەوەی مامۆستا خەتیب دەیڵێ ڕاست بێت، ئەی بۆچی خاتوو عائیشە چووە بەسرە، نەچووە مەدینە کە عەلی لەوێ بوو تا لەگەڵی ڕێك بکەوێت؟ بۆچی سوپاکەی دەستی بەسەر خەزێنەی (بيت المال)ی بەسرا داگرت، بەر لەوەی عەلی بگاتە ئەوێ؟ ئەی بۆچی ریشی کارگێڕی بەسرایان تاشی؟ ئایا ریشتاشین لەو سەردەمەدا یەکێك بووە لە هۆکارەکانی ڕێکەوتن؟ .

لە هێنانەوەی پاساو و تەئویلکردن پێویست بەو ئادادپەروەرییە ناکات. لەڕاستیدا ئەوانەی هاتی عائیشە و تەڵحە و زوبێریان دا پیاواتی بەنی ئومەییە بوون. چەندین کەسمان لەوان لە سوپای عائیشە بینی لەوانە:مەڕوان کوڕی حەکەم و یەعلی کوڕی ئومەیە و عەبدوڵلا کوڕی عامر بوو. ئەوانە ئەو پارەیەی لە سەردەمی عوسمانەوە لە خەزێنە کەوتبووە دەستیان، ئەوا لەبەر دەستی سوپایان دانا و چەك و تفاقیان بە پارەکە کڕی. دکتۆر تەها حوسێن باس لەوە دەکات یەکەم کەس کە ئاماژەی بۆ عائیشە کردووە بەرەو بەسرا بچێت، عەبدوڵلای کوڕی عامر بووە. گوایە وتویەتی لەنێو خەڵکی بەسرا پیاوی چاك هەیە و خۆشەویستی و هۆگرییان هەیە، بۆیە دەتوانن گوێڕایەڵ بن و لە هەر شتێك پاڵپشتی پیاوەکانی بکەن"[230].

ئیبن ئەسیر ئەوە دەگێڕێتەوە کە مەڕوان کوڕی حەکەم بانگی نوێژی دا، دواتر هاتە لای تەڵحە و زوبێر وتی:" سەرکردایەتیەکە بەکێ سپێردراوە" عەبدوڵلای کوڕی زوبێر گوتی" بە باوکم"، محەمەد کوڕی تەڵحەش وتی" بە باوکم" عائیشە کەسێکی بۆ

[229] الالوسي، المصدر السابق، ص٣١٩-٣٢٠
[230] طه حسين، المصدر السابق، ج٢، ص٣٦

گلەیی کردن ناردە لای مەروان و وتی" ئایا دەتەوێ جیاوازی بخەینە ناومان"[٢٢١].

دەگوترێت معاویە نامەی بۆ تەڵحە و زوبێر بەجیا ناردووە و هانیان دەدا لەگەڵ خاتوو عائیشە دەربچن و وا دەکات چاویان ببڕنە خەلافەت و دەڵێ:" بەر لەوە کارەکە بۆ من بێت ، بۆ تۆ و برادەرەکەتە. کامە لەپێشترە بۆ ئەوە، دواترە بۆ ئەویترە" من ئەوە بەدوور دەزانم تەڵحە و زوبێر بەو قسەیە باوەڕ بکەن. لەگەڵ ئەوەشدا بەردەو بەسرا ڕۆیشتن و ئەو ڕووداوە شوومە ڕوویدا. خەتیب دەڵێ:" هۆکاری جەنگی جەمەل کوڕی سەبا و برادەرانی بوو، کە لەریزەکانی سوپای عەلی بوون. کاتێک هەستیان بە نزیکبوونەوەی سوڵحی نێوان دوو کۆمەڵکە کرد، ئەوا ئاژاوەیان نایەوە وایکرد لەگەڵ یەکتر بجەنگن، کەچی ئارەزووی جەنگیان نەبوو"[٢٢٢].

ئەگەر ئەمە ڕاست بێت چی وایکرد، خاتوو عائیشە بێتە گۆڕەپانی جەنگ کاتێک جەنگەکە لە کۆتایی نزیک دەبۆوە. ئەو سواری وشترە بەناوبانگەی هەودج بوو کە بەقەڵغان بوو، بۆیەش جەنگەکە سەرلەنوێ هەڵگیرسایەوە. ئایا ئەو کاتە کوڕی سەبائی لەگەڵ دابوو، یان کەسانێکی لەگەڵ بوو، ڕۆڵی کوڕی سەبایان دەبینی و هانی عائیشەیان دەدا[٢٢٣]. شێخ محەمەد عەبدە دەڵێ:" حوشترەکەی عائیشە سەرقافڵەبوو هەر بۆیەش لەدوولا چەندین کەس کوژرا، لەدەوروبەری حوشترەکەش حەفتا قورەیش هەبوو، تەنها یەک کەس ئەجاتی بوو"[٢٢٤]. سەیر ئەوەیە مێژوونووسان ئەو ژمارە زۆرەی قورەیش فەرامۆش دەکەن، بە خەیاڵ کەسایەتی کوڕی سەبائی دادەهێنن، بۆ ئەوەی بەرپرسیارێتی جەنگەکەی بخەنە ئەستۆ. ئایا ئەوکەسانە لە قورەیش لەپێناو خوا دەیانویست دەوری حوشترەکەیان دابوو، بەرگریان لێدەکرد؟

[٢٢١] ابن الاثير، الكامل في التاريخ، ج٥، ص١٠٥
[٢٢٢] الالوسي، المصدر السابق، ج٢،ص٥٠
[٢٢٣] طه حسين، المصدر السابق، ج٢،ص٥٠
[٢٢٤] محمد عبده، المصدر السابق،ج١،ص٤٠، الحاشية

وەک دەردەکەوێت قورەیش دوای بەیعەتی عەلی بوون بەدوو بەشەوە، بەشێکیان چوونە لای معاویە، بەشەکەی دیکەش چوونە ریزی سوپای عائیشە. عەممار کوڕی یاسر دەڵێ:" قورەیش لەگەڵ عەلی جەنگان، وەک چۆن پێشتر لەگەڵ محەمەد دەجەنگان." تکا لە خوێنەر دەکەم دیقەتی ئەو قسەیەی عەممار بدات و بیری لێبکاتەوە. ئەمە جێگای داخ نییە، تەنها بۆ ئەو کەسانە نەبێت کە لەگەڵ خواستی قورەیش تێکەوتن و دواتریش پەشیمان بوونەوە. چاکترینیان ئەوانە زووبێر بەر لە بەسەرچوونی کاتەکە لەجەنگەکە چووە دەرەوە، بەمەش نموونەیەکی ئابایی دا بۆ زیندوویی ویژدان و نیازپاکی، خودا لێی خۆشبێت. خەریکە باوەڕ بەوە دەهێنم ئەوانەی ئەفسانەی کوڕی سەبائیان داهێناوە تەنها بۆئەوەی پەردەپۆشی کارەکانی قورەیش و پیاوانی بەنی ئومەییە بکەن، ئەگەر مێژووی ئیسلاممان لەو ئەفسانەیە داماڵی، ئەوا شتێک نامێنێتەوە، بۆیە بەنی ئومەییە بەدڵی خۆیان هاتووچۆ دەکەن، ئەمەش ئەستەمە لە لای لایەنگرانی پیاوانی بەنی ئومەییە هەزم بکرێت.

مامۆستا مەحمود مەلاح، لە یەکێک لە نامەکانی دەیەوێ بەرگری لە پیاوانی بەنی ئومەییە بکات دەڵێ:" هەندێک بڕوایان وایە کوڕی سەبائی بوونی نەبووە، بەڵکو شوێنەواری کارەکەی هەبووە!" ئەمە راستە، چونکە دەبێت کەسانێک هەبن پیلان بۆ ئیسلام بگێڕن و بیانەوێ بیڕوخێنن. بەڵام ئەوانە کێن؟ ئایا ئەوان سەبائییەکانن یان پیاوانی بەنی ئومەییە؟ ئایان دەکرێت توێژەرێکی بێلایەن ئەفسانەیەکی وەهمی داینێت بۆ ئەوەی کاولکاریی ئیسلامی بداتە پاڵ؟ مەلاح لەبەر ئەوە داکۆکی لە بەنی ئومەییە دەکات، گوایە ئەوان چەندین وڵاتیان بەناوی ئیسلام فەتح کردووە. با گریمانەی ئەوە بکەین ئەوان سەرداری دەوڵەتی بتپەرستن، ئایا ناکرێت ئەوان بەناوی بتەکانەوە فەتح بکەن. سوڵتانێکی زۆردار دەیەوێت دەسەڵاتی بەهەر ناوێکەوە بێت فراوان بکات. لەوکاتەدا بە دیدی ئەو جیاوازی لەنێوان خودا و هوبەل نییە. کەچی گرنگ بەلای ئێمەوە ئەوەیە بەر لەوەی سەیری فەتحی سوڵتان بکەین، دەبێت سەیری دادپەروەرییەکەی بکەین. مێژووی کۆن و نوێ پڕ بووە لە فەتحی

سوڵتانەکان، بەڵام دادپەروەر لەنێو ئەواندا دەگمەنە. ئەمەش کرۆکی بابەتەکەیە و باوەڕمان پێیەتی و بانگەشەی بۆ دەکەین.مامۆستا مافی خۆیەتی بە پیاوانی بەنی ئومەییە سەرسام بێت و ڕێز لە هۆکارە تایبەکانی ئەوان بگرێت کە دەسەڵاتیان پێوەرگرتووە. بەڵام ناشێ بەناوی ئیسلامەوە ڕێز لەوان بگرین، پرەنسیپە ئاینییەکان شتێکن و پیلانە میکیاڤیلییەکانیش شتێکی دیکەن. ئەوەی بەناوی ئاینەوە ڕێز لە فێڵبازیی بگرێت، ئەوا بێ ئەوەی ئاگادار بێت ئاین دەشێوێنێ. چاکەش لە ئاینێک نییە دامەزرێنەرەکەی میکیاڤیللی بێت.

***

لایەنگرانی بەنی ئومەییە دەڵێن:" یەکەم کەس بنەمای زێدەڕۆیی لەبارەی علی بڵاوکردەوە و ئەفرەتی لەدوو شێخەکە کرد، کوڕی سەبائی و هاوڕێیانی بوو". سەرەڕای ئەمەش دەڵێن:" عەلی هاوڕێیانی کوڕی سەبائی وەک سزایەک بە ئاگر سووتاند. بەڵام خودی کوڕی سەبائی سزا نەدا، ئەمەش لە ترسی خەڵکی شام بوو، بۆیە بۆ مەدائین دووری خستەوە. کوڕی سەبائی لە مەدائین خەریکی بڵاوکردنەوەی ڕێنمایە بەرزەکانی خۆی بوو. کاتێک هەواڵی مردنی عەلی پێگەیشتووە، هەواڵەکەی بەدرۆخستۆتەوە و دەستیکردووە بە بڵاوکردنەوەی پرەنسیپی(رجعە) لەنێو لایەنگرانی خۆی"[224]. ئەگەر ئەوەی دەیڵێن ڕاست بێت، بۆچی معاویە دوای مردنی عەلی ئەوی دەستگیری نەکرد؟ بۆچی ڕێگەی دا بەئازادی ژەهر بەناو خەڵک بڵاوکاتەوە، وەک ئەوەی لەڕۆژگاری عوسمان ئازاد بوو؟ ئایا معاویە لەو ڕازی بوو؟ یان چی؟ بۆچی کوڕی سەبائی لە جێگاکەی دەمرێت و کەسێک لەدوای ئەو هەموو کارە خراپە کە گوایە کردوویەتی سزای نادات و لۆمەی ناکات؟

معاویە حەجەری کوڕی عودەی کوشت، لەبەر ئەوەی ڕازی نەبوو نەفرەت لە عەلی بکات، کەچی کوڕی سەبائی ناکوژێت کە نەفرەت لە ئەبوبەکر وعومەر دەکات.

---

[224] سعد محمد حسن، المهدية في الاسلام، ص٩٣-٩٤

وعەلیش داڵدەی دەدات. ئایا ئەمە نهێنییەکی سەیر نییە؟ ئەو مێژووی ئیسلامە چەندین نهێنی بەخۆیەوە گرتووە، کەچی ئەوان مێژوو لەسەر شێوەی هەزار و یەک شەوە دەنووسنەوە و داواش لە ئێمە دەکەن باوەڕیان پێبکەین و لەگەڵیان کوێر بین. بەبڕوای ئەوان کوڕی سەبائی قینی لە ئیسلام هەبوو دەیویست بیڕوخێنێ، کەچی معاویە بۆ ئەوە خەڵکی لەعەلی هانداوە، لەپێناو خۆشەویستی ئیسلام وبەرژەوەندی گشتی! ئەو خوێنەی لە بەسرا وصەفەین رێژرا تەنها لەئەنجامی ئیجتهادی معاویە بوو لەپێناوی خودا دا، کەسێکیش ئیجتهاد بکات ئەوا پاداشتی دەبێت وەک لە فەرموودەی پێغەمبەر هاتووە.

***

ئالوسی دەڵێ: " سەرەتا سوننەکان لە شیعە دڵسۆزەکان بوون، بەڵام ئەو ئاژاوەیان جێهێشت کاتێک سەبەئییەکانیان لەو ریزەدا بۆ دەرکەوت. ئەمەش لەپێناو ئەوە بوو تێکەڵیی روونەدات و لەگەڵ ئەو چەپەڵانە بەشداریی ناوێک نەکەن"[٢٢٦]. ئەگەر ئەمە راست بێت، ئایا ناکرێت ئەو سەبائییانە سیخوڕبن و لەلایەن معاویە رەوانە کرابن بۆ ئەوەی جەماعەتی عەلی پەرتەوازە بکەن؟ شیعە و سوننە لە رۆژگاری عەلی لە یەکریز بوون وەک ئالوسی باس دەکات. ئایا چی وایکرد جیابینەوە؟ ئایا بەرژەوەندی معاویە پێویستی بەو جیابوونەوەیە نەبوو؟ چ شتێك رێگری لە معاویە دەکات سیخوڕەکانی خۆی بخاتە ریزی عەلی بۆ ئەوەی لەلایەك لایەنگری ئەو بکەن و لەلایەکی دیکەش ئەفرەت لە دوو شێخەکە بکەن؟ بەمەش دەتوانن مشتومڕ و بەربەرەکانی ناپاك بورووژێنن، کە ببێتە هۆی پەرتەوازەبوون و بڵاوکردنەوەی رق و قینە.

دەگوترێت مهلب کوڕی ئەبوصفرە ئەو کارە نابەجێیانەی لەگەڵ خەواریج کردووە. مهلب پیاوێکی نەسرانی خستە ریزی خەواریجەوە و دوای ئەوەی پیلانێکی لەگەڵ

---

[٢٢٦] الالوسي، المصدر السابق،ص٧

داناببوو، بە پاداشتێکی گەورە فریوەی دابوو. نەسرانییەکە چووە لای شێخی خەواریجە کە قەتری کوڕی فجائە بوو، پیاوە مەسیحییەکە کرنۆشی بۆ شێخ برد و وتی:" تەنها کرنۆشم بۆ تۆ بردووە" یەکێك لە خەواریجەکان هەڵسایەوە بەشێخی گوت:" ئەوە لەجیاتی خودا تۆ دەپەرستێ". شێخ وەلامی دەداتەوە ودەڵێ" نەسرانییەکان پێشتر عیسای کوڕی مەریەمیان پەرستووە، عیساش لەمەدا هیچ زیانی بەرنەکەوت" پیاوێکە بۆلای نەسرانییەکە رۆیشت و کوشتی. شێخ نکوڵی لەو کارەکرد، بەمەش خەواریجەکان نکۆڵیان لە شێخ کرد. بەمەش مهلب گەڕایەوە، بۆیە پیاوێکی دیکەی نارد. تا بابەتێکی کەلامی زۆر وردیان لەنێودا بووروژێنێت، بەمەش ناکۆکی کەوتە نێوانیان. هێندەی پێنەچوو خەواریجەکان بوونە چەند کۆمەڵەیەك لەیەکتریان دەدا و یەکتریان تەکفیر دەکرد[137]. ئەگەر مهلب ئەمەی لەگەڵ خەواریج کردبێت، ئایا بەدوور دەزانرێت معاویە ئەمەی لەگەڵ شیعە کردبێت؟ ئەوە ناشاردرێتەوە کە شیعە و خەواریج دوژمنی سەرسەختی بەنی ئومەییە بوون. ئایا معاویە سڵی لەوە دەکردەوە ئەوەی مهلب لە ریزی خەواریج ئەنجامی داوە، ئەو لە ریزی شیعە ئەنجامی بدات؟

مێژوونووسەکان باس لەوە دەکەن کە سیخوڕەکانی بەنی ئومەییە چییان لە ریزەکانی خەواریج کردووە، بەڵام باسی ئەوە ناکەن سیخوڕەکان چییان لە ریزەکانی شیعە کردبووە؟ لەگەڵ ئەوەشدا ددان بەوە دەنێن کە سیخوڕەکانی معاویە هاتبوونە ریزەکانی شیعەوە. بەڵام چییان دەکرد؟ ئایا قورئانیان دەخوێند و ئیستغفاریان دەکرد؟ ئایا معاویە بۆ ئەو مەبەستە ئەوانی ڕەوانە کردبوو؟ لێرەدا دەمەوێ قسەکانم چەند جارێك ئاراستەی مێژوونووسان بکەم و بپرسم: ئایا رکابەریی لەنێوان عەلی و عومەر هەبووە کاتێك عومەر لە ژیان مابوو؛ یان دواتر دروستکراوە؟ ئایا کێ دروستی کرد و سوودی کێی تێدابوو؟ ئەگەر دروستکەرەکەی کوڕی سەبائی بێت

[137] ابن ابی حدید، المصدر السابق، ج٤٠٠-١٤٠١-٤٠١

وەك ئەوان دەڵێن: واچاكترە ئەو مێژووە بە دیواردا بدەین و لە شوێنی ئەو كتێبی هەزار و یەك شەوە بخوێنینەوە. چونكە ئەو كتێبە هەموو ڕووداوێكی سەیر بۆ جنۆكە دەگێڕێتەوە. جنۆكە بە ئیزنی خودا دەتوانن كارێك بكەن. بۆیەش لەنێو دەستمان ئەو مێژووە وەك هەویرە بەخواستی خۆمان لەقاڵبی دەدەین.

***

لە وڵاتانی پێشكەوتوو لێكۆڵەرەوەكان لە بەدواداچوونی تاوان ڕێگایەكی نوێیان بۆ ناسینەوەی تاوانبار دۆزیوەتەوە. ئەوان شێوازی ئەنجامدانی تاوانەكە دیراسە دەكەن و دواتر تێبینی دەكەن كە ئەو شێوازە لە تاوانی دیكە دووبارە دەكاتەوە. بۆیە واباشترە مێژوونووسان بەو شێوازە توێژینەوەی پیلانگێڕەكانی بەنی ئومەییە بكەن، كە لەسەرەتای ئیسلامدا ئەنجامیان داوە. بۆیە دەبینن ئەوەی بەنی ئومەییە لە شوێنێك ئەنجامی دەدا، ئەوا لە شوێنی دیكە دووبارەی دەكاتەوە.

دەگێڕنەوە معاویە هەمان شێوازی لەگەڵ سەركردەكانی ڕۆم بەكاردەهێنا، كە پێشتر لەگەڵ موسڵمانەكان بەكاری دەهێنا. ئەگەر ویستی لەناوبردنی سەركردەیەكی ڕۆمی هەبووایە، ئەوا نامەیەكی پڕ لە خۆشەویستی و ستایشی لەگەڵ پەیامبەریان دەنارد و چەندین خەلاتی بۆ دەنارد. فەرمانیشی بەو سیخوڕە دەكرد خۆی تووشی سیخوڕەكانی ڕۆم بكات، كاتێك سیخوڕەكان ئەو پەیامبەرەیان دەستگیر دەكردو نامەكەیان دەخوێندەوە، وایان دەزانی ئەوسەركردە سەربازییەی نامەی بۆ هاتووە لەگەڵ معاویە خەریكی پیلانگێڕییە ، جا سەركردەكەیان كەنارگیر دەكرد یان بەتوندترین شێوە سزایان دەدا[228]. نابێت ئەوەش لەبیر بكەین، هەمان هۆكار لەلایەن بەنی ئومەییە لەگەڵ شۆڕشگێرانی سەردەمی عوسمانیش بەكارهێنرا. ئەوان نامەیەكیان بۆ كارگێڕی میسر نارد و مۆری عوسمانی لێدرابوو، فەرمانی پێدەكرێت كە هەندێك لەشۆڕشگێران بكوژێت و هەندێكی دیكەش جەڵدە بكات. نێردراوەكەش

[228] عباس العقاد، معاوية بن ابي سفيان، ص٧٠-٧١

بە لای شۆڕشگێڕان تێدەپەڕێت وئەوانیش نامەکە دەدۆزنەوە و ئەو نووسراوە یەکێك بوو لە گرنگترین هۆکارەکانی کوشتنی عوسمان. لایەنگرانی بەنی ئومەییە دەڵێن: "ئەوانەی نامەکەیان نووسی بوو ، لایەنگرانی کوڕی سەبائی بوون"[٣٣٩]. نازانم سەبائییەکان چۆن گەیشتە مۆرەکەی عوسمان و نووسراوەکەیان پێ مۆرکرد. مۆرەکە لە لای مەروان بوو، چونکە ئەو مۆری خەلیفەی هەڵدەگرت. شۆڕشگێڕانیش بەڕاشکاوی ئەویان بە نووسینی نامەکە تۆمەتبار کرد. کەسێکیش بەرژەوەندی لە کوشتنی عوسمان نییە، تەنها کەسە نزیکەکانی نەبێت کە بەنی ئومەییە بوون. ئەگەر کوشتنی عوسمانیش نەبووایە ئەوان نەیاندەتوانی ئەو دەسەڵاتە فراوانە وەربگرن! بۆیە سەیر نییە شۆڕشگێڕان بە کوشتنی ئەو شێخە پیاوچاکە تۆمەتبار بکەن، بۆ ئەوەی خوێنەکەی بکەنە هۆکارێك بۆ گەیشتن بە ئامانجیان.

شۆڕشگێڕان لە کوشتنی عوسمان تێوەگلان، خاتوو عائیشەش لە جەنگی جەمەل تێوەگلا. سەرجەم موسڵمانانیش دواتر بە رکابەرە وەهمییەکەی عەلی و عومەر تێوەگلان. کەچی لایەنگرانی بەنی ئومەییە دێن، بەرپرسیارێتی هەموو ئەمانە دەخەنە ئەستۆی کەسێکی وەهمی بۆ ئەوەی کاری خۆشەویستانیان بەردەپۆش بکەن. بەڵام ئێستا ئایا کاتی لادانی ئەو پەردەیە هاتووە؟

***

یەکێك لە کتێبەکانی ئیبن حەزمم لەبارەی بەراوردکردنی سەحابەکان خوێندەوە. لەوە سەرم سوڕما کە چۆن بنەما مەزنەکانی ئیسلام لە کتێبەکە بۆتە ئەو هیچ وپووچییە دەبەنگییە. ئیبن حەزم دەڵێ چاکترین کەس لەدوای پێغەمبەری خودا عائیشەیە. ئەوەی ئیبن حەزم لەو لێکدانەوەیەدا پشتی پێدەبەستێت فەرموودەیەکی پێغەمبەرە کە دەڵێ: "چاکتربوونی عائیشە بەسەر ژنانەوە، وەك چاکتربوونی خواردنی سەریدە(جۆرێك لەخواردنی هاوشێوەی تەشریبە) بەسەر خواردنەکانی

[٣٣٩] ابن العربي، العواصم من القواصم،ص١٢٨

دیکەوە[٦٤٠]، دوای عائیشەش ژنەکانی دیکەی پێغەمبەر دێن و لەدوای ئەوانیش ئەبوبەکر و عەلی و عوسمان، ئینجا عەلی دێت. ئیبن حەزم هەر چاکەیەك لەبارەی عەلییەوە گێڕدراوەتەوە فەرامۆش دەکات، بۆ ئەوەی عەلی لەو ڕیزبەندە دابنێت.

شیعەش بەتورەیی لەمە هەڵچوون؛ دەستیانکرد بەرەتکردنەوەی قسەکانی ئیبن حەزم و چەندین بەڵگەی نەقلی وعەقلی دەهێننەوە، بۆ ئەوەی بیسەلمێنن عەلی لەدوای پێغەمبەر چاکترین کەسە. کتێبش لەملاو لەولا لەو بارەیەوە کەڵەکە دەبوون. ئەوەی ئەو کتێبانە بخوێنێتەوە ناتوانێت خەم نەخوات لەوەی ئیسلام تەنها بۆتە بەراوردکردنی ئەوەی یەکەمی موسڵمان. ئیبن عەرەفە دەڵێ:" زۆربەی ئەو فەرموودە دانراوانەی(حەدیسی مەوزوع) لەبارەی بەراوردکردنی سەحابەوە هەیە، ئەوا لەسەردەمی ئەمەوییەکان بووە، ئەمەش بۆ نزیکبوونەوە بووە لە هەندێك سەحابە لەدژی بەنی هاشم بەکارهاتووە"[٦٤١]. ئیبن ئەبی حەدید دەڵێ معاویە نامەیەکی بۆ دەستوپێوەندی خۆی نووسیوە و دەڵێ:" فەرموودە لەبارەی عوسمانەوە زۆرە و لە هەموو شار و شوێنێك بڵاوبۆتەوە. ئەگەر ئەو نووسینەی منتان پێگەیشت ئەوا بانگەواز بۆ خەڵك بکەن، فەرموودە لەبارەی بەراوردکرنی سەحابە و خەلیفەکانی سەردتا ڕیوایەت بکەن. هەر زانیارێك موسڵمانان لە ئەبو توڕابی ڕیوایەت دەکەن، فەرامۆشی مەکەن تا پێچەوانەکەی لەبارەی سەحابەوە بۆ دروست دەکەن. ئەمەیان لەلای من خۆشەویستە و بەدڵی من دەبێت، بۆ ئەوەی بەڵگەی ئەبو توڕاب و شیعەبوونی ئەو پووچەڵ بکەمەوە و چاکەکانی عوسمانی پێ زیادبکەن"[٦٤٢].

ئێمە نامانەوێ لە نووسینی ئەو نامەیە گلەیی لە معاویە بکەین، چونکە ئەو دەیەوێت بەهەر شێوەیەك بێت پاڵپشتی دەسەڵاتەکەی خۆی بکات. بەڵام دەمانەوێ گلەیی لەو کەسە گێلانە بکەین کە کەوتنە داوی معاویە و بە چاکەکانی سەحابە و

[٦٤٠] ابن حزم، في المفاضلة بين الصحابة، ص١٩٥
[٦٤١] احمد امين، فجر الاسلام،ص٢١٣
[٦٤٢] ابن ابي حديد، شرح النهج، ج٣،ص١٦

بەراوردکردنیان خەریک بوون وەک ئەوەی خودا لە رۆژی قیامەت لێیان بپرسێت: فلان باشترە یان فلان؟ ئەگەر خەڵک بە بەراوردکردنی پیاوانی زیندوو لەرووی چاکەوە خەریک بوون، ئەمە بەڵگەیەکە بۆ زیندوویەتی کۆمەڵگاکە. ئەمەش ئێستا لەوڵاتانی پێشکەوتوو لەکاتی هەڵبژاردنەکان لەبارەی بەراوردکردنی پیاوانی سیاسەت روودەدات و خەڵک دەزانێ ئەوان چیان هەیە و چ ئەرکێکیان لەسەرە. بەڵام ئەگەر خەڵک بە بەراوردکردنی کەسانی مردوو خەریک بوون، ئەمە بەڵگەیەکە کە کۆمەڵگەکە نەخۆشە و لە مردن نزیکە. کەسێک بایەخ بە مردوو نادات، تەنها ئەگەر کەسە بیەوێت بمرێت و بچێتە لای مردووان خوا لێیان خۆش بێت.

پیاوان دەمرن؛ بەڵام پرەنسیپەکانیان نامرێت. ئەبوبەکر راست بوو کە گوتی: "ئەوەی محەمەدی دەپەرست، ئەوا محەمەد مرد. ئەوەی خوا دەپەرستێ، ئەوا خوا زیندووە و نامرێت" دەتوانین بڵێین بەراوردکردنی نێوان سەحابەکان لە دەروونی موسڵمانان بۆتە گرێیەکی دەروونی، بەرەو مشتومڕێکی ئەزەلیان دەبات کە هیچ سوودێکی نییە. دەگوترێت یەکێک لەوانەی فەرموودەی گێڕاوەتەوە، ناوی عمر بن کادش بووە. رۆژێک گوێبیستی ئەوە دەبێت پیاوێک فەرموودەیەک لەبارەی چاکەی عەلی دادەنێت. بەپەلە ئەویش فەرموودەیەک لەبارەی ئەبوبەکر دادەنێت و دەڵێ: "بە خوا، ئەی کارێکی چاکەم نەکردووە" لەوانەیە گوێگرانی بڵێن: "چاکت کرد، بەرەکەتی خوات لێ بێت". ئەگەریش دەروونشیکاری بۆ ئەو خەڵکانە بکەین دەبینین گرێی دەروونیان هەیە. هەر یەکێک لەوان وادەزانێت ئایین تەنها لە خۆشەویستی فلان وفیساری پیاوانی یەکەم قەتیس بووە. بۆیە دەبینی بەوە سەرقاڵە چاکەی سەحابەکەی خۆی بژمێرێت. بایەخیش بەوە نادات ئەگەر درۆی لەپێناودا بکات. درۆ ئەگەر لەپێناو خوابێت حەڵاڵە!.

لە یەکێک لە فەرموودەکان هاتووە، پێغەمبەر وتویەتی: "من شاری زانستم و عەلیش دەروازەکەیەتی" هەندێک رقیان لەو فەرموودەیە بوو، چونکە وایان دەزانی ستایشکردنی عەلی واتای زەمکردنی ئەبوبەکر دەگەیەنێت، بۆیە فەرموودەیەکیان

لەبەرامبەر ئەوە دانا و وتیان:" من شاری زانستم و ئەبوبەکر میحرابەکەیەتی"[243]. ئەستەم بوو هەندێکیان ئەو فەرموودەیە قبوڵ بکەن و تەنها ئەو چاکەیەش بۆ ئەبوبەکر بێت، بۆیە فەرموودەیەکی سێیەمیان هێنا دەڵێ:" من شاری زانستم ئەبوبەکر بناغەکەیەتی، عومەر دیوارەکەیەتی، عوسمان ساپیتەکەی، عەلیش دەرگاکەیەتی" هەندێکی دیکە فەرموودەی چوارەمیان هێنا کەدەڵێ" من شاری زانستم وعەلی دەروازەکەیەتی و معاویەش ئەلقەکەیەتی"[244].

دواتر ئیبن جوزی هات، تەواوی فەرموودەکەی بە بناغە و دیوار و ساپیتە و دەرگاو ئەلقەکەی هەڵوەشاندەوە. وەك ئەوەی لەوە ترسا بێت فەرموودەکە درێژە بکێشێ هەموو سەحابەکان بگرێتەوە و ئەوکاتە مەیوان ببێتە زێرابی شارەکە و ئەبوسوفیان ببێتە بەلوعەو شتی دیکەی هاوشێوە.

متز بۆمان دەگێڕێتەوە کەسانێکی تەڵەکەچی لە سەدەی چوارەمی کۆچی لەبازارەکانی بەغدا ئامادە دەبوون. یەکێکیان لە لایەك دەوەستا باسی لە چاکەکانی عەلی دەکرد، یەکێکی دیکەش لە بەرامبەری دەوەستا باسی لە چاکەکانی ئەبوبەکر دەکرد. خەڵکیش دەوەستان هوتافیان دەکێشا ودرهەمیان بۆ فڕێ دەدان. هەر تایفەیەك پارەی بەو کەسە دەدا کە ستایشی سەحابەکەی خۆی دەکات، لەئەنجامیشدا ئەو تەڵەکەچیانە ئەو پارەیان لە نێوان خۆیان دابەش دەکرد، کە لەشیعە و سوننەیان وەرگرتبوون"[245]. من کاتێك تەڵەکەچییەکانی سەردەمی خۆمان دەبینم بازرگانی بە تایفەگەری دەکەن، ئەو چیرۆکەم بیردەکەوێتەوە. خەریکە لەیەك کاتدا بۆ ئیسلام بگریم و پێی پێبکەنم. ئەوانەی کتێب لە بارەی چاکەی ئەم پیاو و ئەوپیاو دەنووسن، لەراستیدا جیاوازیان لەگەڵ ئەو ستایشکەرانە نییە کە لە بازاڕ راوی درهەمی خەڵك دەکەن.

---

[243] ابن حجر، الصواعق والمحرقة، ص٢٠

[244] العلجوني، كشف الخفاء،ج١،ص٢٠٤

[245] متز، الحضارة الاسلامية، ج٢، ص١٠٧

جارێکیان سەردانی کارگەکانی فۆردم کرد لەشاری دیترۆیت دواتر سەردانی گەڕەکێکی عەرەبنشینم کرد، کە لەوێ نزیک بوو. سەرم سوڕمان کە بینیم ململانێیەکی توند لەنێوان موسڵمانان لەبارەی عەلی وعومەر هەیە. خەڵکەکە لەیەکتر دەمار و تێوچەوانیان گرژ کردبوو.

لەگەڵ یەکێک لە ئەمریکییەکان باسم لەو ململانێیە ئەزۆکە کرد. ئەمریکیەکە لەبارەی عەلی و عومەر وتی:" ئایا ئەوان لەلای ئێوە لەسەر سەرۆکایەتی حکومەت رکابەریی دەکەن وەك چۆن ترۆمان و دیوی لەلای ئێمە رکابەریی دەکەن" منیش گوتم:" عەلی و عومەر بەر لە هەزار و سێسەد ساڵ لە حیجاز دەژیان، ئەو ململانێیەی ئێستا لەسەر ئەوەیە کە کامیان زیاتر شایەنی خەلافەت بووە؟" ئەمریکەیەکە لە پێکەنین کەوتە سەرپشت. منیش لەگەڵی پێکەنیم، پێکەنینێك بەمانای گریان، لە دڵخان پێکەنیم.

سەیر ئەوەیە ئەو بەسەرهاتەم بۆ یەکێك لەپیاوانی ئایینی گێڕایەوە و ئەویش بەسەرزەنشتەوە وتی:" بۆچی لە لای بێگانە ئابڕوومان دەبەی؟! " ئەو کاری ئابڕووبەرانە ئەنجام دەدات کێشەی نییە، کەچی ئازار دەکێشێ ئەگەر بیانییەك بیزانێ. سەیرتریش لەمە ئەو پیاوە سەرنجی لەسەر ئەو بەسەرهاتەی من ئەوەبوو" بیانییەکان کاری خراپیان لەئێمە زیاترە". ئەمەیە کە دەڵێن عوزری لە قەباحەت گەورەترە. زۆر کەسم لە پیاوانی ئاینی بینیوە خورافە و شتی هیچ لەبارەی باوەڕی بیانییەکان دروست دەکەن، بۆئەوەی پاساو بۆ شتە هیچ و پووچەکانی خۆیان بهێننەوە دواتر بانگەشەی ئەوە دەکەن کەئەوان خاوەنی هەقی رەهان. کەچی ئێمە لە سەردەمێك دەژین خەڵك چاوی بۆنەوە، عەقڵی ئەوان لە رۆژهەڵات و رۆژئاوا دێت ودەچێت. ئێستا ئاسان نییە قەومێك ئەنگیبیەکانی خۆیان داپۆشن و بە کەماڵ خۆیان دەرببەن. ئەمڕۆ هەقیقەتەکان بەبەرچاوی خەڵکەوە دەرکەوتن. ئەوەی ئەمڕۆ خراپەی خەڵك پەردەپۆش بکات ئەوا سبەی کەسانی دیکە ئەو پەردەیە لادەبەن. بۆیە چاکترە ئیعتراف بە هەڵەکەی خۆی بکات و هەوڵی چاککردنی بدات بەر لەوەی کەسانی دیکە ئاشکرای بکات.

***

تکام لەخوێنەر ئەوەیە بەر لەوە مێژوو بخوێنێت، زۆر بەخۆی پێبکەنێ. خودای گەورە گاڵتەجاڕییەکی وەهای دروست نەکردووە بەقەد عەقڵی مرۆڤ شایەنی پێکەنین بێت. ئەو توێژەرەی بە عەقڵی خۆی پێنەکەنێ و گاڵتە بە تەریقە باوەکانی نەکات، ناتوانێت بەدروستیی ببێتە توێژەر. ئەوەی بەخۆشی پێنەکەنێ ئەوا کەسانی دیکە پێی پێدەکەنن!.

# مێژوو و
# بەریەککەوتنی کۆمەڵایەتی



مێژوونووسە کۆنەکان لەوە ڕاهاتوون لە یەک ڕوو سەیری مێژوو بکەن و ڕووەکەی دیکەشی فەرامۆش بکەن، ئەوان سەیری لایەنی پاشاکان دەکەن و لایەنی گەلانیش فەرامۆش دەکەن.

ئەوکەسەی تەنها ئەو لایەنە پاشایەتیەی مێژوو بخوێنێتەوە هیچ تێناگات، تەنها سەرسامبوون نەبێت بەو فەتحکردنە فراوانە و ئاوەدانییە زۆروزەوەندە. واتە ئەو مێژووە بایەخ بەوە نادات کە گەلانی ژێردەست چ کۆیلەبوون و بێبەشبوونێکیان چەشتووە، بەڵکو ئەوان وەک مەرومالاتیان هەژمار دەکات کە هەستیان نییە. ئەگەریش کەسێک لەنێو ئەواندا قووت بێتەوە، ئەوا مێژوونووسان وتوویانە ئەوە دەیەوێت خراپە لە زەوی بڵاوبکاتەوە و یەکگرتوویی میللەت تێک بدات.

بۆیە مێژوونووسان تێڕوانینی دەسەڵاتدار وەردەگرن و تێڕوانینی ڕەعیەت لەبیر دەکەن، لەبەر ئەمەش دەتوانین مێژووی کۆن بەوە وەسف بکەین کە شەلە و تەنها

لەسەر یەك قاچ دەڕوات. ئەمە بۆ ئێمە جێگای داخە كە دەبینین بەشێك لە مێژوونووسان لەوسەردەمەمان لەسەر شێوازی كۆن دەنووسن وەك ئەوەی وەك پێشینانیان لەسەر پاشماوەی دەسەڵاتداران بژین و چاوەڕێی پاداشت بكەن.

مێـژووی مرۆڤایەتی بریتییە لـە گۆڕانكـاری و بزاڤێكـی بـەردەوام، جووڵانـەوە دەرناكەوێت تەنها ئەو كاتە نەبێت كە دووهۆكاری پێچەوانەی دژ بەیەكتر هەبن. تاكە هۆكار واتـای چەسپاویی و نـەبوونی جووڵەیە، لەپەندێكش هاتووە(چـەپڵە بەیـەك دەست لێنادرێت).

***

بۆ ئەفسـەرێكی سەربازی گونجاوە لێكۆڵینـەوە لـەبارەی یـەك ڕووی مێژوو بكات، پیشەكەی ئەمە دەخوازێت. ئەو ناچارە تێڕوانینی خۆی بخاتـە سـەر جەنگـەكان و هۆكاری سەركەوتن و دۆڕانیان؛ بۆیە ئەو دەبێت بە سەركەوتووەكان سەرسام بێت و ڕێز لەوانە بگرێت كە سـەركەوتنی سـەربازی نایابیـان ئـەنجام داوە. مەزنترین كـەس بەلای ئەو، پیاوانی لە نموونەی هانیبال و یۆلیۆس قەیسەر و ناپلیۆن و جەنگیزخان، كەچی پیاوانی وەك عیسا و ئەبوزەڕ و ڕۆسۆ دوور و نزیك پەیوەندیان بەوەوە نییە.

ئەوەی سەیرە زۆرینەی مێژوونووسانی كۆن لەژێر ئەو ڕۆشناییە مێژوو دەنووسنەوە. ئەوان سوپاسگوزاری سوڵتانەكان دەكەن، ئەوەی داگیریان كردووە و بونیادیان ناوە، بەڵام نكۆڵی لە گەلانی قەتمكراو دەكـەن ئەگـەر گلـەییان هـەبووبێت یـان ڕاپـەڕینیان كردبێـت. مێـژوو لـەلای ئـەوان بریتییـە لـە فـەتح كـردن و شاوەدانی، كەچـی ئـەو پڕەنسیپانەی كە شۆڕشگێڕان بانگەشیان بۆ كردووە، ئـەوا گومڕایی و بانگەشـكردنە بۆ ئاژاوەگێڕیی.

توێژەری كۆمەلایەتی نوێ بە دیدێكی دیكە سەیری مێژوو دەكات. ئـەو بێلایەنە وەك چـۆن دیراسـەی ڕووداوی سـوڵتانە داگیركـەرەكان دەكـات، هـەروەهاش سـەیری ڕووداوەكانی گەلانی داگیركراویش دەكات. بێلایەنە لەبەر لایـەك و لایـەنێكی دیكـە تۆمەتبار ناكات، هەموو لەدیدی ئەو یەكسـانن. ئەگەر شیاو بێت بۆ سوڵتانەكان

وڵاتان داگیر بکەن، ئەوا شیاویشە گەلان گلەیی لەوان بکەن و لەوان یاخی بن. زاڵبوون و یاخیبوون لە مێژووی کۆمەڵایەتی دا پەیوەستن بەیەکترەوە، ناتوانرێت لەیەکتر جیابکرێنەوە. ئەگەر ئەوان لەگەڵ یەکتر نەبن، ئەوا ترپەی دڵی مێژوو ئەوەندە زیندوو نەدەبوو.

***

ئێستاش لەبیرمە کە ئێمەی قوتابی لە قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی مێژووی کۆنمان دەخوێند. هیچ شتێك لەمێژوو نەدەگەیشتین تەنها کاری پاشاکان نەبێت. پێویستیش بوو ناوی پاشاکان و ئەو وڵاتانە ئەزبەر بکەین کە داگیریان کردوونە. بێئەوەی پرسیار لەبارەی هەستی گەلانی داگیرکراو بکەین، کە لە ئەنجامی داگیرکردنەوە هەیانبوو.

رۆژێکیان کە من منداڵ بووم هەستم بە ململانێیەکی دەروونی کرد. لەماڵەوە بەسەرهاتی پێغەمبەرانم دەخوێندەوە، لە قوتابخانە چیرۆکی سوڵتانەکان، ناکۆکییەکی گەورەم لەنێوانیان دەبینی. کتێبی پێغەمبەران وێنەیەکی پێچەوانەی ئەو مێژووەمان پێ دەدات کە لە کتێبی سوڵتانەکان هەیە. بۆ نموونە قورئان رقی لە فیرعەون وکارەکانی ئەوانە، کەچی مەزنێتی دەبەخشێتە موسا و ئەوکەسانەی کە لەگەڵی دابوون. بەڵام کتێبی مێژوو لە قوتابخانەکان جەخت لەسەر شکۆمەندی فیرعەون و نموونەی ئەوان دەکاتەوە و یاخیبووەکانی دژی ئەوان فەرامۆش دەکات.

کتێبەکانی قوتابخانە لەلای ئێمە قوتابی فێری ئەوە دەکەن ئەفسەری سەربازیی بن، نەوەك زاناو توێژەر بن. مێژوو بە وێنەیەکی بریقەدار بە ئامرازەکانی خۆشگوزەرانیی و سەرکەوتن بە قوتابی دەدات، بەڵام هەستی کەسانی ژێردەست کە زەمانە پڕ بووە لە هاوار و سکاڵای ئەوان، ئەوا لە خەیاڵی قوتابیان زۆر دوورە. لەوانەیە هاوار و سکاڵاکەیان بەناهەق دابنرێن، چونکە ژێردەستن و ژێردەستیش شایەنی ژیان نییە، ئەوەی لاواز بێت بەهێزەکانی دەیخۆن.

***

وانەکانی قورئان لە قوتابخانەکانی ئێمە فەرزکراوە. بەڵام قوتابیان کە قورئان دەخوێننەوە هەست بە نائارامی دەکەن، چونکە ئەو بابەتە پەیوەندی بە بابەتەکانی دیکەوە نییە. قوتابیان جیاوازییەکی گەورە لە نێوان قورئان و ئەو بابەتانە دەدۆزنەوە کە لەکتێبەکانی مێژوو هەیە، لەڕووداوی خۆش و فەتحکردنی نایاب. بۆیە دەبینین ئەوان لەوانەکانی قورئاندا بێ ئۆقرە چاوەڕوانی دەنگی زەنگ دەکەن، بەڵام لەوانەکانی مێژوودا حەز دەکەن کاتەکە زیاتر بێت بۆ ئەوەی چێژ لە بابەتی شکۆمەندییە مەزنەکانی سوڵتانەکان وەربگرن، کە بە شمشێر و قامچی دروستکراوە.

تێبینی ئەوە لە قوتابیان دەکرێت کە حەزیان لە قورئان نییە، سەرەڕای ئەوەی هەندێکیان واخۆیان دەردەخەن کە بەپیرۆزی دەزانن. ئەوان لە دووبارەبوونەوەی چیرۆکی پێغەمبەران بێزار دەبن. یەکێک لەوان گلەیی لەلای من کرد و گوتی: " لە قورئان شتێک نادۆزمەوە جگە لەوەی ئیبراهیم و نوح و موسا وایانگوت. شتێکی دیکەی تێدا نییە جگە لە سکاڵا لە بەدبەختی و شیوەن و فیغان. کەچی نابینیم لە قورئان ئاماژە بۆ ئەو شارستانیەتە گەشەکردووە بکرێت کە کەسانی پێشوو بەرهەمیان هێناوە".

کێشەی ئەو کەسانە ئەوەیە لە خوێندنەوەی کتێبەکانی قوتابخانە ڕاهاتوون، کاتێکیش قورئان دەخوێننەوە دەبینن جۆرێکی دیکەیە بۆیە لێی بێزار دەبن. ئەگەر ئەوانە دادپەروەریان هەبێت ئەوا دەبێت بزانن، کە قورئان لەهەموو کتێبەکانی دیکە لەقوتابخانە دەیخوێنن لە ڕۆحی تێگەیشتنی مێژوو نزیکترە. ئەو وێنەی کارلێکردنی کۆمەڵایەتیمان بەڕوونترین شێوە بۆ دەکێشێت. کاتێک توێژەر لەژێر ڕۆشنایی تیۆرە نوێیەکان دەیخوێنێتەوە دەبینێ مێژوو بە دەنگ و هاوارەکانیەوە لەبەردەمیەتی.

مێژوو لەقورئاندا بریتییە لە ململانێیەکی تاڵی نێوان پیاوانی هاوشێوەی فیرعەون و پیاوانی شێوەی موسا. لەهەموو زەمانێکیش موسا و فیرعەون هەن. کەواتە مێژوو ئارام و سارد نابێتەوە. ئەو هەموو ڕۆژێک قۆناغێکی نوێمان بۆ دەردەخات کە ڕابردوومان بیر دەباتەوە و بەرەو ئایندەمان دەبات.

قورئان زەمی بەنی ئیسرائیل دەکات، بەڵام ستایشی پێغەمبەرانی دەکات. بەنی ئیسرائیل تووشی لەخۆبایی بوون و خۆیان بە گەلە هەڵبژاردەکەی خودا دەزانی. ئەوان چاویان بڕیوەتە ئەوەی پاشایەکیان لەناو دەربکەوێت فەتحی جیهان بکات و ئەوان بەسەر جیهان زاڵ بکات. کەچی پێغەمبەرەکانیان بۆچوونێکی دیکەیان هەبوو. ئەوان بانگەشیان بۆ شۆڕش و چاکسازی دەکرد نەوەک بانگەشە بۆ داگیرکردن و زاڵ بوون بکەن.

قورئان لەچەند ئایەتێکی ئاماژە بۆ هەقیقەتێکی کۆمەڵایەتی دەکات. یەکێک لە مێژوونووسە کۆنەکان ئەبووە درکی پێ بکات، کاتێک دەفەرموێ: خودا هەر پێغەمبەرێکی ناردبێت ئەوا خۆشگوزەرانەکان بەرپەرەکانێیان کردووە و ژێردەستەکانیش لە دوای دەچن. قورئان باس لە قسەی خۆشگوزەرانەکان دەکات و لە چەند حاڵێکدا ئاماژەیان بۆ دەکات:

١-خۆشگوزەرانەکان دەڵێن:" ( **بل قالوا إنا وجدنا آباءنا على امة وإنا على آثارهم مهتدون**".

٢-هەروەها دەڵێن:" **وقالوا نحن اكثر اموالا واولادا وما نحن بمعذبين**".

٣- به پێغەمبەریش دەڵێن:" قالوا أنؤمن لك واتبعك الأرذلون " هەروەها بە پێغەمبەر دەڵێن:"**ما نراك الا بشرا مثلنا وما نراك الا الذين هم اراذلنا بادي الراي و مانرى لكم علينا من فضل با نظنكم كاذبين**".

تیۆرە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان لەم لایەنەوە خەریکە بەتەواوی لەگەڵ قورئان کۆک بن. خۆشگوزەرانەکان لە هەر نەتەوەیەک بن بەرپەرەکانێی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان دەکەن. ئەوان لە یەکەم حاڵدا شانازی بە نەریتە باوەکانیان دەکەن، دووەمیش شانازی بە سامانە کەڵەکەبووەکەیان دەکەن. لە سێیەم حاڵیشدا شانازی بە پێگەی کۆمەڵایەتییان دەکەن. ئەمەش هاوشێوەی ئەو وەسفەیە کە لە قورئان کراوە بە پلەیەک پێویستی بە تێرامان هەیە.

قورئان بەوردی باسی ململانێی نێوان پێغەمبەران و خۆشگوزەرانەکان دەکات، هەندێک دووبارەی تێدایە، بەڵام مەبەست لەو دووبارەیە ئەوەیە کە خوێنەر تێبگات ئەو لەسەردەمێک دەژی جیاوازی لەگەڵ سەردەمەکانی پێشوو نییە. لەبەرامبەر ئەمەشدا ئەرکێکی کۆمەڵایەتی لەسەرە، بەوەی مێژوو وەک ئەوان دروست بکات.

***

لەسەردەمە درەنگەکاندا موسڵمانان وایان لێهاتووە دوور لە هەقیقەتی خۆی لە قورئان دەگەن. ئەوان قورئان بە تۆماری زانست و هونەرە جیاوازەکان دەزانن. نهێنییەکانی ئەتۆم و گەردوونی تێدایە، داو و دەرمانی تێدایە، جوگرافیا و جیۆلۆجی تێدایە. بۆیە بانگەشە بۆ زانایان دەکەن زانستەکانیان لە قورئان وەربگرن. ئەگەر زانایەک نەیتوانی بە ئامانجی خۆی بگات ئەمە مانای ئەوەیە کورتبینە. ئەگەر هاتوو سەبر لە توێژینەوە بگرێت ئەوا مەبەستەکەی لە قورئان دەدۆزێتەوە.

راستە ئەگەر بڵێین ئەو بیرۆکە سوڵتانیانە لەلایەن ئەو کاهینانەوە بە نێو موسڵمانان بڵاوکرایەوە، کە لەسەر پاشماوەی خۆشگوزەرانەکاکان دەژین. ئەو بیرکردنەوەیە موسڵمانان بێهۆش دەکات و وایان لێدەکات ملکەچی ستەمی دەسەڵاتداران بن و ئەو بنەمایانەی بزووتنەوە و بەرکەوتنی کۆمەڵایەتی لەیادبکەن کە قورئان ئاماژەی پێکردووە. ئەگەر موسڵمانان لە ئامانجەکانی قورئان تێ دەگەیشتن، ئەوا سوڵتانەکان نەیاندەتوانی بەناوی ئایین ستەم بکەن و لەزەت لە ئایینی خودا ببینن. لەراستیدا زۆرێک لە خەلیفەی موسڵمانان جیاوازیان لەگەڵ فیرعەون نییە، کەمێک نەبێت، ئەوان خۆشگوزەران وخوێنرێژن و بیانوویان ئەوەیە " بل قالوا إنا وجدنا آباءنا على امة وإنا على آثارهم مهتدون".

***

نیچە دەڵێ: " ئایین شۆڕشی کۆیلەیە" مارکسیش دەڵێ: " ئایین ئەفیونی گەلانە". لەڕاستیدا ئایین لە یەک کاتدا شۆڕش و ئەفیونە. ئەو لە لای خۆشگوزەرانەکان ئەفیونە، بەڵام لە لای پێغەمبەران شۆڕشە. هەر ئایینێک وەک شۆڕش لەسەردەستی

پێغەمبەرێك دەست پێدەكات و دواتر خۆشگوزەرانەكان دەستی بەسەردادەگرن و دەیكەن بە ئەفیون، ئەوكاتەش پێغەمبەرێكی دیكە دەردەكەوێت و شۆڕشێكی دیكە ئەنجام دەدات.

پێغەمبەران لە خەباتی دژ بە خۆشگوزەرانەكان چەندین ڕێگایان گرتۆتەبەر، هەندێكیان ڕێگای بۆزەتیڤیان گرتۆتەبەر وەك موسا، هەندێك ڕێگای نێگەتیڤیان گرتۆتەبەر وەك عیسا، هەندێك هەردوو ڕێگایان تێكەڵ بەیەكتر كردووە وەك محەمەد. لەڕێگاكانیشدا جیاوازیان هەبووە، بەڵام یەك ئامانجیان هەبووە و ئەویش دژایەتی خۆشگوزەرانە ستەمكارەكان و بانگەشەیە بۆ بنەماكانی دادپەروەری و یەكسانی، خۆشگوزەرانەكان دەیانەوێ كۆمەڵگا بەرەو دواوە بگێڕنەوە، كەچی پێغەمبەران دەیانەوێ بەرەو پێشەوەی ببەن. لە ئەنجامی ئەو بەریەككەوتنە كۆمەڵایەتییە شارستانییەت گەشە دەكات و كۆمەڵگاش پێشدەكەوێ.

***

ئەوەی شایەنی ئاماژە بۆ كردە خۆشگوزەرانەكان بێ ئەوەی هەست بكەن، خزمەتێكی گەورە پێشكەشی بە كۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەكەن. ئەوان پارێزەری ئاسایش و سیستەمی كۆمەڵایەتیین. ئەگەر ئەوان نەبن، ئەوا ئاژاوە دەكەوێتە ناو خەڵك و خەڵك یەكتر دەخۆن. لە دێرزەمانەوە وتراوە: "حكومەتێكی زۆردار، لە ئاژاوە باشترە". ئەمە قسەیەكی دروستە و شایەنی گاڵتەپێكردن نییە. حكومەت بەشێك پارە لە خەڵك وەردەگرێت، ئەگەر حكومەتیش نەبێت ئەوا هەموو سامانەكانیان دەكەوێتە بەردەست دزوچەتەكان. خۆشگوزەرانەكان خزمەتێكی گەورەی دیكە بە مرۆڤایەتی دەكەن. ئەو خۆشگوزەرانییەی كە ئەوان پێیوە سەرقاڵن هەندێكجار دەبێتە هاندانی ئاوەدانی و هونەر و هەندێك زانست. ئەوان بۆ خۆشییەكانی خۆیان ژمارەیەكی زۆر هونەرمەند و پیشەگەری كارامەیان لە خۆیان كۆدەكردەوە. ئەگەر ئەوان نەدەبوون، ئەوا هونەر بەو شێوەیە لەناو خەڵك نەدەبوو.

ئەوان ستەمێکی زۆر لە خەڵك دەکەن. ئەو کۆشکە مەزنەی دروستی دەکەن، هەزاران کرێکار و کۆیلە زەحمەتی لە پێناو دەکێشن و هەندێکیشیان لەسەر زەبری قامچییەکان دەمرن. بەڵام لە هەمان کاتدا ئەمە دەبێتە هۆی گەشەکردنی بیناسازی و هونەر و زانست. ئەگەر هەموو خەڵك پێغەمبەر و پەیڕەوکارانی پێغەمبەران بوونایە، ئەوا شارستانییەتی ماددی بەرەوپێش نەدەچوو. پێغەمبەران زامیەن لە کۆشکی مەزن و لەنێو بادان و تەمبوورلێدان نازین. ئەوان جەخت لەسەر لایەنی واتایی شارستانییەت دەکەنەوە و لایەن ماددیی شارستانییەتیش بەرهەمی خۆشگوزەرانە ستەمکارەکانە.

ئەو کارلێکردنە بەردەوامە لە نێوان خۆشگوزەران و پێغەمبەران چەندین سەدەیە هەیە. بەرهەمەکەی ئەو مەدەنییەتە نوێیەیە کە ئێمە چێژی لێوەردەگرین. مەدەنیەتی نوێ دوو تایبەتمەندی هەیە کە وا دەکەن بە شتە سەیرەکانی مێژوو بناسرێت. یەکەمیان حکومەتێکی دیموکراسییە و ئەویتریشیان پێشکەوتنی زانستییە. ئەو دوو بابەتەش بەیەك تەکان بەرهەم نەهاتوون، بەڵکو هەریەکەیان لە ئەنجامی زنجیرەیەك هەوڵ وکۆشش گەلانەوە هاتوونەتە کایەوە. هەر نەتەوەیەکی مەدەنی لە مێژوودا سوڵتانی خۆشگوزەران و پێغەمبەری شۆرشگێڕی تێدا هەبووە. ناتوانرێت نەتەوەیەك هەبێت، چینی خۆشگوزەرانی تێدا هەبێت، بێ ئەوەی لە بەرامبەریان پێغەمبەران و هاوشێوەی پێغەمبەران تێدا نەبێت.

بۆمان هەیە لێرەدا بڵێین زانست دووجۆرە: یەکەمیان زانستی ئایینە، کەبریتییە لە رێنمایی پێغەمبەران، دووەمیشیان زانستی دونیایە کە خۆشگوزەرانی سوڵتانەکانە. پێغەمبەر محەمەد دەڵێ:" زانایانی ئومەتەکەم وەك پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیلن" ئەمەش مانای ئەوەیە ئەوانی زانستەکانی ئایینیان هەیە پێغەمبەرانی شۆرشگێڕن، کەچی کاهینەکان زانستەکانی ئاین دەکەنە زانستی خۆشگوزەرانیی بۆ

چێژی سوڵتانەکان. بۆیە دەبینین ململانێی نێوان پێغەمبەران و خۆشگوزەرانەکان لە شێوەی فیکر دەبێت و بیروباوەڕیش ئەو کاتە لەنێوان نەیاراندا وەک شمشێرە.

***

لەوانەیە یەکێک بپرسێت: بۆچی دەرکەوتنی پێغەمبەران لەکۆندا زۆربوو، کەچی ئێستا یەک پێغەمبەر دەرناکەوێت؟ وەڵامەکە ئەوەیە: لەبەر ئەو کودەتایە بووە بەسەر هزری مرۆڤایەتی هاتووە. خەڵک لەکۆندا بەقووڵی بایەخیان بەرەوتی ئایینی دەدا، کەچی ئێستا بەرەبەرە عەقڵی خەڵک بەرەو عەلمانییەت دەڕوات. بۆیە ئێستا زیاتر بە تیۆرە زانستییەکان کاریگەر دەبن، نەوەک بە بیرکردنەوەی غەیبی. ئەگەر لەو سەردەمەمان پێغەمبەرێک دەربکەوێت، کەسێک باوەڕیان پێناکات، تەنها چەند گێلێک نەبێت. بۆیەش ئەوە ڕاست بوو کە پێغەمبەر وتی" پێغەمبەرێک لەدوای من نایەت".

لەکۆندا سوڵتانەکان بەناوی ئایینەوە خەڵکیان کۆیلە دەکرد. لەدیدی خەڵک ئەوان لەسەر زەوی سێبەری خودا بوون. خەڵک ئەوکات لەشۆڕش نەدەگەیشتن، تەنها ئەگەر لەسەر زمانی پێغەمبەرێک نەبێت کە بۆ ڕزگارکردنی ئەوان هاتبێت. بۆیە مەحاڵ بوو ڕێبەرێکی کۆمەڵایەتی بتوانێت خەڵک بۆ ڕاپەڕین لە دژی دەسەڵاتدارەکانیان هان بدات، تەنها مەگەر پەیامێکی خودای هەبێت ڕێگەی پێبدات. کاتێک سوڵتان بەناوی خواوە حوکم بکات، ئەوا دەبێت شۆڕشگێڕەکەش نێردراوی خودا بێت.

وەک تێبینی دەکرێت هەر سوڵتانێک کۆمەڵێک کاهینی بەدەورەوە بووە، کەدەسەڵاتی سوڵتانیان پیرۆز دەکرد وداوایان لە خەڵک دەکرد ملکەچی سوڵتان بن. هەر بۆیەش دەبینین دوژمنایەتی لە هەموو قۆناغەکانی مێژووی کۆندا لە نێوان کاهین و پێغەمبەرەکان هەبووە. کاهینەکانیش هەردەم حەزیان نەکردووە نوێکردنەوە لەو ئایینە بکەن کە لەباوانیانەوە ماوەتەوە، چونکە نوێکردنەوە هەر چۆنێک بێت ترسی بەسەر ئەو کاهیانەوە هەیە و هەڕەشە لە پێگەی ئەوان و سوڵتانەکانیان دەکات. هەر لەبەرئەوەشە ئەوان پابەندن بە مەراسیمە شکلییەکانی ئاین و نایانەوێت

گۆڕانکاری تێدا بکرێت. مەراسیمەکانیش دەبنە هۆی دۆگماکردنی عەقڵ؛ چونکە ئەوانەی ئەنجامی دەدەن وا دەزانن خودا جگە لەمەش شتێکی دیکەی لەوان ناوێت. بێگومان خەڵک دڵخۆش دەبن بەوەی کە دەبینن سوڵتان لەسەر ئەنجامدانی ئەو ڕێوڕەسمانە سوورە. لێرەشەوە ئەوئەفسانەیەیان بەسەر زاڵ دەبێت کەدەڵێ: "سوڵتان سێبەری خودایە لەسەر زەوی".

***

هەر ئایینێک شێوە و ناوەڕۆکی هەیە. ناوەڕۆکەکەی بریتییە لەو پرەنسیپە کۆمەڵایەتییانەی کە پێغەمبەران لەسەرەتاوە بانگەشەی بۆ دەکەن. هێندە بەسەر ئایینێک تێناپەڕێت کاتێک کاهینەکان جڵەو دەگرنە دەست. ئەوکاتەش خەڵک بنەما سەرەتاییەکانی ئایین لەبیر دەکەن و تەنها بایەخ بە ڕێوڕەسمە ڕووکەشەکان دەدەن. ئەوکاتەش وادەخەیاڵ دەکەن وەک ئەوەی خودا سوڵتانێک بێت لە سوڵتانەکان، تەنها دەیەوێت ڕەعیەت ملکەچی بێت و شتێکی دیکەی لەوان ناوێت.

ئەوەی جێگای سەرنجە خۆشگوزەرانەکان لە ئەنجامدانی ڕێوڕەسمە شکلییەکان لە خەڵکی دیکە بەتواناترن. پارەیەکی زۆر و زەوەندییان هەیە دەتوانن شوێن و پەرستگای گەورە دروست بکەن. خەڵکیش وادەزانن بەوکارانە ئەوان لە خوا نزیکترن. لەوانەیە وابزانن خودا وەک ئەوان خۆشگوزەرانە.

***

کاتێک مێژووی ئیسلام دەخوێنینەوە؛ دەبینین بە هەمان ڕێچکەی گەلانی دیکە دەڕوات. موسڵمانان وەک خەڵکی دیکەن؛ بۆیە ماقوڵ نییە لە ڕێچەکەی مێژوویان ڕیزپەڕ بن؛ وەک گەلانی دیکە نەبن.

لەئیسلامیشدا سوڵتانی خۆشگوزەران دەرکەوت؛ بۆیە دەبێت لە بەرامبەر ئەوان شۆڕشگێڕیش بەهەر جۆرێک بێت دەرکەوێت. کاتێک عومەر دەستکەوتە

بێشومارەکەی زێڕوزیوی بینی پێشبینی ئەوەی کرد و وتی:" بەڵێ، بەڵام خودا ئەمەی نەداوەتە قەومێك، بێئەوەی دوژمنایەتی و رقیان بەنێو بڵاوبکاتەوە"[٣٤٦].

عومەر دەیزانی قورەیش مەترسی بەسەر ئیسلامەوە هەیە، چونکە قورەیش لە رۆژگاری جاهیلییەت خۆشگوزەران بوو و پێگەیەکی بەرزی کۆمەڵایەتی هەبوو و دەسەڵاتێکی فراوانی هەبوو، بۆیە دوور نەبوو قورەیش هەوڵ بدات دەسەڵاتی بەسەر ئیسلام زاڵبکات و بگەڕێتەوە سەردەمی خۆشگوزەرانی خۆی و خەڵك لەو پێناوەدا کۆیلە بکات. دکتۆر تەها حوسێن دەڵێ:" سەردار لەناو قورەیشدا پیاوێکی بەکاریگەر بوو و چاوی دەبڕیە زۆر شت و زۆرزان بوو، کاتێك کێشە رووی تێدەکرد دەیزانی خۆی بەسەلامەتی دەرباز بکات، هەموو ئەمەی لە قورەیش زانیبوو،بۆیە نەیدەتوانی فێڵ لە خۆی بکات، یان نەیدەتوانی ئیسلام قبوڵ بکات و گوێڕایەڵی دەسەڵاتدارەکەی بێت"[٣٤٧].

کاتێك باس لە قورەیش دەکەین، نابێت پیاوانی بەنی ئومەییە لەبیر بکەین. ئەوان سەنگی هێز بوون لەناو قورەیش دا. هەر ئەوان بوون جەنگیان لە دژی پێغەمبەر بەرپاکرد و دەیانویست بەسەر خۆی و پەیامەکەی زاڵ بن، ئەگەر بۆیان بلوایە ئەمەشیان دەکرد. کاتێك لە دوای فەتحکردنی مەککە بەناچاریی ئیسلام بوون، ئەوا عەممار کوڕی یاسر لەبارەی ئەوان وتی:" ئەوان تەسلیم بوون، ئیسلام نەبوون".

بەهەر حاڵێك بێت کۆمەڵێك باوەڕداری بیاوچاك لەناو قورەیش هەڵکەوتن، کە هەر لەسەرەتاوە بوونە موسڵمان و لەپێناویدا جیهادیان کرد. دروست نییە ئەوان بەدڵ و بەرووخسار بە قورەیش دابنرێن. ئەوان بەڕەچەڵەك قورەیش بوون، بەڵام بەدڵ هەوادارانی پێغەمبەر بوون، بۆیە ئەو قورەیشەی کە ئێمە مەبەستمانە تەنها ئەو

---

[٣٤٦] ئەبویوسف، کتاب الخراج،ص٥٥-٥٦
[٣٤٧] طه حسین، الفتنة الکبری، ج١، ص٨١

جەماعەتەن کە لە سەرەتای بانگەوازی ئیسلام بەدوری بەنی ئومەییە بوون و دواتریش دەیانەویست دەسەڵاتی خۆیان بەسەر خەلافەت زاڵ بن.

ئەو قورەیشە وەک شایین لە ئیسلام نەگەیشتبوو، بەڵکو ئەوان وەک دەوڵەت سەیریان دەکرد بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆیان بەسەر خەلافەت زاڵ بکەن. بەڕوونی ئەوەمان لە رێبەری قورەیش ئەبو سوفیان بەدیکردووە، کاتێک سوپای ئیسلامی بینی فەتحی مەککە دەکەن بە عەباسی مامی پێغەمبەری وت: "بەخوا باوکی فەزڵ دەسەڵات بووە هی برازاکەت، بەیانییش مەزن دەبێت". عەباس پێی گوت: "ئەمە پێغەمبەرایەتییە". ئەبوسوفیانیش وتی: "بەڵێ، باوا بێت"[248]. دەگوترێت کاتێک عوسمانی خەلافەتی وەرگرت، ئەبوسوفیان وتی: "دوای تەیم و عودەی بۆ تۆ بوو. وەک تۆپ بەدەستەوە بێت، با بنەماکانی خەلافەتەکە پیاوانی بەنی ئومەییە بێت، ئەمە دەسەڵاتە نازانم بەهەشت و ئاگر چییە"[249].

نموونەیەکی دیکە لەبارەی مەڕوان کوڕی حەکەم بوو لە رۆژگاری عوسمان، کاتێک لەشۆڕشگێران چوو دەرەوە و وتی: "چیتان دەوێ. وەک ئەوە کۆبوونەوە کە بۆ تاڵان هاتبن، رووتان گرژ کردووە وەک ئەوەی بۆ سەندنەوەی دەسەڵاتی ئێمە هاتبن. بگەڕێنەوە ماڵەکانتان بەخوا لەوەی لەدەستمان دایە، ژێر ناکەوین"[250]

چەندین ریوایەتی دیکە هاوشێوە هەیە کە لێرەدا بواری گێڕانەوەیان نییە. هەموویان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە بەنی ئومەییە خەڵکی دەمارگیری جاهیلیەت بوون، بۆیە هەوڵیان داوە خەلافەتی پێغەمبەر بکەن بە دەسەڵاتێکی دونیایی. ئەمەش لەوان سەیر نییە، ئەوان لەوە راهاتوون رقیان لە ئیسلام بێت و بەهای کەمبکەنەوە. بیست ساڵ ئێیەری و ئەوان دژایەتی محەمەدیان دەکرد. دەبێت ئەوان ئەوکات لە دانیشتن و لە ماڵەکانیان باسی محەمەدیان کردبێت و گوایە چاوی لە

---

[248][248] ابن هشام، السيرة النبوية، ج٤، ج٤، ص٤٧

[249] المقريزي: النزاع و التخاصم، ص٤٠

[250] عباس العقاد، عبقرية الامام، ص٧٦

دەسەلات بووە. دوای ئەوەی بوون بە ئیسلام زەحمەت بوو بتوانن رقی محەمەد و ئایینەکەی لە دڵی خۆیان داماڵن. ئەو بیرۆکەیەی لە ئەستدا رەگی داکوتابێت، ئاسان نییە ریشەکێش بکرێت.

سعد بن موسیەب دەڵێ: پێغەمبەر لە خەونێدا بەنی ئومەییەی بینی لەسەر مینبەر بوون، بۆیە بەوە نیگەران بوو. بۆیە وەحی بۆ هات" انما هي دنیا اعطوها". بەمەش دڵنیا بۆبوە. خودا دەفەرموێ :" وما جعلنا الرؤيا التي أريناك إلا فتنة للناس والشجرة الملعونة في القرآن ونخوفهم فما يزيدهم إلا طغيانا كبيرا"[٢٥١].

ئالوسی سەرنجی خۆی لەبارەی ئەوە دەدات ودەڵێ" ماناکەی ئەوەی کردوویەتی بە فیتنە وبەلا و ئەزموون بۆ ئەوان. ئیبن موسەیب وەهای تەفسیرکردووە، ئەمەش سەبارەت بەخەلیفەکانی ئەوان بوو هەرکارێك کردیان ، ئەوا کردیان، هەر دادپەروەرییەك ئەنجامیان دابێت ئەوا ئەنجامیان داوە"[٢٥٢].

ئەگەر ئەو خەونە روویدا، ئەمە ئاماژەیەکە بۆئەوەی کە زەفتی پێغەمبەر بە بەنی ئومەییە. پێغەمبەر لەژیانیدا بەتەواوی پیاواتی بەنی ئومەییەی ناسیوە و پیلان و فریوی ئەوانی تاقیکردۆتەوە و لەوانەشە هەستی بەوەکردبێت کە ئەوانی لەدوای مردنی چی دەکەن.

محەمەد پێغەمبەرێك بوو، لەسەرووی ئەوانەشەوە پیاوێك بوو ئەزموون و زانینی لەرۆژگار وەرگرتبوو. لەوانەشە درکی بەوە کردبێت کە دوای مردنی ئەو رووداوەکان پێشدەکەون. محەمەد جەنگێکی سەختی لەگەڵ قورەیش کردبوو، تا لەکۆتایی دا توانی بیانکات بە ئیسلام. لەوانەش زانیویەتی ئەوان ئارام ناگرن تا دەگەڕێنەوە سەر رێگەی کۆنیان، جا ئەمە لەرێگای ئایین بێت، یان بەرێگایەکی دیکە بێت. ئەو خەونەی کە پێغەمبەر لەبارەی پیاواتی بەنی ئومەوییە بینویەتی، ئەگەر ئەوە راست

[٢٥١] القرآن، سورة الإسراء: الاية، ٦٠

[٢٥٢] ابن عساكر، كنز العمال، ج٦، ص٦٠

بێت ئەوا بەڵگەیە کە ئەو ترسی ئەوەی هەبووە خەلافەت بکەوێتە دەست ئەوان و منداڵەکانیان یاری بەخەلافەت بکەن.

لە پێغەمبەر دەگێڕنەوە، وتویەتی:" خەلافەت سی ساڵە. دواتر دەبێتەوە پاشایەتی"[٦٢٣] ئێمە نازانین ئاپا پێغەمبەر ئەو قسەیەی کردووە، یان ڕاوییەکان کاتێك ستەمی بەنی ئومەییەیان بینیوە ئەوەیان داوەتە پاڵ. هەر چۆنێك بێت ئەو بابەتی ئەونەکەی دەگێڕێتەوە و شرۆڤەی دەکات، بە دووریش نازانرێت پێغەمبەر پێشبینی ڕووداوەکانی داهاتوو دەکات و ئومەتەکەی لێ ئاگادار دەکاتەوە. پێغەمبەر دەزانێ ئومەتەکەی لەسەر ڕێچکەی گەلانی دیکە دەڕوات. لە دوو فەرموودەی سەحیح و چەندین شوێنی دیکە ئەوە سەلمێنراوە، پێغەمبەر بە سەحەبەکانی گوتووە:" ئێوە لە سەر ڕێچکەی پێشینەی خۆتان بست بە بست و باڵ بەباڵ دەڕۆن، تەنانەت ئەگەر ڕۆیشتنە کونی قومقومۆکێکیش، ئەوا ئێوە بەدوایان دەڕۆن"[٦٢٤].

لەوانەیە یەکێك بڵێت:" ئەگەر پێغەمبەر ئەمەی لە بەنی ئومەییە دەزانی، بۆچی هۆکاری سەرکەوتووانەی لە دژی ئەوان نەدەگرتەبەر بۆ ئەوەی لە مەبەستی خۆیان دووریان بخاتەوە؟". ئەو قسەیە هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ قسەکانی دیکەی بیرمەندانی یوتۆپی نییە. ئەوان بڕوایان وایە کە لە توانای پێغەمبەر دابووە سروشتی مرۆیی بگۆڕێت و ڕێچکەی مێژوو بخاتە سەر ڕێگای نووسراوەکەی خۆی. قورئان وا وەسفی محەمەد دەکات کە بیرخەرەوەی قەومەکەی بووە، نەوەك بەسەریان زاڵ بووبێت. بۆیە پێغەمبەر لە بەرامبەر قەومەکەی شتێکی زیاتر لەب پرهێنانەوە و ئامۆژگاری لەدەست نایەت، دواتریش بۆ ڕووداوەکانیان بەجێدەهێڵێ تا بەخواستی خۆیان کاریان لێ بکات. ئاپا لە توانای مرۆڤ دایە مێژوو لە قاڵب بدات، هەرچەندە ئەو مرۆڤە مەزن و داناش بێت؟! . مێژووی مرۆڤایەتی زۆر لەوە بەهێز و قووڵترە، تا

[٦٢٣] ابن العربي، العواصم و القواصم، ص٢٠٠
[٦٢٤] المقريزي، المصدر السابق، ص٦١

ئامۆژگاری و بیرهێنانەوە کاری لێ بکات، کەچی بیرمەندانی یۆتۆپی، کە دەیانەوێت مێژوو لە ڕێڕەوی سروشتی خۆیان بگۆڕێت، ئەوا عەقڵیان تەسکە و قسەکانیشیان لە سنووری ئەو کۆشکی بلوورین تێپەڕناکات کە تێیدا دەژین.

ئەگەر گریمانەی ئەوە بکەین پێغەمبەر ویستویەتی لە بیرکردنەوە خەیاڵییەکانیدا شوێنکەوتەی ئەفلاتونییەکان بێت و بۆ ئەمەش لەگەڵ بەنی ئومەییە بجەنگێت و دەریان بکات، ئایا بەمە دەتوانرێت ستەمکاریی لەئیسلامدا ڕیشەکێش بکات؟ لەڕاستیدا ڕەگ و ڕیشەی ستەم لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا ڕەگی داکوتاوە. بۆیە ئەگەر پێغەمبەر بیویستایە بەسەرهەر کەسێك زاڵ بێت کە مەیلی بەلای ستەمەوە هەیە، ئەوا ئەوکات دەبوایە تەواوی خەڵك لەناوببات. چونکە هەر مرۆڤێك ستەمکارە ئەگەر بارودۆخی بۆ بگونجێت. بۆیە ئەگەر بەنی ئومەییە لە ئیسلام دەرنەکەوتایە، ئەوا کەسانی دیکە لە شوێنی ئەوان دەردەکەوتن.

ئێمە دەبینین مرۆڤێکی لەخواترس لەبەر بانگەشەی دادپەروەریی و چاکسازیی دەنگی کەوتووە، ئێمە وادەزانین ئەو لە ناوەخنی خۆیدا دادپەروەرە، ئەمەش هەڵەیە. ئەو بانگەشە بۆ دادپەروەریی دەکات لەبەر ئەوەی ستەمکارە، بەڵام ئەگەر خۆی ستەمکار بووایە ئەوا بانگەشەی دەکرد خەڵك بەڕێزوو بن و نوێژ بکەن.

من تکام لە خوێنەر ئەوەیە خەیاڵ بکات خۆی لەناو کۆشکێکی گەورەیە و دەستوپێوەندەکانی دەوریان داوە. کەنیزەکان لەبەر دەستی ئەو سەما دەکەن، بێگومان لەو بارودۆخە ڕازی دەبێت و ئاسوودە دەبێت. ئەگەر یەکێکیش ناڕەزایی لە بەرامبەری دەربڕێت، ئەوا تووڕە دەبێت و چەندین بەڵگەی لۆژیکی بۆ بەرگریکردن لە خۆی دەهێنێتەوە.

***

ویلز ڕەخنە لە پێغەمبەر دەگرێت گوایە بۆ خەلافەت سیستەمێکی ڕوونی دانەناوە بۆ ئەوەی خەڵك لەسەری بڕۆن و دووربن لەو ململانێیە زۆرەی کە لە دوای مردنی ئەو

لەسەر دەسەڵات دروست بوو[٢٥٥] . من پێموایە ئەو ویلزە جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ ئەفلاتونییەکان نییە، ئەو پێیوایە پێغەمبەر نەیتوانیوە سیستەمێکی چەسپاو دابنێت تا خەڵك بێ جیاوازی لەسەری بڕۆن، بەڵام ئەوە لەبیر دەکات کە خەڵك لە لێکدانەوە و تەفسیری هەموو قسەکانی محەمەد و قورئان جیاوازن، قورئان بە زمانێکی عەرەبی زۆر ڕوون و ئاشکرا دابەزیوە، کەچی خەڵك لە تەفسیرکردنی هەر ئایەتێکی چەندین ڕێگایان گرتۆتەبەر، بە خواستی خۆیان لێکدانەوەیان بۆ کردووە، جا پێشبینی نەدەکرا ئەگەر پێغەمبەر هەرشتێکی لەبارەی خەلافەتەوە دانابوایە، ئەوا خەڵك لێکدانەوەی جیاوازیان بۆ دەکرد، ئایا دەکرا پێغەمبەر سستەمێکی ڕوونتر لە قورئان بهێنێت، سەیر بکە موسڵمانان چییان بە قورئان کرد؟

***

موزەیلی عەلاف، پیاوێکی بینی پاڵی بە دیوارەوە داوە و لەبارەی خەلافەتەوە پرسیارێك دەکات ، کەسێك ناتوانێ وەڵامی بداتەوە. لەنێوان ئەو پیاوە و عەلاف ئەو گفتوگۆیەی خوارەوە ڕوودەدات:

پیاوەکە: چی لەبارەی پێغەمبەرەوە دەڵێی؟ ئەو لە ئەرز و ئاسمان ئەمین بوو؟

عەلاف: بەڵێ.

پیاوەکە: ئایا دەیویست ئومەتەکەی لەگەڵ یەکتر جیاواز بن، یان تەبا بن؟

عەلاف: دەیویست تەبا بن.

پیاوەکە: خودا دەفەرمویٚ" وما ارسلناك الا رحمە للعالمین"[٢٥٦] . ئەی بۆچی نەیگوت ئەوە لەدوای منە، خەلیفەی منە. بۆچی وەسیەتێکی نەنوسی و هانی خەڵکی بۆ بدات؟

[٢٥٥] Wells ,outline of history, p622

[٢٥٦] سورة الانبياء، اية ١٠٧

عەلاف سەری سوڕما و نەیتوانی وەڵامی بداتەوە. رکێفی بارگیرەکەی گرت و بەرەو مەئمون رۆیشت و باسی ئەو پیاوەی بۆ گێڕایەوە. مەئمون بانگی پیاوەکەی کرد بۆ ئەوەی لەبەردەم زانایانی پیاوچاک پرسیارەکە دووبارە بکاتەوە، کەچی کەسێک وەڵامی نەدایەوە. کێشەی مەئمون و زانایانی دەوروبەری ئەوەیە بە لۆژیکی کۆن سەیری کۆمەڵگا دەکەن. ئەوان لەو شێتە دەچن کە خۆی بەدیوارەوە بەستۆتەوە. هەر هەموویان یۆتۆپیین و وادەزانن پێغەمبەر دەتوانێ بە یەک وشە هۆکارەکانی ململانێی نێوان مرۆڤ دەربخات و وایکات بە تەبایی و برایەتی تا رۆژی قیامەت بژین. ئەوان ئەوەیان لەبیرکردووە کە لەقورئان هاتووە" **ولو شاء ربك لجعل الناس امة واحدة ولا يزالون مختلفين** "[٢٥٢]. کەواتە مرۆڤ لە یەکتر جیاوازن و بەجیاوازییش دەمێننەوە. تا خودا بیەوێ هەر جیاواز دەبن. هیچ سیستەمێکیش ناتوانێت رێگریان لێ بکات تا جیاواز نەبن. چونکە ئەمەیان لێداوە لە سروشتی مرۆڤایەتییان.

***

محەمەد عەرەبی یەکگرتوو کرد بەرەو فەتحکردنی بردن. فەتحکردنیش دەبێتە هۆی دەرکەوتنی چینێکی خۆشگوزەران، ئەمەش بەهۆی ئەو دەستکەوتانەی کەدەستیان دەکەوێت. ئەمەش پێشکەوتنێکی کۆمەڵایەتییە دەربازبوونی بۆ نییە. لەوانەیە یەکێک لێرەدا بپرسێت:" ئەگەر محەمەد دەیزانی فەتحکردن دەبێتە هۆی خۆشگوزەرانی و ستەم، ئەی بۆچی فەرمانی پێکرد و خەڵکی بۆ هان دەدا؟" ئەو قسەیە لە رووی سروشتە لۆژیکیەکەی جیاوازی لەگەڵ قسەی پێشوو نییە.

عەرەب چەند هۆزێکی (بەدو) بوون یەکتریان داگیر و تاڵان دەکرد. ئەوان چاوەڕوانی یەکێکیان دەکرد یەکگرتوویان بکات و بەرەو جیهانیان ئاڕاستە بکات. ئەگەریش محەمەد دەرنەکەوتایە، ئەوا لەوانە بوو پیاوێکی وەک جەنگیزخان و تەیمورلەنگ لە

[٢٥٢] سورة هود، اية ١١٨

نێوانیان هەڵکەوتایە. جیهانی کۆنیش هەردەم لەبەر هەڕەشەی شەپۆلی بەدوەکان دابوو کە داگیرکەر و دامەزرێنەری دەوڵەتی داگیرکارانە بوون.

ئەو لە خەسڵەتەکانی محەمەد ئەوەیە دوو کاریگەری بەسەر موسڵمانان جێهێشت. لە لایەک عەرەبی یەکگرتوو کرد و بەرەو فەتحکردنی بردن، لەلایەکی دیکەشەوە ئایینێکی پێوان دا، کەچەندین بنەمای یەکسانی و دادپەروەریی تێدایە. بۆیە بینیمان عەرەبی فەتحکار لە لایەک قورئان بەدەستەوە دەگرێت و بەدەستەکەی دیکەش شمشێر بوو. شمێشێر لە سروشتەکەی دا زەبر و زۆرداریییە. قورئانیش لەسروشتەکەی دا شۆڕشگێرییە و بانگەشە بۆ دادپەروەریی دەکات. بۆیە بینیمان عەرەب هەرشوێنێکی داگیرکردبێت ئەوا گەلەکەی ئەوێ هاواریان بۆ محەمەد کردووە.

ئەگەر بەراورد لەنێوان جەنگیزخان و محەمەد بکەین؛ ئەوا جیاوازییەکی زۆریان لەنێوان دەدۆزینەوە. محەمەد عەرەبی بۆ ئەوە ئاراستە نەکردووە لە پێناوی فەتحکردن فەتح بکەن، بەڵکو مەبەستی ئەوەبووە ئەو گەلانە بە فەتحکردن رزگار بکەن کە پێشتر لەبەر دەستی داگیرکرانی تر تالاندوویانە. قورئانیش ئاماژەی بۆ ئەمە کردووە کاتێک شوێنکەوتووانی پێغەمبەری وەسفکردووە. دەفەرموێ"**الذين إن مكناهم في الأرض أقاموا الصلاة وآتوا الزكاة وأمروا بالمعروف ونهوا عن المنكر ولله عاقبة الأمور**"[٢٩٨].

جەنگیزخان مەغولی بەرەو داگیرکردن برد. هەموویان لەیەک جۆر بوون: وڵاتیان کاول دەکرد و خەڵکیان تاڵان دەکرد، گەلانی داگیرکراویش مافیان نەبوو تاوەزایی دەربڕین. بەڵام عەرەب کاتێک وڵاتانیان فەتح دەکرد، ئەوا قورئانیان بەدەستەوە بوو. لێرەشەوە قورئان بووە پەناگەی ئەو کەسانەی گلەیی و گازەندەیان دەکرد. لەئەنجامیشدا تێبینی دوو ڕەوتی دژەیەک دەکەین، یەکێیان فەتحکار و ئەویتریان

---

[٢٩٨] سورة الحج، ایة،٤١

ڕاپەڕیوە. لەنێوان فەتح و شۆڕشدا ئەو شارستانیەتە گەورە دروست بوو کە ئیسلامی پێ دەناسرێتەوە.

هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسان زەمی ئیسلام دەکەن، بەوەی بە دەستێکیان قورئان و بە دەستەکەی تریش شمشێریان هەڵگرتووە. ئەوان نازانن بەمە ستایشی ئیسلام دەکەن، نەوەك زەمکردن. ئیسلام بەو دوو دەستەی کارلێکردنێکی کۆمەڵایەتی گەورەی دروستکردووە کە هەموو ئاگرەکان دادەمرکێنێتەوە. لە لایەك خەڵك دادەمرکێنەوە و لە لایەکی دیکەش هانی شۆڕشیان دەدات. لەو دژیەکەی نێوان سەرکەوتکردن و وروژاندن بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی وەها دروست دەبێت کە نموونەی لە مێژوو نییە.

***

ئەوەی جێگای سەرنجە، پێغەمبەر دوو جۆر لە سەحابەی لەدوای خۆی جێهێشت. جۆرێکیان ئەوە بوو لەسەر دەستی ئەو ڕاهێنانیان کردبوو، هەموو جۆرەکانی مەینەتی و چەوسانەوەیان بینیبوو. هەر ئەوانەش هەڵگری پەیامە ئایینەکە بوون بۆ خەڵك. جۆری دووەم هەڵگری شمشێر بوون، لەسەر دەستی ئەوان فەتحکردن ئەنجام درا.

لە ڕۆژگاری خەلیفەکانی ڕاشدین ئایین کلیلی ئاشتەوایی بوو لە سوپای فەتحکار. ئەو کاتە فەتحکارەکان پێویستیان بە ئەشکەنجەدان و زەبر نەبوو لە بەرامبەر ئەوانەی بەربەرەکانیان دەکەن. ئەمەش مانای ئەوەیە فەتحکردنی ئیسلام جیاوازی لەگەڵ داگیرکردنەکانی کۆن هەیە. ئەو سوپایەی ئیسلام تەنها لە جەنگاوەر پێکنەهاتبوو، بەڵکو پیاوچاکانیشی لەگەڵ بووە کە پشتی گەلانی فەتحکراویان دەگرت و لەگەڵ سکاڵاکانیان دەبوون.

ئەبو یوسف دەگێڕێتەوە، کە یەکێك لە سەحابەکان بینی جەماعەتێك لە ئەهلی زمە(ئایینەکانی دیکە) لەبەر جزیە ئەشکەنجە دەدرێن، بۆیە چووە لای میری سوپاکە

و سەرکۆنەی دەکات و دەڵێ: " خەڵک ئەشکەنجە مەدەن، ئەوانەی لەسەر زەوی ئەشکەنجەی خەڵک دەدەن، لە ڕۆژی دواییدا خودا ئەشکەنجەیان دەداتەوە"[٢٥٩]. مێژوونووسان چەندین ڕیوایەتی دیکە لەمجۆرە دەگێڕنەوە، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە سوپای ئیسلام وەک سوپاکانی ڕۆم و مەغۆل نەبووە کە خەڵک ئەشکەنجە بدات و کەسیش نەبێت بەرپەرچیان بداتەوە.

بۆیە سوپای موسڵمانان دوو شتی دژە یەکتری لەخۆیەوە گرتبوو. گەلانی فەتحکراو دەیانبینی دەستێک زامداری دەکات و دەستێکی دیکە تیماری دەکات. لێرەشەوە وتەکەی گۆستاف لۆبۆن هاتووە و دەڵێ: " مێژوو داگیرکەرێکی بەبەزەیی وەک عەرەبی بەخۆیەوە نەبینیوە". عەرەب داگیرکەر بوون و سیفەتی هەر داگیرکەرێکی دیکەیان هەبوو. بەڵام سیفەتێکی دیکەیان هەبوو کە پێغەمبەر بە سەحابە دڵسۆزەکانی خۆی دابوو، ئەوانیش ئەوسەحابانە بوون کە بۆ هەر شوێنێک دەچوون، بانگەوازیان بۆ دادپەروەریی و بەزەیی دەکرد.

***

فەتحی ئیسلامی بەدرێژایی ماوەی خەلیفەکانی ڕاشدین بەمشێوەیە بەردەوام بوو، بەڵام کاتێک دەوڵەتی ئەمەوی دەرکەوت بەرەبەرە دەگۆڕا. ئەم گۆڕانانەش وایانکرد کە هەندێک لە سەحابە و تابعین ڕەخنە لە سیاسەتی دەوڵەتی نوێ بگرن و لێی دوور بکەنەوە. کۆمەڵێک هەڵپەرست دەوری دەوڵەتی ئەمەوییان دا و لەبەردەم خەڵک خۆیان بە ئایین دەردەخست. لەڕاستیشدا ئەوان تەنها چەند کاهینێک بوون، وەک هەر پیاوانی دیکەی ئایینی کە دەوری سوڵتان دەدەن و بانگەوازی بۆ دەکەن. کەچی سەحابە ڕاستەقینەکان و هەندێک لە تابعین ڕێچکەیەکی دیکەیان لە ژیان گرتەبەر، لە مزگەوتەکان مانەوە و بنەماکانی ئایینی محەممەدیان بەناو خەڵک بڵاودەکردەوە. لێرەشەوە ململانێیەکی قووڵ لەنێوان مزگەوت و کۆشک دروست بوو.

---

(٢٥٩) ابو یوسف، کتاب الخراج، ص١٤٩-١٥٠

هەلگرانی قورئان و هەلگرانی شمشێر لە سەردەمی خەلیفەکانی راشدین لە یەك بەرە بوون وەك پێشتر باسمان کرد، بەلآم لە سەردەمی ئەمەوییەکان دا هەر یەکەیان چوونە بەرەیەك. بەواتایەکی دیکە، ئاین و دەولەت یەکگرتوو بوون، بەلآم لە سەردەمی ئەمەوییەکان جیاکرانەوە، لێرەشەوە بەرکەوتنی کۆمەلایەتی شێوەیەکی نوێی وەردەگرت کە پشکێکی زۆرتری توندوتیژی و ململانێی ئاشکرای بەخۆیەوە بینی.

لەبەرەی دەولەتدا چەندین پیاوی وەك بەسەر کوڕی ئەرتەئەت و حەجاجی کوڕی یوسف و موسلمی کوڕی عەقەبە و شەمەر کوڕی زی جۆشنی دەرکەوتن. بەلآم لە بەرەی ئاین پیاوانی وەك حەسەن بەسری و سعید کوڕی مسیب و عەلی کوڕی حوسێن و سەعیدی کوڕی جوبەیر دەرکەوتن. بەرەی یەکەم شمشێریان کردە ئاین و لەمەشدا کارامە بوون. ئەوانی دیکە قورئانیان کردە ئاینی خۆیان و رێنماییەکانی شۆرشی محەمەدیان لەنێوان گەلانی داگیرکراو بلاو دەکردەوە.

کاتێك حەجاج لە مەوالییەکانی تونڈ کرد (مەبەست ئەوانی ئیسلام بوون و عەرەب نەبوون) و داوای جزیەی لێدەکردن سەرەرای ئەوەی ئەوان ئیسلامیش بوون. لەوکاتەدا گرووپێك لە باوەرداران لە بەسرا هاتنە لای مەوالییەکان و دلنەواییان دەکردن، ئەوکاتە وا روویدا کە هەموو دەست بە گریان و پارانەوە بکەن و دەیانگوت" هاوار بۆ تۆ محەمەد".

ئەو رووداوە نموونەیەکمان بۆ ئەو ململانێیە پێ دەدات کە لە سەردەمی ئەمەوییەکان لە نێوان ئاین و دەولەت دروست بوو. ئەوانەی قورئانیان بەدەستەوە بوو لەگەل گەلانی تەنگکراو وەستان و لەبەرەی دژە تەنگکار. ئەوەی تێبینی دەکرێت لەوکاتەدا ئەوانەی شمشێر بەدەست بوون هەموویان عەرەب بوون، بەلآم ئەوانەی هەلگری قورئان بوون هەموویان مەوالی بوون[٢٦٠]. لە سەردەمی راشدین ئەماتیبینی ئەو

[٢٦٠] احمد امین، المصدر السابق، ج١،ص٢٨

دیاردەیە کاریگەری هەبێت، چونکە پارێزەگەرانی دین و دەوڵەت عەرەب بوون، بەلام کاتێك پیاوانی ئەمەوییەکان بەمارگیرییان بۆ عەرەب زیاتر بوو و ستەمیان لە مەوالی دەکرد، ئەوا مەوالییەکان بەرەو ئایین رۆیشتن و ئاینییان کردە چەکێك بۆ ئەوەی دژایەتی سەردارانی عەرەبی پێبکەن.

بەجەمسەربوونی کۆمەلایەتیی و فیکریی دەبێت لە باروزۆخێکی وەهادا دەربکەوێت، هەرچەند لایەنێك دەمارگیر بێت، ئەوەی لایەنەکەی دیکە دووردەکەوێتەوە بۆ بەرەیەکی دیکە دەڕوات..ئێمە ناتوانین گلەیی لە گەلێك بکەین، چونکە چۆن یەکترکێشکردن و دوورکەوتنەوە لە جیهانی فیزیاو کیمیا ڕوودەدات، بەهەمان شێوەیە لە دونیای مرۆڤایەتیش ڕوودا و هەر دەبێت ڕوویدات.

***

دکتۆر بەدیع شەریف باسی ملمڵانێی نێوان عەرەب و مەوالییەکان دەکات، بەلام رەخنە لە مەوالی دەگرێت و عەرەب بە بێگوناه دادەنێت[261]. ئەو دەڵێ:" عەرەب ئەریتی خۆیان پەیڕەو دەکرد وشانازییان بەخۆیان دەکرد، وا سەیری مەوالییان دەکرد کەناتوانن لەگەڵ عەرەب بگونجێن، چونکە بەدڵ باوەڕیان نەهێناوە و ناشتوانن، چونکە چەندین سیفەتیان هەیە بۆ ئەمە ئامادەیی ناکات و لەگەڵ بنەماکانی ئیسلام گونجاو نییە. لەوانە ئەوان پیلانگێڕن و سەرپێچی دەکات، بەهێنانی شەهادەی بەدرۆ. وەفایان نییە و شتیان لە دڵی خۆیان شاردۆتەوە".دکتۆر بەدیع چەندین نموونەی مێژوویی دەهێنێتەوە، دەیەوێت تێڕوانینی عەرەب بسەلمێنێ، ئەو پێیوایە عەرەب بنەمای شارستانییەتی ئیسلامن و پاڵشتی قەوارەی ئیسلامن، مەوالیش لە تێڕوانینی ئەو، تێکدەری ئەو شارستانیەتەن.

لێرەوە نامەوێ لەگەڵ دکتۆر بەدیع مشتومڕ لەسەر ئەو بابەتە بکەم، بەڵکو دەمەوێ سەرنجی خوێنەر بۆ ئەوە رابکێشم کە ئەم تێڕوانینەی ئەو تەنها لە ڕوێکەوە سەیری

[261] بدیع شریف، الصراع بين الموالي و العرب، ص٤٢

کارلێکردنی کۆمەڵایەتی دەکات، لایەکەی دیکەی فەرامۆش دەکات. ئەو ڕەخنە لە سیفەتەکانی مەوالی دەگرێت کە عەرەب لە مەوالیان بینیوە، ئەوەش لەبیر دەکات کەچەندین سیفەت هەیە لە عەرەب، کە مەوالی ڕەخنەی لەسەر هەیە.

خودا گەلێکی بێ کەموکوڕی دروست نەکردووە، عەرەب چەندین سیفەتی خراپی وەك شـــەهادەهێنانی بـــەدرۆ و بێوەفـــایی و دووڕوویـــی دەدەن پـــاڵ مـــەوالی، لەبەرامبەریشدا مەوالی سیفەتی دەمارگیری جاهیلییـەتی و دەمارگیری هۆز دەدەنە پاڵ عەرەب. دروستە ئەگەر بڵێین عەرەب و مەوال هەموویان لە ڕۆحی ئیسلام دوور بوون، دەگمەنیان نەبێت. ئیسلام بریتییە لە کۆمەڵێك بنەمای یەکسانیی و ئاکاری بەرز، بەمەش لە هەموو ئەو سیفەتانە دوورە کە ئەو نەتەوانە هەیانبوو. خەڵك لە ژیانی خۆیاندا لەژێر کاریگەری دابونەریتەکانی خۆیانن، ئەوانە لەباوانیان وەرگرتووە، کاتێکیش دەچنە نێو ئایینێك تەنها ئەوانەیان دەوێت کە لە بەرژەوەندی ئەوان دایە.

حوسێنی کوڕی عەلی دەڵێ: " خەڵك کۆیلەی دونیان، ئایینیش بەسەر زمانیان لکاوە تا بژێویان دەستکەوێت، بەڵام کاتێك تووشی مەینەتی دەبن، ئەوا ئاینپەروەریان کەم دەبێتەوە" ئەمە پەندێکی کۆمەڵایەتییە پێویستە توێژەری بێلایەن بە بەرچاوی خۆی بگرێت کاتێك مێژووی هەر نەتەوەیەك دەخوێنێتەوە.

عەرەب لەپێناو ئیسلامدا شمشێریان هەڵگرت، بێگومان مەبەستیان دەستکەوت بوو. مەوالییـەکان بـوون بـە ئیسـلام، دەیانەویسـت بـەپێی بنـەماکانی دادپـەروەریی و یەکسانی ئیسلام بەرەنگاری عەرەب ببنەوە. هەر بەرەیەك ئایینی کردۆتە چەکێك لە دژی نەیارەکەی بەکاردەهێنێ. گلەیی لە هیچ یەکێکیان ناگرێت، خەڵك دەیەوێ بژێت جا لەسەر هەرشتێك بێت. ئەوا دەست بە ئایدیاڵەکان دەگرن کاتێك بزانن لەژیانیان سوودی هەیـە، بـەڵام ئەگـەر بینیـان زیانبەخشـە، ئـەوا فەرامۆشـی دەکـەن، یـان دەیگۆڕن.

ئەوکەسانەی لە سەردەمی بەنی ئومەییە دەژیان هەر ئەوانەن کە ئێستا لەگەڵمان دەژین. نابێت چاوەڕوانی ئەوە بکەین ئەمانە لەوانیتر باشتر بن؛ خەڵک و ڕۆژگار هەر وەك خۆیانن. حەجاج خەڵکی دەکوشت و شانازیشی بەوە دەکرد، گوایە ئیسلام سەردەخات، ئەو کاتە مەوالییەکان هاواریان بۆ پێغەمبەر دەکرد. بەڵام ئەگەر مەوالییەکان فەتحیان بکردایە و حەجاج لە شوێنی ئەوان بوایە ئەوا حەجاج هاواری دەکرد" هاوار بۆ محەمەد کوا ئەو یەکسانی و دادپەروەرییەی محەمەدی کوڕی عەبدوڵلا هێناویەتی؟".

بەمشێوەیە مێژوو جووڵە دەکات، ئەگەر وەها نەبێت مێژوو لە شوێنی خۆی ناجووڵێت و تێناپەڕێت. ئایین ڕۆڵی خۆی لە مێژوودا هەیە، هەر وەك چۆن دەوڵەت ڕۆڵی خۆی هەیە. ئەگەر یەکێك توێژینەوەی مێژوو تەنها لە یەکێکیان بکات، وەك ئەوەیە یەکێك بیەوێ مێژوو بوەستێنێ؛ ئەمەش مەحاڵە.

زەهەبی داکۆکی لە حەجاج دەکات و دەڵێ:" توندی حەجاج سوودی هەبوو، دەسەڵاتی سەپاند و خراپەی لەناوبرد، ترسی نەهێشت و سوودەکەی تاهەتایە بەردەوام بوو، زیانەکانیش نەمان."[٤٤٤] زەهەبی تەنها بە چاویلکەی دەوڵەت سەیری ئەو بابەتە دەکات، بەڵام ئایین کە چەندین بنەمای یەکسانی تێدایە ئەوا لەلای زەهەبی بابەتێکی سانایە. ئەگەر خەڵك هەموو وەك ئەو باوەڕیان بە حەجاج و نموونەکانی دیکەی حەجاج بووایە و ملکەچی ئەو بوونایە، ئەوا لە جیهان ئایینێك نەدەبوو. هیچ ڕووداوێکیش نەدەبوو بەرکەوتنی کۆمەڵایەتی هەبێت بۆ بونیادنانی شارستانیەت.

ئایین و دەوڵەت بە سروشتی خۆیان لە یەکتر دوورن، ئەگەر بۆ ماوەیەك یەکتریان گرت، ئەوا بزانە کاتییە، بوارێك نییە، ڕۆژێك دادێ لەیەکتر جیادەبنەوە. ئەگەریش بینیمان ماوەیەکی زۆر ئایین پەیوەستە بە دەوڵەتەوە، ئەوا بزانە ئەمە ئایینی

---

[٤٤٤] سعید الافغانی، ابن حزم الاندلسي، ص١٣٠-١٣١.

کامینەکانە، ئایینی پێغەمبەران نییە. ئەو عەمامە بەسەرانەی کە بۆ ماوەیەکی زۆر لە هەموو قۆناغەکاندا پشتگیری دەوڵەتیان کردووە، ئەوان فێڵبازن و لە شێوەی ئەو کامینانەن کە پاڵپشتی فیرعەونیان دەکرد، یان نموونەی ئەو پیاوانەن کە پاڵپشتی نیرۆنیان دەکرد و یان نموونەی ئەو بازرگانانەن کە لەژێر ئاڵای ئەبوسوفیان شەڕیان دەکرد. ئەوان رازینە بەوەی فیرعەون خەڵک کۆیلە بکا، بەڵام لەوە رازی نیین خەڵک نارەزایی لە بەرامبەر بەکۆیلەکردن دەرببڕێت. مافی سوڵتانە ستەم بکات، کەچی مافی رەعیەت نییە سکاڵا بکات. ئەم بۆچوونەش لەگەڵ سەلیقەی سەروماڵات دەگونجێ نەوەک سەلیقەی ئادەمیزاد.

ئایینی راستەقینە ناتوانێت ماوەیەکی زۆر لەگەڵ دەوڵەت بمێنێتەوە. سروشتە ئایدیالییەکەی هانی دەدات زوو یان درەنگ لە دەوڵەت جیابێتەوە. ئەمەش مانای ئەوەیە قورئان و شمشێر دژبەیەکن. ئەگەر هاتوو پێکیانگرت و ماوەیەکی زۆر لەگەڵ یەک مانەوە، ئەوا بەڵگەی ئەوەیە کە یەکێکیان کەموکوڕی هەیە. جا یان شمشێر ئاستی زەبری دابەزیوە، یانیش قورئان دەستبەرداری شۆڕشەکەی بووە. هەر یەکەیان لە سروشتی خۆیان دەربچێت ئەوا دەبێتە شتێکی دیکە.

بۆ یەکەمجار سیمای دەوڵەت لە مێژووی ئیسلامدا لەسەردەمی عومەر دەرکەوت. ئەوانەی سیاسەتی دەوڵەتیان ئەوکات بەڕێوەدەبرد، ئەو سەحابانە بوون کە لەسەردەستی پێغەمبەر پەروەردە ببوون، لەگەڵ ئەوەدا مەشقی شۆڕشیان کردبوو. عومەر بەچاوێك سەیری سەحابەکانی دەکرد و بەچاوەکەی دیکەشی سەیری سوپا فەتحکارەکەی دەکرد. عومەر زۆرزانی و دووربینی هەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا هەستی بە سەختی دەکرد لە گونجاندنی رەوتی ئایین و رەوتی دەوڵەتێکی بەرفراوان.

عومەر رۆژێك کە خەڵکی لەدەوروبەر بوو، وتی: " بەخودا نازانم من خەلیفەم یان پاشا. ئەگەر من پاشابم ئەوا لە کارێکی گەورە تێوەگلاوم " یەکێك لە ئامادەبووان وتی: " ئەی میری موسڵمانان جیاوازیی لەنێوان ئەو دووانە هەیە، ئینشاڵا تۆ لەسەر

کاری چاکەی. خەلیفە تەنها هەق وەردەگرێت و هەق دەبەخشێتەوە. سوپاس بۆ خودا تۆ وەهای، بەلآم پاشا خەڵك دەچەوسێنێتەوە و تەنها ساماتی ئەمە وەردەگرێت و دەیداتە ئەوەیتر." عومەر بێدەنگ بوو دواتر وتی:" تکام وایە وەها بم". عومەر تکای وایە خەلیفە بێت نەوەك پاشا. ئەگەر دادپەروەر بین دەبێت بڵێین عومەر توانی گونجانێکی گەورە لە نێوان ئایین و دەوڵەت دروست بکات. راستە ئەگەر بڵێین ئایین و دەوڵەت لە رۆژگاری عومەردا وەك دوو هاوسەری مانگی هەنگوین بوون. ئەوان لەرێوی سەلیقەوە لەیەکتر دوور بوون، بەلآم مانگی هەنگوین وایکردووە بۆماوەیەك تەبا بن. بەلآم دەبێت ئەو مانگەی هەنگوین بەسەر بچێت و رۆژگاری ململانێ دەست پێبکات و بەجیابوونەوە کۆتایی بێت.

یارانی محەمەد بەو فەتحکردنە دڵخۆش بوون کە لەسەردەمی عومەر ئەنجام درا، چونکە خوا تواناى لەسەر زەوی پێ بەخشین وەك بەڵێنی پێدابوون. سەربازەکانیش بە فەتحکردن دڵخۆش بوون، چونکە چەندین غەنیمە و دەستەکەوتیان هەبوو کەپێشتر لە خەونیشیان نەبوو. عومەریش دڵخۆش بوو؛ بەلآم لە قولایی دڵییەوە هەستی بە ترسی هاتنی رۆژانی داهاتوو دەکرد. ئەو دەزانێ کەمانگی هەنگوینی کۆتایی دێت و بۆ کەسیش پێشتر ئاسەر نەبووە.

دوورکەوتنەوەی دوو هاوسەرەکە لە رۆژگاری عوسماندا روویدا، کەلێنی نێوانیان بەرەبەرە فراوان دەبوو. رەنگە گونجاو بێت کوشتنی عوسمانی بە تەلاقنامەی ئەو دوو هاوسەرە وەسف بکەین کە ئایین و دەوڵەتە. بەمشێوەیەك ئەوانەی بانگەشەیان بۆدەوڵەت دەکرد، ئەوا کراسەکەی عوسمانیان کردە دروشم. ئەوانەی بانگەشەشیان بۆ ئایین دەکرد، پرەنسیپەکانی شۆرشیان کردە دروشمی خۆیان. ئەوکاتەش ئایین رێگای خۆی گرت و دەوڵەتیش بەرێگایەکی دیکە تێپەری.

***

ویستی خودا ئەوە بوو کە لەئیسلامدا دوو پیاوی لە یەکتر جیاواز هەڵکەوتن، ئەوانیش معاویە و عەلی بوون. یەکێکیان بنەمای دەوڵەتی خۆشگوزەرانی دامەزراند، ئەویتریشیان تۆوی شۆڕشی لە ناو ئیسلام چاند.

عەلی و معاویە لە زۆر بابەت پێچەوانەی یەکتر بوون. عەلی لەمنداڵییەوە لەماڵی محەمەد پەروەردە بووبوو، محەمەد وەك کوڕی خۆی سەیری دەکرد. عەلی بەوە ناسراو بوو کە زۆر بە محەمەدەوە پەیوەست بووە، ئامادەی قوربانی بوو، زۆر پەرۆشبوو بۆ بانگەوازەکەی. دەگوترێت محەمەد لە سەرەتای بانگەوازەکەیدا عەلی لەگەڵ خۆی دەبردە دەرەوە، ئەوکاتەش عەلی منداڵ بوو، دەیویست ترسی منداڵان لە عەلی نەهێڵێت. کاتێك عەلی گەورە بوو ئەوا بەربەرەکانێی دوژمنانی محەمەدی دەکرد، لەپێناو بانگەوازەکەی محەمەد دەکەوتە گێرمە و کێشە. پێغەمبەر زۆر ستایشی عەلی کردووە و ئاماژەی بە چاکەکانی کردووە. ئەحمەد کوڕی حەنبەل دەڵێ: " ئەو چاکەیەی بە عەلی دراوە، بە کەسی دیکە نەدراوە".

معاویە بەتەواوی پێچەوانەی عەلی بووە. معاویە لە ماڵی رێبەری قورەیش گەورە بووە، لەمنداڵییەوە لەسەر دژایەتی و پیلانگێران لە ئیسلام راهاتووە. بێگومان هیندی دایکی کە دڵی حەمزەی خواردووە، رق و کینەی دژ بەئیسلامی لە دڵی کوڕەکی چاندووە. کەسایەتی مرۆڤیش لەو قاڵبە دروست دەبێت کە دایەنەکەی بۆی دادەنێت.

ئەگەر شیاو بێت معاویە بە باوکی پاشایان لە ئیسلام ناوببرێت، ئەوا دەتوانین عەلیش بە باوکی شۆڕشگێڕان ناوببەین لەڕاستیشدا کوڕانی عەلی لەسەر رێچکەی باوکیان رۆیشتن و هەڵگری ئاڵای شۆڕش بوون لە دژی دەوڵەت لەهەموو کاتێکدا.

ئیبن رۆمی دەڵێ:

لكل أوان للنبي محمد قتيل زكي بالدماء مضرج

واتە: هەموو کاتێك بۆ محەمەدی پێغەمبەر کوڕۆڵەیەکی پاك هەیە، کە خەڵەتانی خوێن بووە.

لە وڵاتانی ئیسلام بۆ هەرشوێنێك بچیت، ئەوا گۆڕێکی منداڵانی عەلی دەدۆزیتەوە کە خەڵك پەنای بۆ دەبات و پیرۆزی دەکات. وەك دەردەکەوێت ئەو شۆڕشگێڕانەی عەلی خزمەتێکی گەورەیان پێشکەش بە ئیسلام کردووە. ئەوان چاوی گەلانیان کردۆتەوە، گەلانیان فێرکردووە کە ئیسلام ئەوە نییە کە لەسەر دەستی ئەمەوییەکان و سوپاییەکان دێت. راستە ئەگەر بڵێین شۆڕشی کوڕانی عەلی کەم تا زۆر بەشداری لە بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام کردووە لەنێو ئەو گەلانەی فەتحکراون.

***

ئاسان نییە گەلێکی داگیرکراو بچێتە سەر ئاینی داگیرکەرەکەی. داگیرکراو بە سروشتی خۆی مەیلی بە لای بەرەنگاربوونەوەی داگیرکەر و بێوباوەڕی داگیرکەرە. کەچی بینیمان گەلان لەسەردەمی ئەمەوییەکان بە لێشاو دەهاتنە ناو ئیسلام، ئەمەش دیاردەیەکی سەیرە هاوشێوەی لەمێژوودا نییە. ئایا نهێنی ئەوە چییە؟

ڕۆژهەڵاتناسەکان دەڵێن "سوپای فەتحکار گەلانی بە زەبری شمشێر کردۆتە ئیسلام." ئەمە قسەیەکە قبوڵکردنی لەلای ئێمە ئاسان نییە، چونکە دەزانین ئەگەر شمشێر بۆ بڵاوکردنەوەی ئاین بەکاربێت ئەوا ئەنجامەکەی پێچەوانە دەبێتەوە. مرۆڤ لەوە راهاتووە پێچەوانەی ئەو شتانە بێت کە بەهێز بەسەری زاڵ دەکرێت، هەرکاتێکیش نەتەوەیەك لەبەر ئاینەکەیان چەوسانەوە، ئەوا لەلایەن خۆیانەوە زیاتر دەستی پێوەدەگرن. مێژووش چەندین بەڵگەی بۆ ئەو قسانەمان هەیە.

هەندێکی دیکە دەڵێن: گەلان بۆ راکردن لە جزییە بوون بە ئیسلام. ئەو قسەیەش خاڵی نییە لە کەموکوڕی. بەلای خەڵکەوە ئاسان نییە لەبەر چەند درهەمێك لەساڵێکدا، واز لە ئاینی کۆنیان بهێنن. ئەگەر هاتوو کەمێك لە خەڵك ئەوەیان کردبێت، ئەوا کەسانێکی دیکە ئامادەن ماڵ و گیانیان لەپێناو ئەو ئاینە ببەخشن

کە لە باوانیانەوە ماوەتەوە. بەتایبەتیش لەو سەردەمەدا کە ئایین دەسەڵاتێکی بەهێزی بەسەر دەروونی خەڵکەوە هەیە.

سەرەڕای ئەمەش ئەمەوییەکان ئەو گەلانەیان لە جزیە نەدەبەخشی کە دەبوون بە ئیسلام، ئەمەش لە ترسی ئەوەی خەزینەیان کورت نەهێنێ. تەنانەت عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لەوە نیگەران بوو گوتی: "خودا محەمەدی ناردووە بانگەواز بۆ ئیسلام بکات، بۆ ئەوەی نەناردووە خەزنەدار بێت"[٦٦٣].

لەوانەیە هەندێکیش بڵێن: ئەو گەلانە بوونە بە ئیسلام کاتێک زانیان لە ئایینی کۆنی ئەوان چاکترە. ئەمە بۆچوونێکە بەڵگە کۆمەڵایەتییەکان پاڵپشتی ناکات. ئایین سۆزێکی دەروونییە زیاتر لەوەی بیرکردنەوەیەکی لۆژیکی بێت. ئایا کەی خەڵکی سادە هاتووە بەراورد لە نێوان ئایینەکان بکات بۆ ئەوەی لە ئەنجامی بەراوردەکە چاکتربوونی ئایینێکی بۆ دەربکەوێت؟ مرۆڤ هەموو هەقیقەت لەو ئایینە باوەی خۆی دەبینێ. بەوە رازی نابێت کەپێچەوانەی ئەو بێت، تەنانەت ئەگەر بەڵگەکان لە رۆژیش روناکتر بن. جا دەبێت جگە لەو هۆکارانە، هۆکاری دیکەی کۆمەڵایەتی هەبێت وایکردبێت گەلانی فەتحکراو بین بە ئیسلام، بەڵام ئەو هۆکارە چییە؟

ئەوەی لە مێژووی ئایینەکان تێبینی دەکەین ئەوەیە خەڵک ئایینێکی نوێ کاتێک قبوڵ دەکەن کە دابینکردنی پێویستیەکی دەروونی و کۆمەڵایەتی تێدا بێت. وەک دەردەکەوێت ئەو گەلانە لەو ئایینەی کە مندالانی عەل هەڵیانگرتووە جۆرێک لەوشتانەی تێدایە کە ئەوان دەیانەوێ؛ بۆیە بوون بە ئیسلام بۆ ئەوەی بەو ئایینە بەرەنگاری دەسەڵاتدارە زۆردارەکان ببنەوە. ئەو جۆرە ئایینەش تارادەیەکی زۆر لەو ئایینانە دەچێت کە لەدێرزەمانەوە پێغەمبەران هێناویانە.

ئەمەوییەکان بانگەوازیان بۆ ئایینی ملکەچی و گوێڕایەڵی دەکرد، ئەوان وایان دەزانی ئیسلام گوێڕایەڵبوونی فەرمانی ئەوان و سەیرگرتنە لە حوکمی ئەوان، کەچی گەلانی

[٦٦٣] ابویوسف، المصدر السابق، ص٧٢

ژێر دەست ئارەزووی ئەو جۆرە ئایینەیان نییە. ئەوان لەو دەوڵەتە هەستیان بەستەم دەکرد و رقیان لەو دەوڵەتە بوو، بۆیە ئایینێکیان دەویست دژی ئەو دەوڵەتە بێت.

دەتوانرێت بگوترێت: ئەوەی گەلانی فەتحکراوی لە سەردەمی ئەمەوییەکان کرد بە ئیسلام دوو هۆکار بوون: یەکەمیان ستەمی ئەمەوییەکان بوو، ئەویتریان شۆڕشی کوڕانی عەلی بوو. لە نێوان ستەمکاری و شۆڕشیشدا بزاوی کۆمەلایەتی بە چەندین شێوە دەبووژێتەوە، وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد.

پیاوانی بەنی ئومەییە رقیان لە مەوالی بوو، مەوالیش رقیان لە پیاوانی بەنی ئومەییە بوو، بوارێك نییە دەبێت رقیان لەیەکتر بێت. بزاوی کۆمەلایەتی ملکەچی لۆژیك نابێت، بەڵکو بەپێی رەگەزەکانی خۆی دەڕوات جا خەڵك قبوڵی بکات یان نا. ئەوانەی بەنی ئومەییەیان خۆشدەوێ؛ هەموو خراپەکان دەخەنە ئەستۆی مەوالییەکان، ئەوانەی مەوالیشیان خۆشدەوێت، ئەوا هەموو خراپەکان دەخەنە ئەستۆی دەوڵەتی ئەمەوی، کەسی بێلایەنیش ناتوانێت گەلیەی لە کەس بکات، چونکە دەزانێ ململانێی نێوان دەسەلاتدار و ژێر دەست لەهەر دەوڵەتێك دروست دەبێت، جا دروشم و بانگەوازی هەرچییەك بێت.

***

کەچی ململانێی نێوان دەسەلاتدار و ژێردەست لە سەردەمی نوێدا لەژێر پەردەی ململانێی حیزبایەتی و هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن کۆتایی پێهات. خەڵك وادەزانێ ئەو ململانێیە بوونی نییە، بەلام لەڕاستیدا ئەو هەقیقەتە بوونی هەیە و لە هەمان کاتیشدا پێویستە، چونکە ململانێی نێوان سەرکەوتوو و ژێرکەوتووە[٢٦٤]. دەگمەنیشە ژێرکەوتوو؛ سەرکەوتووەکەی خۆش بوێت و کەسی سەرکەوتووش ژێرکەوتووەکەی خۆش بوێت. ئەوەی وا سەیری ژێرکەوتوو و سەرکەوتوو دەکات کەگوایە یەکتریان

---

[٢٦٤] Barnes ,history of sociology.p194

خۆشدەویٚ، وەك ئەوەیە سەیری گورگ و مەڕ بکات لە چاکە و خواپەرستی لەگەڵ یەکتر هاوکار بن.

کاتێك گوێبیستی ئەو جەنگانە دەبین کە حیزبەکانی ئۆپۆزسیۆن بەیەکتری دەدەن، دەبێت ئەوەمان بەبیر بێتەوە کە ئەو جەنگانە لەسەردەمە کۆنەکاندا بە دڕندەترین شێوە بووە. کەسێك کە شمشێر بەڕووی نەیارەکەی رادەکێشێ؛ بەلایەوە زەحمەت نییە زمانی بەکاربهێنێت و تۆمەتی خراپی بۆ دروست بکات.

***

پێشتر وتمان و ئێستاش دووبارە دەیڵێینەوە: مرۆڤ داوای هەق لەپێناوی هەق ناکات. هەق چەکێکە مرۆڤ بۆ پێویستییەکانی خۆی بەکاری دەهێنێ، زیاتر لەوەی کە ئامانجێکی رەها بێت، مەبەستی خودی هەق بێت. کاتێك خەڵك لەسەر هەقیقەتێك رکابەری دەکەن ئەوا بەدوای مەبەستی تایبەتی خۆیان دەگەڕێن. ئەگەریش هاتوو هەق لەگەڵ بەرژەوەندی دژ بەیەکتر بوو، ئەوا چاکتر بە دوای بەرژەوەندییەکەی بێت. کاتێك مرۆڤ بەدوای بەرژەوەندی تایبەتی خۆی دەگەڕێت کۆششی خۆی بە کۆمەڵێك ئارگومێنتی بەرز پەردەپۆش دەکات بۆ ئەوەی لەگەڵ هەڵوێستەکەی یەکبگرێتەوە.

دەوڵەتی ئەمەوی بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە پارێزەری ئیسلامە و لەپێناو خودادا وڵاتان فەتح دەکات. لەڕاستیشدا هەموو دەوڵەتێکی داگیرکەر لە کۆن و نوێدا دروشمێکی بریقەدار بەرزدەکاتەوە بۆ ئەوەی داگیرکردنەکان پەردەپۆش بکەن. هەندێك لە دەوڵەتان پەردەی مەدەنییەت بەکاردەهێنن، هەندێکی دیکە پەردەی ئایین بەکاردەهێنن، هەندێك پەیامی پیاوێکی سپی، هەندێکی دیکەش پەردەی پاراستن و راسپاردەیی. مرۆڤ ناتوانێت برای خۆشی فریو بدات ئەگەر بە بیانوییەکی بریقەدار نەبێت. بەمەش مرۆڤ جیاوازی لەگەڵ ئاژەڵ هەیە. ئاژەڵ دەتخوا و باکی نییە، کەچی مرۆڤ کاتێك تۆ دەخوا، بانگەشەی ئەوە دەکات لەپێناوی خودا و هەق و هەقیقەت تۆ دەخوا.

لایەنگرانی بەنی ئومییە دەڵێن ساقی مەوال نەبوو شۆڕش لە دژی عەرەب بکات، چونکە عەرەب ئەوانی هێناوەتە سەر ئایینەکەیان. ئەو قسەیە لە قسەی جولەکەکان دەچێت، کاتێک باوەڕیان وابوو بۆ گەلانی جیهان ئایینی تاکپەرستیان هێناوە و ئەوانە گەلە هەڵبژاردەکەی خودان، بۆیە گەلانی جیهان دەبێت شیعتراف بەو چاکەی ئەوان بکەن.

ناپلیۆن کاتێک وڵاتانی داگیر دەکرد، هەر هەمان قسەی دەکرد، ئەو پێیوابوو پێغەمبەری شۆڕشی فەرەنسی و هەڵگری بنەما مرۆییەکانیەتی، بۆیە پێویست گەلان ملکەچ و گوێڕایەڵی بن. ناپلیۆن نەیزانی ئەو بنەمایانەی شۆڕشی فەرەنسی کە ئەو گەلانی پێ داگیر دەکرد، دواتر بوو دروشمی ئەو گەلانەی کە شۆڕشیان لە دژی ئەو کرد.

هەندێک دەوڵەتی تۆیمان بینی کە وڵاتانیان داگیر دەکرد و دەیانگوت:" وەک رزگارکەر هاتووین نەوەک داگیرکەر". کەچی لەڕاستیدا وەک داگیرکەر هاتووە نەوەک رزگارکەر. ماقوڵ نییە دەوڵەتێک خوێنی نەوەکانی بڕێژێت تەنها لەپێناوی خودا داوای پاداشت و سوپاس نەکات. بێگومان ئەو وڵاتانەی بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی گرتووە، کەچی ئەمە بە بیانوی مەدەنییەت و ئازادکردن دادەپۆشێت.یەکێک لە جیاکارییەکانی مێژووش ئەوەیە، کە گەلی داگیرکراو بەهەمان بیانوی داگیرکەر شۆڕش دەکات، کەچی داگیرکەر ڕووبەڕووی دەبێتەوە و دەڵێ:" وەک ئازادیخوازێک هاتووین" داگیرکراو وەڵامی دەداتەوە:" کوا ئازادکردن؟" لێرەوە ململانێی کۆمەڵایەتی لە ملمانێی شمشێرەوە دەبێتە ملمانێی فیکریی، زەمەنیش خولێکی دیکە دەدات. ئەمە لە مێژووی نوێدا ڕوودەدات و وەک پێشتر لە مێژووی ئیسلام و مێژوو سەرجەم گەلانی کۆن ڕوویداوە.

***

ئەمەوییەکان بەناوی ئیسلامەوە وڵاتانیان فەتح دەکرد، کەچی گەلانی ژێردەستی ئەوان هەر بەناوی ئیسلامەوە ڕووبەڕوویان دەبوونەوە. بۆیە بەمەش ئیسلام بووە دوو جۆر: جۆرێك پاڵپشتی سەرکەوتوو دەکات، جۆرێکی دیکەش پاڵپشتی ژێرکەوتوو دەکات. ئەویان دەڵێ سوڵتان سێبەری خودایە لەسەر زەوی، ئەویتر دەڵێ خودا تۆڵە لە زاڵمان دەکاتەوە. هەر کۆمەڵێکیش ئایینی کردۆتە چەکێك و ئەمسەر و ئەوسەر دەکات.

لایەنگرانی ئەمەوییەکان دەڵێن: دەوڵەتی ئەمەویی دادپەروەر بووە. ئەم قسەیەش کەسێك ڕازی ناکات تەنها لایەنگرانی ئەمەوییەکان نەبێت. ستەم وەك پێشتر باسمان کرد بابەتێکی ڕێژەییە. ئەو زیاتر هەستێکی دەروونییە، نەوەك حەقیقەتێکی ڕەها. ئەو هەژارەی دەبینێ دراوسێکەی لە کۆشکێکی گەورە دەژی هەست بە بێبەشی و ڕق وکینە دەکات. ئەو هەژارە سەبر دەگرێت ئەگەر کاهینەکان لەسەر ئایینی سەبر و ملکەچی ئەویان ڕاهێنابێت. بەڵام کاتێك ئایینی شۆڕش وەردەگرێت ئەوا ئەو هەژار ڕادەپەڕێ، ئەوکاتیش هیچ ئامۆژگارییەکی بریقەدار بەرپەرچی ناداتەوە.

مێژوونووسەکان دەڵێن: یەکێك لە سەرکردەکان لەسەردەمی ئەمەوییەکان، تەنها لەشارێکدا سێ سەد هەزار دیل و چل هەزار کچی پاکیزەی گرتووە"[٢٦٤]. بێگومان ئەو دیل و کەنیزانە ڕەوانەی کۆشکی میران دەکرێن، بە واتای ئەوەی لە لایەنێکی کۆمەڵگا خۆشگوزەرانی جەمسەردەگرێت و لەوحاڵەتەدا دەبێ سکالا لە لایەکەی دیکە جەمسەر بگرێت.

خەڵکی شام بەو دیلانە دڵخۆش دەبن، نرخی کەنیزە لە ئەنجامی ئەوەدا دادەبەزێ، ئەوکاتەش کەسێکی شام دەتوانێ کەنیزەیەکی چاو بەلەك بە نرخی کیلۆ گۆشتێك بکڕێت. بەڵام گەلی ژێردەستە دەبێت گلەیی و گازندە بکات، چونکە ماقوڵ نییە کەسێك کچەکەی ڕفێنرابێت و هاوار بکات" خودایە ئایین و دەوڵەت سەربخە"[١٨].

---

[٢٦٤] ابن الاثير، الكامل في التاريخ، ج٤، ص٢٧٢

گەلی نەتحکراو قین لەدڵ دەبێت و ئازار دەکێشێ، هیچ بوارێکی دیکە نییە، کەواتە ئەو پێویستی بە ڕێبەرێکە بانگەواز بۆ ئایینی برایەتی و یەکسانی بکات. ئەگەر ئەو ڕێبەرەش دەرنەکەوێت ئەوا گەل پەنا دەباتە بەر زەندیق و تاوان و دووڕوویی، ناتوانین سروشتی مرۆڤ بە بیرێکە خەیاڵییەکان چاک بکەین. مرۆڤ کاتێک باوەڕی بە بیرکردنەوە خەیاڵییەکان دەبێت ئەوا تووشی دووڕوویی دەبێت و گوفتار و ڕەفتاری پێچەوانەی یەکتر دەبێت.

سروشتی مرۆیی وەک تەوژمێکی سەختی ئاوە، هەرشتێک رادەماڵێ کە لەبەردەمی بێت، ئەگەر بەنداوێکی بۆ دروست بکەین، دەبینین هەموو بەنداوەکان دەبات، ئەوانەی مێژوو دەخوێنن دەبێت لەو هەقیقەتە بگەن بەر لەوەی قسە ئەفلاتونییەکانمان بەسەر ببارێنن، کە ئەو قسانە نە تێنوێتی و نە برسێتی دەشکێنن.

***

دکتۆر بەدیع شەریف دەڵێ: زۆرجار مەوالییەکان ئەهلی بەیتیان دەکردە پەردەیەک بۆ بانگەوازەکانی خۆیان و لە پێناوی ئەواندا رادەپەڕین[٢٦٦]. ئەمە قسەیەکی ڕاستە، مەوالییەکان دروشمێکیان دەوێ پێی ڕاپەڕن، ئەوکات شۆڕش حەتمی بوو، پەند لە بوونی نەبوو، بەڵکو لەوەدابوو کێ ڕێبەرایەتی دەکات.

بەنی ئومەییە خەلافەتیان وەرگرت، کوڕانی عەلی شۆڕشیان لەدژی ئەوان کرد. ئەگەر خەلافەت پشتاوپشت بۆ کوڕانی عەلی بووایە، ئەوا دروستترین مەزندە ئەوەبوو کە پیاوانی بەنی ئومەییە شۆڕشیان لە دژی کوڕانی عەلی ئەنجام دەدا، لەگەڵ ئەوەشدا لە بەرژەوەندی ئیسلام بوو کە کوڕانی عەلی سەرکردایەتی شۆڕشیان دەکرد، چونکە ئەوان نەریتی (بەیتی) و کولتووری ئایینیان هەبوو کە وایدەکرد لە کەسانی دیکە زیاتر لە بنەماکانی ئیسلام نزیک بن.

---

[٢٦٦] بدیع شریف، المصدر السابق، ص٢٦

کوڕانی عەلی لە باوکیان ئیلهامی بنەماکانی شەهادەت و قوربانیدانیان وەرگرتبوو، بەمەش لەچاوی خەڵک بووبوون بەپەناگەیەک خەڵک بۆلایان دەچوون. بۆیە ئەگەر بەنی ئومەییە لە شوێنی ئەوان سەرکردایەتی شۆڕشیان بکردایە، ئەوا ئیسلام لەو حاڵەتەی ئێستای نەدەبوو. لایەنگرانی بەنی ئومەییە لەو قسەیە ڕازی نین، لەوانەیە لەو بڕوایە دابن کە ئەمەوییەکان لە دەوڵەت ڕاناپەڕن جا دەوڵەتی ئەهلی بەیت بێت یان کەسانی دیکە بن. نازانم چۆن یاخیبوونی ئەوان لە دژی عەلی لێکدەدەنەوە کاتێک عەلی خەلافەتی وەرگرت. ئایا سەیریان دەگرت کاتێک خەلافەت بەمیرات بۆ کەسانی دیکەی بەیت دەمایەوە؟ بەنی ئومەییە بیانویان بە خوێنی عوسمان گرت تا خەلافەتیان بەدەستهێنا. ئەگەر ئەمە نەبوایە ئەوا بیانوێکی دیکەیان دەدۆزییەوە، عەقڵی مرۆیی لە دۆزینەوەی بیانو کەم توانا نییە.

***

مامۆستا عەباس عەقاد دەڵێ: "بەنی ئومەییە لە جاهیلیەت و سەرەتای ئیسلام بە چەندین ئاکارەوە تایبەتمەند بوون، کە دەکرێت ئەو ئاکارانە بە ئاکاری ئەمەوی ناوبرێن. ئەمەش لە بەرامبەر ئەو ئاکارەیە کە لەسەردەمی ئێستامان بە ئاکاری دونیایی یان ئاکار پڕاگماتیی دەناسرێت. ئەو ئاکارەش وا لە کەسێک دەکات سوود و بەرژەوەندی خۆی و کەسوکاری بێت. ئەو ئاکارە ئەمەوییە وادەکات هەڵگری ئاکارەکە مەیلی بەلای خۆشییەکانی ژیان هەبێت و ژیانی خۆشگوزەرانی و ماڵی فراوان و خۆشی و ئارەزووەکانی دیکەیان لەلا خۆشەویست دەکات، بۆیە ئەوان لە خۆیان و کەسوکارییان خەرج دەکەن. پێوانەی چاکەش لەلای ئەوان ئەوەیە ئەو شتانەی خۆشیان دەوێ بیدەن بەوکەسانەی خۆشیان دەوێ"[٢٦٢].

ئەو قسەیەی عەقاد لە بارەی بەنی ئومەییە دەیکات ئەگەر ڕاست بێت، ئەوا دەتوانین بڵێین ئەوان هەر لەسەرەتاوە ئامادەگییان تێدابووە سەرکردایەتی دەوڵەی سوڵتانی

[٢٦٢] عباس العقاد، معاوية بن أبي سفيان، ص١١٩

بکەن لەئیسلامدا, چونکە ئەو ئاکارانەی ئەوان تەنها بۆ ئەوە گونجاوە سوڵتانی خۆشگوزەران بن. کاتێکیش ئامرازەکانی خۆشگوزەرانی لەلای موسڵمانان کەڵەکە بوون، ئەوا دەبوایە ئەو کەسانە خەڵك بەڕێوەببەن کە سەلیقەیەکی گونجاویان هەبێت. لەوسەلیقەیەش کەسێك لە پیاوانی بەنی ئومەییە گونجاوتر نییە.

بەڵام کوڕانی عەلی بەو شێوەیە پەروەردە نەکراون. عەلی بەهەژاری ژیا و بەهەژاریش مرد. کاتێك هەندێك سامانی دەستکەوت ئەوا خۆی لێ نەجات دا و بەهەژاری مایەوە. ئاکاری ئەو نموونەی زوهد بوو. عومەر عەبدولعەزیز دەڵێ: "ئەمانزانیوە لەو ئومەتە کەسێك لە دوای پێغەمبەری خودا زوهدی لە عەلی زیاتر بێت، ئەو خشت و دارێکی لەسەریەکتر دانەنا"[٢٦٨].

معاویە لە ماڵی ئەبوسوفیان گەورە بووە. هیندی دایکی ئیلهامی ئەوەی پێدەدا و وەسیەتی دەکرد، معاویە ببێتە جێی شانازی هۆزەکەی هەرچەند لە توانای دابێت دەسەلات بگرێتەدەست[٢٦٩]. ئەوەش زانراوە کە عەلی لە ماڵی محەمەد گەورە بووە، محەمەدیش بەجۆرێکی دیکە ئامۆژگاری کردووە، ئامۆژگارییەکە چییە؟

وەك زانراوە محەمەد زۆر لەگەڵ عەلی لە خەلوەت بووە و عەلیش بەوە ناسراوە کە راسپاردەی پێغەمبەر بووە. بەڵام ئەو راسپاردەیە چییە کە محەمەد بەعەلی داوە؟ لێرەوە سوننە و شیعە دێن مشتومڕ لەسەر ئەو راسپاردەیە دەکەن. شیعە دەڵێن: محەمەد خەلافەتی بە راسپاردە داوەتە عەلی. کەچی سوننە دەڵێن : نەخێر و هەزار نەخێر، خەلافەت لە نێوان موسڵمانان بە شورا بووە. ئەو راسپاردەیەی کە باس دەکرێت, تەنها ئەفسانەیەکە ئبن سەبا دایهێناوە و بەناو خەڵکی بڵاوکردۆتەوە.

شیعە لە سەلماندنی بوونی وەسیەتەکە، دەیەوێ خەلافەتی ئەبوبەکر پووچەڵ بکاتەوە. کەچی سوننە بە نکوڵی کردن لەو راسپاردەیە دەیەوێت خەلافەتەکەی

---

[٢٦٨] ابن الجوزي، تذكرة الخواص

[٢٦٩] بنت الشاطيء، اكلة الاكباد، مجلة الهلال،١-١-١٩٥٥

بەدروست بزانێت. کێشەکە وەک کێشەکانی دیکەی مشتومڕی تائیفییە. خەڵک هەقیقەتی کۆمەڵایەتی لەیاد دەکەن و سەرقاڵی دەمارگیری دەبن بۆ ئەو پیاو ئەم پیاو.

ئایا ناکرێت ئەبوبەکر خەلیفەی پێغەمبەری خودا بێت و لەهەمان کاتیشدا عەلی راسپاردەی پێغەمبەری خودا بێت؟ ئایا ناکرێت راسپاردەکەی پێغەمبەر بۆ عەلی لە بابەتی خەلافەت گەورەتر بێت؟ ئایا چاکەی موسڵمانان تەنیا لە مەسەلەی خەلافەت قەتیس بووە؟ موسڵمانان بڕوایان وایە کە خەلافەت لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا هەموو شتێکە، ئەگەر ئەو چاک بکرێت ئەوا شتەکانی دیکەش چاک دەبن. ئەم بۆچوونە لە لایەن زانایانی کۆمەڵگای نوێ قبوڵ ناکرێت، چونکە ئۆپۆزسیۆن لە چاکسازی کۆمەڵایەتی دا زۆر لە حکومەت گرنگترە. لەڕاستیشدا ئۆپۆزسیۆن و حکومەت دوو لایەنەی پەیوەستن لە پێشکەوتنی شارستانیەت و یەکێکیان بێ ئەوەی دیکە راستەڕێ نابێت.

لە ئەبوسەعیدی خودری دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خودا ڕۆژێک ئەوەی بۆ عەلی باسکردووە کە لەدوای ئەو رووبەڕووی زەحمەتی و شەڕ دەبێتەوە. عەلی دەڵێ:" ئەی پێغەمبەری خودا لەپێناو چی دەجەنگم، لەگەڵ کێ دەجەنگم؟" پێغەمبەر وەڵامی دایەوە و وتی:" لەسەر دەرکەوتنی هەندێک رووداو لە ئاییندا"[٢٧٠]. بۆیە بە دووری نازانین محەمەد راسپاردەی بۆ پەروەردەکراوەکەی خۆی ئەوە بێت داکۆکی لە ئیسلام بکات، کاتێک رێگاکانی زۆر دەبێت و بۆچوونەکان دەکەونە ململانێ؛ دواتریش عەلی هەر ئەمەی ئەنجام دا. بینیمان بە خەلافەتی ئەبوبەکر و عومەر رازی بوو، گوێڕایەڵی ئەوان بوو؛ لەدوای ئەوان نوێژی کرد. بەڵام کە بینی بەنی ئومەییە دەسەڵاتیان زاڵ دەکەن، ئەوا بووە توپەڵێک گڕ و دانەمرکایەوە.

[٢٧٠] ابن ابي حديد، المصدر السابق، ج١، ص٣٧٣

دەگێڕنەوە پیاوێك لە خەڵكی شام لە جەنگی صەفەین بانگی عەلی كرد، عەلی گوێی لە قسەكانی گرت. پیاوەكە دەیگوت:" ئەی عەلی پێت لە ئیسلام وهیجرەت هەبووە، من پێشنیارێكت بۆ دەكەم بۆ ئەوەی خوێن نەڕژێت.بگەڕێوە عێراقەكەت، تەنها لەوێ بمێنەوە، ئێمەش دەگەڕێینەوە شامەكەمان لەوێ دەمێنینەوە." عەلی وتی:" دەزانم ئەمەت بۆ ئامۆژگاریی و بەزەیی پێشنیار كردووە. زۆر بیركردنەوە و شەونخونیم بۆ ئەو بابەتەكرد و زۆرم هێنا و برد. تەنها ئەوەم دۆزییەوە بجەنگم یان كوفر بەوە بكەم كە خودا بۆ محەمەدی ناردووە. خودا لە ئەولیای خۆی ڕازی نابێت، لە زەوی یاخیبوون ببینن و ئەوانیش بێدەنگ بن؛ نە فەرمان بەچاكە بكەن و نە ڕێگری لە خراپە بكەن. بۆیە بینیم جەنگ ئاساتتر بێت نەوەك زنجیری دۆزەخ"[٣٧١].

هەر لە سەروبەندی هەمان جەنگ پیاوێك هاتە لای عەلی و بەسەرسوڕمانییەوە پرسیاری دەكرد: چۆن گونجاوە شەڕ لە دژی معاویە و یارانی معاویە بكات، ئەوانیش وەك عەلی نوێژ دەكەن و قورئان دەخوێنن و ڕوو لەكەعبە دەكەن. عەلی وتی:" برۆ لە عەمماری كوڕی یاسر بپرسە، ئەو بۆت ڕوون دەكاتەوە" وەڵامی عەمماریش ئەوە بوو كە ئەوان ئەمڕۆ لە دژی معاویە دەجەنگن، وەك ئەوەی دوێنێ لەدژی باوكی دەجەنگان، جیاوازییەكیش لەنێوان ئەو دوو جەنگە نییە"[٣٧٢].

عەممار وەك عەلی هاوڕێی بڕوایەكی یەكلاكەرەوەی هەبوو، كە ئەو لە شێوەی جەنگەكەی محەمەد دەجەنگێ، ئەو بابەخ بەوە نادات سەردەكەوێت یان دەشكێ. عەممار جەنگا تا كوژرا؛ تەنها لەو جەنگەشدا سێ سەد كەسی لەسەحابەكانی بەیعەتی ڕەزوان لەگەڵی كوژران، وەك لەبەشی پێشوو باسمان كرد. جیا ئەو سەحابانەی دوێنێ لەگەڵ محەمەد دەجەنگان، ئەمڕۆ لەگەڵ عەلی كوڕی ئەبوتالیب دەجەنگن. بەڵام ئەو سەحابانەی كە لەگەڵ معاویە بوون؛ هەرهەموویان ئەوانە بوون

[٣٧١] عبدالحسين الاميني، الغدير، ج١٠،ص٢١٣
[٣٧٢] ابن ابي حديد، المصدر السابق، ج١، ص٥٠٦

لەدژی محەمەد جەنگابوون، دواتر بەناچاریی بوون بە موسڵمان. ئەمەش دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە پێویستە توێژەرێکی بێلایەن تێڕاماتی بۆی هەبێت.

ئالوسی دەڵێ: ئەوەی لە سەحابە دڵسۆزەکان لە عەلی جیابوونەوە دواتر پەشیمان بوونەوە. شێخی ئەو سەحابانەش سەعدی کوڕی وەقاص بوو. وەك زانراوە سەعد لە سەرکەوتنی معاویە زۆر دڵتەنگ بوو. لەشتێك رازی نەبووایە ئەوا رووبەرووی معاویە دەبۆیەوە و دەیگوت:" ئەی پاشا" رۆژێکیان معاویە لێی پرسی: " بۆ شەڕت لەدژی عەلی نەکرد؟" سەعد دەڵێ:" رەشەبایەك بۆمن هەڵیکرد، منیش گوتم ئاخ ئاخ، تا بایەکە رۆیشت و لەمن تێپەڕ بوو، دواتر رێگەی خۆم ناسی و رۆیشتم"[٢٧٣].

ئەبەڕی دەڵێ:" معاویە ساڵێکیان حەجی کرد و لە (دار نەدوا) دانیشت، لەسەرتەختەکەی خۆی سەعدی دانیشاند. دواتر دەستیکرد بە جنێودانی عەلی. سەعد دوورکەوتەوە و وتی:" من لەسەرتەختی خۆت دانیشاند، دواتریش جنێوت بە عەلی دا، بەخوا هەر خەسڵەتێکی باشم هەبێت ئەوا هی عەلیە، ئەو زۆر لای من خۆشەویسترە. بەخوا ناچم ماڵێك تۆ لەوێ بیت" دواتر هەڵسایەوە[٢٧٤].

***

عەلی بە بیروڕایە ئیشتراکییە سەیرەکانی بەناوبانگ بوو، ئەمەش مانای ئەوە نییە کە ئایینێکی نوێی هێناوە، بەڵکو جەختی لەسەر رێنماییەکانی پێغەمبەر دەکردەوە کەپێشتر ئەو رێنماییانە دەرکەوتنێکی روونیان نەبوو. خەڵك لە رۆژگاری پێغەمبەر و خەلیفەکەی بەشێوەیەکی نیمچە ئیشتراکی دەژیان. بۆیە پێویستی نەدەکرد بانگەواز بۆ بنەماکانی ئیشتراکیی و یەکسانیی بکرێت، چونکە ئەو بنەمایانە کاتێك بانگەوازییان بۆ دەکرێت، کەلەژیاندا پێچەوانەکانیان بەرقەرابن.

---

[٢٧٣] ابن کثیر، البدایة و النهایة، ج٧، ص٧٧

[٢٧٤] موسلم و ترمزی هەمان ریوایەت دەکەن سەیری صحیح موسلم و صحیح ترمزی بکە(عەلی وەردی)

کاتێکیش ئەمەوییەکان دەستیان بەسەر سامانی خەڵک داگرت و ڕێگای خۆشگوزەرانیان گرت، عەلی ڕەخنەی لێ دەگرتن و بیروڕاکانی خۆی بڵاودەکردەوە. لایەنگرانی بەنی ئومەییە دەڵێن ئەو پڕەنسیپانەی ئیشتراکییەت کە ئەبوزەڕ بانگەشەی بۆ دەکرد، لە ئیبن سەبائی وەرگرتبوو، کەچی لەڕاستیدا ئەو لە عەلی مامۆستای وەرگرتبوو. لە نێوان عەلی و ئەبوزەڕ هاوڕێیەتی بەهێز و سۆزی هاوبەش هەبوو. ئەبوزەڕ بەوە لەناو خەڵک ناسرابوو، بۆیە ئەمەوییەکان دڕکیان بەوە دەکرد و چاو لەدوای چاو ڕقیان لەو هەڵدەگرت.

ئەبوزەڕ پێویستی بەوە نەبوو کەسێکی جولەکە فێری بنەماکانی بکات. لەئیسلامدا کۆمەڵێک بنەما هەن کە کەم نین، ئەو بنەمایانەش لە خەلافەتی عەلی بەڕوونی دەرکەوتن. ئەو چەند بنەمایەی عەلی بانگەشەی بۆ کردووە بۆ خوێنەر دەخەینەڕوو:

١-عەلی باوەڕی بەوە هەبوو کە سامان بۆ گەلە، بۆ کەسێک نییە سوود لەو سامانە ببینێت. خەلیفەش جگە لە بژێویەک زیاتری نییە، دەبێت ئەو بژێویەی خەلیفە لەڕەعیەت کەمتر بێت. ناکرێت بە خواردنی بەچێژ تێر بێت. دەبێت لەهەموو وڵاتدا چاوی لە کوڵێرەیەک نەبێت و مانای تێربوون نەزانێ"[٢٧٠].

٢-عەلی دەڵێ:" خودای گەورە ئەوەندەی ماڵ داواتە دەوڵەمەندەکان، بەگوێرەی پێویستی هەژارەکانە. ئەگەر هەژاران برسی بوون یان ڕووت بوون، ئەمە کاری دەوڵەمەندەکانە. خودا لەسەر ئەمە حیسابێکی توندیان دەکات و ئازارێکی زۆریان پێ دەدات" ئەو قسەیە بەچەندین جۆر ڕیوایەت کراوە. قاسم کوڕی سەلام لە کتێبی (الاموال) بەشێوەیەک دەیگێڕێتەوە کە لە چەند وشەیەک دا جیاوازی لەگەڵ ئەوە هەیە کە شەریف ڕەزی دەیگێڕێتەوە، کەسانی دیکەش بە وشەی دیکە دەیگێڕنەوە. وەک دەردەکەوێت عەلی لە چەند بۆنەی جیاواز باسی ئەو قسەیەی کردووە، بۆیە لەگێڕانەوەیدا وشەی جیاوازی تێکەوتووە. گرنگ ئەوەیە لە هەموو گێڕانەوەکان یەک

[٢٧٠] محمد عبده، المصدر السابق، ج٣،ص٨٠

مانای هەیە. ئەم وتەیە بەڵگەی ئەوەیە کە عەلی واز لە دەوڵەمەندەکان ناهێنێ بەخواستی خۆیان پارەکانیان خەرج بکەن. ئەگەر ئەیارانی بە ئاژاوە بەردەوامەکانیان ئەویان سەرقاڵ نەکردایە, ئەوا بنەما ئیشتراکییەکانی خۆی لە خەلافەتەکەی جێ بە جێ دەکرد. لەوانەشە نەیارەکانی هەستیان بەمە کردبێت بۆیە بەردەم سەرقاڵیان کردووە.

٣- عەلی رقی لەو داوەتانە بوو کە خەڵک لە سازدانی رافاتبوون، گلەیی لە یەکێك لە پیاوەکانی دەکات، لەبەرئەوەی چۆتە یەکێك لەو داوەتانە عەلی دەڵێ:" تۆ دەچیتە داوەتێك هەژارەکانی لێ دوورخراونەتەوە، دەوڵەمەندەکان بانگهێشت کراون"[٢٢٦]، هەر داوەتێك دەوڵەمەندانی بۆ بانگهێشت بکرێت، هەژاری لێ دەردەکرێت. ئەمەش چاوچنۆکییە، خەڵك دەبێت لێی دووربکەوێتەوە. خۆزگە عەلی ئەمڕۆ دەردەکەوت، دەیبینی چ جۆرە داوەتێك بەناوی ئیسلامەوە ساز دەکرێت، کە هەموویان لەم جۆرەی سەرەوەن.

٤- عەلی رقی لەو بەخشندە باوەی ناو خەڵك بوو, بەشێوەیەك پارەیەکی زۆر بدرێتە کەسێك کەچی خەڵکی دیکە لەهەژارییەکی کوشندە دا بن. جارێکیان معاویە سەد حوشتر بە پیرەژنێکی بەتی کنانە دەدات کە بەشیعە ناسرابوو و ژنێکی زمان پاراو بوو، معاویە بەو ژنەی وت:" بەخوا ئەگەر عەلی زیندوو بووایە شتێك لەوەی بەتۆ نەدەدا" پیرەژنەکە وتی:" نابەخوا، تاڵەموویەکی لە ماڵی موسڵمانان بەمن نەدەدا!".

٥- عەلی لە پێدانی بەخشش یەکسانیی رەچاو دەکرد، لە نێوان عەرەبێك و غەیرە عەرەبێك, لەنێوان سەردار و کۆیلەیەك، لەنێوان سەرۆك و ژێر دەستێك، جیاوازی نەدەکرد. لەمەش دڵنیاین هەر ئەو هۆکارە بوو وایکرد هەندێك سەرکردە و خانەدان لێی رابکەن و بەدوای معاویە بکەون. هەندێك لە یارانی ئامۆژگارییان کرد، وەك

---

[٢٢٦] المصدر السابق، ج٣،ص٧٨

معاویە جیاوازی لە بەخشش بکات. ئەویش وتی:" ئایا فەرمانی ئەوەم پێدەکەن بە ستەمکاریی سەرکەوتن بەدەست بهێنم"[٢٧٧].

٦- عەلی لە هەڵسوکەوت لەگەڵ هەموو خەڵك یەکسان بوو.

مەوالییەکان بەشێوەیك دەوری عەلییان دابوو، تا هەندێك لایەنگرانی سکالایان لەلای عەلی کرد و وتیان:" ئەو سوورانەت لە سەرووی ئێمە داناوە". عەلی لەگەڵیان دادپەروەر بوو، لەسەر ئەو رێبازە بوو کە جیاوازی لە نێوان عەرەب و عەجەم و قورەیشی و حەبەشی ناکات، بە خواپەرستی نەبێت"[٢٧٨].

٧- لە یەکەم رۆژی بەیعەت بۆ عەلی، ئەو فەرمانی دا دەست بەسەر ئەو سامانە بگیرێت کە بە ناهەق براوە. هەموو ئەو زەوی و زارانەش وەربگیرێنەوە کە لە رۆژگاری عوسمان بەهەندێك دەوڵەمەند دراون[٢٧٩]. ئەو لەو باوەڕەدا بوو " سامان ماددەیە بۆ شەهوەت"[٢٨٠]، بۆیە ئەگەر موسڵمان دەوڵەمەند بێت، ئەوا رێگرە ئایینیەکەی لاواز دەبێت و خۆشگوزەرانی هانی دەدات بەفیز و زۆردار بێت.

٨- عەلی بۆ یەکێك لە سەرکارەکانی نوسی" کار بدە بە خەڵك، لە ئایفەی هاورێیانت دەربچۆ، ئەو کاتە بست بست بەخاکی کەنار برۆ لە کاروباریان بپرسە و سەیر کارەکانیان بکە. لەگەڵ ئەوکەسانەی کارت لەگەڵ دەکەن بە فەرمانی خودا هەڵسوکەوت بکە"[٢٨١]. جیا لەمەش ئامۆژگاری خەزندارەکانی دەکرد بە بەزەیی هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵك بکەن و ئازاریان نەدەن. بە تێڕوانینی ئەو دادپەروەریی لەگەڵ خەڵك زۆر گرنگترە لە گەنجینە. ئەو دەڵێ" خوا بەرەکەت

[٢٧٧] احمد امین، ضحی الاسلام، ج،ص٢٤
[٢٧٨] عباس العقاد، معاویة بن ابي سفیان، ص٣٨
[٢٧٩] سید قطب، العدالة الاجتماعیة في الاسلام، ص١٩٦
[٢٨٠] محمد عبده، المصدر السابق، ج٣،ص١٦٤
[٢٨١] ابو یوسف، کتاب الخراج،ص١٤١-١٤٢

ناخاتە ناو ئەو ئومەتەی کە مافی بێدەسەڵات بەنەرمی و بێ کێشە لە کەسانی بەهێز وەرنەگرێت[٢٨٢].

ئەو بنەمایانەی سەرەوە لەئیسلام دا نوێ نەبوون، بەڵکو رەگوڕیشەی بۆ رێنامییەکانی پێغەمبەر دەگەڕێتەوە، بەلام لە خەلافەتی عەلی زیاتر دەرەوشایەوە لەوەی لە رۆژگاری پێغەمبەر دەرکەوێت. چونکە دونیاکە گۆڕابوو خەڵکی خۆشگوزەران و دەوڵەمەندی تێدا زۆر بوو، کە پێشتر کۆمەڵگای ئیسلامی بەخۆیەوەی نەدیبوو.

***

عەلی کوڕی ئەبوتالب لە عێراق بانگەشەی بۆ ئەو پرەنسیپانە دەکرد، کەچی معاویە لەشام بانگەشەی بۆ جۆرێکی دیکەی بنەماکان دەکرد. دەبێت هەر حیزبێک، هەر جۆرێك بێت، ئەوا بانگەشە بۆ بنەما تایبەتییەکانی خۆی بکات.

معاویە لەدەسەلاتدا بانگەوازی بۆ ئەوە دەکرد کە ئێمە بە (مافی خودایی) ناوی دەبەین. لەڕاستیشدا ئیسلام لەسەرەتادا ئەو بانگەوازەی کرد، چونکە خەڵك دەبێت لەدەسەلاتدا ملکەچی ئیسلام بن، چونکە حوکمی خودایە، دەبێت خەڵك گوێڕایەڵی خودای خۆیان بن. دەسەلاتداریش هەرکارێك بکات، ئەوا راستە، چونکە لە خودای گەورەی وەرگرتووە. بەمەش معاویە هەڵی لەهەندێك ئایەت و فەرموودە وەرگرت و هەندێك کاهینی لە شێوەی ئەبوهورەیرە پاڵپشتیان کردو ئەو بانگەوازیان بۆ بلاوکردەوە. ئێستا بۆ خوێنەر ئاماژە بۆ چەند ئایەتێك و فەرموودەیەك دەکەین کە معاویە لەسیاسەتەکەی پشتی پێبەستووە:

١- ئەو فەرموودەیەی لە بارەی پیرۆزی کراسەکەی عوسمانەوە هاتووە. خاتوو عائیشە ریوایەتی کردووە کە پێغەمبەر بە عوسمانی فەرمووە: «ئەی عوسمان خودا بە کراسێك دەتپۆشێ، ئەگەر موناقیقەکان ویستیان ئەوکراسە دابکەنێن، دامەکەنە تا

---

[٢٨٢] محمد عبده، المصدر السابق، ج٣،ص١١٢

بەمن دەگەی". سێ جار ئەمەی دووبارە کردۆتەوە. کاتێک نعمان کوڕی بەشیر گوێی لەو فەرموودەیە بوو. لە عائیشەی پرسی:" ئەی تا ئێستا لە کوێ بوو؟" مەبەستی ئەوەیە عائیشە چ کارێکی کرد کاتێک خەڵکی لە دژی عوسمان هان دەدا. عائیشە دەڵێ:" بەخوا لەبیرم کرد بوو" معاویە گوێی لەو فەرموودەیە بوو ئارام نەبوو تا ئەو کاتەی داوای لە عائیشە کرد ئەو فەرموودەیە بنوسێتەوە، ئەویش نووسیەوە[٣٨٣]. گومان لەوە دانییە معاویە ئەو فەرموودەیەی بە دەستووسی عائیشە پاراستووە، هەر ئەو فەرموودەیش بۆتە کۆڵەگەیەک لە کۆڵەگەکانی دەوڵەتی ئەمەوی. کراسەکەی عوسمان کەپشتە معاویە. ئەو خاوەنە شەرعیەکەی ئەو کراسەیە کە لە عوسماتی ئامۆزای وەرگرتووە. معاویە بینراوە لە بازاڕی دیمەشق ڕۆیشتووە کراسێکی پینەداری پۆشیوە[٣٨٤]، لەوانە ئەمە خودی کراسەکەی عوسمان بێت. چونکە معاویە لەو زاهیدانە نەبووە تا کراسی پینەدار بپۆشێ. ئەگەری ئەوەش هەیە کە ئەمە بە میرات بۆ خەلیفەکانی بەجێمابێت کە دەتوانین بە کراسی دەوڵەت ناوی ببەین. ئەم کراسە خودا پێی بەخشیون، نابێت بەکێنکیان دایبکەنن.

٢-قورئان دەفەرموێ: " **من قتل مظلوما فقد جعلنا لوليه سلطانا فلا يسرف في القتل إنه كان منصورا**[٣٨٥]". معاویە ئەو ئایەتەی کردە دروشم لە وەرگرتنی خوێنی عوسمان، کەواتە کێ دەتوانێ بەرپەرچی وتەی خودا بداتەوە؟!.

٣-معاویە لە جەنگی صەفەین، بانگەوازی کرد و وتی:" وەرن با بە کتێبی خودا ناوبژیوانی بکەین" ئەنجامەکەشی ئەوەبوو کۆبوونەوەی ناوبژیوانی لە دومەی

[٣٨٣] احمد بن حنبل، المسند، ج٦، ص٨٦-١٤٦
[٣٨٤] ابن العربي، العواصم من القواصم، ص٢٠٩ (الحاشية)
[٣٨٥] القرآن، سورة الاسراء، ايه٣٣

جونەدل ئەنجام درا، لەوێش ئەبو موسا و کوڕ عاص بڕیاری کەنارگیرکردنی عەلییان دا. معاویە وتی:" ئەمە ویستی خودایە لەکتێبەی پیرۆزەکەی ".

٤-کاتێك حەسەن ئەنازولی لە خەلافەت کرد و موسڵمانان بەیعەتیان بۆ معاویە کرد. ئەوساڵە بەساڵی جەماعەت ناوبرا، پێغەمبەری خودا دەفەرموێ:" ئومەتی من لەسەر ناهەقی یەکناگرن" کەواتە خەلافەتی معاویە هەقە، چونکە ئومەتی محەمەد لەسەر یەکگرتووبن، بێگومان ئەو جەماعەتە تەنها گومڕا و زەندیقن.

٥- معاویە ئەو سەرکەوتنەی خۆی بەوە وەسف دەکرد، کە رەزامەندی خودای لەسەرە بۆیە کەسێك نابێت نارازیی بێت. رۆژێکیان لەسەر مینبەر وتی:" کاری عەلی بە فەرمانی خودا بوو و خوداش بڕیاری لەسەر عەلی دا"[٢٨٦]. هەموو شتێك بە ویستی خودا دەبێت. شتێك نییە لەودونیایەدا بێ ویست و رەزامەندی خودا بێت. معاویە وای گوت!.

٦-خودا معاویەی تەنها لەبەر ئەوە سەرخستووە چونکە رێبەری قورەیش بووە، معاویە قورەیشی بەوە ناو دەبرد کە ئەهلی بەیتی خودان، جارێکیان وتی:" خودا لە رۆژگاری جاهیلییەت قورەیشی سەرخست، کە لەسەر کوفر بوون، ئەی چۆن پاڵپشتیان ناکات کە ئەوان هاتوونەتە سەر ئایینی خودا"[٢٨٧]. خەڵکی شام وایان دەزانی کە بەنی ئومەییە ئەو ئەهلی بەیتەن کەخودا لە قورئان باسی کردووەن، مەقریزی باس لەوە دەکات کە ئەهلی شام دوای نەمانی دەوڵەتی ئەمەوی وتویانە:" نەمانزانیوە پێغەمبەری خودا کەسی نزیکی هەبێت، میراتگری بن، جگە لە بەنی ئومەییە"[٢٨٨]

٧-معاویە لەسەر مینبەری شام وتی:" ئەی خەڵکینە پێغەمبەری خودا بە منی گوتووە تۆ لە دوای من خەلافەت وەردەگری، بۆیە خاکێکی دیکەی پیرۆز

---

[٢٨٦] ابن ابی حدید، المصدر السابق، ج١،ص١٧٢
[٢٨٧] الطبري، تاريخ الامم و الملوك، ج٥، ص٨٦
[٢٨٨] المقريزي، النزاع و التخاصم، ص٢٤

هەڵیبژێرە، منیش ئێوەم هەڵبژارد، ئێوەش نەفرەت لە ئەبوتوراب بکەن"[٣٨٩].
ماناکەی ئەوەیە کە پێغەمبەر خەلافەتی بۆ معاویە ڕاسپاردووە. کەچی بە ستەم و دوژمنایەتی ئەبوتوراب لە معاویە جیابۆتەوە، بێگومان ئەهلی شامیش نەفرەتی لێدەکەن.

٨-معاویە (بیت المال)ی موسڵمانانی بە سامانی خودا( مال الله) ناو دەبرد، ئەبەری دەڵێ معاویە ئەو ناوەی لەرۆژگاری عوسمانەوە بەکاردەهێنا. لەبەر ئەمەش ئەبوزەڕ هاتە لای ناڕەزایی دەربڕی، کەچی معاویە وتی:" ڕەحمەتی خودات لە تۆ بێت ئەی ئەبوزەڕ، ئەی ئێمە بەندەی خودا نین، ئەی سامان سامانی خودا نییە، ئەی خەڵق خەڵقی ئەو نییە، ئەی هەموو شتێک هی ئەونییە"[٣٩٠] ئەمە قسەی معاویەیە.

لەو بەڵگە مێژووییانەوە دەردەکەوێت، معاویە لە هەموو لایەکەوە بە چەندین قەرمووده و ئایەتی پیرۆز دەوره درابوو. ئەو خەلیفەی پێغەمبەری خودایە، کراسی خودای لەبەردایە. کارەکانی بە فەرمانی خودایە. سەرەڕای ئەمەش لەئەهلی بەیتی خودایە. ئێمە پشت و پەنامان تەنها خودایە.

نابین لە تێڕوانینی ئەمەوییەکان تەنها بووبوو بە ملکەچیی بۆ سوڵتان. ئەوەی کوفر بە سوڵتان بکات کوفری بە خودا کردووە. ئەو باوەڕە لە لای حەجاج گەیشتە ئەوپەڕی، چونکە ئەو خەلیفەی بە خەلیفەی خودا دەزانی، خەلافەی پێ لە پێغەمبەرایەتی باشتر بوو. دەیگوت:" ئەرزو ئاسمان تەنها بە خەلافەت وەستاون. خەلیفەش لەلای خودا باشترە لە فریشتە نزیکەکان و پێغەمبەران و نێردراوەکان، چونکە خودا ئادەمی بە دەستی خۆی دروست کردو هەموو فریشتەکان سوژدەیان بۆ برد، لە بەهەشتی جێنیشین کرد و دواتر ناردیە

[٣٨٩] ابن ابی حدید، المصدر السابق، ج١،ص٦٦
[٣٩٠] الطبري، المصدر السابق، ج٥، ص٦٦

سەرزەوی و ئەوی کرد بەخەلیفە و فریشتەکانیش بە پەیامبەر". ئەگەر یەکێکیش ڕەخنەی لەوە بگرتایە دەیگوت:" ئایا خەلیفە کەسێکە لە ئێوە و بەخشندەیە، یان پێغەمبەر بە پێی پێویستیەکانی ئێوەیە؟". دەگوترێت عەبدولمەلیک زۆر سەرسام بوو کە ئەو قسانەی دەبیست. چەندین سەرداری دیکەی توندڕەوی لەوقسانە پەیڕەوی حەجاجیان دەکرد"[٢٩١].

کاتێک حەجاج، سەعید کوڕی جبیری لەگەڵ جەماعەتەکەی کوشت، وتی:" ناترسم تەنها لە نزای ئەوکەسە ستەملێکراوانە نەبێت کە لە زمەی جەماعەتن، بەڵام نموونەی ئەم کەسانە، ئەوانە ستەمکارن لەو کاتەوەی لە جەماوەری موسڵمان و سەرکردەی ڕێگای چاکەخوازان جیابوونەوە"[٢٩٢]. ستەملێکراو ئەو کەسەیە باوەڕی بە ملکەچی سوڵتان هەبێت و هێرشی کرابێتەسەر. حەجاجیش لە نزای ئەو ستەملێکراوە دەترسێ. بەڵام ئەوانەی باوەڕیان بە ملکەچی سوڵتان نییە ئەوا حەجاج بڕوای وایە ئەوان کافرن و خوێن وماڵیان حەلاڵە، ئەگەر لە نموونەی سەعید کوڕی جبیریش بن.

تێبینی دەکرێت ئەوە باوەڕی هەموو ئاینێکی سوڵتانییە، یان ڕاستتر باوەڕی هەموو بەهێز و سەرکەوتووەکانە جا لەهەر کات و شوێنێک بن. ئەوان بڕوایان وایە هێزی خۆیان لە خوداوە وەرگرتووە، ئەگەر لەسەر هەقیش نەبن، ئەوا خوا سەرکەوتنیان پێناداتن، هەر لەبەر ئەمەش داوا لە خەڵک دەکەن ملکەچیان بن. لە هەر کۆمەڵگایەک یاسای هێز و شەڕ هەبێت، هەر ئەمەش پێوەری هەق دەبێت لەنێوان تاکەکانیدا. ئەگەر یەکێک ڕووبەڕووی کەسێکی بەهێز ببێتەوە ئەوا داوای شەڕی لێدەکات و دەست دەکەن بەزۆرانبازی، خەڵکیش وەک بینەر دەوەستن.

---

[٢٩١] جرجي زيدان، التمدن الاسلامي، ج٤، ص٨٤

[٢٩٢] كامل الكيلاني، مصارع الاعيان، ص١١٥

هەرکە یەکێکیان سەرکەوت، ئەوانی دیکە چەپڵەدەکوتن و ئیعتراف بە چاکەکەی دەکەن.

بەڵام کەسانی بێ دەسەڵات باوەڕێکی دیکەیان هەیە. ئەوان لەو باوەڕەدان کە هێز نابێتە پێوەرێک بۆ حەقیقەت، ناهەقیش لە زۆربەی کاتەکان سەردەکەوێ. عەممار کوڕی یاسر لە کاتی جەنگی صەفەین ئاماژەی بۆ ئەمە کرد و وتی: "ئەوان بە شمشێر لە ئێمە دەدەن تا کەسانی بە گومان و ناهەق لەنێوە بڵێن: ئەوان لەسەر هەق نەبوونایە بەسەر ئێمە زاڵ نەدەبوون. بەڵام بەخوا ئەوان بەقەد ئەو شتانەی لە چاوی مێشوولەیەک دەردەچێ لەسەرهەق نیین. بەخوا ئەگەر بە شمشێرەکانیان تا (سعفات هجر) بەدوامانەوە بن، هەر دەزانم ئێمە لەسەر هەقین و ئەوان ناهەقن."[٢٩٣]

ئیمام عەلی لەو خوتبەیەی بە خوتبەی(القاصعە[٢٩٤]) ناسراوە، ئاماژەی بەو وتەیەکی لەمجۆرە کردووە. لەڕاستیدا لەو خوتبەیەدا فەلسەفەی ئیمام عەلی بەرووتی دەردەکەوێت. پێم سەیرە مێژوونووسان بایەخێکی تەواو بەو خوتبەیە نادەن. لەو خوتبەیەدا عەلی دەڵێ پێغەمبەران و شوێنکەوتەی پێغەمبەران بێدەسەڵاتن و هەردەم لەمەینەتی دەژین، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کەئەوان دەستەبەرداری هەق نابن. بەڵام ئەگەر پێغەمبەران وەک پاشایانی خۆشگوزەران دەبوون، ئەوا سەرجەم خەڵك بەدوایانەوە دەبوون ئەوکاتەش ئەوانەی دلوای هەق دەکەن و ئەوانەی داوای بەرژەندی دەکەن وەک یەك یەکسان دەبوون.[٢٩٥]

---

[٢٩٣] ابن ابي حديد، المصدر السابق، ج١، ص٥٠٦

[٢٩٤] قصع لەزمانی عەرەبییدا بەو مانایە دێت یەکێك وا بکات کەسێکی دیکە رقی لەدیاردەیەك بێت، بەبڕوای شیعەکان عەلی کوڕی ئەبوتالب لەوخوتبەیەدا توانای وا لە شیعەکانی بکات کە رقیان لەمەتدیك دیاردەبێت، لە ئەدەبیاتی شیعەش ئەو خوتبەیە بە خوتبەی قاصعە ناسراوە. وەرگێڕ

[٢٩٥] محمد عبدە، المصدر السابق، ج١ ص١٦٨

عەلی پێشبینی سەرکەوتنی بەنی ئومەییە دەکات، وەك پێشتر محەمەدیش پێشبینی کردبوو. جارێکیان عەلی وتی:" سوێند بەوەی رۆحی منی بەدەستە دەمەوێ ئەوکەسانە بەسەرتان سەرکەون، لەبەر ئەوەنییە کە ئەوان لەسەرهەق بن، بەڵکو لەبەر ئەوەیە ناهەقی ئەوان زوو دەرکەوێت و هەقی ئێوەش بەمیراتی بێت"[٢١٦]. یەکێك لە یارانی عەلی دەگێڕێتەوە کە رۆژێك لەگەڵ کۆمەڵێك لە ماڵی ئیمام بووە، ئیمام وتویەتی:" کەسانێك لەو قەومە بەسەرتان زاڵ دەبن، دەستتان دەبڕن و چاوتان دەردەهێنن" یەکێك لە ئامادەبووان دەگری، ئەوکاتە ئیمام دەڵێ:" کوڕی ژنە گێلەکە ئایا خۆشیت لەدونیا دەوێ و پلەت لەدواڕۆژ دەوێ؟ خودا پەڵێنی بەو کەسانە داوە کە سەبر دەگرن"[٢١٧]

***

عەلی لە یەکێك لەخوتبەکانی دەڵێ:" نەتەوەکان وایان لێهاتووە لە ستەمی سەردارەکانیان دەترسن، کەچی من لە ستەمی رەعیەتەکەم دەترسم"[٢١٨]. ئەو وتەیە زۆر سەیرە. عەلی کە خەلیفەیە سکاڵا لە ستەمی رەعیەتەکەی دەکات، لەکاتێکدا گەلان سکاڵا لەستەمی دەسەڵاتدارانیان دەکەن. مێژوو دەسەڵاتدارێکی نەبینیوە، سکاڵای لە ستەمی ستەملێکراو هەبێت!

لەڕاستیدا عەلی بەو مانا باوەی لە لای ئێمە هەیە فەرمانڕەوا نەبوو. ئەو دەسەڵاتی بە میرات وەرنەگرتبوو وەك چۆن لەسەدەکانی کۆن پاشایان وەریاندەگرت. بەڵکو رێبەرێك بوو خەڵك بەدوای بوو. خەڵك بەیعەتیان بۆکرد بۆ ئەوەی ئەو پرەنسیپانە جێ بە جێ بکات کە لە سەردەمی عوسمان لەپێناویدا راپەڕیبوون.

[٢١٦] المصدر السابق، ج١، ص١٨٨
[٢١٧] ابن ابي الحديد، المصدر السابق، ج١، ص٢٧٣
[٢١٨] محمد عبده، المصدر السابق، ج١، ص١٨٨

دەبوایە عەلی لە ئەرکەکەی بێئومێد بێت و نەیارەکەی سەرکەوێت، چونکە ئەو بنەمایانەی کە عەلی بانگەشەی بۆ دەکردن بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی بەزەبر گونجاو نەبوون، بەڵکو بنەماکانی ئایدیالی و نموونەیی بوون، دەبووە پەناگەیەک بۆ نەوەکانی داهاتوو تا ڕێگای ڕاستیان نیشان بدات و لە ستەم دووریان بخاتەوە.

ئەو جۆرە پرەنسیپانەش بۆ وروژاندنی خەڵک گونجاون؛ بەڵام بۆ ملکەچکردنیان گونجاو نین. ئەوەی دەیەوێت خەڵک ملکەچی دەسەڵاتەکەی بکات دەبێت هەندێک بنەمای نەرم پەیڕەو بکات کە تۆقاند وستەمی تێدابێت. نەریتی خەڵک ئەوەیە ملکەچی ئەو پیاوچاکە نابن کە لە سنووری فەرمانی خودا شمشێر و سامان بەکاردەهێنێ. ئەوان هێشتا لە لایەک باوەڕیان بەدەسەڵاتی نەهێناوە، لەلایەکی دیکە لێی یاخی دەبن، بەمەش مشتومڕێکی بێسوود لە نێوان خەڵک دروست دەبێت.

عەلی لە مزگەوت لە غەفڵەتی کوژرا. ئەگەر لەوێ نەکوژرایە، ئەوا لەشوێنێ دیکە دەکوژرا. ئەو تا دواهەناسە سووربوو لەسەر خەباتی خۆی. هاوڕێیانی بەرەبەرە لێی جیادەبوونەوە. ئەگەری ئەوە هەبوو بەتەنیا مابایەوە، ئەگەر چەند ساڵێکی دیکە تەمەنی درێژبووایە. ئەوکاتیش بەتەنها تا مردن خەباتی دەکرد.

عەلی بەر لە کوژرانی هاواری دەکرد" کوا سەختترین" ئەو چاوڕوانی بکوژەکەی دەکرد، بۆ ئەوەی لە دونیا بیحەسێنێتەوە. کاتێک ئیبن ملجم بە شمشێرە ژەهراوییەکەی لەسەری عەلی دا، ئەو بکوژە وتی:" بەخودای کەعبە سەرکەوتم" عەلی بەمردن براوە بوو؛ معاویەش بە سەرکەوتنەکەی. جیاوازیش مەزنیش لە نێوان ئەو دووبردنەوەیە هەیە.

لە سەرکەوتنی خێرادا معاویە لەعەلی بەتواناتر بوو. معاویە شمشێر وسامانی بەدەستەوە بوو بەخواستی خۆی بەکاری دەهێنان، لەمەیاندا ئایین و ویژدانێک

بەرپەرچی ئەدەدایەوە، سەرکەوتن ئامانجی هەرەگەورەی ئەو بوو، بۆئەمەش بایەخی بەوە ئەدەدا چەندین هۆکاری ڕەوا و ناڕەوا بەکاربهێنێ، ئەو بۆ فریودانی سەرۆکەکان پارەی بەکاردەهێنا؛ ئەگەر لەمەدا بێئومێد بووایە، ئەوا شمشێری دەخستە سەرسەریان.

معاویە هێزی خۆشی لە کوشتنی عوسمان خواست بوو، خۆی بە جێگرو و میراتگری عوسمان دەزانی. بەڵام عەلی هێزی خۆی لەو بنەمای ئەو شۆڕشە خواست بوو کە لە ڕۆژگاری عوسمان ئەنجام درا. بۆیە دەبوایە شۆڕش کۆتایی بێت و دابمرکێتەوە کاتێک سوڵتان بە شمشێر وسامان بەسەری زاڵ بێت. تا کاتێکی دیکە کۆمەڵگە دەکەوێتە جووڵە و سەرلەنوێ دەست پێدەکاتەوە.

پێغەمبەر محەمەد دەڵێ:" خولی ناهەق سەعاتێکە، خولی هەق تا ڕۆژی قیامەتە". ئەمەیان پەندێکی کۆمەڵایەتی گەورەیە. ئەوانەی بانگەواز بۆ هەق دەکەن بەشێوەیەکی کاتی سەرکەوتوو نابن، بەڵام لەکۆتاییدا ئەوان سەردەکەون. خەڵك بەلای ناهەق دەچن چونکە بڕەوی هەیە و لێی دەترسن، بەڵام دواتر زەبرەکەی دەبینن دەگەڕێنەوە ودووبارە بانگەواز بۆ هەقیقەت دەکەن.

زۆرجار بەناو بازاڕ دەڕۆم دەبینم خەڵك ستەم لە یەکتر دەکەن. یەکێك دڵڕەق لە سمێڵ زلەکان دەبینم کە ستەم لە بەستەزمانێك دەکات و بەقسە و شەق بەشانازییەوە لێی دەدات. بەڵام دواتر تووشی یەکێك لەخۆی بەهێزتر دەبێت و قسەوشەقی بەردەکەوێت. لێرەوە دەنگ بەرزدەکاتەوە و داوای دادپەروەری دەکات و گلەیی لەستەمی بەندەکانی خودا دەکات، بەڵام کاتێک خۆی ستەمکار بوو دادپەروەری لەکوێ بوو؟

مرۆڤ لەسەر کوێیەك بێت ئەمە سروشتەکەیەتی. ئەمەش نهێنی بڵاوبوونەوەی بنەماکانی دادپەروەرییە لە نێوان خەڵکدا. خەڵك ستەمدەکات و بایەخی پێنادات. بەڵام کاتێك خۆی تووشی کەسێکی زاڵمتر دەبێت، ئەوا دەبێتە یەکێك لەوانەی

بانگەشە بۆ دادپەروەری دەکەن و پێشتریش خۆی زاڵم بوو، بەهەر حاڵ دادپەروەریی سەردەکەوێت. ئەوە دوای ئەوە سەرکەوتن بەدەست دەهێنێ. بەڵام ئەوانەی بانگەشە بۆ دادپەروەریی دەکەن سەرناکەون، بەڵکو شەهید دەبن. نابێت ئەوەش لەبیر بکەین کە دادپەروەریی پێویستی بە سوتەمەنی هەیە لە خوێنی شەهیدان.

با گریمانەی ئەوە بکەین عەلی دەیتوانی دەوڵەتێکی مەزن دروست بکات و پشتا وپشت بۆ کوڕەکانی دەمایەوە. ئەوکات کەسێکت نەدەبینی ئەمڕۆ ناوی بهێنێ و شوێنیان بۆ بکات. مەزنی پیاو لە بڕەشییە بەرزەکانیەتی و لەگەڵ ئەو قوربانییەی لە پێناوی دەیبەخشێ. قوربانیەکەشی بەوە پێوانە دەکرێت کە چی لە دونیا دۆڕاندووە و نەیارانیشی چ شتێکیان بردۆتەوە.

***

دکتۆر هۆدگسن سەری لەو حاڵە سوڕدەمێنێ، کە لەئیسلامدا تێبینی کردووە. ئەو وادەبینێ عەلی لە ژیانیدا سەرکەوتوو نەبووە، خەڵک لەبەر ئەو دەڕۆیشتن و دڵیان پڕ زام دەکرد و لێی یاخی دەبوون. کەچی دوای مردنی پێگەیەکی لە دڵی موسڵمانان هەیە، لەمەیاندا هیچ سەحابەیەك ڕکابەریی ناکات"[11].

بەڕاستی ئەو دیاردە کۆمەڵایەتییە سەیرە. ئێمە بۆ هەر شوێنێکی وڵاتانی موسڵمانان بچین دەبینین ناوی عەلی بە محەمەدەوە بەندە. لەمەشیان جیاوازی لە نێوان تایفەکان نییە. دایکان کاتێك لەگەشتەدا ماڵئاوایی لە کوڕەکانیان دەکەن دەڵێن:" خودا و پێغەمبەر و عەلییت لەگەڵ بێ". قوتابییەکی مەغریب باسی ئەوەی بۆ کردم کە ئەگەر کەسێك لەوێ شتێکی قورس بەرزبکاتەوە دەڵێ:" یا محەمەد یا عەلی" لێرەش لە ئەعزەمییە کرێکارانم بینی باری قورسیان هەڵدەگرت و دەیانگوت:" خودا یا محەمەد یا عەلی".

---

[11] Hodgson,how did the early shin …p2

ڕۆژێك پیاوێك ناوی عەلی هێنا، منیش پرسیارم لە هۆکارەکەی کرد، بە تیلەی چاو سەیری کردم و وتی:" خودا بۆ ئەمە فەرمانی داوە" منیش پرسیارێکی دیکەم لێکرد" ئایا خودا هەر فەرمانێکت پێ بکات، جێ بە جێی دەکەی؟" پیاوەکە ڕۆیشت و وەڵامی نەدایەوە.

لەڕاستیدا ئەو پیاوە و موسڵمانانی دیکەش عەلیان خۆشدەوێ ئەمەش لەبەر چەندین هۆکاری دیکە، خودا فەرمانی زۆر شتی دیکە بەوان کردووە، کەچی ئەوان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ سەرپێچی فەرمانەکانی خودا دەکەن. ئەگەر لە ڕۆژگاری عەلی دەبوون، ئەوا لە عەلییان رادەکرد وبۆ لای معاویە دەچوون. دادپەروەریی تاڵە، خەڵك بانگەشە بۆ دادپەروەریی ناکەن، تەنها ئەوکاتەی ستەملێکراو بن. کاتێك ئەوان لە عەلییان راکرد لەبەر ئەوە بوو عەلی لە دادپەروەرییدا توند بوو، ئەرمونیان نەبوو. بۆیە بەهای ئەویان نەزانی، تەنها کاتێك کی لە دەستیان دا، ئەوکاتە چەندین نەهامەتیان بەسەر هات، بەمەش هەستیان بە پەشیمانی کرد و درکیان بەوە کرد کە عەلی بۆ ئەوان بۆ ماوەیەکی درێژخایەن چاکتر بوو.

شەعەبی دەڵێ:" گوێبیستی خەتیبەکانی بەنی ئومەییە بوو لەسەر مینبەر قسەیان بە عەلی دەگوت، وەك ئەوەی عەلی دەست بۆ ئاسمان بەرزبکاتەوە. کەچی ستایشی باسی سەلەفی خۆیان دەکرد وەك ئەوەی ئاماژە بۆ تەرمێکی بۆگەن بکەن". ئەو کاتە دەوڵەت دەستی بەسەر هەر شوێنێك دادەگرت لەوێ نەفرەتی لە عەلی دەکرد، کەچی خەڵك لە هەموو شوێنێك رەحمەتیان بۆ عەلی هەبوو، ئەمەش وەك ئەوەبوو نەفرەتەکانی دەوڵەت بۆ عەلی ببێتە رەحمەت. سەیر ئەوەیە ئێمە ناوی عەلی و کورەکانی حەسەن و حوسێن لەسەر دیواری مزگەوتی ئەمەوی لە شام دەبینین، ئەمەش ئەو مزگەوتەیە کە لەسەر رقی عەلی دامەزرا و هۆڵ و داڵانەکانی بۆ ماوەیەکی زۆر پڕ بوون لە نەفرەتکردنی عەلی.

پیاوانی بەنی ئومەییە بە شێوەی سوڵتانەکانی بەر لە خۆیان یان دوای خۆیان چێژیان لە خۆشییەکانی دونیا بینی. ئەوان ئەو دونیایەیان ویست و خواستەکانیشیان هێنایەدی، بەلام بۆیان نییە داوای لە خەڵک بکەن لەدوای مردنیان ڕێزیان بگرن. خەڵک ڕێز لە دەسەلاتداری خۆشگوزەران دەگرن کاتێک لە ژیان مابێت، ئەمەش یان لەبەر ترسە یان لەبەر بەرژەوەندی، ئەگینا کاتێک دەمرێت ڕێزگرتنەکەشی دەمرێت.

بەشێکی زۆر لەو ژیانەدا هەست دەکەن بەشخوراو و بەدبەختن. ئەو کەسانە ماتەمینی خۆیان بە ئیمامێک دەدەن لەژیاندا خۆشی و چێژی نەدیبێ. زۆر ئەستەمە کەسێکی بەدبەخت ئیمامێک بە پیرۆز بزانێت هەموو شەوەکانی بە دەنگی تەمبور و سەما بەسەر بردبێت. خەڵک ڕێز لە کەسی خۆشگوزەران دەگرن و لەبەری هەڵدەستنەوە، بەلام لە ناخی دڵیان ڕقیان لێیەتی. ئەو کەسە کە دەمرێت خەڵک لەبیری دەکەن، بەلام ل ەشوێنی ئەو یادی پیاوێکی دیکە دەکەن کە لە ژیان بێزاریان کردووە و دڵیان زامدار کردووە.

لە یەکێک لەگەشتەکانم بۆ شام لە بەقالێک پرسیاری عەلی کوڕی ئەبوتالیم کرد و وتم: " چی لەبارەی ئەو دەڵێی" ئەویش بەدوورودرێژی ستایشی کرد، کاتێک پرسیارم لەبارەی معاویەش کرد، هەر ستایشی کرد. دواتر وتم: " ئەگەر لەسەردەمی عەلی و معاویە دا دەژیای لایەنی کامیانت دەگرت؟" تۆزێک وەستا وتی: " لەگەڵ عەلی" من لەوە دڵنیام ئەگەر ئەو پیاوە لەو ڕۆژگارە بووایە ئەوا لەگەڵ معاویە دەبوو. وەک زۆربەی خەڵکانی دیکە، وایزانم خوێنەر و نووسەری ئەو چەند دێڕەش جیاوازییەکیان لەو مەسەلەیە نەدەبوو.

***

هەرکە معاویە مرد، ڕووداوێکی گەورە ڕوویدا کە کۆمەڵگای ئیسلامی بەتوندی هەژاند. ئەویش کارەساتی کەربەلا بوو کە حوسێنی کوڕی عەلی تێدا کوژرا. ئەو

رووداوە شوێنەوارێکی کۆمەڵایەتی زۆری بەجێهێشت، کە هاوشێوەی لەمێژوودا نییە. ئێمەش ئەمڕۆ ناتوانین ئەو شوێنەوارە بەئاشکرایی روون بکەینەوە، چونکە خۆشەویستان و قین لەدڵان سۆزی خۆیان بەسەر وێناکردنی رشتووە و رووداوەکانیان لە حەقیقەتە کۆمەڵایەتییەکەی خۆیان دەرخستووە.

شەهیدبوونی حوسێن تەواوکەری شەهیدبوونی باوکی بوو. راستە ئەگەر بڵێین کارەساتی کەربەلا رەنگێکی دیکەی بە کارەساتی کوفە بەخشی، ئەگەر ئەو رووداوەش نەبووایە خەڵک هەستیان بەگرنگی ئەو پرەنسیپە کۆمەڵایەتییانە نەدەکرد کە عەلی لەژیانیدا بانگەشەی بۆ دەکردن. حوسێن پرەنسیپەکانی باوکی بە خوێنی رەنگ کرد، وایکرد بچێتە قوڵایی دڵەکانەوە.

کارەساتی کەربەلا بریتیی بوو لە زایەڵەی هاوارێك، موسڵمانان باسیان دەکرد و زیدەڕۆییان تێدادەکرد. ئەوان لەمەدا وەك هەر گەلێکی دیکە بوون کە قینیان لە فەرمانڕەواکانیان هەیە و بەدوای تۆڵەکردنەوەن. بۆیە ئەو کاتە ئۆپۆزسیۆن تۆڵەی حوسێنیان لە هەموو شوێنێك کردە دروشمی خۆیان. بەمەش بەنی ئومەییە هەستیان بە هەڵەگەورەکەی خۆیان کرد لە کوشتنی حوسێندا. هەوڵیاندا زامەکە تیمار بکەن، بەڵام هەوڵەکانیان درەنگ بوو.

یەکێك لە جیاکارییەکانی مێژوو ئەوەبوو دەوڵەتی ئەمەوی کوشتنی عوسمانی بۆخۆی کردە بیانوو، کەچی دواتر ئۆپۆزسیۆن لە دژی ئەو کوشتنی حوسێنی کردە بیانوو. مێژووی ئیسلامیش لە نێوان رووداوی ئەو دوو کوشتنە دێت و دەچێت. هەر لایەکیش لەنێوان خەڵك زیدەڕۆیی لە دروشمەکەی خۆی دەکات. یەکیان لەبەر عوسمان دەگری و ئەویتریان لەبەر حوسێن.

راستە ئەگەر بڵێین ئەو گریانەی هەردوو لایەن، تەنها وێنەیەکی ململانێی ئەمرەکەی نێوان دەسەڵاتدار و ژێردەستە. خەڵك زوو کوشتنی عوسمانیان لەبیرکرد، بەڵام کوشتنی حوسێن ماوەتەوە و بەسەر رۆژگار و سەرگار زاڵ بووە.

هۆکارەکەش ئەوەیە حوسێن نموونەی شۆڕشگێڕێکی ستەملێکراوە، کەواتە ئەو دەمێنێتەوە تا دونیای زاڵم و مەزڵوم مابێت.
نابێت ئەوەش لەبیر بکەین، حوسێن و یەزید لە هەر کات و شوێنێك بێت، لە ژیان ململانێ دەکەن. ئەوانەی هێمای بەریەککەوتنی کۆمەڵایەتین، بەرکەوتنی کۆمەڵایەتیش دانامرکێتەوە.

***

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا شیعە یادکردنەوەیەکی گەورە بۆ کوشتنی حوسێن ساز دەکەن. لەو یادکردنەوەیە فرمێسکێکی زۆر دەڕێژن، سنگ و پشتیان دەکوتن، سەریان زامدار دەکەن. دەتوانین بڵێین ئەو بۆنەیەی شیعە بۆتە مەراسیم و ڕۆحی شۆڕشگێڕیی سەرەتای تێدا نەماوە. یەکێك لەوانە لە کۆڕی ماتەمینی بۆ حوسێن دەگری، کەچی دواتر بایەخ بەوە نادات ئەگەر لەسەر ڕێچکەی یەزید بڕوات.
من هەندێکجار کە سەیری ئەو کەسانە دەکەم لەپێشەوەی کەژاوەکانن و داوەت بەناوی حوسێن سازدەکەن، دەبینم لەئاکاردا جیاوازییەکیان لەگەڵ پیاوانی بەنی ئومەییە نییە. بە دووریشی نازانم کەسێك لەوانە جارێکی دیکە حوسێن بکوژێتەوە ئەگەر یەزید فەرمان بدات و معاویە چاو دابگرێ، ئەوان لە مانگی موحەڕەم لەسەر حوسێن دەگرین، دواتر لە مانگەکانی دیکە دەیکوژن.
ئەو ڕێوڕەسمەی بۆ حوسێن ئەنجام دەدرێت، لەلایەن بوەیهییەکان داندرا، ئەوانیش سوڵتانن دەیانەوێ پاڵپشت دەوڵەتی خۆیان بەمە بکەن، دواتر چەندین سوڵتانی دیکە هاتن، دەستیان بە گریان کرد و درێژەیان بەگریان دا، بەمەش ئەو شەهادەتە گەورەیە بووە یارییەك بە دەستی سوڵتانەکان و بەمە کڵاو لەسەر خەڵك دەنێن[٢٠٠].

[٢٠٠] یەکێك لەبرادەرەکانم پێشنیاری بۆ کردم کتێبێك بەناونیشانی (الضحك على الذقون) بنوسم (بەکوردییەکەی ڤیدیومی کڵاو لەسەرنان بەکاردێت -وەرگێر) لەوێ ئەوە ڕوونبکەمەوە کە

پوختـەی قسـەکانمان ئەوەیـە سـوڵتانەکان توانیویانـە بـەدگۆڕانێك لـەو بنـەما کۆمەلآیەتیانە بکەن، کە ئیسلام هێناویەتی. ئەمیدان ڕۆحیان لەپێناویدا بەخشیوە، لـە سروشـتی خۆیـان دوورخسـتۆتەوە و کردوویانـە بەکۆڵەکەیـەك لـە کۆڵـەکانی ستەمکاریی. ئەمەش یەکێکە لەو هۆکارانەی وایانکردووە ئیسلام خەسڵەتی ملکەچیی و دۆگمایی فیکری و کۆمەلایەتی هەبێت و ڕووناکی و گڕی تێدا نەبێت.

ئێستا موسڵمانان وایان لێهاتووە لـە ئـایین ناگـەن، جگـە لـە ئەنجامـدانی ڕێـوڕەسمـە ڕووکەشەکان نەبێت، دواتـر دەسـتیان بـۆ سزا هەڵـدەبڕن و دەڵـێن:" خـودایە دیـن و دەوڵەت سەربخەی" دین و دەوڵەت لە دیدی ئەوان بۆتە یەك شت. ئـەوەی نـەیاری دەوڵەت بێت دوژمنی ئایینە؛ بەمەش چاکخوازی ئایینی کەسێکە لە دەوڵـەت. شـتێك نەماوە سوڵتانی موسڵمانان ئەنجامی بدات، تەنها ئەوە نـەبێت وەك فیرعـەون بڵـێ:" أنا ربکم الاعلی"[٢٠١].

شێخ عەلی عەبدولرەزاق پێیوایە ئەو بڕوایە زۆرداره کە سـوڵتانەکانی پـیرۆز کـردووە، بەرپرسیایەتی یەکەمە لەسەر ئەوەی لەسەدەکانی دواییدا ملکەچی و زەلیلی بەسـەر ئیسلام هاتووە. ئـەو پێیوایە ئیسلام لـەو باوەڕە دوورە، ئیسلام ئـایینێکی پاکە، پەرەسەندنی مافی خودایی نازانێت، بەڵکو ئـەو پەرەسەندنە لـە لایـەن سوڵتانەکانەوە برەوی لەناو خەڵك پێدراوە، بۆ ئەوەی ئـایین بکەنـە زرێیـەك خۆیان و تەختـەکانیان بپارێزن و بەدکاری خۆیان پەردەپۆش بکەن. بەمەش موسڵمانیان ملکەچ کردو ڕێگای ڕاستەقینەیان لە خەڵك ونکرد، ڕۆشنایان لە خەڵك خامۆشکرد و عـەقڵیان بەرتەسك کرد. ئەمـەش بـوو بـە هۆکـاری مردنـی هێـزی توێژینـەوە و چـالاکی فیکری لـە نێـو

---

چۆن سوڵتانەکان و واعیزەکانیان لەپێناو کۆیلەکردنی خەڵك هۆکارەکان بەکاردەهێنن. خۆزگە بمتوانی ئەمە ئەنجام بدەم. پەنا بەخوا.

[٢٠١] القرآن، سورة النازعات، آية ٢٤.

موسڵمانانداء ئەوان تووشی ئیفلیجی بیرکردنەوەی سیاسی بوونەوە لەوەی پەیوەندی بە خەلافەت و خەلیفەکانەوە هەیە"[٢٠٢].

ئەو قسانە خاڵی نیین لە هەقیقەت، بەڵکو خودی هەقیقەتن. ئەو باوەڕە سوڵتانییەی کە بەسەر عەقڵی موسڵمانانەوە زاڵە یەکێکە لە گرنگترین ئەو هۆکارانەی کە بوّتە ئەو کاولکارییە گشتگیرەی کە ئێستاش پاشماوەکەی لە هەموو وڵاتانی موسڵمانان دیارە. محەمەد بەریەککەوتنێکی کۆمەڵایەتی بە جیهان بەخشی، عەقڵەکانی جووڵاند و گەشەی بەشارستانیەت دا. کۆمەڵگای ئیسلامی لەسەرەتادا دەکوڵا، بیر و جووڵەی تێدا هەڵدەقوڵا، بەڵام سوڵتانەکان ئەو گڕەیان دامرکاندەوە و عەقڵی خەڵکیان بە ئامۆژگاری بریقەدار بێهۆش کرد، ئەو ئامۆژگاریانەش دەتوانێ پاساو بۆ کاری سوڵتانەکان بهێنێتەوە و گلەییەکان بخاتە سەر رەعیەت.

***

سوپاسی خودا دەکەین لەبەر ئەوەی ئێمە لەسەدەیەکی نوێ دەژین، کە دەوڵەت لە بەرزایی خۆی دابەزیوە و پەردەی هەقی خودایی لەسەر لادراوە. ئێستا وامان لێهاتووە وەک چۆن سەیری خزمەتکار دەکەین وەهاش سەری دەسەڵاتداران دەکەین کە خەڵك بۆ کاروباری خۆیان بەکرێیان گرتووە.

جارێکیان چوومە یەکێك لە فەرمانگەکانی دەوڵەت، کابرایەکی لادێیی رووت و رەجاڵم بینی هەڕەشە و گوڕەشەی لە فەرمانبەرێك دەکرد، وەك ئەوەی سەردارێکی سەدەکانی رابردوو بێت فەرمان بە کۆیلەکەی بکات. ئەوکاتە هەستم کرد من لە سەدەیەکی نوێ دەژیم. ئەو رووداوەم بەسەرهاتێکی خۆم بەراورد کرد، کە لەتەمەنی گەنجێتیم بینم، من چوومە فەرمانگەیەك دەلەرزیم لەوەی فەرمانبەر فەرمانی دەستگیرکردنم بکات. ئەویش پیاوێکی فەرمان بەدەستە.

---

[٢٠٢] علی عبدالرزاق، الاسلام و اصول الحکم، ص١٠٢

بەر لە چارەکە سەدەیەك عەرز وحاڵێکم دایە فەرمانبەرێك، کەچەندین نیشانەی سەرسوڕمان و نیشانەی پرسیاری تێدابوو، ئەمەش لە خوێندنەوەی ڕۆژنامەکان فێر بیووم، هەرکە فەرمانبەرەکە سەیری عەرزوحاڵەکەی کرد، لەڕاندی و بەتوندیش منی دەرکرد، و وتی:" ئەوە عەریزەیە یان جەریدەیە؟!" هێشتا بەدەرگای فەرمانگەکە نەگەیشتبووم، ڕامکرد لە ترسی ئەوە یەکێك لە جەلادەکان بەدوامەوە بێت.

دواجار لەوە ڕاهاتووم کە بەسەربەرزی بچمە فەرمانگەکانی حکومەت، ئەمەش دوای ئەوەی بنەماکانی حکومەتی دیموکراسیم خوێندەوە وەك کارەکەرێکی بەکرێگیراو سەیری فەرمانبەر دەکەم. کەچی باوکم ئێستاش بەترسەوە دەچێتە فەرمانگەکانی حکومەت، هەرکە فەرمانبەرێك دەبینێ دەترسێ، وەك ئەوەی وا خەیاڵ بکات ئەو فەرمانبەر بۆ سەربازی ئیجباریی یان باج وەرگرتن هاتووە. بۆیەش پەنا دەباتە بەرخودا وداوای هاوکاری لێ دەکات.

باوکم تەنها کەسێکە لەو ملیۆن خەڵکەی کە لە سەردەمی سوڵتانەکانەوە لەوە ڕاهاتوون بەیانی و ئێوارە بڵێن:" خودایە دین و دەوڵەت سەربخە" کاتێکیش بە باوکم دەڵێم:" حکومەت دەبێت لە خەڵکەوە بۆ خەڵك بێت" باوکم دەترسێ و دەڵێ:" کوڕم دەنگت نزم بکە، دیوارەکان گوێچکەیان هەیە".

خودا لە سوڵتانی موسڵمان خۆش بێت، ئەوان باوانی ئێمەیان لە ملکەچییەکی کوشندە ڕاهێناوە. تەنها بەوەندەش وازیان نەهێناوە، بەڵکو فێری ئەوەیان کردووین کە ملکەچی بۆ ئەوان ملکەچییە بۆ خودا. بەمەش سوڵتانەکان توانیویانە باری بە خەڵك بکەن و ماڵیان تاڵان بکەن و ئابڕوویان هەتك بکەن. کەسیش بەرپەرچیان نادانەوە، بەمەش موسڵمانەکانیان خستە دەیجووری سەدە تاریکەکانەوە.

گۆڤارێکی ئاینیم خوێندنەوە کە لەو ڕۆژگارەدا لە بەغدا دەردەچێت[٣٠٣]. بڕگەیەکی تێدا بوو بەناونیشانی (سوڵتان)، کە ئەمە دەقەکەیەتی:-

---

[٣٠٣] مجلة الثقافة الاسلامية، السنة الاولى، العدد السادس، ص٢٥

" سوڵتان ڕکێفی هەموو بابەتەکانی بەدەستەوەیە، ئەو سیستەمی مافەکانە، سەرکردەی هەموو سنوورەکان و ئەو چەمسەرەیە کە دونیای بەدەوردایە. ئەو پاسەوانی خودایە لەسەر زەوی وسێبەری خودایە بەسەر بەندەکانی، بە سوڵتان ئابڕوویان دەپارێزرێ؛ ستەمکاران بەهۆی ئەو سەردەکەون؛ ستەمکاران سەرکۆنە دەکرێن و ترساوەکان دڵنیا دەکرێنەوە".

ئەو گۆڤارە لە سەدەی بیستەم بەناوی ڕۆشنبیری ئیسلامی دەردەچێت. ئەو گۆڤارە نەشەرم لە ئیسلام دەکات؛ نەشەرم لەو سەدەیە دەکات کەئێمە تێیدا دەژین. ئەو ئەمڕۆ ئەو شتانە دەنووسێ وەك ئەوەی واعیزەکانی سوڵتان دە سەدە لەمەوبەر دەیانووسی. بۆیە لەسەر موسڵمانان پێویستە ئایینەکەیان لە سەرچاوەکەیەوە وەربگرن؛ نەوەك لەوکەسانەی کە کاهینی بەکرێگیراون.

# پاشبەندی گاڵتەجارییەکە
# هەندێک لەپیاوانی ئایینی



خەریک بووم لە چاپکردنی ئەم کتێبەی ئێستا لەبەردەستت دایە تەواو دەبووم، تووشی ڕووداوێکی لەناکاو بووم. دەکرێت ئەمە نموونەیەکی ئایاب بێت بۆ گاڵتەجاریی عەقڵی مرۆڤ. ئێوارەی ڕۆژی بیست و هەشتی مانگی شوباتی رابردوو، موحازەرەیەکی گشتیم لە هۆڵی ئاداب دا. هەوڵم دا شاوتوێی هەندێک دیاردەی بەدڕەوشتی کۆمەڵایەتیی بکەم لە مەککەی بەر لەبانگەوازی محەمەد. ئاماژەم بۆ ئەوەکرد کە چ لێکچوونێک لەنێوان ئەو بەدڕەوشتییەی ئەو کات قورەیش تێیدا دەژیا، لەگەڵ ئەوەی زۆردارانی ئێستای ئەم سەردەمەمان هەیە. ئەوەم لە خەیاڵ نەبوو کەسانێک لە گوێگران قورەیش یان خۆشگوزەرانەکانی سەردەمێک لە سەردەمەکان پیرۆز دەکەن.

لە کاتی موحازەرەکە پرسیارم لەبارەی پێغەمبەرەوە لێکرا، بۆچوونی من لەبارەی ئەو پێغەمبەرەوە زانراوە. هەموو ئەو قوتابیانەی کە لە پۆلەکانم ئامادە دەبن و هەموو ئەو خوێنەرانەی کتێبەکانی من دەخوێننەوە، دەزانن من تێڕوانینم لەبارەی پێغەمبەر چۆنە. شتێکم لەو بارەیەوە نییە شایەنی شاردنەوە بێت.

باوەڕی من لەبارەی ئەو پێغەمبەرە جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ باوەڕی توندڕەوەکان هەیە. ئەوان لەباوەڕی خۆیان بە خۆشگوزەرانەکان کاریگەربوون، بەپێی ئەو بەخششانەی سوڵتان پێیداون، لێکدانەوە بۆ مێژوو دەکەن. ئەوانە بڕوایان وایە محەمەد قورەیشی خۆشویستووە و لەسەرووی هەموو هۆزەکانی دیکەی داناوە. گوایە قورەیش هۆزێکی چاک بوونە و هەموو سیفەتەکانی شەرەف و چاکەخوازییان تێدابووە، تەنها عەیبێکیان هەبووە، ئەویش لە رۆژگاری جاهیلییەت بوون کە بتپەرست بوون. بۆیە خودا پێغەمبەری نارد بۆ ئەوەی لەو تەنگییە نەجاتیان بدات و بەمەش ببنە سەرداری خەڵک.

ئەمە باوەڕی ئەوانە لەبارەی پێغەمبەر، ئەوانیش چەندین فەرموودە دەهێننەوە بۆ پشتگیری ئەو باوەڕەیان. کەچی من باوەڕم وایە پێغەمبەر زۆر لەوە مەزنتر بووە. ئەو پەیامە گەورەکەی بۆ ئەوە نەهێناوە، تا هۆزێک بکاتە سەرداری هۆزەکانی دیکە. بەڵکو ئەو شۆڕشگێڕێکی کۆمەڵایەتی بووە، بەر لەوەی کەموکوڕی کەسانی دیکە ببینێت، کەموکوڕی هۆزەکەی دەرخست. ئەمەش ئەرکی هەر پێغەمبەرێکی چاکەخوازە. بۆیە ململانێی نێوان محەمەد و قورەیش توند بوو، گەیشتە جەنگی نێوان مان و نەمان.

محەمەد بەڕەچەڵەک قورەیشی بوو. هەندێک لە سەحابە چاکەکانیشی لە قورەیش بوون. بەڵام رەچەڵەکی ئەوان رێگر نەبوو لەوەی رەخنە لەهۆزەکەی خۆیان بگرن و لێی باخی بن. ئەو خەسڵەتەش لە هەموو خەڵک نییە، تەنها لە هەندێک تاک نەبێت کە

لە کۆمەڵناسی پێیان دەگوترێ خاوەن کەسایەتی سەرڕاست. ئەو کەسانە لە سەرووی سنووری کۆمەڵایەتییەکانن و دوورن لە دەمارگیری قەومەکەیان و کەموکورییەکانیان.

پیاوانی ئایینی لەوە راهاتوون کە قەومەکەی خۆیان بەچاکترین قەوم بزانن، بۆیە دەبینین لە دونیادا شتێك نازانن تەنها شکۆمەندکردنی قەومەکەی خۆیان و سووککردنی بیروباوەڕی کەسانی دیکە نەبێت. ئەوان چاکە لەدەمارگیری تایفیی و نەتەوەیی و هۆزگەرایی دەدۆزنەوە، چاکەکار بەبۆچوونی ئەوان ئەو کەسەیە لەسەر هەق و ناهەق بەرگری لەتایفەکەی دەکات، براکەی سەردەخات ئەگەر زاڵم بێت یان مەزڵوم!.

یەکێك لەوان لە ژینگەیەکی دیاریکراو پەروەردە دەبێت، ئەو لەشتەباوەکان و دابونەریتی کۆمەڵگاکەی رادێت و هەر ئەو هەقیقەتەش دەبینی کەلای ئەوان هەیە، بۆیە دەبینین دونیا پڕ دەکات لەخوتبەی بریقەدار. دەیەوێت خەڵك بێتەسەر ئەو باوەڕەی کە لە باوانییەوە بۆی ماوەتەوە، بەڵام کەسی سەرڕاست رقی لەو کەسانە دەبێتەوە کەدەڵێن:" **إنا وجدنا آباءنا على أمة وإنا على آثارهم مهتدون**"[٢٠٤].

پێغەمبەرم بە کەسێکی سەرڕاست(شخص حدي) وەسفکرد، پیاوانی ئایینی لەو وەسفە تووڕەبوون. کردیان بەهەرا، هەندێکیان چەمکی کەسایەتی حەدیان بەوە لێکدایەوە گوایە کەسایەتی مەحدودە(سنووردارە) نازانم ئەو لێکدانەوەیان لەکوێ هێناوە. ئەوان بەخواستی خۆیان شرۆڤە بۆ بابەتەکان دەکەن و دواتریش لەو شرۆڤەی خۆیان تووڕە دەبن، یان راستتر ئەوان لەخۆیان تووڕە دەبن. ئەو رووداوە ئەو هەرایەم بیردەخاتەوە کە لەکاتی دەرچوونی کتێبەکەم (واعیزی سوڵتانەکان) دروست بوو. لەو کتێبە ئیمام عەلیم بە پیاوێکی شۆڕشگێڕ وەسفکرد، پیاوانی ئایینی وشەی

---

[٢٠٤] القرآن، سورة الزخرف، ئ٢٣

شۆڕشیان(الثورة) لەزمانی عەرەبی دا لێکدرایەوە لەوشەی (الثور) وەرگیراوە، هەرا ئەوما، جیا قورپەسەر ئەو نووسەرەی کە هەرای لەسەر دەقەومێت.

وەک دەردەکەوێت پیاوانی ئایینی دەیانەوێت پێغەمبەر تەنها بۆ خۆیان قۆرخ بکەن-وەک ئەوەی پێغەمبەری تایبەت بەوان بێت، بۆیە ڕازی نابن خەڵک وەسفێکی پێغەمبەر بکات، تەنها بەو وەسفانە نەبێت کە لەنامەنگەکانی مەولودی نەبەوی دەیڵێنەوە، ناشزانن ئەو وەسفانەی ئەوان بۆ پێگەی ئەو پێغەمبەرە خراپە، کە لەڕاستیدا مەزنترین پیاوە لە مێژوودا.

***

ئەوە باوەڕی منە لەبارەی محەمەد، نکۆڵی لێناکەم و لێی پاشگەزنابمەوە. هەر ئەمەم لە موحازەرەکەدا وتووە کە لێژنەیەکی لێکۆڵینەوە بۆ ئەوە مەبەستە پێکهاتووەو تۆماری کردووە، ڕۆژنامەکانی ئاوخۆش بەیاننامەیەکیان بڵاوکردۆتەوە، ڕاستی موحازەرەکەیان بڵاوکردۆتەوە. یەکێک لەمامۆستاکان بەیاننامەیەکی هاوشێوەی بڵاوکردۆتەوە. وامدەزانی پیاوانی ئایینی بەمانە وازدەهێنن و ڕازی دەبن، کەچی لە کۆتایی دا بۆم دەرکەوت ئەوان نە وازدەهێنن و نە ڕازی دەبن! لەو کارانەش پیاوێکی مافیەروەر پێشەنگی دەکرد کە نووسەری یاسایی بوو، ئەو پیاوە خوای لێ ببووروێ فەرمانگەکەی خۆی جێدەهێشت و هاموشۆی بەرپرسانی دەکرد، دیارە دەیویست ئەستۆی نووسەری ئەوچەند دێرە بشکێنێ.

خۆزگە دەمزانی چی لەمەدا هانی دەدا؟ ئەگەر هاندەرەکە ویژدانە ئایینیەکەی بێت، ئایین هانی دەدات بەر لەوەی بڕیار لە بابەتێک بدات، دەبێت لێکۆڵینەوە بکات. ئەگەر هاندەرەکەشی ویژدانە یاساییەکەی بێت، ئەوا ئەمیش هەمان فەرمانی پێدەکات، کە ئایین پێی کردووە. بەڵام لەوانەیە ویژدانێکی دیکەی هەبێت، ئەمەش کرۆکی بابەتەکەیە.

شاندێك لەپیاوانی ئایینی، بەسەرۆكایەتی ئەو پیاوە پاسایییە چوونە وەزارەتی داد، بۆ ئەوەی داوایەك لەسەر ئەو كافر و زەندیقە تۆمار بكەن، كە منم. تەنها بەوە وازیان نەهێنا، بەڵكو هانی واعیزی مزگەوتەكانیان دا، تا ئەركی ئایینی خۆیان لەو بوارەدا ئەنجام بدەن. ئەوانیش زۆر بەچاكی بەو ئەركەی خۆیان هەڵسان. یەكێك لەو واعیزانە كە خەتیبی یەكێك لە مزگەوتە بەناوبانگەكانی بەغدا بوو لەخوتبەی هەینی وتی:" سێ شت وڵات بەرەو بەدڕەوشتی دەبات، ئەوانیش قومار و لەشفرۆشی و دكتۆر عەلی وەردییە ! ". ئەو واعیزە ئەوەی لە بیركردووە ئەم خوتبەیەی ئەو و هاوشێوەكانی هۆكارێكی بەدڕەوشتین.

دوای ئەو خوتبە توندانە، سێ پیاو هاتنەماڵەكەم كەسەریان بە مەندیلی سپی داپۆشرابوو، دەوری ماڵیان دابوو وچرپەیان لەگەڵ یەكتر دەكرد. یەكێك لەدراوسێكانم لێیان هاتەدەر و ئەوانیش رایانكرد. لەبەدبەختی لەماڵەوە نەبووم. من لەو باوەڕەدام ئەو سێ پیاوە لەژیانیان دا بەدڕەوشتی قومار ولەشفرۆشی ئەنجام دەدەن، كاتێكیش بیستوویانە واعیز منی لەپلەی قومار و لەشفرۆشی داناوە، ویستویانە هێرشم بكەنەسەر. ئایا زانیویانە من لەگەڵ دوو بەدڕەوشتییەكەی ئەوان ركابەرم؟

ئەوان هەموو ئەو كارانە دەكەن كە ئایین قەدەغەی كردووە. بەڵام كاتێك هۆكارێك بۆ دەستدرێژی دەدۆزنەوە ئەوا دەبنە توندترین كەس لەسەر ئایین. جێگەی داخە كە دەبینین واعیزەكان ئەو جۆرە هیچ وپووچانە بۆ بانگەشە ئایینیەكانیان بەكاردەهێنن. ئەگەر خوێنەر سەیری ئەو كۆنووسە بكات، كە لیژنەی لێكۆڵینەوە لەبارەی موحازەرەكە تۆماری كردووە. دواتریش بەو هات و هاواری بەراورد بكات كە واعیزەكان دروستیان كردووە، ئەوا ئەنجامێكی ترسناكی بۆ دەردەچێت. ئەم گاڵتەجارییە بەڵگەیە بۆ ئەو ستەمەی كە واعیزەكانی سوڵتان لە سەردەمانی رابردوو ئەنجامیان داون. هەر كاتێكیش ئەو بێگوناهانەم بیردەكەوێتەوە كە بەناوی ئایین

لەسەردەستی کافیرەکان لە سەردەمی کۆن کوژراون، ئەوا سوپاسی خودا دەکەم کە منی لە سەردەمی نوێ دروستکردووە.

یەکێک لەرووداوە سەیرەکان ئەوەبوو، یەکێک لە نوێژکەرەکان کاتێک ئەو هێرشەکردنەی لە مزگەوتێکی ناسراو بیستووە، ئەو کەسە لەوانە بوو کە موحازەرەکەی منیان بینیوە. کاتێک چیرۆکەکەی بۆ ڕاگەیاندم، پرسیارم لێکرد" بۆچی وەڵامی واعیزەکەت نەدایەوە. کاتێک تۆ بێگومانی لە ڕادەی ئەو جەهالەتەی ئەنجامی داوە؟" وەڵامی دایەوە:" بەخوا ترسام لەوەی بەکوفر تۆمەتبارم بکات" جارێکی دیکە پرسیم:" ئایا ئێستا باوەڕت بەڕاستی ئەو قسانە ماوە کە واعیزەکان دەیڵێن؟" وتی" نا بەخوا".

***

ئیسلام ئەوەی بەسەر پەیڕەوکارانی خۆی واجب کردووەکە بەر لەوەی بڕیار لەسەر دروستی تۆمەتەکە بکەن، لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکەن. وەک دەردەکەوێت پیاوانی ئایینی فەرمان بەخەڵک دەکەن چاکە بکەن، کەچی خۆیان لەبیر دەکەن. ئەمەش یەکێک لەو هۆکارانەی وایکردووە نەوەی نوێ لە ئایین و پیاوانی ئایینی دوور بکەونەوە.

پیاوانی ئایینی لە دیدی خەڵک نوێنەری ئایینن. هەر کارێکی نابەجێ ئەنجام بدەن، ئەوا بۆ ئەوەی هەست بکەن ئایین تێکدەدەن. مرۆڤ لەوە ڕاهاتووە بابەتەکە بە ڕووکەش هەڵسەنگێنێ. ڕووی ئایینیش لەپیاوانی ئایینی بەرجەستە بووە. ئەگەر ئەوان خراپ بن، ئەوا ڕواڵەتی ئایینەکەشیان خراپ دەبێت. ئەو کەسانەی قسەدەکەن و ڕەفتاری پێ ناکەن ئەوا لەلای خودا خۆشەویست نین.

***

مەبەستم ئەوە نییە، هەموو پیاوانی ئایینی لەوجۆرە بن کە ئێمە وا گلەییان لێ دەکەین، بەپێچەوانەوە دادپەروەریی داوامان لێ دەکات ئیعتراف بەوە بکەین کە چەندین پیاوچاک و سالح لەنێو ئەواندا هەیە. هەندێک پیاوی ئایینم ناسیوە کە لەناو ئەواندا بۆم دەرکەوتووە ئەوان لەشۆڕشە فیکرییەکانین و لە خۆشەویستیان بۆ چاکسازی لە یارانی پێغەمبەر دەچن، بەڵام ئەوان بێدەنگن. کێشەکەیان ئەوەیە بێدەنگن.

ئەوان لە خەڵک دەترسن کاتێک قسە بکەن. بۆیە قەزاکە پڕ بووە لە دەنگی ئەو کەسانەی کەختۆکەی سۆزی خەڵک دەدەن و ڕق وکینە بڵاودەکەنەوە. دەبێت ئەو پیاوانە بزانن کە ئەرکێکی قورس و نەخوازراویان لەبەردەم دایە. هەقیقەت هەمووی قورس و نەخوازراوە. چاکەخواز بایەخ بەوە نادات خەڵک چ دەڵێن. کاتێک خۆی باوەڕی بەو بیرۆکەیە هەبێت کە بانگەشەی بۆ دەکات. تەنانەت ئەو قوربانی بە ناوبانگی خۆی دەدات. بەڵام زەمەن زامنی نەمرکردنی ئەوە کاتێک فێڵبازەکان لەبیر دەچنەوە.

جیاوازییەکی گەورە لەنێوان کەسی فێڵباز و چاکساز هەیە. فێڵباز مەبەستی پێگەیە لەنێو قەومەکەی، بۆیە بایەخ بەوە نادات ئەوان لەسەر هەقن یان ناهەقن. خۆشی وەک چاکەخوازێک دەردەخات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حەز دەکات لە سەرووی مەجلیسەکانەوە دابنیشێ و خەڵک لەبەری بوەستن. ئەمەش مانای ئەوەیە ئەو کەسە مەبەستی پێگەیە نەوەک چاکسازی!.

پێغەمبەر محەمەد دەڵێ:" خولی ناهەق سەعاتێکە. کەچی خولی هەق تا هاتنی ڕۆژی قیامەتە" بەڵێ کەسی تەڵەکەباز بۆ ماوەیەکی کورت سەردەکەوێت، بەڵام لە کۆتایی دا دۆڕاوە. لەو سەردەمەدا بە دوو پیاوی چاکەخواز سەرسامم، ئەوانیش محەمەد عەبدەیە لە میسر و سەید موحسینی ئەمینە لەشام. شێخ محەمەد عەبدە، لە سەرەتای بانگەشە چاکسازییەکەی بەشێکی زۆری لە جنێوی وەرگرت. تەنانەت بەو

دەجالەیان ناوبرد، کە لەکۆتایی زەمانە دەردەکەوێت. بەڵام ئێستا ئەمرە و هەموو پیاوانی عەمامە بەسەر بەپێکەکەی ئەو ناگەن.

من تا ئێستاش ئەو هەراییەم لەبیرە کە لە بانگەشە چاکسازییەکەی سەید موحسین پەر لە چارەگە سەدەیەك دروست بوو. خەڵك سوکایەتی پێکرد و جنێوی پێدا و پێیان وت زەندیق. بەڵام خۆڕاگر بوو و بەرگری کرد و وەڵامیشی نەدایەوە. دواجار سەید مرد ، بەڵام یادی ئەو نەمرد و نامرێت. ماوەیەکی زۆریش دەمێنێتەوە تا ئەو پڕوپووچییانەی کە ئایینیان شێواندووە لەناو دەچن، کە ئایینیان کردۆتە جێگای پێکەنین.

گومانم لەوە نییە کە زۆرێك لەنموونەی محەمەد عەبدە و سەید موحسین ئەمین لەنێو پیاوانی ئایینی هەن، بەڵام بێ دەنگن و قەزاکەش پڕ بووە لەدەنگی ئەو پیاوانەی خۆیان بەئایین دەردەخەن و ئاینیش لەوان دوورە. ئێستا کاتی ئەوە بۆ بێدەنگەکان هاتووە، قسە بکەن!

***

دەمەوێ ئەو کتێبە بەو قسانە کۆتایی پێبهێنم کە پێشتر لەکۆتایی کتێبی واعیزی سوڵتانەکانم نووسیبوو. ئەمیش ئەوەیە کاتی سوڵتانەکان بەسەرچوو، کاتی گەلان هاتووە. ئێستا کاتی ئەوەیە کودەتایەك لەشێوازی بیرکردنەوەمان ئەنجام بدەین. بۆ ئێمە گونجاو نییە ، ئێمە لەسەدەی بیستەمین کەچی بەشێوازی پێشینانمان لەسەدە تاریکەکان بیر بکەینەوە.

سەردەمی نوێ زەنگی ئاگادارکردنەوەمان بۆ لێدەدات، دەبێت گوێ لەو زەنگە بگرین بەرە لەوەی کات بەسەربچێت. ئەو بەدەنگێکی بەرز بەرەو ڕووەمان لێیت کە گوێچکە کەڕ دەکات. گونجاو نییە وەك نەعامە بین سەری خۆمان لەخاك بنێین بۆ ئەوەی ڕاوچی نەمانبینێ. ئەم ڕاوچییەکە نابینی، وادەزانێ ڕاوچییەکەش ئەو نابینێ.

ئەوەی نوێ بیری نوێ دەخوێنێت. زیهنی پڕبووە لە لۆژیکی واقیعیی. بیرکردنەوەی کەسانی کۆشکی بلورین قبوڵ ناکات کە زەمانە لێی تێر بووە. ئەوانە داوا لە پیاوانی ئایینی دەکەن ئەو بیرۆکانەی پێیدات کە لەگەڵ زەمەن بگونجێن. بۆ ئەوەی ڕێز لەوان بگرن و گوێبیستی قسەکانیان بن. ئەگینا گاڵتە بەوان دەکەن و بەجێیان دەهێڵن. بیرکردنەوە وەک چەکە بەتێپەڕبوونی ڕۆژگار دەگۆڕێت. ئەوەی دەیەوێت لەسەر بیرکردنەوە کۆنەکەی بمێنێتەوە وەک ئەوەیە بەچەکی عەنتەرەی کوڕی شەداد لەبەرامبەر تفەنگ شەڕ بکات. دانای ئیسلام عەلی کوڕی ئەبوتاڵب دەڵێ: " منداڵانتان فێری تەربیەتی خۆتان مەکەن. چونکە ئەوان لەسەردەمێک دەژین، سەردەمی ئێوە نییە" ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە گوێ لەو بانگەوازە بگرین. کە لە پشتی چەندین سەدەی ئایندەوە دێت!

١٩٥٦/٤/١

عەلی وەردی

